# لــه دەوڵــەتی دەسەڵاتەوە
# تا دەوڵــەتی عەقڵ

((لە فەلسەفەی سیاسیی نوێدا))

**کـــەمال پولادی**

**وەرگێڕانی**

**سیروان جەبار زەندی**






از دولت اقتدار تا دولت عقل
(در فلسفه سیاسی مدیرن)
دکتور کمال پلادی
نشر مرکز
چاپ اول ۱۳۸۰

**ناوی کتێب: له دەوڵەتی دەسەڵاتەوە تا دەوڵەتی عەقڵ**

- **نووسینی: کەمال پولادی**
- **وەرگێڕانی: سیروان جەبار زەندی**
- **نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی**
- **بەرگ: هۆگر سدیق**
- **پیتچنین: سۆزان عزەددین**
- **سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات**
- **ژمارەی سپاردن: ٦٠٤**
- **تیراژ: ١٥٠٠ دانە**
- **چاپی یەکەم ٢٠٠٦**
- **نرخ: ٤٠٠٠ دینار**
- **چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە**

**زنجیرەی کتێب -٨٤- (١٨٧)**





**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**
**www.mukiryani.com**
**asokareem@ maktoob.com**
**Tel: 2260311**




## ناوەڕۆك

**پاژی شەشەم:**



## بەشی سێیەم





حکوومەت ئامادەکاریی عەقڵی مرۆڤە بۆ دابین کردنی پێداویستییە مرۆییەکان.
مرۆڤ ئەوەی هەیە بە هاوکاری عەقڵ دابین کردنی ئەم پێداویستیانە ڕێك بخات.

**ئێدمۆند بێرگ**





**پێشکەشە بە:**

- (مامۆستا جەبار و مەنزەرخان)ی باوك و دایکم کە هەر لە منداڵییەوە فێریان کردم ببمە هاوڕێ لەگەڵ کتێب و پێنوس و هەرگیز لێیان دوورنەکەومەوە، ئەم کتێبەیش بەرهەمی ئەوکارەیە.

- هەموو ئەوانەی بەدوای ناسین و ڕاستیدا وێڵن تاوەکو کوێرانە نەڕواننە دنیا و کوێرانەیش تیایدا نەژین.

**وەرگێڕ**

## له بری دەستپێك

زۆرێك له هاورێیانم هەمیشه گلەیی و گازندەی ئەوەم لێدەکەن که بۆچی لـه بـواری پـسپۆڕی خۆمدا کارناکەم و پاش دەستکردنیشم به خوێندنی ماستەر گلەییەکان دوو هێندەبوونەوە بۆیـه بڕیارمدا لەمەودوا بەگوێیان بکەم، بەلاّم بیر و فەلسەفەی سیاسی ئەم جارەیش ناچـاریان کـردم دەستبەرداریان نەبم و لێیان دورنەکەومەوە.

هەروەکو لەناونیشانی کتێبەکەوە بەدیار دەکەوێت نـاوەڕۆکی ئـەم کتێبـە بریتییـە لـە بـاس و لایەنەکانی فەلسەفەی سیاسی دەربـارەی چـەمك و تیـۆری دەوڵـەت و کۆمـەڵگای سیاسـی و گفتوگۆکانی پەیوەست بەم باسە لەناو هزری بیرمەندانی سیاسیی نوێدا هەر لە هۆبزەوە بگرە تا لۆك و رۆسۆ و کانت و هەتا دەگاتە هیگڵ وەکو وێستگە و لوتکەی ئەم کاروانە.

لە کۆتاییدا هیوادارم توانیبێتم کارێکی باشم پێشکەش کردبێـت و خزمـەتێکم بـە خوێنـەر و قوتابی و خوازیارانی مەعریفە بەگشتی و مەعریفەی سیاسی بەتایبـەتی کردبێـت و لەهـەمان کاتدا هیوادارم ئەم کتێبە کەلێنێکی دیکەی گۆشەیەکی کتێبخانەی زمـانی شـیرینی کـوردیی پێ پڕببێتەوە. جێی خۆیەتی لێرەدا ڕێز و سوپاسـی بـێ پایـانی خـۆم ئاراسـتەی هـەموو ئـەو بەڕێزانە بکەم کە هانیاندام و هاوکارم بوون لەم کارەدا.

لەگەڵ ڕێزمدا

سیروان جەبار زەندی

٢٠٠٥/١١/١٠







## پێشەکی

ئەم کتێبە چیرۆکی هەوڵی بەجۆش و ئاڵۆزی ئەو فەیلەسوفانەیە کە دەیانەوێت تەواوی ئازادی و پەیوەندییەکانی ناو ڕێکیی کۆمەڵگای مرۆیی لە چوارچێوەی میتافیزیک و سروشت وەربگرنەوە و یەکراست بیگەڕێننەوە بۆ سنوری عەقڵ و ویستی مرۆیی. لەو کاتەوەی کە هۆبز لڤیاتانی نوسی و لەو کاتەوەی کە هیگڵ نیشانیدا کە لڤیاتان ناتوانێت شتێکی دیکەی جگە لە ویستی هاوبەشی هاوڵاتیان بێت بیری سیاسی ڕێگەیەکی دوورودرێژی بڕی کە بابەتی چۆن و بۆی دەوڵەت هێزی بزوێنەری سەرەکی ئەوبوو. بەدرێژایی ئەم وەرچەرخانە مێژووییە پرسیاری سەرەکی فەلسەفەی سیاسی لە سنوری بیردا ئەوەبوو کە دەوڵەت چییە، بۆچی هەیە، چۆن دروست بووە، بۆچی دەبێت پەیڕەوی لێ بکرێت و دەبێت چۆن ڕێك بخرێت؟ لەم کاتەدا کە مرۆڤ بوێرانە هەوڵی دەدا هەموو شتێك بە هاوکاری عەقڵی مرۆیی هەڵبسەنگێنێت و لەمحەکی عەقڵی مرۆیی بدات پرسی دەسەڵاتی دەوڵەت و مافەکانی خەڵکی کە بەردەوام لە پرسە سەرەکیەکانی بیری سیاسی بووە ڕوویەکی تایبەتی لەخۆگرت. پرسیارکردن لە چۆن و بۆی دەوڵەت و پێگەی عەقڵ لەناو ئەودا کە بە بابەتی عەقڵانیەتی دەوڵەت باسی لێوەکراوە بابەتی سەرەکی ئەم کتێبەیە.

بەڵام مەبەستی نووسەری ئەم کتێبە ئەوە نییە کە بکەوێتە گەڕان بەناو دنیای بەرفراوانی باسەکانی پەیوەست بە تیۆری دەوڵەت. ئەوەی کە ئەم کتێبە خەریکی سەلماندنێتی ئەو بانگەشەیەیەکە دەکرێت بیری پەیوەست بە چۆن و بۆی دەوڵەت وەکو یەك پرۆژە تەماشا بکرێت کە لە هۆبزەوە تا هیگڵ ڕێڕەوێکی دیاریکراوی بڕیوە و تیایدا مرۆڤ توانیویەتی لە بواری بیری پەیوەست بە دەوڵەتدا بەسەر نامۆبوون لە خۆی زاڵببێت و لە کۆتاییدا بەوە بگات کە دەوڵەت ناتوانێت شتێکی دیکەی جیا لە هێزی هاوبەشی ئەوبێت. بەبڕوای نووسەر بیری سیاسیی نوێ سەبارەت بەلایەنی عەقڵانیی دەوڵەت بە پشت بەستن بە عەقڵی مرۆڤ و پشت بەستن بە بنەما نوێیەکان بۆ یەکەمین جار لەلایەن هۆبزەوە لە هەیکەلی سیستەمێکی فەلسەفی گەورەدا دەستی پێکرد و بەلۆژیکی ناوەکیی خۆی ڕێگەیەکی بڕی کە بەچاوپۆشی لەسەرهەڵدانی چەندین تیۆری جیا و هەندێ کات ناکۆك و دابەشبون بۆ چەند لقێکی جیاواز لەگشتی بوونی خۆیدا بەرەو





مەبەستێك کە بریتییە لە دۆزینەوەی عەقلانیترین ڕێگەی ڕێکخستنی کۆمەڵگا هەنگاوی ناوە. بەدواداگەڕانی دینامیزمی ناوەکیی ئەم گەڕانە بەرزە بریتییە لە بابەتی ئەم کتێبە.

((ویستی عەقلانی)) لە تیۆرەکەی هیگڵدا کۆتایی ڕەوتێکی کامڵ بوونی دوورودرێژی سنووری بیری سیاسییە کە تیایدا تیۆری دەوڵەت پاش تێپەڕینی لە دیکترینەکانی ((ویستی ڕەها))ی هۆبز و ((ویستی زۆرینە))ی لۆك و ((ویستی هەموان))ی بینتهام و ((ویستی گشتی))ی ڕۆسۆ و ((ویستی ئەخلاقی))ی کانتەوە گەیشتوەتە پێگەی خود ئاگایی. هەریەك لەم دیکترینانە کە بەشی خۆی بەدەستکەوتێکی گەورەی ڕەوتی بیری سیاسی لەقەڵەمدەدرێت و لەگەڵ ئەوەی کە ڕەنگدانەوە جۆراوجۆرەکانی نامۆبوونی بیر دەخاتەروو بە لەخۆگری چەند پێگەیەکی گرنگی تێپەڕین بەرەو تیۆری ویستی عەقلانی و دەوڵەتی عەقلانی هیگڵ دادەنرێت. بەم جۆرە ئەم کتێبە بەپشت بەستن بە لۆژیکی ناوەکیی ڕەوتی بیر ئەو پێگانەی کە دیکترینی ((ویستی ڕەها))ی هۆبز تا ((ویستی عەقلانی))ی هیگڵ بڕیویەتی دەخاتە بەرباس. تا ئێستا تیۆرەکانی بیرمەندە جیاوازەکانی ئەم قۆناغە بەشێوەیەکی جیا لەیەك و ناپەیوەست و تەنات دژ بە یەکیش لێیان کۆڵراوەتەوە. نووسەر دەیەوێت ڕەوتی بیر لە هۆبزەوە هەتا هیگڵ وەکو یەك گشتی تاك بخاتە ژێر لێکۆڵینەوە و بەر لە هەموو شتێك لەگەڵ دۆزینەوەی یاسامەندی ناوەکیی کامڵبوونی بیری پەیوەست بە دەوڵەت. نمونەی بەرزترین فۆرمی ڕێکخستنی دەوڵەت وەکو ئەنجامی لۆژیکیی ڕەوتی کامڵ بوونی ئەم بیرە بناسێنێت.

## خستنەڕووی پرسەکە

بیری نوێ بەگرنگیدان بە عەقڵی مرۆڤ وەکو تاکە ڕێکخەری بواری ژیانی کۆمەڵایەتی، و ڕەتکردنەوەی وێنای پەیوەست بوونی عەقڵی مرۆیی بە عەقڵی میتاییەوە بە شێوەیەکی نوێ دەستی بە توێژینەوەی بنەماکانی عەقلانیەتی دەوڵەت کرد. بەم جۆرە ئەم بابەتە خرایەروو کە دەوڵەت دەزگایەکی مرۆییە و عەقڵی مرۆیی بۆ ڕێکخستنی لایەنێکی گرنگی ژیانی کۆمەڵایەتی دروستیکردووە. هاوکات ئەم پرسە خرایەروو کە باشترین شێوەی ڕێکخستنی کاروبارە گشتییەکان بەپێی عەقڵی مرۆیی بە چ شێوەیەکە. گەرچی ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە دەوڵەت ڕێکخراوێکی دروستکراوی مرۆڤە بۆچوونێکی نوێ نییە بەڵام بۆچونێکە کە لە سەدەی حەڤدەیەمدا بەشێوەیەکی جدی و هەمەلایەنە هۆشی گەورەترین بیرمەندانی سیاسیی بەرەولای خۆی ڕاکێشاوە. گەرچی ماکیاڤیلی یەکەمین بیرمەندی سیاسی بووکە وتی دەبێت لە

ڕاستییەکانی ژیانی کۆمەڵگادا بەدوای عەقلانیەتی دەوڵەتدا بگەڕێین بەڵام هۆبز یەکەمین تیۆردارێژی گەورەبوو کە لەگەڵ دوورخستنەوەی دەربڕینی میتایی لە دەوڵەت بە تێڕوانینێکی نوێوە پێی نایە ناو مەیدانەوە تاوەکو ناوەڕۆکی کۆمەڵگای ڕێکخراو و جەوهەری دەوڵەت لە یەك سیستەمی فەلسەفی گەورەدا ئاشکرا بکات. هۆبز بە پێچەوانەی ماکیاڤیلی کە لەناو بەد سروشتییە ئەخلاقییەکانی مرۆڤدا بەدوای سەرچاوەی دەوڵەتدا دەگەڕا، دەوڵەتی بە ڕێکخراوێکی دروستکراوی ویست و عەقڵی مرۆیی ناساند و دوابەدوای وەها تێڕوانینێك بوو کە ئەم بابەتە هاتە پێشەوە کە چۆن دەکرێت بە ناسینی بنەماکانی عەقلانیەتی دەوڵەت بە شێوەیەکی عەقلانی (دەوڵەت) ڕێکی بخەینەوە.

ئەو بۆچوونەی کە دەوڵەت بە ڕێکخراوێکی دروستکراوی مرۆڤ دادەنێت نەك ڕەنگدانەوەی پرۆسەی سروشتی یاخود ویستی خودایی، بووە سەرچاوەی ڕەوتێکی گەورە لە بیری سیاسی ڕۆژئاوادا. وەها تێڕوانینێك کەوتە بەرامبەر جیهانناسی کلاسیك کە کۆمەڵگای بە بەشێك لە سیستەمی جیهانی و پشت ئەستوور بە عەقلانیەتێکی گەورەتر دەزانی، عەقلانیەتێك کە مرۆڤ بەشێکە لەو و ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤیش تەنها بە بەستنەوە بەو سەرچاوەیەوە دەکرێت بە عەقلانی دابنرێت. بەوەها تێڕوانینێك وەها وێنا دەکرێت کە مرۆڤ تەنها لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم سیستەمە فراوانەدا دەتوانێت پێگەی ڕاستەقینەی خۆی بدۆزێتەوە. بەڵام بیری نوێ هەم عەقڵ و هەم دەوڵەتی لە هەموو دەروازەیەکی دەرەوەی کۆمەڵگا جیاکردەوەو تێگەیشتنێکی نوێیی بۆ عەقڵ و ڕێکی دامەزراند. بیری گرێبەستی کۆمەڵایەتی و دەستکردبوونی دەوڵەت بە تێگەیشتنێکی نوێ بۆ هەردوو چەمکەکە بەرهەمی وەها تێڕوانینێکە بۆ دەوڵەت.

## بابەتی سەرەکیی ئەم کتێبە

بابەتی سەرەکیی ئەم کتێبە بریتییە لە ناسینی لۆژیکی ناوەکیی وەرچەرخانێك کە بیری چۆن و بۆی دەوڵەتی لە هۆبزەوە هەتا هیگڵ تێپەڕاندوە تا سەرئەنجام بە فۆرمۆلبەندی تیۆری دەوڵەتی نوێ لە بەرزترین ڕوخساریدا کۆتایی پێهاتووە. بەجیا لە هۆکارە ناوەکییەکان، بیری عەقلانیەتی دەوڵەت لەسەربنەمای دینامیزمی ناوەکیی خۆی و بەپێی سەرهەڵدان و دیارکەوتنی ناکۆکییە ناوەکییەکانی سیستەمە هزرییەکان و چارەسەرکردنیان لە سیستەمەکانی دواتردا ڕەوتێکی کامڵبوونی دیاریکراوی وەکو تاکە ڕووداوێك بڕیوە کە ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی بریتییە لە [illegible] سەرەکی ئەم کتێبە. لەم کتێبەدا مامەڵە لەگەڵ بۆچوونەکانی دەستەیەك لە بیرمەندانی






سیاسی لە هۆبزەوە هەتا هیگل دەکەین. هۆبز لە سەرەتای ڕێگەکەدایە کە دوابەدوای ماکیاڤیلی بە تێڕوانینێکی نوێ بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا و دەوڵەت بناغەی بیری سیاسی نوێی دامەزراند و هیگڵ لە کۆتایی ڕێگەکەدایە کە دوابەدوای قۆناغە یەك لەدوای یەکەکانی کامڵ بوونی بیری سیاسی تیۆری دەوڵەتی نوێیی وەکو کامڵ کراوترین تیۆری دەوڵەت ئامادەکرد. بەم شێوەیە بەبڕوای نووسەر لە ماوەی ئەم قۆناغەدا یەك پرۆژە بەئەنجامدەگات.

کتێبگەلێکی زۆر سەبارەت بەو بیرمەندانەی کە لەم کتێبەدا باسیان لێوەکراوە نوسراوە. لەوانەیش هێشتا سەبارەت بە هۆبزولۆك و ڕۆسۆ و هیگڵ و بێنتهام باسگەلێکی گەرم و گوڕ لە ئارادایە و لێکدانەوە گەلێکی نوێ بۆ تیۆرەکانیان دەخرێتەڕوو. جگە لەمە پێشهات و ڕووداوە نوێیە مێژووییەکان تێڕوانینێکی نوێ سەبارەت بەم بیرمەندانە دروستدەکات و پرسیار گەلێکی نوێ دەربارەیان دەخاتەڕوو. بۆ نموونە سەرهەڵدانی ڕێچکە گەلێکی وەکو فاشیزم و تەنات ستالینیزمیش چەند تێڕوانینێکی نوێ و لەوانە چەند تۆمەتێکی نوێیی ئاڕاستەی هۆبز کرد. بەهەمان شێوە سەرهەڵدانی دەوڵەتە تۆتالیتارەکان حەزو مەیلێکی نوێی سەبارەت بە بەرهەمەکانی ڕۆسۆ و هیگڵ دروستکرد. هەندێ کات نەیارانی ڕێچکە فاشیستی و تۆتالیتاریزمەکان ڕق و توڕەیی خۆیان سەبارەت بەم ڕێچکانە ئاراستەی بیرمەندانێکی وەکو هۆبز و ڕوسۆ و یاخود هیگڵ کردووە. لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینانەیشدا باسە پۆست مۆدێڕنیستییەکان سەبارەت بە نسبییەت [Relativity]ی ئەخلاقیی لێکدانەوە گەلێکی نوێیان دەربارەی بۆچوونەکانی هۆبز وەکو بەرگریکاری فرەییخوازی سیاسی و فرەییخوازی ئەخلاقی دروست کرد.

بەڵام تائێستا بەزۆری ڕاڤەکاران و ڕەخنەگران و مێژوونووسان بۆچون و تیۆرەکانی ئەم بیرمەندانەیان بەشێوەیەکی جیا لەیەك و لە بەرامبەر یەك خستووەتەڕوو و لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجامداوە. لەوەها تێڕوانینێك بۆ بۆچوونی ئەم بیرمەندانە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لایەنی جیاواز و دژبەیەکیان لە بەرچاوگیراوە. بەم شێوەیە ئێمە بەزۆری ڕووبەڕووی جیاوازی تیۆرەکانی لۆك لەگەڵ هۆبز و کانت لەگەڵ بێنتهام و ڕۆسۆ و هیگڵ لەگەڵ ئەوان دەبینەوە. لەم کتێبەدا دەمانەوێت بە تێڕوانینێکی جیاواز نیشانی بدەین کە سەرەڕای ئەو جیاوازی و ناکۆکیانەی کە هەیە لە تیۆرە سیاسییەکانی ئەم بیرمەندانەدا، بیری سیاسی لە هۆبزەوە هەتا هیگڵ خاوەن پێوەندێکی ناوەکییەو دەکرێت وەکو یەك پرۆژە هەڵبەسەنگێندرێت و تیۆرە جۆراوجۆرەکانی هەریەکەیان بەشی خۆی بەشێوەیەك هاوکار بوونە لە پێشکەوتنی ئەم پرۆژەیەدا، پرۆژەیەك کە تیایدا بیری سیاسی نوێ سەبارەت بە دەوڵەت قۆناغێکی وەبەرهێنان و گەشەکردنی تێپەڕاندووەو بە کامڵبوون گەیشتووە.

بەم شێوە بیری سیاسی بەتێڕوانینێکی نوێ بۆ دەوڵەت ڕێگەیەکی نوێی دەستپێکردوە کە پاش تێپەڕین لە قۆناغە یەك لە دوای یەکەکانی کامڵبوون لەسەربنەمای وەرچەرخانی ناوەکیی دنیای بیر (بەچاوپۆشی لە هۆکارە دەرەکییەکان) سەرئەنجام بەو ئامانجەی کە ئێمە وەکو زاڵبوون بەسەر لەخۆ نامۆبوون قسەمان لەسەرکرد گەیشتووەو بەو خودئاگاییە گەیشتووە کە دەوڵەت شتێکی دیکەی جگە لە دامەزراوی مرۆیی نییە کە مرۆڤ بۆ ڕێکخستنی ئامانجەکانی خۆی دروستی کردووەو دەتوانێت بەشێوەیەکی عەقڵانی ڕێکی بخات تاوەکو ئامادەسازییەك بێت بۆ گەیشتن بە ئازادیی خودئاگا.

خاڵی دەستپێکردن و بنەمای سەرەکیی تیۆری دەوڵەتی نوێ کە لە بنەڕەتدا سیستەمە تیۆرییەکان لەسەر ئەو دامەزراون بریتییە لەو ڕوانگە گشتییەی کە دەوڵەت بە دەزگایەکی دروستکراوی مرۆڤ و دامەزراو لەسەرویست و عەقڵی مرۆڤ دەبینێت. گەرچی تیۆری دەوڵەتی نوێ وەکو دەوڵەتێکی دامەزراو لەسەر بەشداری و ویستی گشتی و هەموان ئەمڕۆکە بۆ ئێمە بە بۆچوونێکی سادە و بەڵگەنەویست دێتە پێش چاو، بەڵام بیری سیاسی بۆ گەیشتن بەم خاڵە ڕێگەیەکی دوور و پڕ لە بەرزی و نزمیی بڕیوە کە تیایدا سیستەمگەلێکی فەلسەفی گەورە هاتونەتەبوون وڕێبوارانێکی گەورەی وەکو هۆبزولۆك و هیۆم و بێنتهام و ڕۆسۆ و کانت و هیگڵ و زۆرێکی تریان دروستکردووە. لەم کتێبەدا باس لەوە دەکرێت کە چۆن بیری عەقڵانییەتی دەوڵەت دوای ئەوەی کە بەتێڕوانینێکی نوێەوە لە تیۆرەکەی هۆبزدا دەستی پێکرد لە وێستگەکانی پاشتراو لە ماوەی سیستەمی هزریی هیۆم لە لایەك و ڕۆسۆ لەلایەکی ترەوە بۆ دوو لقی گەورە دابەش بوو: لقێك کە زیاتر گرنگیی بە بەشبوون و تاك دەداو بەشێوەی سوودگەرایی (یۆتیلیتاریانیزم) گەشەیکرد و لقێکی تر کە بۆچونێکی گونجاوتری هەبوو بەرامبەر بەگشتبوون و ویستی گشتی و لەبیرۆکەکانی تیۆری ئۆرگانیستی ڕۆسۆدا ڕەنگی دایەوە و سەر ئەنجام لە خاڵی دووبارە بەیەك گەیشتنەوەی ئەم دوولقەدا هیگڵ سەنتێزێکی لە تیۆری سیاسیی خۆیدا دروست کرد کە تیایدا بەشبوونی لقی یەکەم لەگەڵ گشتبوونی لقی دووەمدا لە یەك کۆمەڵەی نوێدا کۆبوونەوە.

دەبو پرسگەلێکی زۆر لە ڕێگەی عەقڵانییەتی دەوڵەتدا چارەسەربکرێت تاوەکو تیۆری دەوڵەتی عەقڵانی وەکو دوا وێستگەی ئەم بۆچوونە بەتەواوی دەوڵەمەندی خۆیەوە بەدیارکەوێت. یەکێك لە گرنگترینی ئەو پرسانە بریتی بوو لە پەیوەندی ئازادی تاکەکەسی لە لایەك و بەربەستە کۆمەڵایەتییەکان و دەسەڵاتی دەوڵەت لەلایەکی ترەوە. لە کۆمەڵێك لەو بیرە سیاسییانەی کە لەم






کتێبەدا باسی لێوە دەکەین و بەتێڕوانینی لیبرالی و سورگەرایی دیاری دەبن دەسەڵاتی دەوڵەت لەلایەك و ئازادی تاکەکەسی لەلایەکی ترەوە بەهەڵگری پەیوەندیگەلێکی پێچەوانە وێنادەکرێن کە بەشێوەیەکی سروشتی تیایاندا شوێنێکی کەم بۆ عەقڵانی کردنی دەوڵەت دەمێنێتەوە. دەبوو بیری سیاسی بە دیاریکردنی پەیوەندی دروستی نێوان تاك و کۆمەڵگا ئەم گرفتە لەبەردەم خۆیدا لابەرێت. هەر لێرەوە ڕۆسۆ تێڕوانینێکی نوێی بۆ تاك و کۆمەڵگا و ئازادی و مرۆڤبوون خستەڕوو و هیگڵ نیشانیدا کە ئازادبوون جیاوازە لەرەهابوون و تەنها لە کۆمەڵگادا تاك دەتوانێت بگۆڕێت بۆ کەسێتییەکی ئەخلاقی و تەنها وەکو کەسێتییەکی ئەخلاقیش ئازادی دەبێتە شتێکی خاوەن بەهاو واتادار بۆ ئەو. هەروەها هیگڵ ئەوەیشی خستەڕوو کە ئازادی پرۆسەیەکە بە گەشەکردنی بەرەبەرەی عەقڵانیەت لە کۆمەڵگادا بەدەستدێت. بەم شێوەیە بەدیارکەوت کە ئازادی کارێکی سەرو کۆمەڵایەتی نییە.

هەروەها بیری دەوڵەتی عەقڵانی ئەو واتایەش لەخۆ دەگرێت کە هەموو ماف و ئەرکێك لە ویستی گشتی خەڵکییەوە سەرچاوە دەگرێت و هیچ ماف و ئەرکێك لە دەرەوەی ویستی بە کۆمەڵی خەڵکی بوونی نییە. ڕۆسۆ بەرەتکردنەوەی تیۆری مافی سروشتی و کانت بەدوورخستنەوەی ئەخلاق لە هەموو سەرچاوەیەکی میتافیزیکی و پشت ئەستوورکردنی بە عەقڵی تاکەکەسی ڕێگەی ئەم پێشکەوتنەیان لە هزردا هەموار کرد. هیگڵ بەدانانی عەقڵی بە کۆمەڵ و مێژوویی لەبری عەقڵی تاکەکەسی (کانت) واتایەکی نوێیی بە ئەخلاق[1] بەخشی. بەشێك لە واتای ئەو وتەیەی کە دەڵێت هەموو ماف و ئەرکێك لە ویستی گشتی خەڵکییەوە سەرچاوە دەگرێت ئەوەیە کە مولکداری هیچ کارێکی پیرۆزنییە و کۆمەڵگا دەتوانێت دەربارەی بڕیار بدات. گەرچی زۆرێك لەو بیرمەندانەی کە بەشداربوونە لە پێشکەوتنی بیری دەوڵەتی عەقڵانیدا بەڕاشکاوی پشتگیریان لە مولکداری تایبەتی کردووە، بەڵام هەروەك پاشتر باسی دەکەین ئەم پشتگیری کردنە لەگەڵ لۆژیکی ناوەکیی سیستەمی هزریی هەندێکیاندا ناگونجێت. بەهەرحاڵ گەرچی هیگڵ مولکداریی تایبەتی ڕەت ناکاتەوە بەڵام بەپێی سیستەمی هزریی خۆی ئەوە قبووڵدەکات کە کۆمەڵگا دەتوانێت دەربارەی (وەکو هەموو شتێکی تر) بڕیار بدات.

بەم پێیە بانگەشەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە دەکرێت بیری سیاسیی نوێ وەکو یەك پرۆژە تەماشا بکرێت کە تیایدا سەبارەت بە دەوڵەت وەکو هێزی هاوبەشی هاوڵاتیان نەك هێزێکی دەرەکی و نامۆ

(1) Morality.

بەوان، هۆشیاری بەدەست هاتووە. ئەم هۆشیارییە نەك تەنها تێگەیشتنی باشتری جەوهەری دەوڵەت لە خۆدەگرێت بەڵکو لە هەمان کاتدا لە خۆگری ڕێکخستنی خوازراوی دەوڵەتیشە بە جۆرێك کە ڕەنگدانەوەی بەشداری هەمووان و گشتیی ئەوان بێت. ئەگەر بیری سیاسی نوێ وەکو یەك پرۆژە تەماشا بکەین ئەوکات ئەم بابەتە دێتە ئاراوە کە چۆن دەتوانین لێك جیابوونەوە و جۆراوجۆرییەکانی ڕوون بکەینەوە؟ ئایا دەتوانین چەقێکی دیاریکراو بدۆزینەوە کە بیری سیاسی نوێ بە دەوریدا پەرەی سەندبێ و بەرەو پێش چوبێت؟ بانگەشەیەکی تری ئەم کتێبە ئەوەیە کە بڵێت بەڵێ دەکرێ وەها چەقێك بدۆزرێتەوە. ئەم چەقە کە نووسەر کتێبەکەی خۆی بە ئاراستەی ئەو بەرەو پێشەوە بردووە بریتییە لە هەردوو چەمکی عەقڵ و ویست و پەیوەندی نێوان ئەم دووە. بیری سیاسی نوێ بەشێوەی ئاگایانە و نا ئاگایانە بەدەوری چەقی و ویستی مرۆیی یاخود بە واتایەکی وردتر بەدەوری پەیوەندی نێوان ئەم دووە لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی و ڕێکخستنەوە و ئۆرگانیزەکردنی دەوڵەت بەرەو پێشەوەچووە. بەبۆچوونی نوسەر ئەگەر بمانەوێت میتاتیۆرییەك بۆ بیری سیاسی نوێ لە بەرچاوبگرین ئەوا دەتوانین پێگەی عەقڵ و ویست و پەیوەندی نێوان ئەم دووە لەگەڵ یەکتردا لە ڕێکخستنی سیستەمی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەستنیشان بکەین. بەشێکی گرنگی هۆکاری ئەم کارە ئەوەیە کە بیری سیاسی نوێ بۆ خستنەرووی ڕێکخستنی کۆمەڵگا و دەوڵەت لە ویست و عەقڵی مرۆڤەوە دەست پێدەکات. بیری سیاسی نوێ لە بەرامبەر بیری سیاسی کلاسیکدا لەو جێیەوە دەستپێدەکات کە کۆمەڵگای سیاسی بەشێك نییە لە سیستەمێکی گەورەتری جیهانی، بەڵکو ڕێکییەکە بەرهەمی مرۆڤ و پشت ئەستوور بە ویست و عەقڵی مرۆڤ، عەقڵ و ویستێك کە پەیڕەو و شوێنکەوتووی عەقڵ و ویستێکی بەرزتر و گەورەتر نین. بەدەستپێکردن لەوەها خاڵێکەوە هەوڵی بیری سیاسی لە تەواوی سەردەمی پڕجۆشی وەرچەرخانی خۆیدا هەر لە سەدەی حەڤدەیەمەوە هەتا سەدەی نۆزدەیەم ئەبووە کە چۆن بەشداری ویست و عەقڵ لە دامەزراندن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای سیاسی ڕوون بکاتەوە و بسەلمێنێت.

پرسی سەرەکیی سەبارەت بە عەقڵانیەتی دەوڵەتیش ئەوەبوو کە چۆن فۆرمێکی کۆمەڵی سیاسی بدۆزینەوە کە تیایدا هەر کەسەو لە هەمان ئەوکاتەی پەیڕەوی لە دەوڵەت دەکات بەردەوام شوێنکەوتووی ویست و عەقڵی خۆی بێت و وەکو بەر لە پەیوەست بوون بە کۆمەڵگای سیاسییەوە ئازاد بێت. نووسەر لەم کتێبەدا هەوڵیداوە ئەوە بسەلمێنێت کە ئەو لقەی بیری سیاسی کە بە تیڕوانینی نۆمینالیستی بۆ ویست و هاوکات لەگەڵ ئەودا تیڕوانینی ئامێری بۆ دەوڵەت بەرجەستە





دەبێت ناتوانێت دژیەکی لۆژیکیی ملکەچی بەرامبەر بە دەوڵەت و پەیڕەویکردنی ویستی خۆی یان بە واتایەکی تر هاوکات ملکەچبوون و ئازادبوون بە دروستی چارەسەر بکات. چارەسەرکردنی وەها دژ یەکێکی لۆژیکی بە تیڕوانینی کۆمەڵگا گەرایانە بۆ پێکهاتەی عەقڵ و ویستی مرۆڤ و بەستنەوەی بە جەوهەری کۆمەڵایەتی مرۆڤ (بۆ نموونە جەوهەری کۆمەڵایەتی عەقڵ و ویست) دێتەدی. بۆیە بەبۆچوونی نووسەر چارەسەری دژیەکیی لۆژیکیی ناوبراو تەنها لە تیۆری ویستی گشتی ڕۆسۆ و ویستی عەقلانیی هیگڵ کە تیایاندا ویست وەکو ویستی عەقلانی نەك وەکو ویستی ڕەها و دەوڵەت وەك لایەنێکی ژیانی ئۆرگانیکی کۆمەڵگا نەك وەکو ئامێرێکی دەرەوەی کۆمەڵگا و بەرامبەر بەو، لێکدراوەتەوە دێتەدی.

هۆبز بەسەرچاوەی نۆمینالیستییەوە لەم خاڵەوە دەستپێکرد کە کۆمەڵگای سیاسی دانراوێکی دەستکردە کە بەرهەمی ویستی تاکە پێکهێنەرەکانێتی. ئەم ویستانە دەبنە ویستی ڕەها بەو واتایەی کە مەرجدارو پابەندی هیچ شتێك نین. بەم شێوەیە کۆمەڵگای سیاسی بە سپاردنی ویستی هاولاتیان بە ویستی فەرمانڕەوا یاخود بە واتایەکی تر بەکرداری گواستنەوەی ویستەکان لە گرێبەستێکی کۆمەلایەتیدا دروستبووە نەك بە هاوبەشبوونی ویستی تاکەکان. لە ڕاستیدا تیڕوانینی نۆمینالیستی بۆ ویست، ویست بۆ حەز و ڕاکێشان بچووك دەکاتەوە. هەربۆیەش تێگەیشتنی هۆبز بۆ ویست حکوومەت لە ڕەوتی لۆژیکی خۆیدا بە تیۆری سوودگەرایی و دیاریکردنی دەوڵەت لەسەر بنەمای ئەم تیڕوانینە کۆتایی هات. گەرچی هۆبز لە پەیوەندی نێوان عەقڵ و ویست لە دامەزراندنی دەوڵەتدا پێگەیەکی گرنگی بۆ عەقڵ دیاریکردبوو، بەلاّم شوێنکەوتوانی ئەو ڕاستە و خۆ عەقڵیان خستە خزمەتی حەزەوە. بەم شێوەیە لە تیۆری سوودگەراییدا دەوڵەت بۆ دامەزراوێك لەپێناو ڕێگەگرتن لە بەریەك کەوتنی ئەو حەزانەی کە خوازیاری شادی و خۆشیی تاکە کەسین بچووك بوویەوە. گەرچی دیموکراسیی نوێنەری بە باشترین فۆرمی حکوومەت بۆ ئەو مرۆڤانە لەقەڵەمدەدرا کە خوازیاری سوودی کەسین و لە هەمان کاتدا باشترین دادوەری سوودی کەسیی خۆیانن، بەلاّم هێشتا حکومەتی نوێنەری بریتییە لە هێزێکی دەرەوەی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕووبەڕووی رادەوەستێت. بۆیە شوێنکەوتوان لە کاتی ملکەچیکردن لە دەوڵەت بەشێوەیەکی لۆژیکی پەیڕەوی لە ویستی خۆیان ناکەن، چونکە لە هەموو کاتێکدا حکوومەت ئامێرێکی دروستکراوە بۆ هەماهەنگ کردنی ویستە ناکۆکەکانی مرۆڤە خۆ ویستەکان. گەرچی لایەنی ئابووریی بەرژەوەندی

تاکەکان بەشێوەیەکی خۆبەخۆ لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگادا یەکدەگرێتەوە، بەلاّم لەرووی سیاسییەوە وانییە و پێویستی دەزگایەکی دەست کرد دێتە ئاراوە.

لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینە بۆ عەقڵ و ویست تێڕوانینێکی تر گەشەی کرد کە جەوهەری کۆمەڵگای سیاسیی بە ویستی عەقلانّی دەستنیشان کرد نەك ویستی رەها و عەقڵی تاکەکەسی. ویستی عەقلانّی ویستێکە کە هەردوو رەگەزەکەی واتە ویست و عەقڵ بەهۆی ژیانی کۆمەلاّیەتی مرۆڤەوە دەگۆڕێت بۆ جەوهەری کۆمەلاّیەتی. ئەم تێڕوانینە لە فەلسەفەکانی رۆسۆ و کانت و هیگڵدا پەرەی پێدراو کامڵ بوو. گەرچی هێشتا رۆسۆ و کانت عەقڵیان وەکو عەقڵی تاکەکەسی لەبەرچاو دەگرت بەلاّم تیۆری ویستی گشتی و تێڕوانینی کۆمەڵگاگەرایانەی رۆسۆ و تیۆری عەقڵی پەتی و مەعریفەناسیی کانت هەریەك بەشی خۆیان کاریگەرییەکی دەست نیشانکەریان هەبووە لەدروستبوونی سیستەمی فەلسەفیی هیگڵ. بەسەرهەڵدانی تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆ و ویستی ئەخلاقیی کانت و ویستی عەقلانّیی هیگڵ رێگە بۆ خستنەرووی دەوڵەت وەکو هێزێکی هاوجەوهەر لەگەڵ ژیانی کۆمەلاّیەتی مرۆڤ و خستنەرووی باشترین شێوەی بە عەقلانّی کردنی کرایەوە. هیگڵ توانیتی لە تیۆری دەوڵەتی خۆیدا هەم حەز و ویست و عەقڵە تاکە کەسیەکان و هەم حەز و ویست و عەقڵی بە کۆمەڵ بەیەکەوە سەنتێز بکات و لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە تیۆری ئامێریی دەوڵەت دەستکەوتەکەی سوودگەراییش کە بریتی بوو لە جیاکردنەوەی بواری کۆمەڵگای مەدەنی لە بواری دەوڵەت بەرەو تیۆری دەوڵەتی خۆی رابکێشێت.

چۆنیەتی پەیوەندی نێوان عەقڵ و ویست و پەیوەندی ئەم دووە لە دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسیدا لەم خشتەیەدا دەخەینەروو:





## پەیوەندی نێوان عەقڵ و ویست و پەیوەندی ئەم دووەبەرێکی کۆمەڵگای سیاسییەوە لەبیری نوێدا

| جۆری تێڕوانین | مافگەرایی<br>هۆبز- لۆك | سوودگەرایی<br>هیۆم- بێنتهام- میل | عەقڵگەرایی<br>رۆسۆ- کانت- هیگڵ |
|---|---|---|---|
| چەمکە سەرەکییەکان | | | |
| ویست | ویستی رەهای رووەو ماف و حەز | ویستی رەهای روو بە حەز | ویستی عەقلانّیی روو بە چاکەی بە کۆمەڵ |
| پێگەی عەقڵ | عەقڵ، یارمەتیدەری مافی سروشتی و حەز | عەقڵ، خزمەتگوزاری حەز و خۆشی تاکەکەسی | عەقڵ، سیستەمدەری ژیانی بە کۆمەڵ |
| پەیوەندی نێوان عەقڵ و ویست | عەقڵ لە خزمەتی ویستی رووەو مافی سروشتی و حەز | عەقڵ لە خزمەتی ویستی روو بە حەز و شادیی کەسی | عەقڵی هاو جەوهەر لەگەڵ ویست |
| تێڕوانین بۆ ئازادی | مافی سروشتی | ئامرازی خۆشی و شادی | مەبەستی ژیانی کۆمەلاّیەتی |
| سەرچاوەی ئەرکی سیاسی | ماف- حەز- عەقڵ | حەز و شادیی کەسی | عەقڵ، عەقڵی کۆمەلاّیەتی (رۆسۆ) عەقڵی کردەیی (کانت) عەقڵی جۆریی (هیگڵ) |
| سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی | گرێبەستی کۆمەلاّیەتی | سوودی هەمووان | لایەنێك لە ژیانی کۆمەلاّیەتی (رۆسۆ- هیگڵ) عەقڵی کردەیی (کانت) |
| مەبەستی دەوڵەت | پارێزگاری کردنی لە ئاسایش و مافی سروشتی | دەزگای گونجاندنی سوودە ناکۆکەکان | پێگەی رەنگدانەوەی ئازادی ئەخلاقی و عەقلانّی |

## باس و سەرچاوەکان و ڕێڕەوی بەڵگە هێنانەوەی ئەم کتێبە

نوسەر بەپێی بۆچوونی خۆی بەچاوێکی نوێوە روانیویەتیە بیری سیاسی نوێ و بەشێوەیەکی نوێ سوودی لەو سەرچاوانە وەرگرتووە کە دەربارەی بیری سیاسی نوێ لەبەردەستدان. هێڵی بەڵگە هێنانەوەی ئەم کتێبە دەربڕی ئەم کارەیە. نووسەر لە سەرەتادا هەوڵیداوە ئەوە نیشانبدات کە چۆن هۆبز بەپێی تێڕوانینی مەعریفەناسی خۆی و بەپشت بەستن بەویستی رەها تیۆری دەوڵەتی دەستپێکرد و چۆن وەها دەربڕینێك بۆ ویست بەشێوەیەکی لۆژیکی سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی لە سپاردنی ویستی تاکەکان بەویستی فەرمانڕەواوە وەردەگرێت. فۆرمی ئەو حکومەتەی کە لە سپاردنی ویستی تاکەکان بەویستی فەرمانڕەوا سەرچاوە دەگرێت دەبێتە حکومەتی دەسەڵاتخواز. هۆبز بەم بەڵگە هێنانەوەیە تیۆری عەقلانیەتی دەسەڵاتی دامەزراند. هۆبز لەگەڵ ئەوەی کە رۆڵی مافی پاراستنی زات و حەز و ئارەزووی پاراستنی زات لە بناغە دانانی کۆمەڵگای سیاسیدا بەرجەستە دەکات، پێگەیەکی بەرزیش بۆ عەقڵی مرۆڤ دیاری دەکات بەڵام چیدی ئەم عەقڵە جیاوازە لە عەقڵی ئەفلاتۆنی و لە هەنگاوی یەکەمدا روو بە حەز و ئارەزووە. عەقڵی مرۆڤ فەرمان دەدات کە پێویستە بۆ دەستەبەرکردنی مافی پاراستنی خود سەرەتا کۆتایی بە باری سروشتی کە بریتییە لە باری نائارامی بهێنرێت و بارێکی دەستکرد پێکبهێندرێت کە ببێتە شوێنگرەوەی غەریزە تاکە کەسییەکان.

هۆبز بەرە هادانانی ویست وەکو حەز و ئارەزوو باسی لێوەکرد، بۆیە لە پاش ئەو بەرە بەرە رەوتێکی نوێ دروستبوو کە لەبری ئەوەی بۆ کۆنترۆڵکردنی غەریزەکان پەنا بۆ عەقلانیەتی دەسەڵات بەرێت، رەسەنایەتیی بەخشییە خودی حەزەکان و لەراستیدا عەقلانیەتێکی نوێی بۆیان لەبەرچاو گرت. لایەنگرانی سوودگەرایی لەم دەستەیە بوون. ئەوان بەدواداگەڕانی خۆشی و شادیی کەسییان بە بناغەی رەفتاری تاك و بنەڕەتی سوودی هەمووان بە فاکتەری بوونیی دەوڵەت ئاراستەکرد. بەڵگەیان هێنایەوە کە کۆمەڵگای رێکخراو تەنها لەپێناو ئەو سوودەی کە بۆ مرۆڤ هەیەتی بوونی هەیە و نابێت هیچ رۆڵێکی هەبێت جگە لەوەی کە تاکەکان لەدروستکردنی ئەزیەت و ناڕەحەتی بۆیەکتر رابگرێت. هەر ئەمە بەسە بۆ ئەوەی کە تاکەکان لە کاتی بەدواداگەڕانی باشەی کەسیدا باشەی کۆمەڵایەتیش دابین بکەن. بەڵام ئەو دەوڵەتەی کە لەسەر ئەم بنەمایە دادەمەزرێت گەرچی لەشێوەی دیموکراسیی نوێنەریدایە بەڵام دەزگایەکی






دەرەوەی کۆمەڵگایە و بەرامبەر بە کۆمەڵگاش رادەوستێت. واتە بەردەوام هێزێکی دەرەکییە و ئامێرێکە بۆ هەماهەنگ کردنی ویستە نەیار و ناکۆکەکان.

ڕۆسۆ کە لە لایەنگری لە بنەماکانی هۆبزەوە دەستی پێکردبوو تێڕوانینێکی نوێی بۆ ویست دیاریکرد و بەم شێوەیە بوو کە رەوتێکی نوێی لەبیری سیاسی دامەزراند. ئەم رەوتە هاوکات بوو لەگەڵ تێڕوانینێکی نوێ بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگای مرۆیی کە یەکێك لە لایەنە گرنگەکانی بریتی بوو لە گرنگیدان بەهێزە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان لە شیکردنەوەی کردار و پەیوەندییەکانی مرۆڤ. ڕۆسۆش کە هەروەك هۆبز لە شیکردنەوەی کۆمەڵگای رێکخراودا لە باری سروشتییەوە دەستی پێکردبوو دەیوت کە ئەو مرۆڤەی کە هۆبز باسی کردووە لە راستیدا مرۆڤی کۆمەڵایەتییە نەك مرۆڤی سروشتی. لووتبەرزی و لەگەڵ ئەودا تەواوی بەدکردارییەکان لە کۆمەڵگاوە سەرهەڵدەدەن. مرۆڤی سروشتی بچووکترە لە چاك و خراپ و لەراستیدا بچووکترە لە مرۆڤ. ڕۆسۆ تاوانبارێکی نوێیی بۆ نارێکییە کۆمەڵایەتییەکان دۆزییەوە. کۆمەڵ مرۆڤەکانی بەرەو خراپی پەلکێش کردووە و دووبارە دەبێت هەمان کۆمەڵ خراپییەکان لەناوبەرێت. لە راستیدا ئەم خراپییانە قۆناغێکی کاتی و پێویستن بۆ پەڕینەوە بەرەو ئەو کۆمەڵگا نوێیەی کە سیاسەت دەبێت دروستیبکات. لە کۆمەڵگای نوێدا مرۆڤ لە کۆتەکانی هەردوو جۆر کۆیلەبوون، واتە کۆیلەبوونی سروشت و حەزەکان و کۆیلەبوونی چەند تاکێکی تر رزگار دەبێت. تەنها بە دەربازبوون لەم دوو کۆیلەبوونە رزگاری کۆتایی دێتەدی. رێگەی ئازادی مرۆڤیش هەر لەم رێگەیەوە تێدەپەڕێت. مرۆڤ کاتێك ئازادە کە هەم لە کۆتی کویلەبوونی حەز و ئارەزووەکانی خۆی دەرباز دەبێت و هەم لە کۆتی کۆیلەبوونی چەند کەسێکی تر.

بەم شێوەیە ڕۆسۆ پێگەی ((ویستی عەقلانی)) و ((ویستی گشتی))ی هێنایە پێشەوە. بەتێڕوانینی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بۆ مرۆڤ شوێنێك بۆ ویستی رەها نامێنێتەوە. چیدی ویست حەز و راکێشانی پەتی نییە، بەڵکو بەدنیای دەرەوە و بەهەڵواسرابوون بەخۆیەوە مەرجدار دەبێت (کۆمەڵگا و شتی بابەتی ویستی من بەشدارن لە ناوەڕۆکی ویستی مندا). بەم پێیە عەقلانیەتی کۆمەڵایەتی بەشێکی لە ویستی مندا هەیە و بۆیە ئەم ویستە دەتوانێت بەردەوام عەقلانی تر ببێت. بەشێك لە بەڵگە هێنانەوەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە ئەم تێڕوانینە بۆ عەقڵ و ویست و ئازادی و دادپەروەری هێز و توانایەکی لۆژیکیی زیاتری هەیە.

تێڕوانینی ڕۆسۆ لە گۆشەی ویستی عەقلانی و ویستی گشتییەوە بۆ کۆمەڵگای سیاسی بووە سەرچاوەی ئیلهامێك بۆ تیۆری ویستی ئەخلاقی و عەقڵی کردەیی کانت و عەقڵی کردەیی

کانتیش بە نۆرەی خۆی بووە سەرچاوەی ئیلهامێك بۆ عەقڵی هیگڵ وەکو جەوهەر و هێزی بزوێنەری بوونەوەرەکان. هیگڵ ئەو نارێکیانەی کە هێشتا لە تیڕوانینی ڕۆسۆ بۆ عەقڵ و ویست لە ئارادابوو لەناوبرد و تیۆری دەوڵەتی عەقلانی و دەوڵەتی عەقڵی گەیاندە دوا وێستگەی مەبەست. دەوڵەتی عەقلانی بەرهەمی کامڵ بوونی دامەزراوەی دەوڵەت بەدرێژایی مێژوو و بەشداری گشتی و تەواوی هاولاتیان و پێگەی ڕەنگدانەوەی ئازادیی خودئاگایە. بەم شێوەیە ویست وەکو جەوهەری کۆمەڵگای سیاسی لەبیری سیاسی نوێدا ڕێگەیەکی لە هزردا بڕیوە کە دەکرێت بەم شێوەیە دیاری بکرێت:

ویستی ڕەها (هۆبز) ← ویست وەکو حەزی بەدواداگەڕانی خۆشی (هیۆم – بێنتهام)
← ویستی گشتی (ڕۆسۆ) ← ویستی ئەخلاقی (کانت) ← ویستی عەقلانی (هیگڵ).

هێڵی بەڵگەهێنانەوەی ئەم کتێبەیش بەدوای هەمان ئەو هێڵە داچووە. کتێبەکە لە ویستی ڕەهای هۆبزەوە دەست پێدەکات و بەویستی عەقلانیی هیگڵ کۆتایی دێت. نووسەر هەوڵیداوە لەناوبیری گەورە کەسانێکی وەکو هۆبز و لۆك و هیۆم و بێنتهام و میل و ڕۆسۆ و کانت و هیگڵدا بەدوای لۆژیکی ناوەکیی ئەم ڕێگەیەدا بچێت. لەڕاستیدا ئەم ڕێگەیە لە ئاراستەکردنی عەقلانیەتی دەوڵەت لەلایەن هۆبزەوە دەستپێدەکات و بەتیۆری دەوڵەتی عەقلانیی هیگڵ بەرەو پێشەوە دەچێت.

نوسەر لەو بڕوایەدایە کە وەها باسێك لەبیری سیاسی نوێدا باسێکی نوێیە. تائێستا بەگشتی باسەکان سەبارەت بەلایەنەکانی لەپێشتربوون و لایەنەکانی دیاری بوون و لایەنە جیاوازەکانی تیۆرەکانی بیرمەندانی سیاسی بووە. هەڵبەتە هەندێ کات بەشێك لە نووسینەکان ئاماژەیان بە لایەنە هاوبەشەکانیشیان کردووە و ئێمە لە دەقی ئەم کتێبەدا ئاماژە بەم نووسینانە دەکەین، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئەم نووسینانە کورت و لەبنەڕەتدا پەرت و بلاون. نووسەر هەوڵیداوە نەك تەنها بۆ بەدواداچوونی لایەنە هاوبەشەکان بەڵکو لە لۆژیکی جیاوازی ئەم تیۆرانەیشدا سەبارەت بە چۆن و بۆ و ڕێکخراوی دەوڵەت بەدوای شێوەی بەرەو پێشچوونی بیری سیاسی نوێدا بچێت. ئەم خشتەیەی خوارەوە هێڵکاریەکی پرس و باسەکانی ناو کتێبەکەیە:






## هێڵە سەنتەرییەکانی باس و بەڵگەهێنانەوەکانی کتێبەکە

| | |
|---|---|
| پرسی سەرەکی کتێبەکە | هەڵسەنگاندنی بیری سیاسی نوێ و سەبارەت بە عەقلانیەتی دەوڵەت وەکو یەك پرۆژە. |
| خاڵی جەخت لەسەر کردنی باسەکان | دینامیزمی ناوەکیی ڕێڕەوی بیری سیاسی سەبارەت بە ئۆرگانیزەکردنی سیاسیی کۆمەڵگا. |
| ئاراستە وەرگرتنی ڕێگەی بیری سیاسیی نوێ | بەدواداگەڕانی ڕێکی عەقلانی لە جەوهەری دەوڵەتدا و دۆزینەوەی فۆرمێکی ڕێکخستنی کۆمەڵگای سیاسی کە تیایدا هەر کەسە و لەگەڵ پەیڕەوی کردن لە یاسا و دەوڵەت لە ڕاستیدا پەیڕەوی لە عەقڵ و ویستی خۆی کردبێت. |
| خاڵی دەستپێکی بیری سیاسی نوێ | وەلاوەنانی وێنای پشت ئەستوورکردنی ژیان و سیستەمی مرۆیی بە سیستەمێکی عەقلانیی گەورەتر و میتایی و هەڵسەنگاندنی ژیانی سیاسی لەسەربنەمای عەقل و ویستی مرۆیی. |
| مەبەستی کۆتایی ڕێڕەوی بیر | دۆزینەوەی سیستەمێکی عەقلانی بۆ فەرمانڕەوایی عەقڵ ویستی بە کۆمەڵ. |
| ڕێڕەوی بزاوتنی بیری سیاسیی نوێ | لە ویستی ڕەهای فەرمانڕەواوە بەرەو فەرمانڕەوایی ڕەهای ویستی عەقلانیی هاولاتییان. |
| تێپەڕگە گرنگەکان | ویستی ڕەهای هۆبز ویستی زۆرینەی لۆك ویستی هەموانیی بێنتهام ویستی گشتیی ڕۆسۆ ویستی ئەخلاقیی کانت ویستی عەقلانیی هیگڵ |
| دەستکەوتە گرنگەکان | ١- زاڵبوونی بیری سیاسی بەسەر دیاردەی لە خۆنامۆبووندا لە سنووری تیڕوانین بۆ دەوڵەت ٢- دۆزینەوەی ڕێکییەکی عەقلانی بۆ دەوڵەت بەهاو ئاراستە لەگەڵ بەدیهاتنی ئازادی خود ئاگایانەی مرۆڤ. |
| شێوەی گەیشتن بەم مەبەستە | بەشداری گشتی و کوللی (گشتی بە واتای بەشداری هەموان و کوللی لەبری گرنگیدان بە چاکەی هاوبەش) |

## شێوەی ئێمە لە لێکۆڵینەوەی تیۆرەکاندا

بەپێی ئەوەی کە لەسەرەتای پاژی دواتردا باسی لێوەدەکرێت کاری تیۆردارێژە گەورەکانی سەدەکانی حەڤدە و هەژدە و نۆزدە کە ئێمە لەم کتێبەدا باسیان لێوەدەکەین جیاوازە لەوەی کە بە واتای پۆزەتیڤیستیی ئەمڕۆ بە زانست ناودەبرێت. ئەم تیۆردارێژانە لێکۆڵینەوەیان لەسەر حەقیقەتەکان نەدەکرد و ئەگەر ئەم کارەشیان بکردایە ئەوا بۆ مەبەستێکیتر بوو. ئەوان گریمانەیان دروستنەدەکرد تاوەکو بیخەنە ئەزموونەوە و ئەو گریمانە پەرەت بکەنەوە. بناغەی کاری ئەوان بریتی بوو لە بنەڕەتە جێبباسەکان و ناساندنەکان و بنەما سەرەتاییەکان و لەمانەوە دەگەیشتنە ئەنجام و ناسینێکی نوێ. یاخود تەنانەت پشت ئەستووربوون بەشتێك کە بە هەستی ئاسایی یان عەقڵی سەخڵەمی[2] مرۆڤیان لەقەڵەمدەدا.[3] کاری ئەوان بریتی بوو لە بیرکردنەوەی تیۆری[4]. جگە لەمە زیاتر مامەڵەیان لەگەڵ پاساوهێنانەوە و گەڕاندنەوەدا دەکرد تا دەربڕین و روونکردنەوە بە واتا نوێیەکەی[5].

بەم شێوەیە ئێمەیش لەم کتێبەدا پەیڕەوی لە شێوەکەی ئەوان دەکەین. پشت بەستنی ئێمە لە لێکۆڵینەوەی تیۆرەکاندا بریتییە لە لێکۆڵینەوەی بەس بونیان و چۆنیەتی گونجانی ناوەکییان بەپێی گریمانە و بنەڕەتە جێباسەکانیان. لە بنەڕەتدا تێڕوانینی ئێمە ئاراستەی ئەو خاڵەیە کە بزانین بۆچی دەیانەوێت ئەوە بڵێین کە تا چ ئاستێك توانیویانە روونکردنەوەیەکی رازیکەر بخەنەڕوو؟ ئەو گریمانە و چەمکانەی کە هەڵیانبژاردووە تا چ رادەیەك شایستەی ئەم بابەتەیە؟ ناڕێکی تیۆرەکان و دژیەکە ناوەکییەکانیان لە کوێیە؟ چۆن ئەم ناڕێکیی و دژیەکە لۆژیکیانە تیۆرەکەی بەرەو دژواری و نەگونجان پاڵ پێوەناوە. چۆن لەناوبردنی ئەم نەگونجانانە رێگەی بۆ سەرهەڵدانی سیستەمێکی تیۆری نوێ کردوەتەوە؟ چۆن بەم شێوەیە پرۆژەیەك قۆناغ بە قۆناغ رێگەی کامڵبوونی بڕیوە جگە

2- Common Sense.
3- John plamenatce, Man and Society, London, Longman, 1963, intro, pxIII.
4- Speculation.
5- explanation.





لەمانە ئەو بابەتیش بۆ کارەکەی ئێمە شیاوی لێوردبوونەوەیە کە بزانین بیرمەندانی پاشتر چ رەخنەیەکیان لە بیرمەندانی پێشووگرتووە و بە چ وێنایەکەوە ناڕێکییەکانی ئەوانیان لە تیۆرە نوێیەکەی خۆیاندا چاك کردوەتەوە. هەڵبەتە ئەوەی کە خودی ئەم رەخنانەش بۆ خۆیان شیاوی رەخنەن بابەتێکی ترە کە ناتوانێت لە ناوخۆیدا ببێتە رێگری پێشکەوتنی رەوتێك لەبیری سیاسیدا.

لە تیۆرەکانی فەیلەسوفە مەزنەکاندا هەمووەدەم پەیوەندییەکی نزیك هەیە لە نێوان بەشەکانی تیۆرەکەدا. بۆ نموونە تێگەیشتنی ئەوان سەبارەت بەوەی کە مرۆڤ چییە، چ سیفاتێکی گرنگی هەیە، چۆن کەوتووەتە ئەم جیهانەوە و بۆچی هەوڵدەدات، کۆمەڵگا چۆن دروستدەبێت و چۆن درێژە بەبوونی خۆی دەدات. بەم شێوەیە گریمانەکانیان لەم رووەوە شیاوی رەخنە و لێکۆڵینەوەیە و ئەو بۆچوونانەی کە بۆ ئەم پرسە خراونەتەڕوو وردبوونەوە و وتوێژ هەڵدەگرن.

لەگەڵ ئەمەیشدا مەبەستی ئێمە تەنها ناڕێکی و دژیەك و رەخنەی تیۆرە سیاسییەکان نییە. بەشێکی گرنگی سەرنجی ئێمە رووە و ئەو لایەنانەیە کە هێڵی هاوبەشی تیۆرەکان پێکدەهێنێت و گوزارشت لە بەردەوامی یەك بنەڕەتی بیر لە تیۆرە یەك لە دوایەکەکاندا دەکات. چوارچێوەی بیری سیاسی زیاد لەوەی کە مەیدانی رووبەڕووبوونەوە ململانێی هزرەکان بێت سنووری بەردەوامی رەگەزە نوێ و داهێنانەکانیانە لە یەکتردا. ئەمە بۆخۆی لایەنێکە لە کامڵبوونی بیر. بیرمەندان وەکو یەك پەند لە ناڕێکی و داهێنانە هزرییەکانی یەکتر وەردەگرن. تیۆری دەوڵەتی هیگڵ وەکو کامڵترین تیۆری بابەتی لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبە نەك تەنها قەرزاری بیری ویستی گشتی رۆسۆ و خودرێسایی ویستی کانتە، بەڵکو سوودی لە ئابووریی سیاسیی ئادەم سمیت و ((دیموکراسی بازاڕ))ی میلیش وەرگرتووە کە لە رووییەکەوە بنەڕەتی بەرامبەری تیۆرەکەی ئەو پێك دەهێنن. دەوڵەتی نوێ وەکو یەك تاکە پرۆژە تەماشا بکرێت کە بیرمەندانێکی مەزنی بنەڕەتە جیاوازە هزرییەکان لە دامەزراندنیدا وەکو یەك بینای گەورە بەشداریان کردووە. بیری هۆبز بناغەی ئەم بینا گەورەیە پێکدەهێنێت کە وەکو تۆو بەشەکانی زۆرێك لە تیۆرەکانی پاشتری لە خۆیدا هەڵگرتووە. لە بۆچوونەکەی ئەودا هەم رەگەزەکانی نەریتی چێژگەرایی[6] و هەم نەریتی

6- hedonism.

ویستگەرایی و دروستکردنیش[٧] هەردووبونیان هەیە. بنەڕەتێك لە بیری سیاسی کە پەیوەستە بە ناوی هیوم و بێنتهام و میلەوە لەگەڵ برەوپێدانی رەگەزەکانی چێژگەرایی و بنەڕەتێکی تر کە پەیوەستە بە بەناوی رۆسۆ و کانت و هیگڵە وە لەگەڵ ویستگەرایی و دروستکردن پەیوەندیان هەیە. بەم جۆرە بەشێك لەسەرنجی ئێمە لەم لێکۆڵینەوەدا رووەو ئەو رەگەزانەیە کە زنجیرەی پەیوەست بوون و کامڵبوونی بیری پەیوەست بە عەقلانیەتی دەوڵەت پێکدەهێنن. شیاوی ئاماژەیە کە ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا مامەڵە لەگەڵ هەموو لایەنەکانی فەلسەفەی سیاسی (لە قۆناغی مەبەست)دا ناکەین و تەنها باس لەو لایەنانە دەکەین کە زیاتر پەیوەستن بە بابەتەکەی ئێمەوە. بە واتایەکی تر کاری ئێمە لێرەدا بریتی نییە لە روونکردنەوەی تیۆرە سیاسییەکانی دەستەیەك لە بیرمەندان، هەرچەندە کە ناکرێت خۆمان لە ئاماژەکردن بە هەندێك لە رەگەزە سەرەکییەکانی ئەم تیۆرانە بەدوور بگرین. جەختی ئێمە لەسەر داینەمیکیەتی بیری عەقلانیەتی دەوڵەتە لە روانگەیەکی گشتی و سەرووتر لە کاری تاکەکەسیی هەریەك لە بیرمەندان.

---

7- Will and artifice.





## پاژی پێشەکی

## بنەماکانی فەلسەفەی سیاسیی نوێ (مۆدێرن)

لە سەدەی هەژدەیەمدا بزووتنەوەیەکی هزریی مەزن بۆ کردنەوەی چەند سنوورێکی نوێ لە زانستی مرۆڤ و تاقیکردنەوەی هەموو شتەکان لەسەربنەمای عەقڵی مرۆیی دەستیپێکرد و بەرە بەرە گۆڕا بۆ گەورەترین بزووتنەوەی سەردەمی نوێ. عەقلانیەت لە شێوە جۆراوجۆرەکانیدا ناوەندی سەرەکیی ئەم بزووتنەوە مەزنە بوو. وەها سەردەمێك بوو کە لە لوتکەی داینەمیکیەتی خۆیدا بە ((سەردەمی عەقڵ)) و ((سەردەمی رووناکی)) ناوی دەرکرد. لە چوارچێوەی عەقڵگەرایی ئەم سەردەمەدا بوو کە بیری سیاسی و لەوانەیش تیۆری دەوڵەت رێگەی سەختی خۆی بۆ دابڕینی هەموو پێوەندییەك لەگەڵ میتافیزیك و سەقامگیربوون لەسەربنەمای عەقڵی مرۆیی دەستیپێکرد. تێڕوانین بۆ مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی حاکم بەسەرخۆیەوە بووە سەرچاوەی تێڕوانینێکی نوێ بۆ دەوڵەت وەکو ئەنجامی ویست و دروستکراوی مرۆڤ. بیرمەندان بەدیدێکی نوێوە روانیانە ئەو پرسەی کە چۆن مرۆڤ چووە ناو باری مەدەنییەوە و دامەزراوە سیاسییەکان لە کوێوە دروستبوون و چ رۆڵ و مەبەستێکیان هەیە. بەم جۆرە پرسیارگەلێکی نوێ سەبارەت بەم پرسە و بەم ناوەڕۆکانە سەریانهەڵدا کە مرۆڤ چۆن دەتوانێت دەوڵەتێکی دامەزراو لەسەر ویستی کۆمەڵ دروستبکات؟ بۆچی دروستکردنی وەها دەوڵەتێك خوازراوە؟ بۆچی دەبێت دەوڵەت ئەنجامی رێکەوتنی راستەقینەی تاکە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای سیاسی بێت؟ چوارچێوەی دەسەلاتی دەوڵەت کوێیە و کەی و چۆن دەبێت و ملکەچی لە دەوڵەت بکردرێت؟

ئەو بیرمەندانەی کە بناغەی دەوڵەتی نوێیان دامەزراندووە لەو بڕوایەدابوون کە جیهان سیستەمێکی عەقڵ پەسەند [معقول]ی وایە کە دەکرێت ناوەڕۆکەکەی بدۆزرێتەوە. ئەوان پێیان وابوو کە چارەنووسی مرۆڤەکان لە دەستی خۆیاندایە و دەتوانن بە خۆ رزگارکردن لە کۆتی

بیروباوەڕە میتافیزیکییەکان و بەسوود وەرگرتن لە توانای عەقڵ بەجۆرێکی خوازراو چوارچێوەی کۆمەڵایەتی خۆیان ڕێکبخەنەوە و هەلومەرجێکی گونجاو بۆ گەشانەوەی ئەخلاقی مرۆیی و فەرمانڕەوایی عەقڵ فەراهەم بکەن. هەوڵدان بۆ ناسینی سەرچاوە و ناوەڕۆکی دەوڵەت و دۆزینەوەی ڕێکخستنی عەقڵانیی بۆ دەوڵەت بەشێك بوو لەم بەدواداگەڕانە گشتییە.

سەدەی هەژدەیەمی زایینی کە تیایدا تێڕوانینی نوێ بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگا دەستیپێکرد سەدەی ئامێری بوو. بلاوەی ڕوانگەی ئامێریش لە شوێنی خۆیدا بەشدار بوو لە تێڕوانینی نوێ بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگای سیاسی. بە پێچەوانەی ڕابردوو کە باس لە گیانی ژیان دەکرا، لەم سەدەیەدا باس لە وزە و مادە هاتە ئاراوە. بە هەمان شێوە تێگەیشتنێکی نوێ بۆ عەقڵیش لە ئارادابوو. لە ڕوانگەی دێریندا کاتێك باس لە عەقڵ دەکرا بەشێوەیەکی بنەڕەتی ئاماژەکردن بوو بە جەوهەری سیستەمی سروشتی و بنەڕەتی بوونەوەرەکان. بەلام لای بیرمەندانی سەدەی حەڤدە مەبەست لە عەقڵ یەکێك بوو لە تواناکانی مرۆڤ کە دەتوانێت بە هۆیەوە چەند ئەنجامێکی متمانەدار لە بینینەکانی خۆیەوە بەدەست بێنێت. بە بۆچوونی بیری دێرین کاری مرۆڤ بریتی بوو لە وێنەیەکی ڕاستییەکی پێشوو بەلام بەڕایی بیرمەندانی سەدەی حەڤدەی ئەوەی کە مرۆڤ دروستی دەکرد بەرەسەن و ئەفرێنەر دادەنرا[8].

ئەم تێڕوانینە نوێیە بۆ عەقڵ و سروشت و دروستکردن ڕوانگەیەکی نوێی سەبارەت بە دەوڵەت دروستکرد کە بەهەمان شێوە دەوڵەتیش بە ئەنجامی ویست و دروستکردنی مرۆڤ دادەنێت.

ئێستاکە سروشت بۆخۆی ئامێرێك و میکانیزمێکە دەبێت دەوڵەتیش بە هەمان شێوە ئامێرێك بێت. ئەو کەسەی کە ئەم ئامێرە دروستدەکات مرۆڤە و هەر کەسێك کە دەیەوێت دەوڵەت بناسێت دەبێت دروستکەرەکەی واتە مرۆڤ بناسێت. دروستکردنی دەوڵەت لەلایەن مرۆڤەوە کارێکی ڕەسەنە و وێنەگرتنەوەی شتێکی پێشتر نییە. بە هەمان شێوە ڕاستی و دادپەروەریش شتێکی پێش وەختی نین بەڵکو لەگەڵ دروستبوونی کۆمەڵگای ڕێك کەوتوودا دروستدەبن.

8- C. I. Wayper, political Thought, English University press LYD 1973, p.43.



## شێوازی هەڵێنجاندنی شێوەی سەرەکیی زانستی کۆمەڵگا

گالیلە و دیکارت کە زانستی نوێیان دامەزراند هەموو شتێکیان وەرگێڕا بۆ ماتماتیك. لە ڕاستیدا بەم جۆرە زانست بە زانستی ماتماتیك لێکدرایەوە. لەوەها حاڵەتێکدا پرسیارکردن لە باری زانستی سیاسەت پرسیارێکی جوان بوو. گالیلە بڕوای وابوو کە ئەگەر فەلسەفە بە زمانی هەندەسە بنووسرێتەوە ئەوا سەبارەت بە سروشت دروست دەردەچێت. بەلام لە سنووری ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیدا ڕاست دەرناچێت. بە وتەی خۆی ژیانی سیاسی بواری هەست و سۆز و کڕین و فرۆشتنەکانە. زانستی کۆمەلایەتی ناتوانێت زاڵ ببێت بەسەر ئەم هەست و سۆز و کڕین و فرۆشتنانەدا و بەرەو مەبەستی عەقلانی ڕێنمایی بکات. بەلام بیرمەندانی سەدەی حەڤدە ئەم تیۆرەی گالیلەیان پەسەندنەکرد. ئەوان عەقلگەرایانێکی پایەدار بوون و بڕوایەکی بێ ڕادە و سنوریان بە توانای عەقڵ هەبوو. لەم ڕووەوە جیاوازی لە نێوان سەرچاوە فەلسەفییە جیاوازەکاندا نەبوو و هەموو هاوبۆچوون بوون لەم بڕوایەدا[9]. لەوەها فەزایەکدا بوو کە هۆبز ویستی تیۆرێکی گەورە بۆ کۆمەڵگای سیاسی دابڕێژێت کە سەبارەت بە تەنە مادییەکان لەڕووی شێواز و بەهای زانستی و ڕوونی باسەوە بە تەواوی لە تیۆرەکەی گالیلە بچێت. بە هەمان شێوە گرسیۆس-یش کە لەڕووی گریمانە و بنەماکان[10]، بەتایبەتی ئەو ئەنجامانەی لێوەی بەرهەم دێت لە تیۆری سیاسیدا لە جەمسەری بەرامبەری هۆبزدابوو ئەویش بڕوای وابوو کە دۆزینەوەی ((ماتماتیکی سیاسەت)) بەهیچ شێوەیەك کارێکی مەحاڵ نییە. گرسیۆس دەیوت کە ژیانی کۆمەلایەتی کۆمەڵێکی ناڕێك و تێکەڵ بە یەکی ڕاستییە[11] پەرت و بلاوەکان نییە و لەسەربنەمای ئەحکامێکە کە خاوەن هەمان بەهاو بیناوی حوکمە ماتماتیکییەکانە.

9- Ernst Cassirer, The Myth of the State, yale University press, 1946, p.163.
10- Assumption.
11- Facts.





## عەقڵ وەکو ئامرازی سەرەکیی دۆزینەوەی حەقیقەت

لەسەربنەمای ئەم پێشەکییە پرسیارێکی تریش دروست بوو کە گرنگییەکی بنەڕەتیی هەبوو بۆ پێشکەوتنی پاشتری بیری سیاسی. ئێستاکە پێویستە بە هەمان شێوەی حەقیقەتە ماتماتیکییەکان راستییە سیاسییەکانیش ئاشکرا بکەین و بسەلمێنین ئەی ئەو بنەڕەتەی کە دەبێت بەڵگەهێنانەوەی لەسەر دابمەزرێنین کامەیە؟.

ئەگەر بۆ سیاسەتیش شێوازێکی ئقلیدسی هەبێت لەم حاڵەتەدا دەبێت بەر لە هەموو کارێك بەدوای بنەڕەتە جێبباسەکان و بنەماکاندا بگەڕێین بۆی. کەواتە هەنگاوی یەکەم لە تیۆردارێژی سیاسیدا بریتییە لە دۆزینەوەی بنەڕەتە جێبباسەکان. خاڵی سەرنج راکێش ئەوەیە کە ئەمە بۆ بیرمەندانی ئەوکات لە کارێکی زۆر دژوار نەدەچوو. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە پێویست ناکات بۆ دۆزینەوەی ئەم بنەڕەتە جێبباسانە بەدوای شتێکدا بگەڕێین، هێندە بەسە کە هەوری توندڕەوی و وێنا نادروستەکان لە هۆشمان دووربخەینەوە تاوەکو بگەینە توانای عەقڵ. عەقڵی مرۆڤ دەتوانێت دروست و نادروست و حەقیقەت و ناحەقیقەت لێك جیابکاتەوە. بە واتایەکی تر عەقڵ دەتوانێت هەم خود و هەم دژە خود بدۆزێتەوە. وەها تێگەیشتنێکی عەقڵ لە تەواوی سەدەی حەڤدە و هەژدە و نۆزدەدا گۆڕا بۆ بنەرەتێکی بەڵگەنەویست. دوابەدوای ئەمە بیرمەندانی سەدەی حەڤدە و هزرڤانانی سەدەی هەژدە و سەردەمی رۆشنگەریش لەو بڕوایەدابوون کە دەبێت بۆ چاکسازی لە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی سەرەتا روناکی عەقڵ بکەینە مەشخەڵی رێنما. نوسەرانی ئنسکلۆپیدیا بەردەوام جەختیان لەسەر ئەو بابەتە دەکردەوە کە دەکرێت هەموو کات بە پێشکەوتنی کەلتوورو زانست شێوەیەکی باشتری سیستەمی کۆمەڵایەتی بەر قەرار بکرێت. تەنها بە پێشکەوتن و بەرفراوانکردنی کەلتووری عەقڵی دەتوانین ئومێد بە نوێبوونەوەی ژیانی سیاسی و ئەخلاقی ببەستین. بیرمەندانی سەدەی نۆزدەیش بە هەمان شێوە جیهانیان بە سیستەمێکی دامەزراو لەسەر عەقڵ و خاوەن پێکهاتەی عەقڵ پەسەند دادەنا کە دەکرێت بە هاوکاری پرۆسەی ئەنجامگیری ئاشکرا بکرێت. ئەوانیش لەو بڕوایەدابوون کە بەکارهێنانی دروست و رێکی زانستی فەلسەفی ئەو توانایەمان دەداتێ کە






پێکهاتەی بینراوی راستی ئاشکرا بکەین[١٢]. ئەو بۆچوونانە لە جیهانناسی نوێوە سەرچاوەیان دەگرت کە لە بەرامبەر جیهانناسی کۆن رادەوەستا. لە جیهانناسی کۆندا وێنا وابوو کە بوونەوەرەکان لەسەربنەمای رێکییەکی میتایی رێکخراون. خوداو گیان و جیهانی ناسووتی بە سێ پایەی سەرەکیی ئەم بونەوەرانە دادەنران کە بەردەوام سیستەمی ناسین دەگەڕانەوە بۆ ئەوان. بەپێی ئەم جیهانناسییە دەبێت لە سەرووی سروشتدا بەدوای کاملبوونی راستەقینەدا بگەڕێین نەك لە سروشت. لە وەها سیستەمێکی ناسیندا ئەوکارە بە حەتمی دادەنرا کە ناتوانرێت و نابێت زانستی دەوڵەت بخرێتە سەر بنەماکانی ناسینی کۆمەڵگا، بەڵکو دەبێت بە هاوکاری هێزە میتافیزیکییەکانی وەکو ئایدیاکان یاخود یاسای خوایی سەقامگیر بکرێت. بۆ مالبرانش و سپینۆزایش هیچ رێگەیەك روەو حەقیقەتی سەربەخۆ لە بوونی خودا بوونی نەبوو. بەڵام هۆبزی دامەزرێنەری زانستی نوێی سیاسەت ناسینی دەوڵەتی لە هەموو جۆرە مەرجەعێکی دەرەکی و میتایی دوورخستەوە.

## لۆژیکی نوێ

تێڕوانینی نوێ بۆ کۆمەڵگای سیاسی لۆژیکێکی نوێی دروستکرد کە جیاوازبوو لە لۆژیکی سکولاستیك و لۆژیکی ماتماتیکی دیکارت (هەرچەندە کە کاریگەری لۆژیکی نوێی لەسەربوو). لۆژیکی نوێ بە پێچەوانەی لۆژیکی سکولاستیك کە پشتی بە ناساندن و چەسپاندن دەبەست، لۆژیکی دروستکردن بوو و جەختی لەسەر دروستکردن دەکردەوە. بیرمەند لە توێژینەوە و بەڵگەهێنانەوەدا هەوڵدەدا سەرەتا بەهۆی ئەم لۆژیکەوە پێکهاتەی ئەو گشتە ئاوێتەیەی کە لە بەردەستیدایە شیبکاتەوە و بیگەڕێنێتەوە بۆ بەشە سەرەتاییەکانی ئەوکات بەسەر لەنوێ دروستکردنەوەی چۆنیەتی ئاوێتەبوون و رێساکانی دروستبوونی بدۆزێتەوە. لەسەر ئەم بنەمایە بوو کە هۆبز هەوڵیدا کۆمەڵگای رێك کەوتوو شیبکاتەوە بۆ رەگەزە سەرەتاییەکانی، ئەوکات فاکتەرەکانی پێوەندی مرۆڤەکان و کۆبوونەوەیان لە کۆمەڵگایەکی سیاسیدا بدۆزێتەوە. ئەمەیش هەمان ئەو کارەبوو کە گالیلە و نیوتن بۆ ناسینی سروشت ئەنجامیان دابوو. هۆبز شێوازی توێژینەوەی سروشت و توێژنەوەی کۆمەڵگای بە لێك جیا

(١٢) فردریك کاپلستون، تاریخ فلسفه، جلد ششم، ترجمه اسماعیل سعادت ومنوچهر بزرگمهر، تهران، انتشارات سروش، ١٣٧٢، ص٤٠٢.

نەدەزانی. ئەم شێوازە کە بە شێوازی ئەنجامگیری ناودەبرێت جیاوازە لە شێوازی ماتماتیکی دیکارت و سپینۆزا. لە شێوازی ماتماتیکیدا ئەندازە و ئەنجامگیری تەنها لەسەربنەمای بنەڕەتی جێیباس بە ئەنجام دەگات. بەڵام لە شێوازی ئەنجامگیریدا بەو جۆرەی کە باسکرا سەرەتا گشت شیدەکرێتەوە بۆ بەشەکانی و پاشان بەدەستپێکردن لە سادەترین بەشەوە هەنگاو بەهەنگاو دەگەینە بەشە ئالۆزترەکان. بەم جۆرە بوو کە هۆبز سەرەتا بۆ دۆزینەوەی عەقلانیەتی فەرمانڕەوایی سیاسی ویستی کۆمەڵیی نێو کۆمەڵگای شیکردەوە بۆ ویستی یەکەیەکەی تاکەکان و پاشان لە توێژینەوەی سروشتی تاکەکانەوە گەیشتە باری شەڕ. بەم شێوەیە لە شیکردنەوەی ویستی بە کۆمەڵی نێو کۆمەڵگاوە گەیشتە ویستی تاکەکەسی و باری سروشتی. ئەوکات لە شیکردنەوەی سروشتی مرۆییەوە باری شەڕی ئەنجامگیری کرد. تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتیش لەم بنەمایانەوە وەدەرهات. بۆیە نابێت بۆ دۆزینەوەی رەگی گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەکو ئۆرگانێك بگەڕێینەوە بۆ مێژوو و لێکۆڵینەوە ئەزموونییەکان. ئەو کەسانەی کە بۆ گەڕان بەدوای بنەمای گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا دەگەڕێنەوە بۆ مێژوو یاخود بۆ شوێن پێ هەڵگرتنەوەی پشت بە بەڵگە مێژووییەکان دەبەستن بەبێ سوود خۆیان ماندوو دەکەن. هەڵبەتە نابێت ئەوە بەو واتایە لێکبدەینەوە کە بیرمەندانی بڕواردار بەم شێوەیە شیکردنەوەیە لێکۆڵینەوە ئەزموونیەکانیان پشت گوێ خستووە.

## چەمکی عەقلانیەت

بیری سیاسی لە کۆنترین سەردەمەکانەوە لە گەڕاندابووە بەدوای پێوەرێکی عەقلانی بۆ ئاراستەکردن و خستنەڕووی پرسی سەرەکی سیاسەت واتە پەیوەندی نێوان حەق و دەسەڵات. فەیلەسووفە سیاسییەکان لە ئەفلاتۆنەوە تا بە ئەمرۆ پێیان وابووە کە چەند پێوەرێك هەیە بۆ جیاکردنەوەی دروست و نادروست لە کاری سیاسەتدا، پێوەر گەلێك کە لەبەردەستی عەقڵی مرۆییدایە. هەر بۆیەش یەکێك لە گرنگترین سەر گەرمییە هزرییەکانی فەیلەسووفە سیاسییەکان بریتی بووە لە دۆزینەوەی بنەمایەکی عەقلانی بۆ رێکخستنی کاروباری سیاسی جا چ لە یاسای خودایی یان یاسای سروشتی یاخود لە عەقڵی مرۆییدا بێت، بەهەرحاڵ ئاراستەکردنی عەقلانیی پەیوەندی نێوان حەق و دەسەڵات بەتایبەتی یەکێك لە گرنگترین رەنگدانەوەکانی واتە دەوڵەت لە پرسی بنەڕەتییەکانی بیری سیاسی بووە.



لە سەدەی حەڤدەیەمدا هەوڵی بیرمەندان لەم بوارەدا گرنگی و روونییەکی نوێی لە خۆگرت تا لە ئەنجامدا بیری مرۆڤی سەرخست لە دۆزینەوەی بنەمایەکی عەقلانی بۆ دەوڵەتێکی عەقلانی. چەمکی عەقلانیەت ئاماژەیە رووەو تێڕوانینێك کە مەبەستەکەی بریتییە لە لێکدانەوە و رێکخستنی بابەتەکانی جیهان لەسەربنەمای بنەڕەتەکانی عەقڵ. ئەم حوکمە بە یەکسانی لە بەرامبەر ئەو فەلسەفانەی کە بە بۆچوونەکانی عەقڵگەری یان ئەزموونگەری دیاریکراون و لە ئەفلاتۆنەوە هەتا هۆبز بەردەوامە دروست دەردەچێت. عەقڵگەرایی لە یۆنانی کۆندا زیاد لە هەموو شتێك بەرامبەر جیهانی هەستیی کە لە گۆڕان و وەرچەرخانی بەردەوامدایە خرایەروو. لەم رووەوە میتافیزیك لە یۆناندا بەشێوەی زانستێکی عەقلانی کە لەو دیوی جیهانی گۆڕاوەوە لە گەڕاندایە بەدوای بنەرەتە چەسپاوەکاندا بەدیارکەوت. هەر لێرەوە ئەرەستۆ لە لۆژیکەکەی خۆیدا کەوتە خستنەرووی شێوەی بیر کە دەکرێت بە هاوکاری ئەو بگەینە ناسینێکی عەقلانی بۆ راستی. بەڵام هەر لەبەر ئەمە بوو کە لە نەخشەکەی ئەرەستۆدا جیهانی گۆڕاوەکان و تاکەکان لە دەرەوەی سنووری عەقڵ مایەوە. دیارخەری سەرەکی فەلسەفەی سیاسی کلاسیك کە لە بنەڕەتدا مامەڵە لەگەڵ ئەو شتەدا دەکات کە دەبێت هەبێت نەك ئەوەی کە هەیە لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. عەقڵگەرایی یۆنانی بەلای ناسیندا دەچوو نەك ویست. لە جیهانبینینی رۆمەکاندا بوو کە عەقڵ و ویست تێکەڵ بە یەك بوون و عەقڵ گۆڕا بۆ هێزێك لە ژیانی تاکەکەسیدا. هەر لەم جیهانبینینیەدا بوو کە عەقڵ گۆڕا بە ئامرازێك بۆ کۆنترۆڵکردنی ژیان. بابەتی گرنگی ئەم بوارە ئەوەبوو کە هەموو مرۆڤەکان خاوەن تێڕوانینی ئەخلاقی و عەقلانین. ئەم بۆچوونە بووە سەرچاوەی ئەو بیرە یاساگەرییە گشتییەی کە لەلایەن سیسرۆوە برەوی پێدراو بەرەو کامڵبوون رویشت و تا قۆناغی نوێی بیری رۆژئاوا درێژەی پەیداکرد. لە قۆناغی هێلنیزاسیۆندا بیری دەوڵەتێکی جیهانی کە بەیاسای جیهانگرەوەی عەقڵ رێکخراوە، گۆڕا بەبیری باو. بەڵام لە پلەی یەکەمدا ئەم یاسا جیهانگرەوە و دەوڵەتە جیهانییە خاوەن سروشتێکی وێنەیی بوو و لەبەرئەوەی کە ئارمانێکی دوورە دەست بوو بۆیە دەبووەمایەی سەرشکەستەیی و ناوەوەگەری. لەو جێیەوەی کە عەقڵ نەیدەتوانی ژیانی مرۆڤ بەجۆرێك رێکبخات کە هەموو شتە ناعەقلانییەکان لە مەیدانی ژیان وەدەرنێت و بەسەر رەگەزەکانی چارەنوسدا کە رێسا عەقلانییەکانی وەلاوە دەنا زاڵ ببێت تاك (ئەو تاکەی کە کەوتبووە دەرەوەی دنیای رێك و گونجاوی دەوڵەتشارەوە) بەدوای پەناگایەك لە ناوخۆیدا کەوتە گەڕان. بڕیاروابوو کە بینینی عەقلانی تاك بەسەر حەزە دەروونییەکانیدا زاڵببێت. بەم جۆرە





بوو کە ئارمانی مرۆڤی خاوەن عـەقڵی هـەیوانی، ئـەو کەسـەی لـەژێر ڕێنمـایی عەقڵدایـە و سەرەڕای گۆڕانکارییەکانی ژیانی دەرەکی ئازادی و کەسێتی سەربەخۆ و پشت ئەستوور بەخۆی دەچەسپێنێت، گەشەی کرد. لە دنیای مەسیحییەتدا عەقڵانیـەت واتایـەکی نـوێی پەیـداکرد. متمانە بە توانای عەقڵ کە لە دیارخەرەکانی بیری هەیوانی بـوو لەناوچـوو. سـێنت ئۆگەسـتین ڕایگەیاند کە مرۆڤ ناتوانێت دوابەدوای دابەزین بەپێی بینینی عەقڵانی بڕیار بـدات. هـەروەها وتی کە ویست و غەریزەکان بوون و سروشتێکی سەربەخۆیان هەیە لە مرۆڤدا و لەژێر کۆنترۆڵی عەقڵدا نین. تەنها بە پشتیوانی خودایی مرۆڤ دەتوانێت پاش دابەزین بـە هاوکـاری عـەقڵ بـە ڕزگاری بگات. ژیانی مرۆڤیش وەکو نەخشەیەکی واتادار کە نەخشەی خودایی ئاشکرا دەکـات وێنەکێشرا. لەو جێیەوەی کە مێژووی مرۆڤ لەگەڵ ڕێکەوت و چارەنووسی خوداییدا لێك ئالاْوە ئیدی لە بەردەستی بینینی عەقڵانیدا نییـە. تـەنها سـرووش نەخـشەی گـشتی ژیـان ئاشـکرا دەکات. شەریعەتی خودایی واتای ژیان بەرجەستە و دیـاری دەکـات نـەك بـیر و بیرکردنـەوەی لۆژیکی. بەم جۆرە واتایەکی سەرووی عەقڵانی بۆ ژیان وێناکرا. دەرککردنی ویستی خـودا لـە دەرەوەی سنووری عەقڵی مرۆڤدایە. لەسەردەمی ڕێنیسانسدا جـارێکی تـر لێکدانـەوەی ژیـان لەسەربنەمای عەقڵی سەرووی مرۆیی تووشی قەیران هات. بیری چارەنووسـی خـودایی شـوێنی خۆی دایە بیری ڕێککەوت لە جیهانی کۆندا. ڕەگەزە ناعەقڵانییە دوور لـە پێـشبینی و هـەواو هەوەسدارەکانی ژیان لە فەلسەفە و ئەدەبیاتی سەردەمی ڕێنیسانسدا برەوی پەیداکرد. جارێکی تر تاك وەکو مرۆڤی عەقڵمەندی هەیوانی گەڕایـەوە بـۆ نـاوخۆی و لـە عـەقڵی تاکەکەسـی و هەڵهاتن لە جەنجاڵی ژیاندا بەدوای ئاسایش و ئارامیدا گەڕا. ئەم بیرە بڵاوەی کرد کە زۆربوونی شتەکان و ڕووداوەکان و بێ کۆتایی بوونی ئەگەر و تواناکان ڕێگە لـە ڕێکخـستنی عـەقڵانیی کاروبارەکان دەگرێت. بەهەمان شێوە فۆرمـە نەریتییـەکانی بیرکردنەوەکـە مایـل بـوو بـەلای گشتدا و گرنگی بە تایبەتەکان نەدەدا بەناشیا و لە قەڵەمدرا. ئەوەی کە لەم کاتەدا گرنگی پێ دەدرا بریتی بوو لە سوود وەرگرتن لە بنەڕەتە عەقڵانییەکان بۆ ڕێکخستنی فرەیـی لـە دنیـای هەستپێکراوەکاندا. ئێستا ئیدی بیرەکان ئارەزوومەندی گۆڕینی شتەکان نەبوون بۆ سیستەمێك لە نموونە چەمکییەکان بەڵکو ئارەزوومەندی خۆیان بەرامبەر بەرووداوەکانی جیهانی دیاردەکان کـە بـە ناهەماهـەنگ لەگـەڵ یاسـا عەقڵانییـەکان وێنـادەکران نیـشاندا. بـەلاْم لەسـەدەی حەڤدەیەمدا هەراو جەنجاڵێکی نوێ لە زانست و عەقڵگەرایيـدا پەیـدابوو. سـەدەی حەڤدەیـەم سەرەتای پێشکەوتنی زانست و سەرهەڵدانی تێگەیشتنگەلێکی نوێ بـوو دەربـارەی






جیهان. دیکارت و بیکۆن دوو کەسێتی دیاری دامەزراندنی عەقڵگـەرایی نـوێ بـوون. بیکـۆن دەیویست هۆشی مرۆڤ بکاتە خاوەن ئامرازێك کە بتوانێت ناسینی پەیوەست بەدنیای خۆمـانی پێ بەدەست بێنێت. ((لۆژیکی نوێ))[١٣] بە هاوکـاری شـێواز و بەرنامـەی وردی لێکۆڵینـەوە ڕێگەکانی گەیشتن بە زانستی یەقینی نیشان دەدات. وەکو هـەموو بوارەکـانی تـر کاریگـەری عەقڵگەرایی بۆ سەر سیاسەت بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە سـەدەی حەڤدەیەمـەوە دەسـتیپێکرد بەلاْم ڕەنگە کەمتر بوارێك بەر بکەوێت کە کاریگەری عەقڵگەرایی تیایدا هێندە جەخت لەسەر و بەردەوام بووبێت، بە جۆرێك کە لەم کاتـەدا کاریگـەری عەقڵگـەرایی لەسـەر سیاسـەت لـە هەموو کاتـەکانی دی بـەهێزتربوو. پەیـدابوونی فـەرمانڕەوایانی نـوێ و چـینگەلێکی نـوێ و کۆمەڵگای سیاسی نوێ ڕەنـگ و ڕوویـەکی بـێ وێنـەی بەخـشیبووە هەوڵـدان بـۆ زانـست و دیکترینە نوێیەکان. بەم جۆرە بوو کە عەقڵگەرایی زانـستیی سـەدەی حەڤدەیـەم گەشـەیکرد. بناغەی ئەم عەقڵگەراییە لەسەر ماتماتیك کە بە بەرزترین زانستی عەقڵی لەقەڵەمدەدرا دانرا. ماتماتیك گۆڕا بۆ سیستەمی بیری تیۆریی دیکارت و سـپینۆزاو لایبنیـتس. هـەمان شـێوازی عەقڵی — ماتماتیکی لە بواری زانستە سیاسی و کۆمەلاْیەتییەکانیش بەکاربرا. لێرەدا بابەتەکە بریتی بوو لە بە عەقڵانی کردنی ژیانی کۆمەلاْیەتی و سیاسی لەسەربنەمای بنەڕەتە گـشتی و بەڵگەنەویـستەکان. بـەم شـێوەیە بـوو کـە دەوڵـەت بـە ئـامرازی عـەقڵ بـۆ کـۆنترۆڵکردنی سەرکێـشییەکانی تـاك و چارەسـەرکردنی ململانێـی غـەریزە ناعەقڵانییـەکانی تاکـە پێکهێنـەرەکانی کۆمـەڵگا لـە قەڵـەم درا. ڕێـسا و یاسـا بـە ڕەگەزگـەلێك دانـران کـە بـۆ دروستکردنی ئاسایش و سەقامگیری لە کۆمەڵگای سیاسی و بە عەقڵانی کردنی کاروبارەکـان پێویستن. مەگەر شتێکی دیکەی جگە لەوە بوو کە لە دنیای زانستی سروشتیشدا ڕێساو یاسـا هۆکاری زاڵبوون بوو بەسەرکارە پاژی و ڕواڵەتییەکاندا؟ لەگـەڵ سـەرهەڵدانی دەوڵەتـە ڕەهـاو گەورە نوێیەکاندا ئەم بۆچوونەیش گەشـەیکرد کـە مرۆڤـەکان تـەنها بەملکەچـی لـە عـەقڵی دەوڵـەت دەتـوانن بـەپێی سیـستەمێکی عـەقڵانی کاربکـەن. ئارەزوومەنـدبوونی تێڕوانینـی تاکەکەسی وەکو خۆبەدەستەوەدانە لە بەرامبەر غەریزە ناعەقڵانییەکاندا. لە وەهـا فەزایەکـدا بوو کە ماکیاڤیلی فەرمانڕەوایی نوێ (کە جیاواز بوو لە فەرمانڕەوای فیودال)ی فێـری شـێوەی فەرمانڕەوایی کرد. ماکیاڤیلی یەکەمین بیرمەند بوو کە فەزیلەتە سیاسییەکانی بـە لـە پێـشتر

13- Novum organum.

دانا لەچاو فەزیلەتە ئەخلاقییەکاندا. بەلاّم هۆبز بوو کە دیکترنێکی سیاسی گونجاوی بۆ فەرمانڕەوای نوێ دانا. لە دیکترینەکەیدا دەبێت بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیانی مرۆیی لەسەربنەمای ویستی یەك فەرمانڕەوا کە بەرجەستەکەری بەرژەوەندی دەوڵەتە[١٤] ڕێك بخرێت. لەم هەلومەرجەدا عەقڵ وەکو دەسەلاّتی زاڵ کە لە ویستی دەوڵەتدا چەقدەبەستێت لە قەڵەم دەدرێ. لەگەڵ ئەمەدا هۆبز ویستی دەوڵەتی لە ویستی تاکەکانەوە وەدەرهێنا کە ئەمە بۆخۆی بناغەیەکی نوێ بوو بۆ بیری سیاسی.

لە سەدەی هەژدەیەمدا تێڕوانینێکی نوێ پەیدا بوو کە جەختی لەسەر ((خود ڕێسایی ویست)) دەکردەوە. لەم کاتەدا چینی ناوەڕاست بۆخۆی لەبواری سیاسی و کۆمەلاّیەتیدا دەسەلاّتی گرتبووە دەست و چیدی پێویستی تاکە فەرمانڕەوایەك نەبوو. ئێستا ئیدی سەرکوتکردنی غەریزەکانی تاك لە بەرامبەر عەقلانیەتی دەوڵەت و ((بەرژەوەندی دەوڵەت))دا لە ئارادا نەبوو. ئێستا نەك غەریزەکانی تاك بەڵکو دەسەلاّتی دەوڵەتە دەسەلاّتخوازەکان بە نا عەقلانی لەقەڵەمدەدران. بەم جۆرە عەقڵ ڕۆڵێکی نوێی پەیداکرد لە ژیانی سیاسی و کۆمەلاّیەتیدا. لێرە بەدواوە عەقلانیەت وەکو بەرهەمی هاوکاری عەقڵە سەربەخۆ و ئازادەکانی تاکەکان تەماشاکرا. عەقلانییەتی خودرێسا[١٥] بە لە پێشتر لە ویستی دەوڵەتە چەقبەستووەکان دانرا. تاك دەبێت ئازادبێت تاکو بەرزترین سروشتە عەقڵییەکانی خۆی وەدیار بخات. لەکاتێکدا کە لەسەدەی حەڤدەیەم هەماهەنگ کردنی قازانجی تاکەکان بەکاری عەقڵی سیاسی (دەوڵەت) دادەنرا بەلاّم لەم کاتەدا دەوترا کە چالاکی سیاسی تاکەکان حەز بە هەماهەنگی دەکات. لە بەرامبەر بێ متمانەبوونی سەدەی حەڤدەیەم بەرامبەر بە عەقڵی تاکەکەسی تێڕوانینی باوی سەدەی هەژدەیەم بریتی بوو لە متمانەکردن بە بەهرەکانی عەقڵی تاکەکەسی.

لە سەدەی هەژدەیەمدا عەقلانیەتی تاکەکەسی شوێنی عەقلانیەتی دەسەلاّتی گرتەوە. بەلاّم سەدەی نۆزدەیەم لە شوێنی خۆیدا عەقلانیەتی تاکەکەسی خستەژێر پرسیارەوە و لە بری ئەو عەقلانیەتی مێژووی خستەڕوو. هەڵبەتە چ لە عەقلانیەتی دەسەلاّتی سەدەی حەڤدەیەم و چ لە عەقلانیەتی ئازادیی سەدەی هەژدەیەم بەهای عەقڵ وەکو حەقیقەتێکی بێ کات نەچووە ژێر پرسیارەوە. تێڕوانینی مێژوویی جەختی لەسەر لایەنی دەرکەوتە و دنیایی و کاتیی ڕاستییە

14- Raison d'etat.
15- Self regulation.



کۆمەلاّیەتی و کەلتوورییەکان دەکردەوە. ڕۆسۆ مرۆڤی پێش کۆمەلاّیەتی بە پێش عەقلانی ناودەبات. دەیوت کە عەقڵ و عەقلانیەت لەگەڵ زمان و پێناسە و چەمکە گشتییەکان کە بەرهەمی کۆمەڵن پەیوەندی هەیە. عەقڵ لە کۆمەڵگادا پەیدا دەبێت و بەرەو کامڵ بوون دەچێت. ڕۆسۆ سیاسەتی بە ئامرازی بە عەقلانی کردنی کۆمەڵگا داناو وتی کە کۆمەڵگا لە باری ئێستایدا عەقلانی نییە و دەبێت بە عەقلانی بکرێت. لە فەلسەفەی هیگڵدا عەقڵ وەکو بیرێك کە لە پرۆسەی مێژوودا بەرە بەرە دێتە دی خرایەروو، نەك وەکو سیستەمی هزر و چەمکەکان کە تەنها یەك بەیەك جار هاتووەتە ئاراوە. هیگڵ مێژووی وەکو کارێکی عەقلانی ناساند. هیگڵ ئەو بوارانەی کە پێشتر لەماوەی سەردەمانێکی دووروودرێژدا بە سنووری ناعەقلانی یان سەرووی عەقڵی دەژمێردرا خستەناو چوارچێوەی عەقلانیەتەوە. دەوڵەتیش وەکو دامەزراوەیەکی عەقلانی لەم کارە بەدەرنەبوو.

بەپێی ئەوەی کە باسکرا دەکرێت بڵێین کە مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی و بیرمەندان بەتایبەتی بەردەوام عەقلانییەتێکیان بۆ دامەزراوە کۆمەلاّیەتی و سیاسییەکان لەبەرچاوگرتووە. دەوڵەت یەکێکە لە گرنگترینی ئەم دامەزراوانە و بەرێگەی یەکەم ئەم حوکمە دەیگرێتەوە. بەم شێوەیە کاتێك کە باس لە عەقلانیەتی دەوڵەت دەکەین هەم لایەنی بۆ و چۆنیی ئەم دامەزراوەیەمان لەبەرچاو گرتووە و هەم ئەوەی کە تا چ ئاستێك و چۆن بەدیارخەری ڕەنگدانەوەی عەقڵ دادەنرێت.

هیگڵییەکان جیاوازیان دادەنا لە نێوان ((خودی عەقلانی)) و ((خودی ناعەقلانی)). ((خودی عەقلانی)) ئەوەیە کە بەسەر هۆکارەکانی کۆیلایەتی مرۆڤ (کۆیلەبوون لە بەرامبەر سروشت و کۆیلەبوون و لە بەرامبەر هەست و سۆزە بێ سنوورەکان)دا زاڵبووە و لە مێژوودا ((خودی نا عەقلانی))ی بەرەو پێشەوە بردووە. خودی عەقلانی خودی ((ڕاستەقینە)) و ((ئارمانی)) و سەربەخۆ و بالاّتری مرۆڤە کە دەکەوێتە بەرامبەر مەرامە نا عەقلانی و ((سروشتە نزمترەکان)) و خودی عەقلانی یان ((خودی ڕاستەقینە)) شتێکی گەورەترە لە تاك و گشتێکی کۆمەلاّیەتی. ئەم خودە ڕاستەقینەیە وەکو ویستی بە کۆمەڵ زاڵ دەبێت بەسەر ویستە پاژی و سەرکێشەکاندا و بەم جۆرە ئازادی ڕاستەقینە و بالاّتر دێتەدی. لەم پێشەکییە و دوا بەدوای وەها ڕەوتێکی بیری سیاسی بیری دەوڵەتی عەقلانی هاتەبوون.





## سێ تێگەیشتنی عەقڵانیەت

بەم جۆرە و بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت لە بیری ڕۆژئاوادا سێ جۆر و سێ بناغەی جیاوازی عەقڵ لە بەرامبەر یەکتردا دیاری بکرێت. تێگەیشتنی یەکەم لە فەلسەفەی کلاسیك و تیۆرییەکەی ئەفلاتۆنەوە سەری هەڵدا و چەندین سەدە بیری دێرینی خستبووە ژێرکاریگەری خۆیەوە. ئەفلاتۆن عەقڵانیەتی بە توانای تێگەیشتنی سیستەمی عەقڵانی بوونەوەرەکان و یەکسان بوون لەگەڵ ئەودا دادەنا. بە بۆچوونی بیری کلاسیکی (دێرین) و ئەو تیۆرەی کە ئەفلاتۆن دایمەزراند کارکردنی عەقڵانی واتە کارکردن بەپێی سیستەمی سروشت (عەقڵانیەتی گەورەتر و سەرووتر لە عەقڵی مرۆڤ). دەکرێت لە پۆلێن کردنێکی گشتیدا جۆری دووەمی عەقڵانیەت لە تێڕوانینی دیکارت و هۆبز بۆ عەقڵانیەت دیاری بکەین. دیکارت و هۆبز عەقڵ و عەقڵانیەتیان لە سیستەمی جیهانییەوە گواستەوە بۆ تاکی مرۆڤ. ئەوان مرۆڤیان بە بوونەوەرێك پێناسە کرد کە خاوەن توانای بیرکردنەوە و وەرگرتنی بڕیارە عەقڵانییەکانە. دوابەدوای ئەم تێڕوانینە بۆ عەقڵ بزاڤێك سەری هەڵدا کە حەز و ئارەزووەکانی مرۆڤی کردە بنەمای ئەخلاق و کردار و عەقڵی دیکارت و هۆبزی بەرەو پێگەی هەژمارگەری پەتی و عەقڵی ئامرازی بۆ دواوە پاڵنا. بیرمەندانی سوودگەرایی لەبری عەقڵ ئەخلاقیان بە پشتئەستووری دەروونناسی تاك دانا.

لە بەرامبەر ئەم ڕەوتەیشدا ڕەوتێکی نوێی هزریی گەشەیکرد کە ئەخلاق و عەقڵانیەتی لە هەموو پێوەندێك لەگەڵ سروشتدا جیاکردەوە و یەکڕاست بەستییەوە بە عەقڵی پەتی و ویستی مرۆڤەوە. کانت عەقڵی بەویستی عەقڵانی لێکدایەوە و هیگڵیش پێگەی ویستی عەقڵانیی لە تاکەوە گواستەوە بۆ کۆمەڵ و عەقڵی خودرێسای کانتی بۆ هەموو بونەوەرەکان بەرفراوان کرد.

## دیارخەرە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسیی نوێ (مۆدێرن)

بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە خاڵی پشت بەستنی ئەم کتێبە بریتییە لە بیری سیاسیی نوێ، خراپ نییە جیاوازییەکانی ئەم بیرە بە بەراورد لەگەڵ بیری پێش نوێ دیاری بکەین.





بیری سیاسیی کلاسیك خاڵی چەقبەستنی باسی خۆی خستبووە سەرئەوەی کە مرۆڤ دەبێت چۆن بژیێت. پرسی سەرەکیی بیری کلاسیك بریتی بوو لە پایەبەرزی و ئەرکی مرۆڤ. بەڵام بیری سیاسی نوێ لە پلەی یەکەمدا لەوە دەکۆڵێتەوە کە مرۆڤ چۆن دەژیت، ئەوکات لەسەر ئەم بنەمایە دەڵێت کە دەبێت چۆن بژیت. ماکیاڤیلی بۆ یەکەم جار چەمکی فەزیلەتی سیاسی واتە نیشتمان پەرستیی کردە شوێنگرەوەی چەمکی پایەبەرزی مرۆڤ. بەڵام هۆبز توانیتی لەو کیشوەرە نوێیەی کە ماکیاڤیلی دۆزیبوویەوە دنیایەکی نوێی بەرپا بکات[١٦].

## ڕەزامەندی لە بری عەقڵ و فەزیلەت

مافی سروشتی کلاسیك لە وەڵامی ئەوەی کە چ کەسێك باشترین دادوەری پاراستنی زاتی مرۆڤەکانە دەیوت تاکی هۆشمەند، واتە کەسێك کە خاوەن عەقڵی کردەییە. بە هەمان شێوە سیستەمی ئایدیالیش بریتییە لە سیستەمی فەرمانڕەوایی ڕەهای کەسی هۆشمەند. باشترین ڕژێمی کردەییش بریتییە لە ڕژێمی ئاریستۆکراتەکان (چونکە کۆکردنەوەی حیکمەت و حکوومەت و دۆزینەوەی فەرمانڕەوایی خاوەن حیکمەت کارێکی سەختە). هۆبز ئەم تێڕوانینەی وەلاوەنا و بناغەی سیستەمی فەلسەفی خۆی لەسەر ئەوبنەمایە دانا کە بەشێوەیەکی سروشتی هەر کەسە و خۆی باشترین دادوەری پاراستنی خود و ئامرازەکانێتی. تەنانەت هۆشمەندترینی مرۆڤەکانیش ناتوانن سەبارەت بە پاراستنی زاتی نەزانێك شیاوتربن لە خودی خۆی. هەربۆیە لە بنیاتی دەوڵەتدا ڕەزامەندی و ڕێکەوتن لە پێشترن لە چاو عەقڵی گشتیدا.

بەپێی تێگەیشتنی کلاسیکیی مافە سروشتییەکان ناکرێت مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا بەیەکسان دابنرێن چونکە لە گەیشتن بە کامڵبوونی مرۆیی یەکسان نین. لەبەرئەوەی مەرجی دادپەروەری بریتییە لە ڕەفتاری یەکسان لەگەڵ مرۆڤە یەکسانەکاندا بۆیە ناکرێت بۆ کەسانێك کە لە ئاستێکی نزمتردان مافێکی یەکسانی هاوشێوەی کەسانی سەرووتر لەبەرچاو بگیردرێت. بەم جۆرە فەرمانڕەوایی هی ئەو کەسانەیە کە لە کامڵبوونی مرۆییەوە نزیکترن. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە عەقڵ لەپێش ترە لە خود دەبێت ئەو کەسانەی کە هۆشمەندترن فەرمانڕەوایی ئەو کەسانە بکەن کە کەم هۆشترن. ناکرێت فەرمانڕەوایی هۆشمەندانە

16- Leo Strauss, Natural Right and History, Chicago, London, University of Chicago press 1953, p. 176.

وەرگێڕانە فارسییەکەی حقوق طبیعی و تاریخ، ترجمە باقر پرهام، تهران انتشارات نگاه، ١٣٧٥.

ببەستریێتەوە بە ڕەزامەندی و ڕێکەوتنی شوێنکەوتوان و ئەوانەی کە لە ئاستە نزمترەکاندان. وەها کارێك وەکو رابەریکردنی کەسە سەرووترەکانە لەلایەن خوارووترەکانەوە. هەڵبەتە دەبێت هۆشەمدان کەسەکانی خوارووتر رازی بکەن بەرامبەر بە حکوومەتەکەی خۆیان. هەیوانییەکان (بەپێی بۆچوونی ناسراو) چەند گۆڕانێکیان دروستکرد لە بیری کلاسیکیدا و یەکسانی عەقڵیان قبووڵ کرد و بەم جۆرە نەریتێکی گرنگیان لەبیری مافە سروشتییەکاندا بنیاتنا. لە بەرامبەر مافە سروشتییەکانی کلاسیکدا مافی سروشتیی نوێ جەخت لەسەر یەکسانی مرۆڤەکان دەکاتەوە و لە حکوومەتدا ڕەزامەندی و ڕێککەوتن بەسەرووتر لە هۆشمەندی دادەنێت.

## عەقڵی مرۆیی لەبری یاسای سروشتی و یاسای خودایی

یەکێك لە گرنگترین سەرگەرمییەکانی بیری سیاسی بریتییە لە گەڕان بەدوای پایە و بنەمایەك بۆ دادپەروەری. لێرەدا مەبەست لە دادپەروەری یاسایەکی گشتیە کە بکرێت لەسەر بنەمای ئەو سەبارەت بە یاسا دانراوە مرۆییەکان قەزاوەت بکرێت. بەشێوەیەکی گشتی بیری کلاسیکی لە یاسای خودایی یان لە یاسای سروشتیدا بەدوای وەها بنەما و پێوەرێکدا گەڕاوە. بەڵام بیری نوێ بە دەستکەوتی عەقڵی مرۆیی داناوە بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگا. لە بیری کۆندا تەنها سۆفستائییەکان یاسا و دادپەروەریان بە هەڵقولاوی و عەقڵی مرۆیی دادەنا. بەشێوەیەکی گشتی یۆنانییە کۆنەکان کۆمەڵگایان دەخستە ناو ڕێکییەکی جیهانیی گەورەترەوە کە لۆگۆس یان یاسای خودایی زاڵە بەسەریدا و نۆمۆس یان یاسای دەوڵەت ڕەنگدانەوەی ئەوە. ئەفلاتۆن لە بەرامبەر سۆفستائییەکاندا هەوڵیدا کە دادەپەروەری بداتە پاڵ شتێکی پایەدارتر لە نۆمۆس واتە ئایدیا بە بۆچوونی هەیوانییەکان دەبێت یاسای دادپەوەرانە لەسەربنەمای یاسای سروشتی کە دەرکەوتەیەکی یاسای عەقڵی جیهانییە بێت.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سێنت ئۆگەستین بیری هەیوانی و مەسیحیەتی بەیەکەوە ڕێکخست و وتی کە ویستی خودایی و عەقڵ بەرزترین سەرچاوەی یاسای ئەبەدین. هۆبز عەقڵ و ویستی مرۆیی کردە سەرچاوەی دەوڵەت و عەقڵ و ویستی دەوڵەتیش کردە سەرچاوەی یاسا.

## خۆشی لە بری باشە- چێژ لە بری فەزیلەت

بیری سیاسیی کلاسیك چەمکی ناوەندی باشەی هەیە کە بریتییە لە وەدیهێنانی توانا شاراوەکانی کەسێتی مرۆڤ بە شێوەیەکی یەکپارچە و هەماهەنگ. فەلسەفەی کلاسیك لەو





خاڵەوە دەستی پێدەکرد کە جۆراوجۆری چێژەکان لە جۆراوجۆری پێداویستییەکانەوەیە. چێژ تێرکردنی پێداویستییە. چێژەکان لێك جیاوازن و زنجیرە پلەیەکیان هەیە. چێژی مرۆڤ جیاوازە لە چێژی ئاژەڵ. ئەم دووە لە دوو پلەی جیاوازدان. بۆ ئەوەی بزانین کە چ شتێك باشە بۆ مرۆڤ دەبێت بزانین سروشتی مرۆڤ چ شتێك دیاری و دەستنیشان دەکات. لەم کاتەدا هەست بەوە دەکەین کە ئەوەی مرۆڤ لە ئاژەڵ جیادەکاتەوە بریتییە لە گۆ یان عەقڵ. ئەوەی کە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا دەگونجێت بریتییە لە بیرکردنەوە و رامان و کاری عەقڵ پەسەند و ژیانی عەقلانی. ئەوەی کە لەگەڵ ژیانی بەرزتری مرۆڤدا گونجاوترە بریتییە لە فەزیلەت نەك چێژ. لە بەرامبەر ئەم بیرەی کلاسیکدا بیری نوێ گەڕان بەدوای چێژی خستە سنووری باشەوە. سوودگەرایی باشەی لەگەڵ ئەوەی کە چێژ دروستکەرە بە یەك شت لە قەڵەمدا.

## ماف لەبری ئەرك

بیری کلاسیك جەختی لەسەر ئەرك و وەزیفەی مرۆڤ دەکردەوە. لە بیری کلاسیکیدا تەنانەت ئەگەر ئاماژەشیان بە مافی مرۆڤ بکردایە ئەوا دەیانبەستەوە بە ئەرکی مرۆڤەوە، بەڵام بیری سیاسی نوێ مافی بە بناغەی راستی سیاسی داناو ئەرکی دەوڵەتیشی بە پاراستنی ئەم مافە لە قەڵەمدا. بەشێوەیەکی گشتی دامەزراندنی ڕێکی کۆمەڵایەتی لەسەربنەمای ئەرك بە تیۆرە یۆتۆپیاییەکان کۆتایی دێت. بە لە پێشتردانانی ماف لە بەرامبەر ئەرکدا و بەستنەوەی ئەرك بە مافەوە (نەك بەپێچەوانەوە) شۆڕشێکی دروستکرد لە تێڕوانینی مرۆڤ بۆ تاك و کۆمەڵگا. بەپێی ئەم تێڕوانینە مافی فەرمانڕەواو کۆمەڵگای مەدەنی لەو مافەوە وەرگیراوە کە لە بنەڕەتدا هی تاکە. هۆبز دامەزرێنەری تێڕوانینێك بوو کە تیایدا مرۆڤ لە باری سروشتیدا مافی تەواوی هەیە بەڵام ئەرکەکانی ناتەواون.

## ویست لە بری عەقڵی جیهانی

ئەگەر بەپێی سروشت هەموو کەسێك مافی پاراستنی خۆی هەیە ئەوا سەبارەت بە ئامرازە پێویستەکانی پاراستنی خۆیشی مافی هەیە. هەروەك ئاماژەی پێکرا بیری کلاسیکی مافی قەزاوەت کردن دەربارەی ئامرازەکانی پاراستنی خودی دەدایە مرۆڤی خاوەن عەقڵی کردەیی. بەڵام هۆبز لەو بنەڕەتەوە دەستی پێکرد کە هەرکەسە و بۆ خۆیشی باشترین دادوەرە سەبارەت بە ئامرازەکانی پاراستنی زاتی خۆی. ئەم بەڵگەهێنانەوەیە بەوە کۆتایی دێت کە ویست

بناغەی دەوڵەتە نەك بیرکردنەوە و رامان. ناوەرۆکی فەرمانڕەوایی فەرمان ویستە نەك بیرکردنەوە. یاسا بەهۆی سەرچاوە بوونەوە یاسایە نەك بەهۆی عەقڵ پەسەندبوونەوە. دوابەدوای ئەم تێڕوانینەدا چەند بنەڕەتێکی نوێ لەبیری سیاسیدا پەیدابوو کە ئەرکەکانی مرۆڤی بە ئەرکی سیاسی لێکدەدایەوە و لە سیاسەتدا بەدوای سەرچاوەی ئەخلاقدا دەگەڕا. هەروەها ئەو بۆچوونە گەشەیکرد کە مەزنی و کامڵبوونی مرۆڤ لە سیاسەت و گۆڕانی کۆمەڵگادا وەدی دێت. بەم جۆرە بیری سیاسی بەرەو ئەو ئاراستەیە رۆیشت کە دیموکراسی و بەشداری گشتی بە باشترین شێوەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا بناسێنێت، نەك حکوومەت لەسەربنەمای بنەرەتگەلێك کە سەرچاوەکەی لەودیوی عەقڵی مرۆییەوەیە. بیری سیاسی نوێ بۆ گەیشتن بەوەها ئەنجام و بنەڕەتگەلێك رێگەیەکی درێژ و پڕ لە بەرزی و نزمیی بڕی کە تیایدا هەریەك لە بیرمەندە گەورەکان و تیۆرە گرنگەکان بەشیاوی بەشێکیان لە ئەستۆدابوو. تەواوی ئەم دەستکەوتە گەورانە لە ماوەی دوو سەدە لە داینەمیکی ترین سەدەکانی مێژووی مرۆڤ بەدی هات.

## بەگشتی

دەکرێت لە تێڕوانینێکی گشتیدا بڵێین کە لە بیری سیاسی نوێدا سەرچاوە و مەبەستی دەوڵەت بەدەست پێکردن لە سێ بنەمای جیاوازە و لێیکۆڵراوەتەوە. لەسەر ئەم بناغەیە دەتوانین ئەو تیۆرانەی کە لەم کتێبەدا لێیان دەکۆڵرێتەوە بۆ سێ بنەڕەتی سەرەکی دابەش بکەین. لە یەکەمین بنەڕەتی بیری سیاسیدا سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاق و دادپەروەریی مافی سروشتیی نوێ (نەك مافی سروشتی بەواتا کلاسیکییەکەی) بەرچاو دەکەوێت. هۆبز مافی سروشتی بە سەرەتاییترین و بنەڕەتی ترینی واتە مافی پاراستنی زات سنوردار دەکات. ترس لە مەرگی ناسروشتی بنەڕەتی ترین و بەهێزترین حەز واتە حەزی پاراستنی زات دەخاتەڕوو. و مافی سروشتی لەم حەزە بنەڕەتییەوە سەرچاوە دەگرێت. هۆبز بناغەی کۆمەڵگای سیاسی و دادپەروەری و ئەخلاقی لەسەربنەمای ئەم حەزە و ئەم مافە جێگیرکرد. بەم جۆرە لە تیۆری مافی سروشتی نوێدا ئەرکی دەوڵەت بە پارێزگاری کردن لە مافی سروشتی تاك لە پاراستنی زات لە قەڵەم درا نەك خستنەڕوو یان بەرەو پێش بردنی فەزیلەت. بەوەها تێڕوانینێکیش تاك لە بەرامبەر کۆمەڵگاداو ماف لە بەرامبەر ئەرکدا بە لەپێشتر دادەنرێت. لۆکیش بەسەرنجدانی متمانەدارترینی لێکدانەوەکان بە جیاوازییەکی کەم لە هەمان بنەماوە دەستیپێکرد.





کۆمەڵێکی تر لە تیۆرە سیاسییەکان مافی سروشتی و گرێبەستی دامەزراو لەسەربنەمای ئەو پەسەند ناکەن و لەبری ئەو لە دەروونناسی مرۆڤ و بنەڕەتی دەروونناسیی گەڕان بەدوای چێژ و دوورکەوتنەوە لە ئازار و ناخۆشییەوە دەستپێدەکەن. لەم بنەڕەتەی بیری سیاسیدا کۆمەڵگا لەسەر سوود و قازانج دامەزراوە نەك مافی سروشتی. دامەزرێنەرانی سوودگەرایی واتە هیۆم و بێنتهام و میل لەم دەروازیەوە دەستپێدەکەن و بنەڕەتێکی جیاواز لە بیری سیاسیدا بنیاتدەنێن. ئەوان ئەخلاق دەبەستنەوە بە دەروونناسی تاکەوە و دادپەروەری لە ژیانی سیاسیدا دەسڕنەوە. لە کۆتاییدا کۆمەڵەی سێیەمی تیۆرە سیاسییەکان نەمافی سروشتی و نە باشە و سوودی کەسی بەڵکو عەقڵ بەسەرچاوە و بنەڕەتی کۆمەڵگای سیاسی و رێکی سیاسی لەقەڵەمدەدەن. بەبڕوای ئەم کۆمەڵەی بیرمەندان چ عەقڵی کردەیی پەتی یان عەقڵی کۆمەڵایەتی و سەرئەنجام عەقڵی جۆری سەرچاوەی کۆمەڵگای سیاسی و ماف و دادپەروەرین. کانت و رۆسۆ و هیگڵیش سەر بەم بنەڕەتەی بیری سیاسین.

بەم جۆرە هەریەك لەم سێ بنەڕەتەی بیر جەختیان لەسەر چەند لایەنێکی رۆڵی دەوڵەت کردووەتەوە، لەو بنەڕەتەی بیردا کە سەرچاوەی دەوڵەت لەسەربنەمای مافی سروشتی تاك بنیات دەنێت لە پلەی یەکەمدا دەوڵەت دەزگایەکە بۆ پاراستنی ئاسایشی شوێنکەوتوان یان بەواتایەکی تر بەرگریکردن لە پاراستنی زاتی شوێنکەوتوان و ئەوەی کە پەیوەستە بەم مافەوە. لە کۆمەڵەی دووەمی تیۆرە سیاسییەکاندا کە باشە و سوودی تاك دەکاتە خاڵی دەستپێکردنی خۆی و دەوڵەت بە پارێزەری سوودی گشتی یان بە دەربڕینێکی وردتر زۆرترین سود و قازانجی زۆرترین ژمارە لەقەڵەمدەدات، لە هەنگاوی یەکەمدا دەوڵەت ئامێری گونجاندنی قازانجەکانە. لە کۆمەڵەی سێیەمی تیۆرە سیاسییەکاندا دەوڵەت رەنگدانەوەی ویستی گشتی و ویستی ئەقلانییە. لەم روانگەیەدا دەوڵەت ماشێن یاخود ئامێرێکی دەرەکی نییە کە تاکەکان بۆ بە ئەنجامگەیاندنی کارێکی سنووردار دروستیانکردبێت. بە بۆچوونی ئەم کۆمەڵەی بیرمەندان دەوڵەت لەناو ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی مرۆڤەکانەوە هەڵدەقوڵێت و لەسەربنەمای عەقڵی تاکەکەسی و کۆمەڵیی ئەوانە. لەرووی جۆری تێڕوانین بۆ تاك و کۆمەڵگا و بەشداری سیاسییەوە دەکرێت تیۆرەکانی سەرەوە بۆ دوو دەستەی سەرەکی دابەش بکرێن. دەستەیەك لە تیۆرەکان جۆرێك لە پەیوەست بوون و هاوجەوهەری[١٧] لەنێوان تاك و کۆمەڵگا یاخود بە

17- Identification.

واتایەکی تر تاك و دەوڵەت بەدیدەکەن. لە بەرامبەری ئەوانیشدا دەستەیەك لە تیۆرەکان رادەوەستن کە هیچ جۆرە هاوجەوهەریەك لە نێوان تاك و دەوڵەتدا بەدی ناکەن و دەوڵەت بە تەنها لایەنی کەمی پێویست یاخود تەنانەت خراپەی پێویست بۆ دابینکردنی ئەو مەبەستە لەقەڵەمدەدەن کە هەرچی کەمتر تاکەکان دەستدرێژی بکەنە سەر سنووری ئازادی یەکتر و تا ئەوجێیەی کە دەکرێت کەمتر رێگربن لە بەردەم رەنگدانەوەی ئازادی کەسێتی یەکتر. دەستەی یەکەم بڕوای بە کۆمەڵگەرایی و دەستەی دووەم بڕوای بەتاکگەرایی هەیە. لایەنگرانی کۆمەڵگەرایی لەو بڕوایەدان کە تاك لە دەرەوەی کۆمەڵگا هیچ شوناسێکی نییە و ئازادی تاکەکەسیش تەنها لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەتوانێت بەدی بێت، هەروەك چۆن کە تاك تەنها لە کۆمەڵگادا دەتوانێت جەوهەری خۆی بەدی بێنێت. ئەم روانگەیە کە رۆسۆ و هیگڵ لە تیۆرداڕێژە بەرجەستەکانین سەرئەنجام بە تیۆری ئۆرگانێکی دەوڵەت کۆتایی دێت لە کاتێکدا کە دەستەی دووەمی تیۆرەکان کە هۆبز و لۆك و بێنتهام و میل لە کەسە دیارەکانین بە تێڕوانینی ئامێریی دەوڵەت کۆتایی دێت.

ئێمە لەم کتێبەدا هەوڵمان داوە نیشانی بدەین کە تیۆری یەکەم واتە ئەو تیۆرەی کە ویستی گشتی بە جەوهەری دەوڵەت دادەنێت و لە بەرزترین رووی خۆیدا لەناودیکترینی ویستی عەقڵانی هیگڵدا رەنگدەداتەوە لە رووی بنەما و هەماهەنگی ناوەکی و گونجانی لۆژیکییەوە دەوڵەمەندترە. بەتایبەتی ئەوەی کە ئەم دیکترینە بە جۆرێك یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی فەلسەفەی هیگڵ بەرزترین رەگەزەکانی تیۆرەکانی پێشووی لە خۆیدا هەڵگرتووە. هیگڵ لەرووی ناوەرۆکەوە عەقڵانیەت بە شتێکی کۆمەڵایەتی و نێوان هۆشەکان لەقەڵەمدەدا و نیشانیدەدات کە تاك لە رێگەی بەشداری لە ژیانی کۆمەڵایەتییەوە دەگاتە بنەڕەتیترین رێسا عەقڵانییەکان. بەوەها دەربرینێك بۆ عەقڵانییەت ئەم بۆچوونەیش دێتە ئاراوە کە مرۆڤ دەتوانێت بەرەخنە و شیکردنەوەی پەیوەندییە نادروستەکانی ناو کۆمەڵگا لەسەربنەمای عەقڵی بە کۆمەڵ ئەو بارە پاشاگەرداناوییەی کە لە بەدواداگەڕانی قازانجی تاکەکەسییەوە سەرچاوە دەگرێت رێك بخات[١٨].

---

(١٨) ارنست کاسیرر، رۆسۆ، کانت، گۆتە، ترجمە حسن شمس آوری و کاظم فیروزمند، تهران، نشر مرکز، ١٣٧٤، ص١٩٩.



بەسەرنجدانی ئەوەی دەربارەی دابەشکردنی تیۆرە سیاسییەکانی دەوڵەتی مۆدێرن بۆ سێ بنەڕەت باسمان لێوەکرد ئەم کتێبەمان بۆ سێ بەش دابەشکردووە. لە بەشی یەکەمدا باس لە عەقڵانیەتی دامەزراو لەسەر ماف و لە بەشی دووەمدا عەقڵانییەتی دامەزراو لەسەر سوود و قازانج و لە بەشی سێیەمدا دەوڵەتی دامەزراو لەسەر عەقڵ کراوە. لەگەڵ ئەمەیشدا خراپ نییە لێرەدا ئاماژە بەوە بکەین کە چەقی باسی کتێبەکە واتە گەڕان و بەدواداچوونی بەشێك کە بیری سیاسی نوێ سەبارەت بە دەوڵەت لە ئاراستەکردنی عەقڵانی دەوڵەت لەلایەن هۆبزەوە تا دەوڵەتی عەقڵانیی تیۆرەکەی هیگڵ درێژەپێدەدات بەرزترە لەم جیاوازیە بنەڕەتیانە.

# بەشی یەكەم

## عەقلانییەتی دامەزراو لەسەر مافی سروشتی

هۆبز دەوڵەتی لە حەز و مافی سروشتی مرۆڤ لە پاراستنی خود هەڵهێنجا. بەم شێوەیە هێشتا بۆچوونەكەی ئەو نزیكییەكی هەیە لەگەڵ بۆچوونی رابردوداری كلاسیكی لە رۆژئاوا واتە دیكترینی مافی سروشتی. بەڵام لە هەمان كاتدا هۆبز دەربڕینێكی بۆ یاسای سروشتی و مافی سروشتی خستەروو كە بە وەرچەرخانێكی تەواو لە رەوتی بیری سیاسیی رۆژئاوادا لەقەڵەمدەدرێت. هۆبز یاسای سروشتیی بۆ یاسای هۆشیاری و ئاگایی و مافی سروشتیشی بۆ مافی پاراستنی خود گواستەوە. بەم جۆرە هۆبز حەزو مافی پاراستنی زات (بەو پێیەی كە پاشتر روونی دەكەینەوە)ی كردە بناغەی كۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاق و دادپەروەری. دیكترینەكانی یاسای سروشتی كلاسیك پشتی بە ئەركەكانی مرۆڤ دەبەست و ئەگەر مافەكانی ئەوی لەبەرچاو بگرتایە ئەوا لە ئەركەكانیەوە هەڵیدەهێنجا. هۆبز ئەم پەیوەندییەی پێچەوانە كردەوە و مافی كردە بناغە و ئەركەكانی لەوەوە وەرگرت، لە تیۆرەكەی هۆبزدا تەواوی مافەكانی كۆمەڵگای مەدەنی و فەرمانڕەوا لەبنەڕەتدا لەو مافانەوەیە كە لەسەرەتادا پەیوەستە بە تاكەوە. لۆكیش گەرچی چەند لایەنێكی مافە سروشتییە كلاسیكییەكانی قبووڵكرد بەڵام لە بنەڕەتدا بەهەمان شێوە بەرەو پێش چوو. ئەگەر هەركەسێك بەپێی سروشت مافی پاراستنی خودی خۆی هەبێت ئەوا بەناچاری بەرامبەر بە ئامرازە پێویستەكانی پاراستنی خۆیشی مافی هەیە. لە وەڵامی ئەو پرسیارەی كە چ كەسێك سەبارەت بە ئامرازە پێویستەكانی پاراستنی خود مافی قەزاوەتی هەیە بیری كلاسیكی وەڵام دەداتەوە كە هۆ[illegible]دان وەها مافێكیان هەیە. هەر بۆیەش رژێمی فەرمانڕەوایی رەهای هۆشمەند بە باشترین





رژێم لەقەڵەمدەدرێت. بەڵام هۆبز دەیوت كە بەشێوەیەكی سروشتی هەركەسەو خۆی باشترین دادوەری پاراستنی گیانی خۆیەتی. بەم پێیە لە كۆمەڵگای سیاسیدا رەزامەندی یان رێكەوتنی تاك لە پێشترە لە هۆش یان عەقڵی چالاك. فەرمانڕەوا بەهۆی گرێبەستەوە فەرمانڕەوایە نەك لەبەرئەوەی كە خاوەن هۆشە. لۆكیش لەم بارەیەوە هاوئاراستەی بۆچوونەكەی هۆبزە. لەم بەشەدا دەبینین كە چۆن عەقلانییەتی دەوڵەت پەیوەستە بە مافی سروشتی مرۆڤەكانەوە.

هۆبز دوابەدوای ئەمە لە بەرامبەر بیری كلاسیكیدا كە عەقلانییەتی بە هاووێنەبوون لەگەڵ سیستەمی عەقلانیی جیهاتی لە قەڵەم دەدا، مرۆڤی وەكو زاتێك كە دەتوانێت بیربكاتەوە و كار بە عەقڵ بكات و بڕیاری عەقلانی هەبێت و هەروەها رووبەرووی زنجیرەیەك كێشمەكێش و حەز و ئارەزووی سروشتییە پێناسە كرد. بەم شێوەیە هۆبز لە رەفتاری مرۆڤدا هەم بۆ عەقڵ و هەم بۆ حەزیش شوێنێك لەبەرچاو دەگرێت. پاش هۆبز زنجیرەیەك لەبیرە سیاسی و فەلسەفییەكان پێگەی حەز و ئارەزووەكانیان بەسەر پێگەی عەقڵدا سەرخست و بەشێكی گرنگتریان بە حەز و ئارەزووەكاندا لە رەفتار و ئەخلاقی مرۆڤدا و رێبازی سوودگەراییان دروستكرد.

هۆبز ویستی كە پابەندی و ئەركەكانی مرۆڤ لە ویستەوە وەربگرێت. بەڵام ویستێك كە هێشتا پەیوەندی هەبوو لەگەڵ یاسای سروشتیدا. ماوەیەكی زۆری پێ چوو تاوەكو كانت لەسەر ئەو بناغەیەی كە ئەو دایمەزراند بوو ویستی لە هەموو پشت بەستنێك بە سروشت جیاكردەوە و خودرێسایی ویستی عەقلانیی دامەزراند.

**پاژی یەکەم:**

## دەوڵەت وەکو خواستی ویستی ڕەها

لەم پاژەدا سێ بابەبەتی سەرەکیمان خستوەتە بەرباس. یەکەم ئەوەی کە چۆن لە بیری سیاسی نوێدا ویستی مرۆڤ (چ ویستی تاکەکەسی یان ویستی گشتی) وەکو سەرچاوە و دامەزرێنەری دەوڵەت و کۆمەڵگای سیاسی پێگەی سەرەکیی لە فەلسەفەی سیاسیدا بۆخۆی تەرخانکرد. دووەم ئەوەی کە بۆچی بەم پێیە دەوڵەت بە بەرهەمی دروستکردی مرۆڤ لە قەڵەمدرا. سێیەم ئەوەی کە چۆن تۆماس هۆبز لەسەر ئەم بنەمایە تیۆرێکی سەبارەت بە ئەرکی سیاسی خستەروو کە بووە بناغەی تیۆرەکانی بیرمەندانی پاشتر و بزوێنەری کامڵبوونی بیری سیاسی نوێ. هەروەها هەوڵدراوە نیشانبدرێت کە چۆن لە فەلسەفەی سیاسی هۆبزدا بەش و ڕەگەزەکانی زۆرێك لە فەلسەفە تیۆرە سیاسییەکانی پاشتر کۆبوەتەوە و چۆن لێکدانەوەی جیاوازی فەلسەفەکەی ئەو بووەتە مایەی بەش بەش بوون و کامڵبوونی بیری سیاسی لە ماوەی قۆناغەکانی پاشتردا.

لەو بەشە سەرەکییانەی تیۆرەکەی هۆبز کە بووە سەرچاوەی ئیلهامی بیرمەندانی پاشتر و ناوەندی بیری سیاسی نوێ دەکرێت باس لە بنەڕەتی ویست و ڕێکەوتن و پەیمانی کۆمەلایەتی لە دامەزراندنی دەوڵەت، و بنیاتنانی ئەرکی ئەخلاقی لەسەر دامەزراندنی سیاسی بکرێت. گرنگترین بنەڕەتێك کە هۆبز لە تیۆرە سیاسییەکەی خۆیدا گرنگی پێداوە لە تیۆرە سیاسییەکانی بیرمەندانی پاشتریشدا بە چەندین شێوەی جۆراوجۆر برەوی پێدرا بریتی بوو لە ویستی مرۆڤ لە دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسیدا. چەمکی ویست یەکێکە لەو چەمکانەی کە لە بۆچوونی ڕۆسۆ و کانت و هیگلدا ڕەنگدانەوەی نوێی وەرگرت و بووە ناوەندی زنجیرەیەك تیۆر و دیکترینی فەلسەفی و سیاسی. چەمکگەلێکی وەکو ((ویستی ئازاد)) و ((ویستی عەقلانی)) بوونە یەکێك لە چەمکە سەرەکییەکانی فەلسەفە و تیۆرە سیاسییەکانی ماوەی قۆناغەکانی پاشتری کامڵبوونی خۆیان.






### ویستی مرۆڤ وەکو بنەڕەتی دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی

بیری سیاسی نوێ خاڵێکی لێکترازانی گرنگی هەیە لەگەڵ بیری کلاسیکی یاخود بیری پێش نوێ و ئەو خاڵەش بریتییە لەوەی کە لە بیری سیاسی نوێدا دەوڵەت بەدامەزراوەیەکی مرۆیی و پەیوەست بەویستی مرۆیی لە قەڵەم دەدرێت. لەبیری کلاسیکیدا بەشێوەیەکی گشتی دەوڵەت یان بەکارێکی سروشتی و ئەنجامی سروشتی لەقەڵەم دەدرا یاخود دەدرایە پاڵ ویستی خودایی[1]. لەبیری سیاسی نوێدا کە بۆ یەکەمین جار بەشێوەی سیستەمێکی تیۆری ڕێکوپێك لە لایەن هۆبزەوە بنیاتنرا دەوڵەت وەکو ڕێکییەك هەڵسەنگێندراو شیکرایەوە کە مرۆڤەکان بۆ وەدیهێنانی پێداویستییەکانیان دروستیان کردووە. بیری نوێ کە ماکیاڤیلی بناغەکەی دامەزراند و هۆبز بەرەو لوتکە سەری خست بەرامبەر بەبیری کلاسیکی کە دەکرێت بە نەریتی عەقڵی- سروشتیش ناوببرێت ڕادەوەستا. هۆبز ئەندازیاری ئەم پرۆژە مەزنە لەبری ئەوەی بەشێوەی باو باسەکەی خۆی لە یاساوە دەستپێبکات لە ویستەوە دەستییپێکرد و ئەمەبووە سەرچاوەی وەرچەرخانێکی گەورە لە تەواوی بیری سیاسی نوێدا تا ئەو جێیەی کە سەرئەنجام بە تیۆری ((ویستی عەقلانی))ی هیگڵ کۆتایی هات. هۆبز بەشێوەیەکی بنەڕەتی فەلسەفەی سیاسی خۆی لەسەر دوو بابەتی ویست و دەستکرد بنیاتنا. ئەم بنەڕەتەی کردە بنەمای تیۆری سیاسی خۆی کە مرۆڤ خۆی دەسەلاتی مەدەنی دروستدەکات و پاشان پەیڕەوی لێدەکات. بەر لە دروستکردنی دەسەلاتی مەدەنی ویستی مرۆڤ ویستی ڕەهایە. ڕەهایە بەو واتایەی کە بە هیچ پێوەرو ڕێساییەك سنووردار نابێت. مرۆڤ لە باری سروشتیدا پەیڕەوی هیچ ئەرکێك نییە. نەبوونی ئەرك لەرووویەکەوە هەمان مافی سروشتییە و مافی سروشتیش مافی ڕەهایە چونکە لە سروشتی ویستەوە ئەنجامگیری دەکرێت نەك لە یاسایەکی سەرووتر. کۆمەڵگای مەدەنی بارێکی دروستکراوە. ئەفرێنراوی ئازادی ویستە ڕەهاکانە. ئەم کۆمەڵگایە بە گواستنەوەی مافی تاك بۆ فەرمانڕەوا لە چوارچێوەی گرێبەستێکی کۆمەلایەتیدا دروستدەبێت. بەم گرێبەستە دەسەلاتێکی فەرمانڕەوایی دروستدەکرێت کە ویستی ئەو دەبێتە شوێنگرەوەی ویستی دروستکەرەکانی[2].

---

[1] هەڵبەتە لەم بوارەدا ریزپەرێکیش هەبوو کە دەگەڕایەوە بۆ بۆچوونی سۆفستاییەکان. سۆفستاییەکان دەوڵەتیان بەدروستکراوی زۆرداران بۆ فەرمانڕەوایی کردن بەسەر ستەمکێشەکانەوە لەقەڵەمدەدا.

2- Thomas Hobbes, Leviathen, ed. Michael Oakeshott, Oxford, Black well n. d. p.91.

ئەم بیرە واتە پێگەی ویستی مرۆڤ لە پێکهێنانی دەسەلاٚتی فەرمانڕەواییدا گۆڕا بۆ فەلسەفەیەکی زالّ لە ئەوروپادا و بیری کلاسیکی کەلایەنی سەرەکیی ئەو بریتی بوو لە بیری عەقلاٚنی — سروشتی وەلاوەنا. هۆبزی هەلّگیرسێنەری بیری نویٚ بە نۆرەی خۆی سوودی لە نەریتی نۆمینالیزمی سکولاستیك[٣] وەرگرت. نۆمینالیستەکانی سەدەی سیازدە و چواردە کەسانێك بوون کە حەقیقەتی شتەکانیان لە تاك بوونیاندا دەبینییەوە. هەروەها ئەم بابەتەیشان خستەروو کە ویست لە پێشترە لە عەقلّ. ئەم بیرە بەرامبەر بە فەلسەفەی باوی سەدەکانی ناوەڕاست بوو کە دوو ڕەگەزی عەقلاٚنی و جەوهەری تاکی لە کەسێتی مرۆڤدا دیاری کردبوو. لە قۆناغەکانی پاشتردا لایەنی عەقلاٚنی بەدیکترینەکەی دیکارت کۆتایی هات ئەو دیکترینەی کە تیایدا ناسین و خود ئاگایی وەکو زەمینەی سەرەکی کەسێتی مرۆڤ بە لەپێشتر دیاری کران. ئەو دیکترینەی کە لەکەسێتی مرۆڤدا ویستی بە لەپێشتر دادەنا بەرامبەر بەدیکترینەکەی دیکارت رادەوەستا[٤]. لەم دیکترینەدا دەوترا کە کەس بوونەوەرێکی جیاو دابڕاو و خود سەنتەرە و شیاوی تێگەیشتن نییە. نومینالیستەکانی کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست جەختیان لەسەر ئەو بابەتە دەکردەوە کە مرۆڤ وەکو بونەوەرێکی خاوەن ویست و بیرکردنەوە بۆخۆی خاوەن یەکێتی ناوەکییەو پەیوەندیشی لەگەلّ کەسەکانی تردا تەنها پەیوەندییەکی دەرەکییە. ڕەنگە مرۆڤەکان لەگەلّ یەکتردا کۆببنەوە و ببنە شوێنگرەوە، یاخود نوێنەری یەکتر، بەلاٚم هەرگیز گشتێکی یەکپارچەی وا دورستناکەن کە تیایدا تاکێتییەکەیان لاواز ببێت. تەنانەت عەقلّی تاکیش لە هەموو ڕوویەکەوە تاکە. کاتێك کە کەسێك قەناعەت پێدێنیت بە واتای ئەوە نییە کە لەگەلّیدا گەیشتویتە تێگەیشتنێکی هاوبەش بەلّکو عەقلّی خۆتت کردووەتە شوێنگرەوەی عەقلّی ئەو. لە کۆمەلّگای سیاسیشدا ئەم تاکێتییە لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە. کۆمەلّگا تەنها بەکرداری تاکەکەسی ویستەکان دروستدەبێت. واتای ئەم وتەیە ئەوەیە کە ویستی تاکەکان ئاراستەی یەکترنین بەلّکو ئاراستەی بابەتی ویستەکان واتە گرێبەستن. جەوهەری گرێبەست بۆخۆی ویستی هاوبەش نییە بەلّکو بابەتی هاوبەشی ویستەکانە. گرنگیدان بەم خالّە گرنگییەکی زۆری هەیە بۆ تێگەیشتنی تیۆرەکەی هۆبز بەتایبەتی دیارخەری فەرمانڕەوا لە روانگەی ئەوەوە. ئەوکارەی کە فەرمانڕەوا ئەنجامیدەدات وەکو کاری تاکەکان و هەلّبژاردنی ئەو وەکو هەلّبژاردنی تاکەکان نییە. کاری ئەوکاری خۆی و

3- Scholastic nominalism.

4- Michael Oakeshott, introduction in: Thomas hobbes, Leviathan, p. III.





هەلّبژاردنی ئەو هەلّبژاردنی خۆیەتی. ئەم تێڕوانینەی هۆبز سەرەڕای هەبوونی چەند ڕوویەکی هاوبەش تیۆرەکەی ئەو لە تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆ و هیگلّ جیادەکاتەوە[٥].

هیگلّ کارەکەی هۆبز لە دانانی ویست وەکو بناغەی ڕێکیی سیاسی ستایش دەکات، بەلاٚم لەو جێیەوەی کە هۆبز بە بۆچوونی ئەو (هیگلّ) ویستی بۆ حەز بچوك کردووەتەوە ڕەخنەی لێدەگرێت. هیگلّ دەلّێت ویست ناچارە مەبەستەکانی خۆی بەشێوەیەکی عەقلاٚنی هەلّبژێرێت. هیگلّ لە ویستی ڕەهاوە بەرەو چەمکی ((ویستی عەقلاٚنی)) دەچێت و دەلّێت گەرچی ویست لە فۆرمدا بیٚ کۆتاییە بەلاٚم لە ناوەڕۆکدا کۆتاییدارە. کاتێك کە تاك بەپێی چەمکە گشتییەکانی ئەخلاق کاردەکات ویستەکەی ((ویستی عەقلاٚنی))یە[٦].

## دەولّەت وەکو دروستکراوی مرۆڤ

گەرچی دەکرێت باسی عەقلاٚنیەتی دەولّەت لە هەموو ڕێچکە فەلسەفییەکاندا بخرێتەڕوو بەلاٚم لە بنەڕەتدا بە قبوولّکردنی بیری دەستکردبوونی دەولّەت بابەتی عەقلاٚنیەتی دەولّەت بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە دەکەوێتەڕوو. بابەتی عەقلاٚنیەتی دەولّەت پەیوەندییەکی لێکنەپچڕاوی هەیە لەگەلّ دیکترینی دەستکردبوونی دەولّەتدا. هەلّبەتە ئەو بۆچوونەی کە پێیوایە دەولّەت ئامادەسازییەکی مرۆییە سەرەتا بەشێوەیەکی ناتەواو لەلایەن سۆفستاییەکان و ئیپیکۆرییەکان خرابوویەڕوو بەلاٚم بەر لە هۆبز ئەم بۆچوونە زۆر پەرەی نەسەندبوو. بیری زالّی بەر لە سەدەی حەڤدەیەم بریتی بوو لە روانگەی عەقلّیی- سروشتی کە دەولّەتی بە کارێکی سروشتی دادەنا نەك کارێکی دەستکرد، بەلاٚم لە سەدەی حەڤدەیەمدا بوو کە روانگەی کلاسیکی بە توندی کەوتە بەر گومانەوە. ڕاپەڕینی مرۆڤگەرایی و سەرهەلّدانی زانستی نویٚ رۆلّێکی گرنگیان هەبوو لەم گۆڕانکارییەدا. چیدی بیرمەندانی سەدەی حەڤدە بە پێچەوانەی نەریتی فەلسەفەی یۆنانی جیهانیان بە ئاوێتەی ئۆرگانیزمە زیندووەکان نەدەزانی. ئەوکات سروشت بە جۆرێك ئامێر لەقەلّەمدەدرا. تەنانەت زۆرێك مرۆڤیشیان بە جۆرێك ئامێر دادەنا[٧]. ئەم تێڕوانینە نوێیە بۆ سروشت و بۆ عەقلّ بووە سەرچاوەی چەندین تیۆری نویٚ دەربارەی دەولّەت وەك ئەنجامی ویست و دروستکراوی مرۆڤ. هەر بەو جۆرەی کە سروشت وەکو میکانیزمێك وێناکرا، دەولّەتیش بە میکانیزمێك دانرا کە مرۆڤ بە ویستی خۆی

5-Ian Tregenza "the life of Hobbes in the writing of Michael Oakeshott" History of political Thought, Vol. XIII, No3, autum 1997, pp. 530-556.

6- G. W. F. Hegel, philosophy of Right, trans. T. M. Knox, Oxford, 1952.

7- C. I. Wayper, op. cit. p43.

دروستیکردووە. هەڵبەتە لەرووی چۆنیەتی لێکدانەوەی واتای ویستەوە (حەز و ئارەزوو[8] یان ویستی عەقڵانی) سیستەمگەلێکی هزریی جیاواز سەریانهەڵدا، بەڵام ئەوەی کە ویستی مرۆڤ سەرچاوەی سیستەمی کاروبارەکانە ببووە چەقی تیۆری زۆربەی بیرمەندان. جگە لەمە بیرمەندانی نوێ نەك تەنها مرۆڤیان بەدروستکەری دەوڵەت دادەنا بەڵکو جەختیان لەسەر ئەو خاڵەش کردەوە کە مرۆڤ ئەوی لەسەربنەمای نموونە هەڵگرتنەوە لە شوێنێك یاخود پشتبەستن بە عەقڵێك لە دەرەوەی عەقڵی خۆی دروستنەکردووە.

هۆبز ویستی کە بەرگری لە مەبەستی دەوڵەتی عەقڵانی بکات و نیشانیبدات کە دەسەڵات و ملکەچی ئاراستە کردنی عەقڵانیی هەیە. جگە لەمە سووربوو لەسەرئەوەی کە نیشانیبدات کە حکومەت دامەزراوەیەکی خودایی و دەرەوەی سنووری پشکنین نییە و مرۆڤ ئەرکدار نییە بەوەی کە بەشێوەیەکی کاردانەوەیی بەرگری لە فەرمانڕەوایی بکات، بەڵکو دەبێت لەسەربنەمای عەقڵ قبووڵی بکات و بە چالاکی پەیڕەوی لێبکات[9].

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم تێڕوانینە و گرنگیدان بەو روانگەیەی کە مرۆڤ بە فەرمانڕەوای چارەنوسی خۆی دادەنێت. ئەم پرسیارە هاتە ئاراوە کە مرۆڤەکان چۆن و لەسەر چ بنەمایەك دەوڵەتی جێ مەبەستی خۆیان دروستدەکەن. ئەم پرسیارە پرسیارێکی بنەڕەتی بوو. وەڵامی ئەو بیرمەندانی کە بناغەکانی بیری دەوڵەتی نوێیان دامەزراند ئەوەبوو کە دەبێت دەوڵەت ئەنجامی رێککەوتنی ئەو تاکانە بێت کە دروستیدەکەن. بەوەها رێکەوتنێك رێکی و یاسا بەرقەرار دەبێت و پاشاگەردانی کۆتایی پێدێت. هەڵبەتە پرسی ئەوەی کە وەها دەوڵەتێك بەشێوەیەکی دیار دەبێت چ تایبەتمەندیگەلێکی هەبێت و دەبێت چوارچێوەی دەسەڵاتی[10] تاکوێ بێت بۆخۆی باسێکی ترەو پاشتر دێینەسەری.

خراپ نییە بەر لە باسکردنی هەندێك لە رەگەزە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی هۆبز کە بناغەی فەلسەفەی سیاسی نوێ و چەقی کامڵبوونی (لەوانە) لە تیۆرەکانی فەیلەسووفەکانی پاشتردا دروست کرد چەند ئاماژەیەك بە پایەکانی سیستەمی هزریی هۆبز بکەین. دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە هەیکەلی تیۆرەکەی هۆبز لە چڕترین خستنەروودا کورت بکەینەوە:

8- Appetite.
9- Thomas cook's introcluction to: John Lock, Two Treatises of Government, New york, London, collir Macmillan, 1947.
10- Authority.



١- ئەوەی کە مرۆڤ بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی پاڵ پێوەدەنێت بریتییە لە پارێزگاریکردن لە حەز و مافی سروشتیی پاراستنی خود.
٢- پاراستنی خود کە مافی سروشتی هەموو کەسێکە تەنها بە پێکهێنانی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی دێتەدی.
٣- بەر لە پێکهێنانی دەوڵەت (و کۆمەڵگای مەدەنی) ((باری سروشتی)) زاڵە کە تیایدا مرۆڤەکان لە گیان و ماڵی خۆیان دڵنیانین. ئەوان کە بەردەوام لە بەدگومانیدا دەژین بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئاسایشی خۆیان هەموودەم لە هەوڵی زیادکردنی دەسەڵاتی خۆیانن و رکەبەری لەسەر دەسەڵات کارێکی بێ کۆتاییە.
٤- ترس لە مەرگی ناسروشتی تاکەکان پاڵ پێوەدەنێت تاوەکو بچنە ناو گرێبەستێکی کۆمەڵایەتییەوە و کۆمەڵگای مەدەنی (دەوڵەت) پێکبهێنن.
٥- لەم گرێبەستەدا هەموو کەسێك لەگەڵ تەواوی تاکەکانی تر پەیمانێك دەبەستێت کە تەواوی مافی سروشتیی سەبارەت بە قەزاوەتکردن دەربارەی پاراستنی خود بەتاك یاخود کۆمەڵێکی پێکهاتوو لە سێ تاك بسپێرێت.
٦- بەم شێوەیە لڤیاتانێك (دەوڵەتی دەسەڵاتدار) لە دایك دەبێت.

تیۆرەکەی هۆبز کە بەو شێوەیەی سەرەوە خرایەروو هەم چەند چەمکێکی سەرەکی نوێی لە خۆیدا هەڵگرتووە و هەم پرسیارگەلێك دەورووژێنێت کە چۆنیەتی وەڵامدانەوەیان چ لە تێگەیشتنی فەلسەفەی سیاسی هۆبز و چ لە رێڕەوی پاشتری بیری سیاسی گرنگییەکی زۆری هەیە. لە باسەکانی پاشتردا لەم بابەت و پرسیارانە دەدوێین.

## عەقڵانیەتی ملکەچی و ئەرکی سیاسی

یەکێك لە پرسە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی هەر لە سەردەمی ئەفلاتۆنەوە تا سەردەمی هاوچەرخ بریتی بووە لە پەیوەندی نێوان ماف و دەسەڵاتی سیاسی. ئەو پرسەی کە بۆچی دەبێت ملکەچی دەوڵەت بین یەکێکە لە پرسە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی. لە سەدەی حەڤدەیەمدا بابەتی پەیوەندی نێوان ماف و دەسەڵات و عەقڵانیەتی ملکەچی بە تەواوی بەرفراوانی خۆیەوە خرایەروو. تیۆری ئەرکی هۆبز و بنەما و گریمانەکانی هۆبز دەستپێکی بیری سیاسی نوێ بوو لە جدیترین روخساریدا. کەواتە بۆ باسکردن لە بیری نوێ لە





جدیترین روخساریدا دەبێت لـە تیـۆری ئـەرکی هـۆبز یـان بەشـێوەیەکی گـشتی لـە بنـەما و گریمانەکانی هۆبزەوە دەستپێبکەین.

تیۆری ئەرکی هۆبز هێنـدەی کـە بـاس وروژێنـەرترین بەشـی فەلـسەفەی سیاسـیی ئـەوە بەهەمان ئاست بنەڕەتی فەلسەفەی سیاسی خۆی و سەرچاوەی زۆرێك لە تیـۆرە سیاسـییەکانی پاشتریش بووە. تیۆرەکانی هیۆم و لایەنگرانی سوودگەرایی لەلایەك و کانت و رۆسۆ لەلایـەکی ترەوە هەریەك بە چەند تێکەڵکردنی جیاوازی وەرگرتن و دانەوە ئیلهامیان لـە تیـۆری ئـەرکی هۆبزەوە وەرگرتووە. ئەم تیۆرە تا بە ئەمڕۆش بە چەند لێکدانەوەیەکی نوێ بووەتـە سەرچـاوەی ئیلهامی تیۆرداڕێژانی سیاسی. لە نوێترین لێکدانەوەی تیۆری ئـەرکی هـۆبز (کـە لـە ڕێـڕەوی خۆیدا بە فەرمانڕەوایی بـێ سـنووری فەرمانڕەوایـەکی دەسـەڵاتدار کۆتـایی دێـت)دا جۆرێـك بنەمای پلۆرالیزمی سیاسی بەرچاو دەکەوێت[١١].

لەم باسەدا سەرەڕای تێڕوانینێکی ئەو لێکدانەوە جیاوازانەی کە بـۆ تیـۆری ئـەرکی هـۆبز خراونەتـەڕوو ئامـاژە بەلایەنـە جۆراوجۆرەکـان و ئـەو خـاڵی پێوەندانـەی کـە لەگـەڵ تیـۆرە سیاسییەکانی بیرمەندە گەورەکانی پاشتردا هەیبووە دەکەین، بەتایبەتی لەو خاڵە دەدوێـین کـە چۆن بنەماو گریمانە سەرەکییەکانی هۆبز توانیویانە هەم ببنە سەرچاوەی ئیلـهام و لـە هـەمان کاتیشدا سەرچاوەی پەراگەندەبوونی تیۆرداڕێژە گەورەکانی پاشتر بێت.

تیۆری ئەرکی هۆبز مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتەدا دەکات کە ئەرك چییە، چۆن دروستدەبێت و بۆچـی و تـا چ ئاسـتێك دەبێـت پـەیڕەوی لـە فـەرمانڕەوایان بکرێـت و چ کەسـانێك خـاوەن مەشرووعیەتی سیاسین. بەواتایەکی تر لێرەدا نـاوەڕۆکی فـەرمانڕەوایی و چـۆنیەتی دەسـەڵات واتە چەقی فەلسەفەی سیاسی هۆبز باسی لێوە دەکرێـت. سـەبارەت بـەوەی کـە لـە روانگـەی هۆبزەوە پێوەری مەشروعیەتی دەسەڵات چییە و دەسەڵاتی مەشـرووع چـۆن لـە دەسـەڵاتی نـا مەشرووع جیادەکرێتەوە جیاوازی بۆچون هەیە. تیۆری ئەرکی هۆبز بەو شێوەیەی کە لە کتێبـی هاوڵاتی و لڤیاتاندا هاتووە شوێنی گرنگترین بۆچوونە جیاوازەکانـە. ئـەم بۆچـوونە جیاوازانـە بەدەوری دوو پرسدا دەسووڕێنەوە کە بەم شێوەیەی خوارەوەیە: ١- ئایـا تیـۆری ئـەرکی هـۆبز

11- See: Richard Tuck "rights and pluralism" in James Tylly (ed), philosophy in an Age of pluralism Cambridge 1994, also: Andrew Lister scepticism and Pluralism Thomas Hobbes's political thought, history of political Thought, Vol XIXNOI, spring 1998, pp.35-6.





تیۆرێکە دەربارەی هۆشیاری و دووربینی و رووەو هۆشیاری و دوربینی[١٢]. ٢- یاخود تیۆرێکە دەربارەی ئەخلاق و گریمانەناسی ئەخلاق. بەواتایەکی تـر ئایـا ئـەو ئەرکـەی کـە هـۆبز باسـی لێوەدەکات لەسەربنەمای سوودی عەقلانیی کەسییە یان لەسـەربنەڕەتی ئـەخلاق؟ بـە هـەمان شێوە ئەم پرسیارە کە ماتریالیزمی هۆبز تا چ ئاستێك بەشدارە لە تێگەیشتن و روونکردنـەوەی ئەو بـۆ ئـەرك؟ لڤیاتـان بـە باسـکردن لـە فیـسیۆیۆلۆژییەوە دەسـتپێدەکات و پاشـان بـەرەو دەروونناسی دەچێت و لەوێوەوە بەرەو سیاسەت هەنگاو دەنێت. بنەڕەتی جێیباسی فەلـسەفەی هۆبز ئەوەیە کە هەرچی هەیە مادە لەباری بزاوتندایە. پرسیار لەوەدایە کە ئەم تێڕوانینە تـا چ ئاستێك کاری کردووەتە سەر تیۆری ئەرکی ناوبراو؟

تیـۆری ئـەرکی هـۆبز لـەماوەی چـل سـاڵی رابـردوودا سـەرنجی گـەورەترین لێکۆڵـەرە سیاسییەکانی بەلای خۆیدا راکێشاوە. لەریزی ئـەو لێکۆڵەرانـەیش دەکرێـت بـاس لـە هـاوارد وارێند[١٣] و ئێرنـست کاسـیرر و ئـەی. ئـی. تـایلۆر[١٤] و میخائیـل ئۆکـشات و سـی. بـی. ماکفێرسۆن و لیو ستراوش بکەین. هەریەك لەم لێکۆڵەرانە لێکدانەوەیەکی تایبەتیان هەیە بـۆ تیۆری ئەرکی هۆبز کە ئێمە بە کورتی باسیان لێوەدەکـەین و ئـەوکات دەڵـێین کـە لەراسـتیدا دەکرێت هەردوو پرسی هۆشیاری و ئەرکی ئەخلاقی بەیەکەوە لە تیۆرەکەی هـۆبزدا کۆببنـەوە. بەڵام ئەوەی کە ئەم لێکدانەوانە سەرنج راکێش دەکات ئەوەیـە کـە هەریـەك لـەوان هـۆبز لـە یەکێك لەو بیرمەندە مەزنە سیاسییانەی کە لەم کتێبەدا باسیان لێوەدەکەین نزیـك دەکاتـەوە. بۆ نموونـە لێکدانـەوەی وارێنـد و تـایلۆر هـۆبز لـە کانـت نزیـك دەکاتـەوە و خوێندنەوەکـەی ئۆکشات[١٥] بەرەولای رۆسۆ و لێکدانەوەکەی کاسیرر بەرەو هیـۆم و لایـەنگرانی سـوودگەرایی نزیکی دەکەنەوە. بە بۆچوونی ئێمە تیۆرەکەی هـۆبز چـەند روویـەکی هاوبەشـی هەیـە لەگـەڵ هەریەك لەمانەدا.

دەبێت بۆ باسکردن لە تیۆری ئەرکی هـۆبز لـە بنـەما و گریمانـەکانی فەلـسەفەی سیاسـی ناوبراوەوە دەست پێبکەین. هۆبز لە هاوڵاتی و لڤیاتاندا جۆرێك باری سروشتی وێنەدەکێـشێت

12- Prudential.

13- Haward Warrend, The Political Philosophy of Hobbes: His Theory of Obligation, Oxford, Clarendon press 1957.

14- A. E. Taylor, The ethical doctrince of Hobbes, Philosophy, XIII 52, October 1938, pp. 406-426.

15- Michael Oakeshott, moral life in writing of Thomas Hobbes, in Rationalism in politics and other Essays, New York basic book 1962.

کە تیایدا دەسەلاتێکی هاوبەش بەسەر تاکەکانەوە نییە و تیایدا بەهۆی رکەبەری لەسەر سەرچاوە دەگمەنەکان و یەکسانی تواناکان (بێ توانایی کەسێك بە بەتوانایی عەقڵی ئەو کەسە پڕ دەبێتەوە) شەڕی هەمووان لە دژی یەکتر لە ئارادایە. بەڵام مافی سروشت مرۆڤ پاڵ پێوەدەنێت کە باری سروشتی بەجێ بێڵێ و بچێتە ژێر دەسەلاتی هاوبەش یان دەسەلاتی یەك فەرمانڕەواو لە سایەی کۆمەڵگایەکی سیاسیدا جێگیر بێت. کەواتە هەموو کەسێك لەگەڵ ئەوانی تردا پەیمان دەبەستێت کە بەشێك لە مافی حکوومەت کردن بەسەرخۆیەوە بسپێرێت بە فەرمانڕەوایەك. لە ئەنجامی ئەم پەیمانەدا ئەو کەسەی کە لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەژی دەبێت لە ئەرکدا تا ئەوکاتەی کە فەرمانڕەوا دەسەلات و سەقامگیری لە دەستدایە پەیڕەویی لێ بکات. کەواتە بابەتی پەیمانی سیاسی ناوەڕۆك و سەرچاوەی ئەرکی سیاسی روون دەکاتەوە[١٦].

بەڵام پرسەکە لەسەر یاسای سروشتە و ئەوەی کە ئایا یاسای سروشتی حوکمی عەقڵە یان فەرمانی خودا و ئەگەر حوکمی عەقڵە چۆن لەگەڵ پێناسەکەی هۆبز بۆ یاسا دەگونجێت و ئەگەر فەرمانی خودایە دەکرێت چ بەڵگەیەکی لە بەرهەمەکانی هۆبزدا بۆ بدۆزرێتەوە. شیاوی باسە کە سەبارەت بە یاسای سروشتی تێڕوانینگەلێکی جیاواز هەبوو. کۆنترین تێگەیشتن ئەوە بوو کە یاسای سروشتی یاسایەکی بالایەکە لە سەرووی یاسا تایبەتی و جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگا جیاوازەکانەوەیە و پێوەری دادپەروەری و دامەزراوە سیاسییەکانە.

کەواتە ئەم پرسیارە دروستدەبوو کە بنەمای گشتی بوونی یاسای سروشتی چییە. یەکێك لە وەلامەکان ئەوەبوو کە عەقڵ بنەمای یاسای سروشتییە. وەلامێکی تر ئەوەبوو کە یاسای سروشتی فەرمانی خودایە. بەڵام هۆبز بەرامبەر بەم بۆچوونە راوەستا.

پرسێکی تر بریتییە لە پێکهاتەی بەڵگەهێنانەوەی هۆبز. هەروەك ئاماژەی پێکرا لەم بارەیەوە دەکرێت دوو روانگەی گشتی لێك جیابکەینەوە. لە روانگەی یەکەمدا دەوترێت کە پەیوەندییەکی لۆژیکی لە نێوان تیۆری فیسیۆلۆژی و دەروونناسی و سیاسی هۆبزدا هەیە. بەڵام لە روانگەی دووەمدا وەها باسدەکرێت کە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان تیۆری سیاسی و تیۆری ئەرکی هۆبز لەگەڵ تیۆرەکانی دیکەی ناوبراو سەبارەت بە فیسیۆلۆژی و دەروونناسی نییە و لێرەدا لێك پچڕانێکی مەعریفە ناسانە رویداوە. لایەنگرانی روانگەی یەکەم پابەندیی توندی هۆبز بە زانست و رەوتی باوی سەردەمی خۆی کە بە توندی پابەندی شیکردنەوە زانستییەکان

١6- Jock Lively and Andrew Reeve, op. cit. p. II.



بە بەڵگەی پەیوەندی نێوان فەلسەفە و فەلسەفەی گشتی ناوبراو دادەنێن. لەم روانگەیەدا دەوترێت کە تیۆرەکەی هۆبز تیۆرێکە دەربارەی هۆشیاری، یاخود ورووژاندنی دەروونناسانە و ناوەڕۆکێکی ئەخلاقیی روونی نییە. هۆبز بنەڕەتی پیشکێنەرانەی زانستیی کە بەر لە ئەو لەسەردەمی ئەودا هەبوو گواستەوە بۆ شێوەی کرداری مرۆڤ.

پرۆفیسۆر ماکفێرسۆن[١٧] کە لە ریزی ئەم دەستەیەی بیرمەندانە بەردەوامییەکی لۆژیکی لە نێوان فیسیۆلۆژی و دەرونناسی هۆبز و تێگەیشتنی ئەو بۆ ماف و پابەندییەکانی مرۆڤ دەبینێت. ئەم تێگەیشتنە بۆ تیۆرەکانی هۆبز سەرەتا بە نووسراوەکانی ریچارد پیتێرس لە کۆڕە زانستییەکاندا خرایەڕوو[١٨]. ئەگەر ئەم بۆچوونە قبوولْ بکەین ئەوکات دەبێت بڵێین کە ئەرکی سیاسیی نێو تیۆرەکەی هۆبز لە پێش گریمانە نیمچە ئەزموونییەکانی[١٩] ناوبراو لە بارەی سروشتی مرۆڤەوە بەدەستدێت. لە روانگەی دووەمدا دەوترێت کە پێکهاتەی بەڵگەهێنانەوەی هۆبز زیاتر لەگەڵ لۆژیکی سیاسیدا لە پەیوەندیدایە. لەم بەڵگەهێنانەوەیەدا گرێبەستی کۆمەلایەتی ئەڵقەی پێکەوە بەستنی نێوان باری سروشتی و باری مەدەنی یاخود کۆمەڵگای سیاسییە. فەرمانڕەوای سیاسی بە گرێبەست دێتەبوون. یاسای سروشتی پێش زەمینەیەك بۆ پەیوەندیکردنی تاکەکان بە گرێبەستی کۆمەلایەتییەوە. پرسیاری گرنگی پەیوەست بەم روانگەیە ئەوەیە کە بۆ دۆزینەوەی بناغەی ئەرکی سیاسی دەبێت تا کوێ بگەڕێینەوە دواوە؟ ئایا ئەرکی ناو کۆمەڵگای سیاسی ئەرکێکی نوێیە کە بە فەرمانڕەوا یان گرێبەستی کۆمەلایەتی یاخود هەردووکیان پشت ئەستوورە و یان ئەوەی کە فۆرمێکی تایبەتی ئەرکەکە لە پەنای یاسای سروشتیدا بوونی هەبووە؟.

لێرەدا رووبەرووی دووپرس دەبینەوە. پرسی یەکەم بریتییە لە پێناسەی یاسای سروشتی و بەراوردکردنی لەگەڵ پێناسەکەی هۆبز بۆ یاسا. هۆبز یاسا بە فەرمانی کەسێك کە مافی دەرکردنی یاسای هەیە پێناسە دەکات. لەم حاڵەتەدا لە باری سروشتی کە هیچ فەرمانڕەوایەك بوونی نییە چ کەسێك مافی دەرکردنی فەرمانی هەیە؟ بەم پێیە چۆن دەکرێت یاسای سروشتی بە یاسا لەواتا دروستەکەیدا لە قەڵەم بدرێت؟ تایلۆر لە وەلامی ئەم پرسیارەدا یاسای سروشتی

17- C. B. Macpherson, thepolitical theory of possessive lndiridualism, oxford, Black well, n. d.
18- Richard peters, Hobbes, Harmonds, Worth, 1956.
19- Quasi – empirical.





بە فەرمانی خودا دادەنێت[٢٠]. تارلقۆن دەڵێت یاسای سروشتی فەرمانی خودایە و فەرمانی خوداش پەیڕەو کراوە. دادپەروەری بەدی نایەت مەگەر ئەوەی کە هەموو تاکەکان پەیڕەوی لە فەرمانی خودا بکەن.

بەم شێوەیە و بەپێی ئەم تێگەیشتنە تەنانەت بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنیش یاسای سروشتی ئەرك دروستکەر بووە. هەرچەندە کە فەرمانڕەوا لە بەرامبەر هاوڵاتیاندا ئەرکدار نییە، بەڵام ئەم یاسا سروشتییە خودی فەرمانڕەوایش ئەرکدار دەکات. هێزی ئەرکدارکەری یاسای مەدەنی لە خودی یاسای سروشتییەوە سەرچاوە دەگرێت[٢١]. هەروەك ئاماژەمان پێکرد ئەم خوێندنەوەیە بۆ هۆبز لە لێکدانەوەکەی هاوارد وارێندەوە پەیدابووە. هاوارد بە گواستنەوەی رستەیەك لە لڤیاتانەوە دەڵێت هەروەك چۆن ئێمە یاسای سروشتی لە باری سروشتیدا وەکو فەرمانی خودا تەماشا دەکەین لە روانگەی هۆبزیشەوە دەکرێت وەکو یاسا بە واتا دروستەکەی لەقەڵەمبدرێت و ئەم فاکتەرە چۆنیەتی لایەنی ئەرکدارکەریی یاسا ئاشکرا دەکات[٢٢]. لێکدانەوەی تایلۆر بۆ هۆبز زۆر لەکانت نزیکی دەکاتەوە و دەڵێت کە ئەخلاقی هۆبز بە تەواوی لەسەربنەمای دێنتۆلۆژی ئەخلاقە[٢٣]. بەبڕوای تایلۆر هۆبز جیاوازی داناوە لە نێوان دادپەروەرانە بوونی کارێك و دادپەروەرانە بوونی کەسێك. کاری دادپەروەرانە کارێکە کە بەپێی حەق بە ئەنجام گەیشتوە، بەڵام کەسێك کە بەپێی حەقێك کاردەکات خود بەخود نابێتە کەسێکی دادپەروەر. ئەمە هەمان ئەو جیاوازییەیە کە کانت لە نێوان کردار بەپێی یاسا و کرداری سەرچاوە گرتوو لە یاسا دایدەنێت. لە تیۆرەکەی کانتدا ((ویستی چاك)) ویستێکە کە تەنها خوازیاری هاو وێنەبوونی یاسای گشتی بێت. بەپێی شیکردنەوەکەی تایلۆر هۆبز پێشڕەوی کانتە. بەڵام هەڵە کارێکە کە خوازیاری هەردوو لایەنی دژ یەکێکی لۆژیکی بێت. کرداری دروست کردارێکە کە بکەرەکەی بیەوێت ئەم کردارە بگۆڕێت بۆ یاسای گشتی. تایلۆر دەڵێت هۆبز شتێکی تارادەیەك هاوئاستی ((فەرمانی رەها))ی کانتی بۆ یاسای ئەخلاقی هێناوە. بە بۆچوونی تایلۆر هۆبز ناوەڕۆکی یاسای وەکو بابەتێکی ماتماتیکی تەماشا دەکرد کە عەقڵی

20- Charles Tarlton, rehabilating hobbes: obligation, anti – faschism and themyth of a Taylor Thesis, History of political Thought, Vol XIX. No.3, Autum 1998. pp. 407-442.
21- A. E. Taylor, op. cit.
22- Howard Warrender, op. cit. p. 98.
23- deontology.





مرۆڤ وەبەری هێناوە. بەڵام جیاوازی سەرنج راکێشی نێوان کانت و هۆبز ئەوەیە کە هۆبز دەڵێت ئەم بابەتە ماتماتیکییە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا و بە فەرمانی فەرمانڕەوا دەگۆڕێت بۆ یاسا[٢٤].

هەروەها تایلۆر دەڵێت کە خۆ بەدەستەوەدانی بێ بەند و مەرج لە بەرامبەر فەرمانڕەوادا تەنها خواستی ئاشتی و ئاسایش نییە، بەڵکو ئەرکێکی ئەخلاقییە و ئەم ئەرکەش هاو وێنەی یاسای ئەزەلییە کە کاتێك کەسێك پەیمانێك دەبەستێت دەبێت بە ئەنجامی بگەیەنێت و ئەم پەیمانەش بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی دروستبووە. ئەرکی ملکەچیکردن لە یاسا تەنانەت ئەگەر کەسەکە بە نارەوایشی بزانێت لە دێنتۆلۆژیی ئەخلاقییەوە سەرچاوە دەگرێت. کەواتە ئەگەر لێرەدا تەنانەت دەروونناسی هۆبزیش بەلاوەبنێین دووبارە بە لەبەرچاوگرتنی فەرزکراوەکانی هۆبز دەربارەی پشت بەستنی کۆمەڵگای مەدەنی بە گرێبەست و ئەرکی تاك لە چاودێری کردنیدا، ئەرکی ئەخلاقی لە شوێنی خۆیدا دەمێنێتەوە. ئەم دێنتۆلۆژییە تەنانەت فەرمانڕەوایش بە بنەڕەتی دادپەروەری و دادپەروەری کردن بەپێی یاسای سروشتی یان یاسای ئەخلاقیی خودا پابەند دەکات[٢٥].

بەڵام سەبارەت بەوەی کە هۆبز بۆ ئاراستەکردنی ئەرك لە باری سروشتیدا و بەردەوامبوونی لە باری مەدەنیدا پەنای بۆ یاسای سروشتی وەکو فەرمانی خودا بردبێت گومانێکی جدی لە ئارادایە. جگە لە دانە پاڵی ئایتزم بە هۆبزەوە ئەگەر بێتو هۆبز وەها بۆچوونێکی هەبوایە ئەوا دەبوو جێی ستایشی خواپەرستانی سەردەمی خۆی بوایە نەك ئەوەی بە توندی بەر نەفرەتیان بکەوێت.

بریان باری بۆچوونەکەی وارێند و تایلۆر سەربارەت بە تیۆری ئەرکی هۆبز و پشت بەستنی بە یاسای سروشتی وەکو فەرمانی خودا رەت دەکاتەوە و لەسەربنەمای لڤیاتان گوزارشتێکی نوێی لێبەدەستەوە دەدات کە لە شوێنی خۆیدا شتێکی جوانە[٢٦]. باریش لەو بڕوایە دایە کە ئەرك لەباری سروشتیدا هەیە بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز لە وارێند و تایلۆر باسی لێوە دەکات. پاش ناساندنی ئەرك لە لڤیاتانداو ئەوەی کە هۆبز ئەرکی بەسپاردنی مافێك یان گواستنەوەی مافێك بۆ یەکێکی تر باسکردووە، وەها بەڵگە دێنێتەوە کە ئەرك بەوجۆرەی کە هۆبز پێناسەی کردووە لە باری سروشتیشدا بوونی نییە. واتە لە هەلومەرجێکدا رەنگە تاك تەنانەت لەوکاتەی کە دەسەڵاتێکی هاوبەشیش بەراست سەریەوە نییە لە ئەنجامی سپاردن یاخود گواستنەوەی

24- A. E. Taylor, op. cit.
25- Ibid.
26- Brian Barry, "Warrender and his critics", philosophy, Vol 43, 1968, pp. 117-137.

مافی خۆی ئەرکێك لە ئەستۆبگرێت. لەم کاتەدا حەقیقەتی ویستی تاکیش وەدیار دەکەوێت و قبوولکردنی وەها ئەرکێك شتێکی سەپێندراو نییە. کاتێك کە دەڵێین کەسێك ئەرکدارە واتە ئەوەی کە مافێکی لە خۆی وەرگرتووەتەوە. بەواتایەکی تر بەشێك لە مافی خۆی سەبارەت بەشتەکان وازلێهێناوە یاخود گواستوویەتییەوە بۆ کەسێکی تر. گواستنەوەی بەرامبەری ماف بەگرێبەست ناوەدەبرێت.

ئایا لەباری سروشتیدا واتە لەو هەلومەرجەی کە دەسەڵاتێکی هاوبەش بەراست سەر لایەنەکانی گرێبەستەوە نییە دەکرێت ئەرك دروستببێت؟ هەڵبەتە نابێت ئەم پرسیارە بخرێتە سەر ئەو شێوەیەی کە پەیماندەرەکان ئەرکدارن یان نا. پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا هیچ فۆرمێکی وەرگرتنەوە یان گواستنەوەی ماف دەتوانێت لە باری سروشتیدا ئەرك دروستبکات؟ ئەم پرسیارە بەوهۆیەوە دەخرێتەڕوو کە لەم حاڵەتەدا گرێبەست تەنها بەشێوەیەکی مەرجدار بەکاردێت. تۆ کاتێك سوود لە ئەنجامی پەیماندانەکەی خۆت وەردەگرێت کە لایەنی بەرامبەر پێش پەیمان بدات، بەڵام ئەگەر گومانێکی مەعقوول لەکاردا بێت کە لایەنی بەرامبەر پەیمانەکەی خۆی بەئەنجامناگەیەنێت تۆیش لە بەئەنجامگەیاندنی بەشەکەی خۆت خۆ بەدووردەگرێت[27]. کەواتە بابەتی سەرەکی لێرەدا بریتییە لە متمانە. لە هەلومەرجێکدا کە دەسەڵاتێکی هاوبەش بەراست سەر لایەنەکانی گرێبەستەکەوە نییە هەرچی رەگەزی متمانە لە گرێبەستەکەدا بە پێویست تر دابنرێت ئەگەری ئەوەی کە گرێبەستەکە ئەرك دروستبکات کەمتر دەبێتەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا هۆبز دەڵێت تەنانەت لە گرێبەستێکیشدا کە دەبێت لایەنی یەکەم پەیمانی خۆی بە ئەنجام بگەیەنی و لایەنەکەی تر لە قۆناغێکی پاشتر بە ئەنجامی بگەیەنێ، دیسانەوە لایەنی دووەم ئەرکدارە و دەبێت پەیمانەکەی خۆت بەئەنجامبگەیەنێت[28]. بەڵام هێشتا دەبێت پرسیارێك وەڵام بدرێتەوە: ئەگەر تۆ سەرەتا پەیمانەکەی خۆت بەئەنجامبگەیەنێت چ گرێنتیەك لە ئارادا هەیە کەلایەنەکەی بەرامبەریشت پەیمانەکەی خۆی بەئەنجامبگەیەنێت؟.

بەر لە وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە دەبێت باس لە خاڵێك بکەین. پەیماندان بە پەیڕەویکردن لە فەرمانڕەوا یان یاساکان لایەنێکی تایبەتی پابەندبوونە بەرامبەر بە پەیمان. فەرمانڕەوا بە

27- Thomas Hobbes, Leviathan, ed by Michael Oakeshott, Oxford, Blackwell, n. d. p. 95.
28- Ibid, p. 95.





فەرمانەکانی خۆی پەیمانگەلێکی نوێ دروستدەکات بەڵام ئەم پەیمانانە جۆرێکی (هەموو باسەکان لەسەر جۆرە) نوێی ئەرك نییە. کاتێك کە من پەیمان دەدەم رۆژێك بەپێی فەرمانی خاوەن کارێك کاری بۆ بکەم ئەگەر فەرمانم پێبکات بۆ نموونە باغچەکەی پاك بکەمەوە ئەم ئەرکە نوێیە جۆرێکی تازەی ئەرك نییە بەڵکو درێژەی هەمان پەیمانی پێشووە. هەروەك باسمانکرد بەبڕوای هۆبز ئەرك بریتییە لە سپاردنی مافێك و ئەرکی پەیڕەویکردن لە فەرمانڕەوا ئەنجامی گواستنەوەی مافی سروشتی کەسەکانە بۆ فەرمانڕەوا[29]. تاك تەواوی ئەو شتانەی کە دەکرێت لە رێگەی گرێبەستێکەوە بیگوازێتەوە (لێرەدا جگە لە بەرگری کردن لە گیان) بە فەرمانڕەوای دەسپێرێت تاوەکو ئەو لە کارپێکردنی مافی سروشتی خۆی لە کاروبارەکاندا رێگرێکی کەمتری لەبەردەمدا بێت. مەبەستی ئەم کارەیش سەقامگیرکردنی ئاشتی و ئارامییە. تەنانەت ئەگەر فەرمانڕەوا ستەمکاریش بێت دیسانەوە باری مەدەنی باشترە لە باری سروشتی و لەلایەکی ترەوە داواکردنی هەر گرێنتیەك لە فەرمانڕەوا کە ئەگەری دەست درێژییەکانی ئەو کۆنترۆڵ بکات لە راستیدا بانگەشەکردنی گەرانەوەیە بۆ باری سروشتی.

ئێستا دەگەینە پرسیارەکەی سەرەوە کە بۆچی پەیماندان بە گواستنەوەی مافی سروشتی بۆ فەرمانڕەوا لەلایەن پەیماندەرەکانەوە ئەرکی نوێیان بۆ دروستدەکات. بە واتایەکی تر چۆن پرسی متمانەکە بوونی وەرگرتنەوەی ئەرك دروست دەکات چارەسەر دەبێ؟ وەڵامەکە ئەوەیە کە فەرمانڕەوا وەها کاردەکات کە بیانوویەك بۆ جێبەجێ نەکردنی پەیمانەکە لەلایەن لایەنەکانی گرێبەستەوە (کە لە نەبوونی دەسەڵاتێکی هاوبەشدا ئەگەری هەیە) نامێنێتەوە. ئەوکات دەسەڵاتێکی جێگیر بەرپادەبێت کە پەیمان شکێنانی گرێبەستەکە سزا دەدات و گومانێکی مەعقوولێش لە ئارادانییە کە کاتێك لایەنی یەکەم کار بە پەیمانەکەی خۆی دەکات ئەوانی تر خۆ بەدوور بگرن لە بەئەنجامگەیاندنی پەیمانەکەیان و بیخەنە بەردەم هەڕەشەوە.

مایکل ئۆکشات خوێندنەوەیەکی جیاوازی بۆ هۆبز خستوەتەروو کە لە رۆسۆ نزیکی دەکاتەوە[30]. دیسانەوە لە دەربڕینەکەی ئۆکشاتیشدا تیۆری ئەرکی هۆبز وەکو تیۆرێکی ئەخلاقی لێکدراوەتەوە. بەواتایەکی تر لە دەربڕینەکەی ئۆکشاتیشدا تیۆرەکەی هۆبز لە هەنگاوی یەکەمدا تیۆرێکە دەربارەی ئەرکی ئەخلاقی نەك تیۆرێك دەربارەی هۆشیاری و

29- Ibid, p. 91.

٣٠- ئۆکشات سەرەتا ئەم تیۆرەی لە پێشەکییەك بۆ پیاداچوونەوەی لڤیان خستەڕوو.

دووربینی. بەپێی بەڵگەهێنانەوەی ئۆکشات هۆبز ئەرکی ئەخلاقیی بە فەرمانی فەرمانڕەوا پێناسە کردووە. هۆکاری دروستبوونی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایش بریتییە لە ترسی سروشتی مرۆڤ لە مردن و یاسای سروشت مرۆڤەکان ناچار و ئەرکدار دەکات بەجێگیرکردنی فەرمانڕەوا[٣١]. ئەرك لە باری سروشتیدا ئەرکی ئەخلاقی نییە، بەڵام بە جێگیرکردنی فەرمانڕەوا دەگۆڕێت بۆ ئەرکی ئەخلاقی. ئۆکشات دەڵێت هەموو ئەرکە ئەخلاقییەکان لە یاساوە وەردەگیرێن و لەو شوێنەی کە یاسا نییە هیچ ئەرکێکیش بوونی نابێت. یاسا دانەریش ئەو کەسەیە کە ئارگۆمێنت بوون و مەرجەع بوونی[٣٢] پەیڕەویکردن لەخۆی بەدەستهێناوە. دروستکردنی ئەم مەرجەع بوونەش کارێکی دروستکراوە. بەواتایەکی تر هیچ جۆرە مەرجەع بوون و دەسەڵاتێکی سروشتی بوونی نییە. دەسەڵاتی یاسایی یان مەرجەع بوون هەمان ئەو تاك (یان کۆمەڵێك لە تاکەکان)یە کە خەڵکی بە فەرمی دەسەڵاتی ئەویان ناسیوە و لە بەرامبەریدا ئەرکیان بە ئەستۆ کەوتووە. کۆمەڵگای سیاسی یان شاریش بارێکی دروستکراو لە پێگەی مرۆڤە. لە باری دروستکراودا یاسا گەلێك هەن کە یاسادانەر لە ڕێگەی بەدەستهێنانی دەسەڵات و پێگەی مەرجەع بوونەوە دایناون. یاسای کۆمەڵگای سیاسی یان سیڤیتاس[٣٣] ئەرك دروستکەرە. بەڵام ئەم ئەرکە ڕەنگدانەوەی هیچ یاسایەکی سروشتیی دیکەنییە. هۆی ئەوەی کە بۆچی من بە شێوەیەکی ئەخلاقی ناچارم بە پەیڕەویکردن لە فەرمانڕەوا ئەوەیە کە لەگەڵ تاکەکانی تر و بەکاری وەك یەك و مافی یەکسان دەسەڵاتی وەها کارێکمان بە ئەو بەخشیوە[٣٤]. بە بۆچوونی ئۆکشات هۆبز تیۆرێکی بێ وێنەی دەربارەی سەرچاوەی ئەخلاقی داڕشتووە بەو تێگەیشتنەی کە ویستی تاکەکان سەرچاوەی ویستی فەرمانڕەواو یاساکانە. کەواتە ویستی فەرمانڕەوا دروستکەری دروست و نادروست و حەقیقەت و هەڵەیە. بەم شێوەیە هۆبز بەم دەربڕینە دەبێتە پێشڕەوی ڕۆسۆ، چونکە هەروەك دەبینین ڕۆسۆ لە ((ویستی گشتی))دا کۆبوونەوەی مەدەنی بە پێوەری حەقیقەت لەقەڵەمدەدات و بڕوای وایە کە بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی مرۆڤەکان بەدوورن لە ئەخلاق.

31- Michael Oakeshott, introduction to: Leviathan by Thomas Hobbes.

٣٢- ریچارد تاك، هابز، ترجمه حسین بشیریه، تهران، طرح نو، ١٣٧٦، ص ١٦٣.

33- Civitas.

34- Michal Oakeshott, Moral Life in the Writing of Thomas Hobbes, op. cit, p. 6.





کێشەی دەربڕینەکەی ئۆکشات ئەوەیە کە بەشێوەیەکی گشتی یاساکان و مافی سروشتی لە پێش چاوناگرێت، لەکاتێکدا کە هۆبز ڕایدەگەیەنێت کە مافی سروشتیی دامەزراو لەسەر ویست بێ سنوور و چوارچێوە نییە و یاسای سروشتی دەتوانێت مافی سروشتی سنووردار بکات. زۆرێك لە شتەکان لە باری سروشتیدا لەلایەن یاسای سروشتییەوە قەدەغەکراون[٣٥].

## ئایا بناغەی کۆمەڵگای سیاسی عەقڵانییە یان ئەخلاقی

پاش ئەم ڕوونکردنەوەیە دەربارەی دەربڕین و خوێندنەوە جۆراوجۆرەکان بۆ تیۆری ئەرکی هۆبز سەرئەنجام دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە ئایا لە تیۆرەکەی هۆبزدا بونیادی کۆمەڵگا عەقڵانییە یان ئەخلاقی؟ بەواتایەکی تر ئایا تیۆرەکەی هۆبز تیۆرێکە دەربارەی هۆشیاری یان تیۆرێکی ئەخلاقییە؟ ئایا هۆبز زانای زانستی ئەخلاقە یان دامەزرێنەری شیکردنەوەی ئەزمونیی کۆمەڵگا؟ بە بڕوای نووسەر سەبارەت بە تیۆرەکەی هۆبز کەلێنێکی گەورە لە نێوان ئەم دوو ڕوانگەیەدا نییە. بە واتایەکی تر دەکرێت ئەم دوو لایەنەی بۆچوونەکەی هۆبز بەگونجاو لەگەڵ یەکتر دابنرێن و وەها بانگەشە بکرێت کە هۆبز لە نێوان لایەنی هۆشیاری و سوود و ماف یان بەواتایەکی تر لە نێوان لایەنی عەقڵانی و ئەخلاقی بەشێوەیەکی جوان پەیوەندی دروستکردووە. بەم پێیە دەکرێت بڵێین کە مرۆڤەکان بەهۆی هۆشیاری و دوابەدوای ئەو بەهۆی ئەو سوودەی کە وێنایان دەکرد و سەرئەنجام لەسەر بنەمای ئەو ئەرکەی کە بەهۆی گواستنەوەی مافی پاراستنی زات لە ئەستۆیان گرتووە (و ئەم کارە کارێکی ئەخلاقییە) هەستاون بەدامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی (جێگیرکردنی فەرمانڕەواو پەیڕەوی لێکردنی).

بە بۆچوونی نووسەر هەردەستەیەك لە لێکدانەوەکان چەند ڕەگەز و لایەنێکی جیاوازی بیری هۆبزیان وەرگرتوە و بەزیانی لایەن و ڕەگەزەکانی تر گەورەیان کردووەتەوە. بەم جۆرەیە کە دەستەیەك لە لێکدانەوەکان هۆبزیان ڕووە و سوودگەرایی و دەستەیەکی تر ڕووەو تیۆرەکانی ڕۆسۆ و دەستەیەکیش ڕووەو لایەنی ئەخلاقی کانت نیشانداوە. دەستەیەکی تری لێکدانەوەکانیش تیۆرەکەی هۆبزیان بە ناهەماهەنگ باسکردووە و بۆ ڕوونکردنەوەی گەڕاونەتەوە بۆ دنیای دەرەکی

٣٥- ریچارد تاك، پێشوو، ل١٦٤.

و سنووری دەرەوەی لۆژیك. ماكفیرسۆن یەكێكە لەوانە و هەوڵی داوە بەپێویستی كۆمەڵگای بازاڕ و سەرمایەداری تازەگەشەكردوو تیۆرەكەی هۆبز روون بكاتەوە[٣٦].

بەر لە هەموو شتێك دەبێت بڵێین كە بەبۆچوونی ئێمە تێپەڕین لە فیسیۆلۆژی و دەروونناسی هۆبزەوە بەرەو تیۆری سیاسی ناوبراو كارێكی دژوارە و لەم رووەوە ناتوانین زۆر پشت بە پەیوەندی فەلسەفەی سیاسی و ئەخلاقی هۆبز لەگەڵ فەلسەفەی گشتی ناوبراو دەربارەی بزاوتن ببەستین. بەتایبەتی سەبارەت بە پەڕینەوە لە داتا ئەزموونییەكان دەربارەی فیسیۆلۆژی و دەروونناسی تاك بەرەو حوكمە رێساییەكان دەربارەی ئەوەی كە دەبێت مرۆڤ ئەنجامی بدات (دروستكردنی پەیوەندی لەنێوان ناچاربوون و ئەركداربوون) دژوارییەكی زۆر لە ئارادایە. بەتایبەتی سەرنجدانی ئەم بابەتە جێی گرنگییەكە هۆبز لە نووسینەكانی خۆیدا چەندین جار ئاماژەی بە مافی سروشتی و یاسای سروشتی كردوە.

لەگەڵ ئەمەیشدا هیچ گومانێك لەوەدا نییە كە هۆبز بەواتایەكی نوێ مافی سروشتیی بەكار بردوو مافی سروشتی نوێی دامەزراند كە لەبری پشت بەستن بە مەبەست[٣٧] پشت بەحەزەكانی مرۆڤ و بەتایبەتی بەهێزترین حەزی مرۆڤ واتە حەزی پاراستنی خود دەبەستێت[٣٨]. هۆبز بڕوای وابوو كە یاسای سروشتی كاریگەر نابێت تا ئەوكاتەی كە بنەڕەتەكانی بگونجێت لەگەڵ حەزەكاندا. دەبێت یاسای سروشتی لە بەهێزترین حەزەكانەوە دەربهێنرێت و ئەم حەزەش بریتییە لە حەزی پاراستنی خود. لە باری سروشتیدا مافێكی سروشتی بنەڕەتی هەیە كە هەموان سەبارەت بەو كۆكن و ئەویش ئەوەیە كە كەسەكانی تریش وەكو خودی ئەوان ئەو مافەیان هەیە كە لە بەرامبەر دەستدرێژی كردنە سەر گیانیان بەرگریبكەن. بەڵام چونكە سەبارەت بە سوودوەرگرتن لەم مافە هەر كەسەو بەدادوەری خۆی دادەنرێت بۆیە سەرهەڵدانی ناكۆكی و برەو پەیداكردنی ناسەقامگیری شتێكی ناچارییە. تەنها بڕوای هاوبەشی نێوان مرۆڤەكان بریتییە لە خوازراوبوونی پاراستنی خود. دەكرێت لە هەموو روویەكەوە بڕوای تاك بگۆڕدرێت بەڵام هەرگیز ناكرێت كەسێك بە كوشتنی خۆی رازی بكرێت. كەواتە مافی پاراستنی خود بۆ هەموان كارێكی بەڵگەنەویستە. هۆبز كە دەیویست فەلسەفەكەی خۆی وەكو ماتماتیك لەسەر بنەڕەتە بەڵگەنەویستەكان دابمەزرێنێت لەم بابەتە

36- See C. B. Macpherson, op. cit.
37- Telos.
38- Leo Strauss, Natural Right and History, Chilcago, London, University Chicago press 1957, p. 175.






بەڵگەنەویستەوە دەستپێدەكات و پێش گریمانەكەی خۆی لەسەر ئەو دادەمەزرێنێت. دەكرێت بەم شێوەیە بەدوای درێژەی بەڵگەهێنانەوەكەدا بچین: لەگەڵ ئەوەی كە مافی پاراستنی خودكارێكی سروشتییە بەڵام سەبارەت بەوەی كە ئەم مافە لە كوێوە دەستپێدەكات و بەكوێ دەگات هیچ بڕوایەكی هاوبەش لە ئارادا نییە. وەها هەلومەرجێك زەمینە بۆ بارودۆخی شەڕ دەڕەخسێنێت. لەبەرئەوەی كە بارودۆخی شەڕ مەترسییەكی سەرەكییە بۆ سەر پاراستنی خود بۆیە دەبێت هەموان بۆ دەربازبوون لەو هەلومەرجە هەوڵبدەن.

بەم شێوەیە دەكرێت سەبارەت بەلایەنی كەمەوە واتە حەز و هاوكات لەگەڵ ئەودا مافی پاراستنی خود وەكو بناغەی هەوڵدان بۆ ئاشتی رێكەوتن هەبێت. بەڵام ئەوەی كە هۆبز چۆن لە حەزو ئارەزووەكانەوە بەرەو گرێبەستی ئاشتی پەل دەهاوێت بابەتێكی تری جێی باسە و یەكێكە لەو بابەتانەی كە دەیان كتێب دەربارەی نوسراون[٣٩]. پرسیارەكە ئەوەیە كە بۆچی دەبێت لەباری سروشتیدا تاك هەوڵ بۆ ئاشتی بدات؟ بۆچی نابێت خوازیاری شتێكی زیاتر لە بەشەكەی خۆی بێت؟ وەڵامێك بۆ ئەم پرسیارە ئەوەیە كە دەبێت هەموو كەسێك لە باری سروشتیدا بۆ پاراستنی خود هەوڵبدات یان زیاتر لەمە، بۆ نموونە لەپێشتربوون بەسەر كەسەكانی تردا. جگە لەم دووە شتێكی دی نییە، چونكە بە واتای رەتكردنەوەی مانەوەیە. بەڵام هەوڵدانی تاك بۆ پاراستنی خود كارێكی رەواو باشە و بۆ زیاتر لەمەیش ناڕەواو خراپ[٤٠]. دەكرێت لەولاوە بڵێین كە هەوڵدان بۆ پاراستنی خود هەوڵدانە بۆ ئاشتی و هەوڵدان بۆ زیاتر لەمە راگەیاندنی شەڕە. كەواتە هەوڵدان بۆ ئاشتی كارێكی ((عەقلانی))یە. هەوڵدان بۆ ئاشتی بەو پێیەی كە كارێكی عەقلانییە بریتییە لە ئەركێك. كاری عەقلانیش كارێكە كە لەناو خۆیدا بە دوورە لە دژیەكی لۆژیكی، بۆیە هەماهەنگ و گونجاوە.

بەم شێوەیە هەوڵدان بۆ ئاشتی بە یەكسان دانراوە لەگەڵ كرداری عەقلانی و بەئاگایی (دامەزراو لەسەر هۆشیاری). لە هەمان كاتدا ماف لەناو زەبر و هێزدا لە بەین نەچووە، چونكە هێڵێكی جیاكەرەوە لە نێوان سنووری حەز و ئەركدا كێشراوە. بەڵام هێشتا پرسیارێكی تر دەمێنێتەوە كە دەبێت وەڵام بدرێتەوە: بۆچی دەبێت كرداری عەقلانی واتە كردارێك كە لەناو خۆیدا هەماهەنگ و بەدوورە لە دژیەكی ناوەكی بەكرداری ئەركدار دابنرێت؟ یاسای سروشتی

39- Kinch Hoekstra, "Hobbes and the foll", poltitcal Theory. Vol 25, on5, October 1997, pp. 620-654.
40- Unjust.

لە تیۆرەکەی هۆبزدا لەسەربنەمای عەقڵە نەك ئەرك. ئەگەر یاسای سروشتی بخەینە سەر ئەرك ئایا ناچار نابین بگەڕێینەوە بۆ تیۆرەکەی تایلۆر و وارێند و بۆ گەڕان بەدوای بناغەی ئەرکدا بگەڕێینەوە بۆ یاسا و یاسادانەر و لەوێشەوە بۆ خودا وەکو یاسادانەری یاسای سروشتی؟

هەروەك ئاماژەمان پێکرد لە تیۆرەکەی هۆبزدا ئەرك لە یاساوە سەرچاوە دەگرێت و یاسا فەرمانی کەسێکە کە دەسەڵاتی دەرکردنی وەها فەرمانێکی هەیە. جا ئێستا کە تیۆرەکەی وارێند و تایلۆرمان رەتکردوە دەبێت چ کەسێك وەکو ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی کردن واتە دانانی یاسای هەیە تەماشا بکەین؟ ئایا دەکرێت هاوڕابین لەگەڵ ئۆکشاتدا و لەبری لێکدانەوەی کانتی بۆ هۆبز واتە دەرهێنان ئەرك لە کرداری عەقلانی واتە کردارێك کە لە ناوخۆیدا بە دوورە لە دژیەکی لۆژیکی (وەکو فەرمانی رەهای کانت) بگەڕێینەوە بۆ لێکدانەوەی رۆسۆیی بۆ هۆبز و بڵێین کە یاسا فەرمانی کەسێکە کە لە کۆمەڵگای سیاسیدا واتە لە بارێکی دروستکراودا خاوەن مەرجەعیەتی دەرکردنی فەرمانە[٤١]. لە بەرامبەر وەها تێگەیشتنێك بۆ ئەرك هێشتا ئەم پرسیارە لە ئارادایە کە ئەگەر بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی (سەقامگیربوونی یاسا و فەرمانڕەوا) هیچ ئەرکێك بوونی نییە چۆن تاکگەلێك کە متمانەیان بە یەك نییە پەیمان دەبەستن و بەرامبەر بە پەیمانەکەیشیان بە پابەندی دەمێننەوە؟ خودی هۆبزیش لە پاژی پازدەی لڤیاتاندا لەلایەن ((نەزانێك))ەوە ئەو گرفتەی خستوەتەروو کە بۆچی تاك لەبەر سوودی قۆناغێك پەیمان نەبەستێت و پاشانیش بەپێی بەرژەوەندی هەڵینەوەشێنێتەوە[٤٢]؟

بەم پێیە بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی یان باری دروستکراو دەبێت جۆرێك ئەرك بوونی هەبێت کە مرۆڤەکان بەرامبەر پەیمانەکەی خۆیان پابەند بن و لە ئەنجامدا بتوانن پەیمانی گرێبەست ببەستن. هۆبز بڕوای بەوەها ئەرکێك هەبوو. ئەم ئەرکە لەسەربنەمای یاسای سروشتییەو یاسای سروشتیش بە نۆرەی خۆی بریتییە لە ((فەرزکردنی عەقڵ)) و ((ویستی عەقڵ)) (نەك فەرمانی خودا). بەڵام وەڵامی ئەو پرسیارەی کە دەبێت ئەرکی ئەخلاقی لە یاسا واتە فەرمانی فەرمانڕەواوە سەرچاوە بگرێت ئەوەیە کە هۆبز جیاوازی لە نێوان دوو جۆر ئەرکدا داناوە[٤٣]. جۆرێك ئەرکی بە ئەرکی In foro interno (بەهێزی ناوەکی) ناوبردووە. مرۆڤ

41- See: Michael Oakshott, op. cit.
42- Kinch Hoekstra, op. cit.
43- Jack Lively and Andrew Reeve, op. cit, p.15.






ئەرکدارە ((بەهێزی ناوەکی)) پەیڕەوی لە یاسای سروشت بکات. ئەگەر لە بەرژەوەندیاندا بێت ئامادەن پەیڕەوی لە یاسای سروشت بکەن، بەڵام حەزکردنی مرۆڤ بە ئەنجامدانی ئەم سەرنجەی پەیوەست بە ساخڵەمی و ئاسایشی مرۆڤ هەمواردەبێت. گەرچی هەموو کەسێك دەتوانێت لەو بنەڕەتانەی کە بۆ ژیان لە سایەی ئاشتی و ئارامیدا پێویستە تێبگات، بەڵام رەنگە شوێنکەوتنی یەك لایەنەی پێچەوانەی ئاسایش بێت. هەر تاکێك دەبێت بەپێی لێکدانەوەی عەقلانی بڕیار بدات کە ئایا لە بەرژەوەندی یان ویستی ئاسایشی ئەوە کە بەپێی یاسای سروشت کاربکات؟ لە کاتێکدا کە هەر ئاوێنەیەك بەڵگەیەکی نەبێت کە فەرز بکات ئەوانی تریش وادەکەن و لەم حاڵەتە خۆی خستوەتە بەردەم هەڕەشەوە. کەواتە دەبێت بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە پەنا بۆ گرێبەست ببرێت. بەڵام تاکگەلێك کە متمانەیان بەیەکدی نییە ناتوانن بچنە ناو گرێبەستێکەوە ئەوە لەخۆدەگرێت ئەو پەیمانەی کە ئێستا دەیبەستن لە ئایندەدا سوودەکەی لەلایەن لایەنی بەرامبەرەوە بۆ ئەوان دەبێت، چونکە وەها گرێبەستێك لایەنی بەرامبەر هاندەدات بۆ خۆبەدورگرتن لە بەئەنجامگەیاندنی پەیمانەکەی خۆی. وادابنێین کە کەسێك لەگەڵ دیلێك گرێبەستێك دەبەستێت کە پاش ئازادبوونی دیلەکە بڕێك پارە بە کەسەکە بدات. لێرەدا ئەو پرسە هەیە کە ئەگەر کەسی یەکەم پەیمانەکەی خۆی بەئەنجامبگەیەنێت (دیلەکە ئازاد بکات) چ گرێنتیەك لە ئارادا هەیە کە دیلەکە پەیمانەکەی خۆی جێبەجێ بکات (بڕە پارە دیاریکراوە کە بدات بە کەسەکە). کەواتە دەبێت گرێبەستەکە بەجۆرێك بێت کە هەردوو پەیمانەکە هاوکات بەئەنجامبگەن. هۆبز دەڵێت ئەو گرێبەستانەی کە لەباری سروشتیدا بواری بەئەنجامگەیشتنی هاوکاتیان نییە لەباری مەدەنیدا وەها بوارێکیان بۆ فەراهەم دەبێت: ئامادەبوونی فەرمانڕەوایەك کە دەسەڵاتی ناچارکردنی کەسەکانی هەیە بەجێبەجێ کردنی گرێبەستەکە، بوونی فەرمانڕەوا بیانووی خۆدزینەوە لە پەیمانەکە لەناو دەبات[٤٤]. کەواتە فەرمانڕەوا ئەرك ((بەهێزی ناوەکی)) بە ئەرك بەهێزی دەرەکی تەواو دەکات. بەڵام لێرەدا پرسێکی نوێ دێتەئاراوە. لە روخساردا ئەم بەڵگەهێنانەوەیە لە خۆگری گەڕ [گەڕان] و یەك لەدوای یەك بوونە. ئەگەر ئامادەبوونی فەرمانڕەوا یاساکان فەرز دەکات و یەکێك لە هەلومەرجەکانی ئەو یاسایە ئەوەیە کە مرۆڤەکان پابەندبن بە پەیمانەکانیانەوە و لەولایشەوە فەرمانڕەوا بۆخۆی ئەنجامی گرێبەستەکەیە کەواتە کاریگەربوونی فەرمانڕەوا

44- Brian Barry, op. cit.

مەرجی هەبوونی ئەو ئەرکەیە کە دەبێت خۆی ئەنجامی ئەوبێت. لەم حاڵەتەدا چ جیاوازییەك هەیە لە نێوان ناچاربوون (بە واتای ناچارکردن بە کارێکی دیاریکراو لەلایەن فەرمانڕەوایەتی کاریگەرەوە) و لە ئەستۆگرتنی ئەرك؟ ئایا ئەرکداربوون بۆخۆی ناچاربوون نییە. ناچاربوون لایەنی ئەخلاقیی نییە لە کاتێکدا کە ئەرك لایەنی ئەخلاقیی هەیە. وەڵامەکەی ئەوەیە کە ئەرك لە روانگەی هۆبزدا بریتییە لە سپاردن و گواستنەوەی ماف. کەواتە کاتێك کە مرۆڤ ئەو مافەی کە لەباری سروشتیدا هەیەتی لە چوارچێوەی گرێبەستێکدا دەیگوازێتەوە بۆ فەرمانڕەوا ئەرکێکی ئەخلاقیی لە ئەستۆگرتووە. بەم شێوەیە لێرەدا لێکچوون هەیە لە نێوان ئەرکی ئەخلاقی واتە سپاردنی مافێك و کرداری روو بە پاراستنی خود (کرداری عەقلانی).

بۆیە هۆبز سێ بەڵگە بۆ پەیڕەویکردن لە فەرمانی فەرمانڕەوا دەهێنێتەوە: ١- تاك ئەرکدارە بە پەیڕەویکردن لە فەرمانی فەرمانڕەوا چونکە لە گرێبەستەکەدا پەیمانی داوە کە وەها بکات، ٢- فەرمانڕەوا نوێنەری تاکە و تاك دەسەڵاتی پێداوە و کاری فەرمانڕەوا کاری ئەوە. تاك ناتوانێت گازندە بکات کە کرداری فەرمانڕەوا زیانی پێدەگەیەنێت یان مافی ئەو پێشێلدەکات. ٣- عەقڵ کە چاکەی تاك بەو [تاك] نیشاندەدات پێی دەڵێت کە سەرەتا بچێتە ناو گرێبەستی سەقامگیرکردنی فەرمانڕەواوە و پاشان پابەند بێت بە پەیمانەکەی خۆیەوە. ئەم سێ خاڵە پەیوەستن بە یەکەوە و یەك گشت دروست دەکەن. ئەرك پەیوەستە بە خاڵی دووەمەوە و خاڵی دووەم ئەنجامی خاڵی یەکەمە و خاڵی سێیەم جەخت کردنەوەیە لەسەر سوودی تاك لە بە ئەستوگرتنی ئەرك. دەکرێت بەم روونکردنەوەیە ئەرکی ئەخلاقی بە کۆك دابنرێت لەگەڵ کرداری عەقلانی لە تیۆرەکەی هۆبزدا.

بەهەرحاڵ هۆبز عەقڵ بەلایەنیکەمێك دادەنێت کە دەبێت بیر و بڕواو بنەڕەتە ئەخلاقییەکانی لەسەر بنیات بنرێت[٤٥]. یاسای سروشت لە روویەکەوە یاسای عەقڵە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە هەموو کەسێك ئەوەی کە پێی خۆشە بە ((چاك)) و ئەوەی کەپێی ناخۆشە بەخراپ ناودەبات تەنها عەقڵی ساخڵەم رێگەی ئاشتی و ئارامی دەدۆزێتەوە[٤٦]. هەروەك بینیمان ئەرکی کرداریش لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. هۆبز بڕوای وابوو کە لە کۆتاییدا فەلسەفەی ئەخلاقی دروست پشت ئەستوورە بە عەقڵ. سەقامگیربوونی ئاشتی و باری مەدەنی

45- David Johnston, The Rhetoric of Leviathan: Thomas Hobbes and the. Politics of cultural Trans formation, princetion 1986. p. 213.
46- Andrew Lister, op. cit.






پەیوەستە بە مەبەستە درێژخایەنەکانی پاراستنی خودەوە. عەقڵ توانایەکە کە تاك دەبەستێتەوە بە سیستەمێکی ئەخلاقیی دەرەکییەوە. لە تیۆرەکەی هۆبزدا پاراستنی خود مەبەستێکە کە نەلۆژیکی و نەنالۆژیکییە، بەڵام پاشتر هیۆم وتی کە عەقڵ شتێکی دیکەی جیا لە کۆیلەبوونی حەزەکان نییە و بەم جۆرە فەلسەفەی هۆبزی بەرەو سوودگەرایی گەڕاندەوە. بەم شێوەیە هیۆم عەقڵی بەتەواوی خستە خزمەتی حەز و رقەوە. بەم جۆرەبوو کە هیۆم بەرەو ئەو گومانگەراییە کە کانت ویستی بۆ رووبەڕووبونەوەی بە تەواوی ئەخلاقی لە حەز و رق داببڕێت. کانت بۆ ئەم کارە ناچاربوو کە ئەخلاق لە پێوەندبوونی بە سروشتەوە رزگار بکات و یەکڕاست بیبەستێتەوە بە عەقڵی کردەییەوە[٤٧]. بەم شێوەیە هیۆم بە جەختکردنەوە لەسەرحەزەکان لەلایەك و کانت بەدابڕینی ئەخلاق لە حەزەکان و بەستنەوەی بە عەقڵەوە لەلایەکی ترەوە هەر یەك پەیوەندیان هەیە لەگەڵ لایەنێکی تیۆرەکەی هۆبزدا.

هەروەها تیۆری ئەرکی هۆبز لەگەڵ تیۆری ویستی گشتی رۆسۆیشدا چەند خاڵێکی هاوبەشی گرنگی هەیە. هەروەك بینیمان هۆبز گرنگترین مەرجی ئەرکی سیاسیی بەجێگرکردنی فەرمانڕەواو دروست بوونی دەسەڵاتی هاوبەش داناوە. بەو شێوەیەی کە باسمانکرد تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی نا تەواویش ئەرك لە باری سروشتیدا هەبێت ئەوا کاتێك دەگۆڕێت بۆ ئەرك بە واتا تەواوەکەی کە کۆمەڵگای سیاسی دروستببێت تاوەکو جێبەجێ کردنی بەڵێن و پەیمانەکە لەلایەن لایەنەکانی گرێبەستەکەوە دەستەبەر بکات. لێرەدا تیۆری ویستی گشتی رۆسۆ چەند روویەکی هاوبەش لەگەڵ تیۆرەکەی هۆبزدا پەیدا دەکات. هەربۆیەشە کە یەکێك لە توێژەران وەها رای خۆی دەربڕیوە کە لە پێشەکییەکەی ئۆکشات بۆلڤیاتان رەنگدانەوەیەکی باسەکەی تایلۆر بەرچاو دەکەوێت[٤٨]. چونکە تایلۆر بوو کە بۆ یەکەمین جار ئاماژەی بە بەهای تیۆری ئەخلاقی هۆبز بەجیا لە دەروونناسی ناوبراو کرد[٤٩]. ئۆکشات لەپێشکییەك بۆلڤیاتان تیۆری ئەخلاقیی هۆبز لە دەروونناسی ناوبراو جیادەکاتەوە و دروستبوونی ئەرك لەسەر دروستبوونی کۆمەڵگای سیاسی دادەمەزرێنێت. رۆسۆیش ویستی گشتی بەسەرچاوەی هەموو ئەرکێکی سیاسی و بەهایەکی ئەخلاقی لەقەڵەمداوە. لەگەڵ ئەمەیشدا پێشەکییەکەی ئۆکشات بۆلڤیاتان بوو کە زیاد لە هەموو بۆچوونی رەخنەگرانی بەرەو تێڕوانینێکی نوێ بۆ هۆبز راکێشا و دوای ئەمە بوو کە زۆرێك

47- Andrew Lister, op. cit.
48- Stuart Brown "Hobbes, The taylor thesis", phifosophical Reviw, Vol, 68, 1959, p. 304.
49- ibid, p.303.

له توێژەران بڕوایان هێنا كه لێكدانەوەی هۆبز تەنها لەسەربنەمای هۆشیاری و سوودی تایبەتی و بنەمای دەروونناسانه بەس نییه[٥٠]. بەر لەمه تێڕوانینی باو بۆ تیۆری ئەركی هۆبز بریتی بوو له خوێندنەوەی تیۆرەكه لەسەربنەمای بنەڕەتی هۆشیاری.

لەگەڵ ئەمەیشدا دەبێت سەرنجی جیاوازیەكی گرنگی نێوان تیۆرەكەی هۆبز و تیۆرەكەی رۆسۆ بدەین. له تیۆرەكەی هۆبزدا تەنانەت بەر له پێكهێنانی كۆمەڵگای مەدەنیش تاكێتی كەسەكان له شوێنی خۆیدایه. ئەم تاكێتییه كه لەسەربنەمای مەعریفەناسین نۆمینالیستی هۆبزه له هیچ كاتێكدا لەناو ناچێت. ویستی كەسەكان له یەك ویستی گشتیدا ئاوێته نابێت بەڵكو له ویستی فەرمانڕەوادایه یەكدەگرێتەوه. بەڵام ئەو بۆچوونەی كه دەڵێت سەقامگیربوونی دەسەلاتی هاوبەش مەرجی كۆتایی پێكهێنانی ئەركه زۆر لەو رایەوه نزیكه كه ((ویستی گشتی)) بەسەرچاوەی ئەركی سیاسی دادەنێت.

## له ((لڤیاتان))ەوه تا ((ویستی گشتی))

له هەنگاوی یەكەمدا باسكردن له پەیوەندی نێوان تیۆری ئەخلاقی هۆبز و رۆسۆ كەمێك سەیر دێتەبەرچاو. بەتایبەتی كه هۆبز هەم درێژەی نەریتی رێژەییبینی ئەخلاقییه و هەم یەكێكه له گەورەترین تیۆرداڕێژانی تاكگەرایی له كاتێكدا كه رۆسۆ لەلایەكەوه كۆمەڵگاگەرایه و لەلایەكی ترەوه بڕوای به یەقینی ئەخلاقی هەیه. هەروەك دیاره هۆبز له قۆناغی لاوێتیدا لەژێر كاریگەری قوتابخانەیەكی مرۆڤگەرایی بوو كه نوێنەره دیارەكانی بریتیبوون له مۆنتنی و لیبسوس. ئەم مرۆڤگەرایانه بڕوایان وابوو كه لەرووی بیروبڕواو داب و نەریتەوه وەها هەمەرەنگییەك لەنێوان مرۆڤەكاندا بەدی دەكرێت كه دۆزینەوەی پێوەرێك بۆ ئەخلاق مەحاڵه[٥١]. هەندێك له لێكۆڵەران له پەیوەندی هۆبز لەگەڵ گومانگەرایی سەردەمەكەی خۆیدا وەها بەرەو پێش هەنگاویان ناوه كه هۆبزیان بەرابەری پلۆرالیزمی سیاسی لەقەڵەمداوه[٥٢]. ریچارد تاك كه لەریزی ئەم تیۆرداڕێژانەیه دەڵێت كه له تیۆرەكەی هۆبزدا

50- Hoard Warrender, Hobbes studies: Documentation Versus History political studies XXXIII, 1985, pp. 304-7.

٥١- ریچارد تاك، پێشوو، ل ٧٦.

52- Richard Tuck, "Right and pluralism" inphilosophy in an Ageof pluralis ed. James Tully, Cambridge, 1994.



بەستنی گرێبەست و پێكهێنانی كۆمەڵگای سیاسی تەنها بنەمایەكه بۆ رەخساندنی بارێك كه تیایدا هاولاتیان لەسەربنەمای قبوولكردنی جۆراوجۆری بەهاكان له پاڵ یەكتردا ژیان بەسەرببەن. به بڕوای ئەم لێكۆڵەرانه ئەخلاقی هۆبز ئەخلاقێكی گواستنەوه خوازییه[٥٣].

هاودەنگییەك لەسەر مافی پاراستنی خودی بنەڕەتی نییه كه بكرێت تەواوی بڕوا مەشروعه ئەخلاقییەكان بۆ ئەو بچووك بكرێنەوه بەڵكو تەنها رێككەوتنێكه كه دەكرێت لەسەربنەمای ئەو بۆ رێكخستنی ئاشتیانەی بارودۆخ و ئاسایشی بەرامبەر گفتوگۆ بكرێت.

كەواته بەرای ئەم لێكۆڵەرانه هاودەنگی لەسەر مافی پاراستنی خود لایەنی كەمێكه بۆ پێكهێنانی بنەڕەتێك كه تیایدا به بۆچوونی گرسیۆس له نێوان كەلتوورەكان و به بۆچوونی هۆبز لەنێوان تاكەكان گفتوگۆ به ئەنجام دەگات[٥٤]. بەپێی ئەم شیكردنەوەیه هۆبز عەقڵ بەلایەنی كەمێك دادەنێت كه دەبێت بیرو بڕوا ئەخلاقییەكان یان بنەڕەته ئەخلاقییەكان لەسەر ئەو بنیات بنرێت. یاسای سروشت یاسای عەقڵه. كەواته عەقڵی ساخڵەمه كه رێگەی ئاشتی و ئارامیمان بۆ دیاردەكات. ئەوكات لەسەربنەمای ئەم لایەنی كەمەكۆمەڵگایەك دادەمەزرێت كه به گفتوگۆ و وەرچەرخانی كەلتووری بەرەو سەقامگیری تەواوی ئارامی بەرەو پێش دەچێت[٥٥].

وەها تێڕوانینێك بۆ روانگەی هۆبز و گەوره كردنەوەی پەیوەندی هۆبز بەگومانگەراییەوه هەم وەرچەرخانی هۆبز له مەعریفەناسی گومانگەرایی لەبەرچاو ناگرێ و هەم كەم گرنگی به بنەما گواستنەوه خوازی و بنەماگەراییه[٥٦] ئەخلاقییەكانی هۆبز دەدات. جگه لەمه سەلماندنی بانگەشەی ئەم شیكارگەرانه كه هۆبز فەلسەفەی خۆی بۆ دەربڕینی فەلسەفەی گومانگەرایی دامەزراندووه به توندی جێی وتوێژ و رەتكردنەوەی زۆربەی لێكۆڵەرانه. به ئاشكرا تیۆرەكەی هۆبز گواستنەوه خوازه. راسته كه له تیۆرەكەی هۆبزدا فەرمانڕەوا له ویستی خەڵكیەوه دروست بووه بەڵام ویستی فەرمانڕەوا ویستی شوێنكەوتووان نییه بەڵكو ویستی خۆیەتی: یەك ویست له بری چەندین ویستی ناكۆك.

53- Reductive.

54- Ibid, p. 168.

55- David Johnseton, the Rhetoric of Leviathan: Thomas Hobbes and the politics of cultural Transformation, Princeton 1986, p. 213.

56- Foundational.





## ویستی فەرمانڕەوا شوێنگرەوەی ویستی هاوبەش

جێنشینکردنی ویستی فەرمانڕەوا لەبری ویستی یەکەیەکەی تاکەکان بە یەکێك لە بنەماکانی مەعریفەناسی و لۆژیکی بەڵگەهێنانەوەی هۆبز لەقەڵەمدەدرێت. لە باری سروشتیدا ویستی تاکەکان ویستی ڕەهایە. ڕەهایە لەو ڕووەوەی کە بە هیچ پێوەر و ڕێسایەك سنووردار نابێت. لە باری سروشتیدا مافی سروشتی بوونی هەیە، چونکە هەموو کەسێك دەزانێت کە خەڵکیش وەکو ئەو مافی ئەوەیان هەیە کە پارێزگاری لە گیانی خۆیان بکەن[٥٧].

بەڵام سەبارەت بە سوود وەرگرتن لەم مافە دادوەرێکی هاوبەش لە ئارادانییە و ئەم کارەش بەواتای ئەوەیە کە هەر کەسە و سەبارەت بەچۆنیەتی سوود وەرگرتن لە مافی پاراستنی خود دادوەری خۆیەتی. ئەم کارە مایەی ناسەقامگیری و نائاسایشییە. کەواتە مرۆڤەکان بە پێکهێنانی بارێکی مەدەنی مافی دادوەری خۆیان بەو بوونەوەرە دروستکراوە دەسپێرن. باری مەدەنی یان کۆمەڵگای سیاسی ئەفراندنی ئازادی ویستە ڕەهاکانە. کۆمەڵگای مەدەنی بە سپاردنی ئارەزوومەندانەی مافی سروشتی و ئازادی سروشتیی تاکەکانی پێشوو شوێنکەوتوانی ئێستا لە چوارچێوەی گرێبەستێکدا دادەمەزرێت. ئەم دەسەڵاتە فەرمانڕەوایە خۆی شوێنکەوتووی یاسا نییە چونکە یاسا بەو شێوەیەی کە باسکرا ئەرك دروست دەکات نەك ماف. دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی یان فەرمانڕەوا شوێنکەوتووی عەقڵی بە کۆمەڵیش نییە. یاسا فەرمانی فەرمانڕەوایە. بەم شێوەیە ئەو عەقڵ و ویستانەی کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی دروستدەکەن دەگۆڕێن بۆ عەقڵ و ویستی فەرمانڕەوا.

لە کۆمەڵگایەکدا کە بەم شێوەیە دروستدەبێت نابێت هیچ ویستێك بەرامبەر بە ویستی فەرمانڕەوا ڕابوەستێت چونکە ئەم کارە بەواتای تێکدانی هەلومەرجی ئاشتی و ئاسایش و ئاراستەی سەرەکی کۆمەڵگای سیاسییە. دەبێت هەموو ویستەکان بگواسترێنەوە بۆ ویستی یەك بوونەوەری دروستکراو یان یەك نوێنەری دەستکرد. بەڵام ئەوەی کە لەم کردارەوە دێتە بوون ویستێکی هاوبەش نییە، بەڵکو ویستی تاکی ئەم کەسێتییە دروستکراوەیە. دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە تیۆرەکەی هۆبزدا دەسەڵاتێکی ڕەهایە. یەکڕاست مافەکانی تاك بە فەرمانڕەوا سپێردراوە. دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دەسەڵاتێکی تایبەتی و هەمیشەییە. ناکرێت سەبارەت بە مەشروعییەتی فەرمانی فەرمانڕەوا بۆ هیچ شوێنێك داوا بەرزبکرێتەوە.

57- Leo Strauss, op. cit.





هەڵبەتە ناکرێت تیۆرەکەی هۆبز ببەسترێتەوە بە دیکتاتۆری یان تۆتالیتاریانیزمەوە. ڕاڤەکارەنوێیەکان زۆر لەم بە هەڵە بیرکردنەوەیە دەربارەی تیۆرەکەی هۆبز دوورکەوتونەتەوە. ماوەیەك دانە پاڵی هۆبز بەگرووپی لایەنگرانی تۆتالیتاریانیزم و تەنانەت نازیزم و فاشیزمیش لە نێوان زۆرێك لە ڕەخنەلێگرانی ناوبراودا باوبوو. یەکێك لە ڕەخنەگران فەلسەفەی هۆبزی بە فەلسەفەی تیرۆر و زۆرداری (تیرانی) ناودەبرد[٥٨]. ڕەخنەگرێکی تر دەڵێت، گەرچی هۆبز لە بنەما و پێش گریمانە عەقلانییەکانەوە دەست پێدەکات بەڵام لە وێوە پێویست بوونی تۆتالیتاریانیزم هەڵدەهێنجێت[٥٩]. بیر بەهەڵەچووتر لەم دووره ڕەخنەگرێکە کە دەڵێت لڤیاتان سەبارەت بە نازیزم و فاشیزم و کۆمۆنیزم شتگەلێکی زۆرمان پێ فێردەکات. بەڵام ئەمڕۆکە ئەم شیکردوانە کە ڕەنگە لەلایەن ڕۆشنبیرانەوە لە هەلومەرجی کاردانەوە لە دژی فاشیزم و نازیزم دروستبووبێت هیچ لایەنگرێکی نییە و بەتێگەیشتنێکی نزمی بیری هۆبز لەقەڵەمدەدرێت.

تیۆرەکەی هۆبز هیچ پەیوەندییەکی بە تۆتالیتاریانیزم یان فاشیزمەوە نییە. ڕەهابوونی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە تیۆرەکەی هۆبزدا زیاتر بەواتای ڕەهابوونی فەرمانڕەواییەکە پاشتر بە جۆرێکی تر لەلایەن بیرمەندانی پاشترەوە قبوولکرا. هۆبز نەك تەنها پەیوەندی نییە بە تۆتالیتاریانیزمەوە بەڵکو بە بڕوای گەلێك لە بیرمەندان دامەزرێنەری لیبرالیزمیشە[٦٠]. لە تیۆرەکەی هۆبزدا فەرمانڕەوا دەست لە ژیانی تایبەتی و کەسیی خەڵکی وەرنادات. دانانی ئاین لە چوارچێوەی دەسەڵاتی فەرمانڕەوادا تەنها بۆ دابینکردنی ئاشتی و سەقامگیری کۆمەڵگایە. بە واتایەکی تر مەبەستی هۆبز لایەنی دەرکیی کۆنترۆڵی فەرمانڕەوا بەسەرئاینەوەیە.

## یەکبوونی ویستی تاکەکان لە ویستی فەرمانڕەوادا

بەم شێوەیە لە تیۆرەکەی هۆبزدا فەرمانڕەوا خاوەن دەسەڵاتێکی زۆرە و ئەگەر فەرمانڕەوای ڕەهایش نەبێت بەلای کەمەوە فەرمانڕەوای دەسەڵاتخوازە. هۆبز لەگەڵ ئەوەی کە هەیکەلی بیری سیاسی نوێی دامەزراند بەڵام بە گواستنەوەی ویست و مافی تاکەکان بۆ فەرمانڕەوا لڤیاتانێکی لێ دروستکرد کە باڵی کێشا بەسەر ویست و مافی دروستکەرە بنەڕەتییەکانیدا. بەم شێوەیە بیری سیاسی نوێ لە سەرەتای ڕێگەکەدا بەهەمان شێوە کە تەواوی سەرچاوەکانی دەسەڵاتی سیاسیی

58- Rober Maclur, Leriathen and the people, Baton Rouge 1939, p. 95.
59- Z. Lubiensky "Hobbes philosophy and its historical background" , Journal of philosophical Studis vol 18 (1930) pp. 238.
60- R. H. Crossman. Government and Governed, London 1940, p. 69.

لەهێزە میتافیزیکییەکان وەردەگرتەوە هەمووی لە یەك شوێندا بەدەسەلاتێکی نوێ دەسپارد کە گەرچی بەرهەمی عەقڵ و ویستی تاکەکان بوو بەڵام بە جۆرێکی تر لێیان نامۆ دەبوو و لە بەرامبەریاندا رادەوەستا. بەواتایەکی تر هۆبز هەموو ئەو شتانەی کە لە خودای ئاسمانییەوە وەریگرتەوە بەخشییە خودای زەمینی. بەم جۆرە بیری سیاسی رووبەرووی دەرکەوتنێکی تری نامۆبوون لە خۆی بویەوە کە هەڵبەتە زاڵبوون بەسەریدا دژوارییەك کەمتری هەبوو و هەروەها پێویستی بە کاتێکی کەمتر هەبوو. لڤیاتان یان خودای زەمینی هۆبز بەرهەمی بەناچاری هێز گەلێکە کە لەناو ناخی خودی مرۆڤدا حەشارماوە بەڵام کاتێك کە روو بە دەرەوە رەنگدەداتەوە خێرا لەو نامۆ دەبێت و لە بەرامبەریدا رادەوەستێت. لڤیاتان بەرهەمی ویستی تاکە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای سیاسییە بەڵام بۆخۆی دەگۆڕێت بۆ ویستێکی جیاوازی جیالەوان. ئەم ویستە جیا لە تاکە و بریتییە لە سەرچاوەی هەموو ماف و ئەرکێك و تەنها سەرچاوەی یاسایە.

ئێستا فەلسەفەی سیاسی نوێ لەسەرەتای حەوت خانێکی نوێدا بوو کە بەزاڵبوون بەسەریدا دەبوو بەو خودئاگاییە بگات کە فەرمانڕەوا بەرهەمی هاوبەشیی ویستەکانی خودی ئەوانە نەك ویستگەلێکی جیا لەویستی ئەوان. و ئەمە واتە هەمان زاڵبوون بەسەر لەخۆ نامۆبووندا کە بریتییە لە هێڵی بەڵگە هێنانەوەی ئەم کتێبە، رێگەیەك کە دەبێت لە میانەیدا بیری سیاسی نوێ بەخود ئاگایی بگات و بەسەر لەخۆ نامۆبووندا زاڵبێت رێگەیەکە کە دەبێت لەمیانەی پاژەکانی پاشتردا لێی بدوێین. بەڵام بەر لەمە ئاماژەکردن بە چەند خاڵێکی تر لە بیری هۆبزدا کارێکی پێویستە. گرنگترین خاڵ بریتییە لە توانای خودی بیری هۆبز بۆ کامڵبوون لە بیرەکانی پاشتردا کە تا بەئێرە ئاماژە بە چەند لایەنێکی کرا. لەوانە ئاماژە بەلایەنی هاوبەشی فەرمانڕەوا لە تیۆرەکەی هۆبز لەگەڵ ویستی گشتی لە تیۆرەکەی هۆبز و کانت و هیگڵ کرا کەجێی خۆیەتی جارێکی تر جەختی لەسەربکەینەوە، هەرچەندە کە روونکردنەوەی باسێکی دوور و درێژە و لە باسەکانی پاشتردا دێینەسەری.

هۆبز کە دروستبوونی ئەرکی کاریگەر ((بەهێزی دەرەکی)) بە بەستنی گرێبەست و جێگیربوونی فەرمانڕەوا مەرجدار دەکات و فەرمانڕەوا بەسەرچاوەی ئەرکی سیاسی و یاسایی دەناسێنێت رێگە بۆ تیۆری ((ویستی گشتی)) کە ویستی خەڵکی لە میانەی بەشدارییە هەمەلایەنەکان دەکاتە سەرچاوەی ئەرك و یاسا دەکاتەوە. لەراستیدا وەها وەرچەرخانێك لەبیری سیاسی نوێدا وەرچەرخانە لە لڤیاتانەوە بۆ ویستی گشتی یان لڤیاتانی راستەقینە. بەهەرحاڵ چیرۆکی ئەم وەرچەرخانە چیرۆکێکی بێ کێشە نییە و لە شوێنی خۆیدا باسی لێوەدەکەین.






**ڕەهابوونی فەرمانڕەوایی یان ڕەهابوونی فەرمانڕەوا**

تیۆرەکەی هۆبز وەکو شمشێرێکی دوو دەم وایە. هەم دەکرێت بۆ ئاراستەکردنی فەرمانڕەوایەکی دەسەلاتخواز سوودی لێ وەربگیردرێت و هەم بە پێچەوانەوە لەدژیدا، هەروەك چۆن دیکترینی گرێبەستی کۆمەلایەتی ناوبراو بەدەستی میراتگرەکانی گۆڕا بە ئامرازێك بۆ ئاراستەکردنی حکوومەتی سنووردار (لۆك) و ویستی گشتی رۆسۆ. بنەڕەتی ویست و رێکەوتن لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسیدا بنەرەتگەلێکی نوێ بوون کە لەلایەن هۆبزەوە گۆڕان بە تیۆرێکی ئەلتەرناتیڤ لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسیدا و پاشی ئەو بەرە بەرە بیری سیاسیان کردە مەیدانی ئامادەبوونی خۆیان. تیۆرەکەی هۆبز ئاسۆیەکی نوێی لەبیری سیاسیدا کردەوە کە لە هەمان روانگەوە کەوتە بەر رەخنە. لێرەدا و لە گۆشەنیگای هەمان ئاسۆوە ئاماژە بە هەندێك لە رەخنە و ناکۆکییەکانی تیۆرەکەی هۆبز لە بارەی دیارخەرە گشتییەکانی دەوڵەتی جێ مەبەستی ئەو دەکەین تاوەکو بە هەڵسەنگاندنەوەی ئەم تیۆرە رێڕەوی وەرچەرخانی پاشتری فەلسەفەی سیاسی نوێیشمان خستبێتەڕوو.

سەیر لەوەدایە کە خودی هۆبزیش دەیزانی تا ئەوجێیەی کە پەیوەست دەبێت بە ناوەڕۆکی حکوومەتەوە شمشێرێکی دوودەمی خستوەتە بەردەست[٦١]. هۆبز دەڵێت گرێبەستی سپاردنی هاوکاتی مافە سروشتییەکانی تاکەکان بە فەرمانڕەوایەك هەموویان دەگۆڕێت بۆ یەك ((کەس)). تا ئەوکاتەی کە خاوەن فەرمانڕەوایەکن حوکمی یەك کەسیان هەیە. هۆبز دەیزانی کە رەنگە ئەم یەك بوونە لە دژی خودی فەرمانڕەوادا بەکاربرێت. هەربۆیەش بەڵگەدێنێتەوە کە یەکێتی بریکار دراوەکان (تاکەکان) نییە کە کۆمەڵگا دەگۆڕێت بۆ یەك ((کەس)) بەڵکو یەکێتی بریکار (فەرمانڕەوا)یە کە یەکێتی دەبەخشێتە کۆمەڵگا.

تیۆرەکەی هۆبز لەو روانگەیەوە کەوتە بەر رەخنە کە گرێبەستە کۆمەلایەتییەکەی بە بەدوور لە هەڵوەشاندنەوە باسکراوە. وەها تایبەتمەندییەك دەبێتە هۆی ئەوەی کە گرێبەستی کۆمەلایەتی سپاردن بچووك ببێتەوە. جگە لەمە ئێستا کە دەکرێت لەسەربنەمای گرێبەست دەوڵەت دروستبکرێت بۆچی ناکرێت لەسەرهەمان بنەما سنووردار بکرێت؟ ئەمە ئەو کارە بوو کە لۆك پێی هەڵسابوو. بە هەمان شێوە ئەم پرسیارەش هاتە ئاراوە کە بۆچی دەبێت یەکەمین هەنگاو لە بەستنی گرێبەستدا دوایین هەنگاو بێت. بۆچی دەبێت تەنها یەك جار گرێبەست ببەستن و بۆ هەتاهەتایە

61- Ernst Cassirer. The mythof the state, Yale University press, 1946, p. 175.

حکوومەت بە فەرمانڕەوایەك بسپێرن. یەکێك لە پاشکۆکانی ئەم گرێبەستە سەرهەڵدانی ئەو بارە ناکۆکەییە کە تاکەکان تەواوی ئازادی و دەسەڵاتەکانی خۆیان بۆ فەرمانڕەوا بگوێزنەوە و لەوە بەدواوە وەکو بوونەوەر گەلێکی سەربەخۆ و خاوەن ویستێکی تایبەت بە خۆیان بونیان نەبێت(؟) ئایا دەکرێت وەها بیرێك بە گرێبەستی کۆمەڵایەتی پاساوی بۆ بهێنرێتەوە؟ هۆبز دەڵێت پاراستنی خود خاڵی سەرەکیی هەنگاونانە بەرەو گرێبەستی کۆمەڵایەتی و دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسیی، ئایا ناکرێت لەسەربنەمای ئەم وێنایانە بوترێت کە تاکەکان بە حوکمی پاڵنەری پاراستنی خود و بەرژەوەندییەکان نابێت بەدەست بەستراوی خۆیان بدەنە دەست دەسەڵاتی فەرمانڕەواییەوە؟ بۆچی نابێت ئەو مرۆڤانەی کە ئەو هەموو گرنگی بە ئاسایشی خۆیان دەدەن لە هەمان ئەوکاتەی کە دەسەڵاتێکی فەرمانڕەوایی پێکدەهێنن لە بەرامبەر دەست درێژییەکانی حکوومەتدا مافگەلێکیش بۆ خۆیان لەبەرچاو بگرن[٦٢]؟.

ڕەنگە بکرێت لە بەرامبەر ئەم ڕەخنانەدا ئەم تێبینانە بخرێنەڕوو کە بە قازانجی تاکەکان نییە کە ڕێساگەلێك بۆ چوارچێوەی ملکەچی کردن لە حکوومەت دابنێن. هەروەها بە قازانجی تاکەکان نییە کە فەرمانڕەوایی دابەش ببێت. نابێت ملکەچی هاولاتیان بە چەند مەرجێك مەرجداربێت. درکاندنی ئەوەی کە حکوومەت بە هۆیەك لە هۆیەکان و لەسەربنەمای ماف یان نەریت یاخود بنەڕەتی ئەخلاقی سنووردارە بەو واتایە یەکە تاك دەتوانێت لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا ملکەچی لە حکوومەت نەکات. بۆ نموونە یاسایەك هەیە کە ئەگەر فەرمانڕەوا بیبەزێنێت هاولاتیان دەتوانن لە بەرامبەریدا بەرگری بکەن. لەم حاڵەتەدا دوو جۆر یاسا بوونیان دەبێت: یاسایەك کە چوارچێوەی ملکەچی هاولاتیان دیاری دەکات و یاسایەکی تر کە سنووری دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوا بەدیار دەخات. بەڵام هۆبز دەڵێت ئەگەر زیاتر لە یەك یاسادانەر هەبێت ئەوا لەم حاڵەتەدا ئارامی و ئاسایش بوونیان نابێت. بەم شێوەیە ئەگەر حکوومەت مەرجدار بێت ئەوا ململانێ کارێکی حەتمییە. ململانێ لەنێوان مافەکانی هاولاتیان و دەسەڵاتەکانی فەرمانڕەوا. سەرچاوەیەکی تریش بۆ دادوەری کردن دەربارەی ئەگەری ململانێ لەسەر مافەکان و دەسەڵاتەکان لە ئارادا نییە و ئەگەر هەشبێت لەڕاستیدا ئەو دەبێتە فەرمانڕەوا.

وادیارە لێرەدا هۆبز و بیری سیاسی نوێ ڕووبەڕووی لوغزێك بوونەتەوە. واپێدەچێت هەر ڕێکەوتنێك دەربارەی سنووردار بوونی دەسەڵاتی فەرمانڕەوا شتێکی خەیاڵی بێت و تەنها کاتێك درێژەی هەبێت کە کاری پێ نەکرێت. بەڵام هەر لەگەڵ ئەوەی کە بیانەوێت کاری پێبکەن لێکدانەوەگەلێکی جیاواز دێننە ئاراوە و پێویستیی هەبوونی سەرچاوەی سێیەم وەکو لێکدەرەوە و ڕاڤەکاری کۆتایی سەرهەڵدەدات، تا ئەوکاتەی کە وەها لێکدەرەوە و ڕاڤەکارێك دیاری نەکراوە ئاشتی و ئارامی لە مەترسیدایە و کاتێك کە سەرچاوەی لێکدانەوەی کۆتایی پەیدابوو ئەم سەرچاوەیە دەبێتە فەرمانڕەوا[٦٣].

لە ڕاستیدا ئەم لوغزەی کە لەبەردەم فەلسەفەی سیاسیدا بوو لوغزێك بوو پەیوەست بە پرسی فەرمانڕەوایی. پاشتر ئەم لوغزە بە پەنابردن بۆ بنەڕەتی فەرمانڕەوایی یاسا (لەبری فەرمانڕەوایی تاکەکان)، هەروەها فەرمانڕەوایی ویستی گشتی چارەسەرکراو پاشتر ڕوونکردنەوەکەی دەخەینەڕوو. بەڵام دەکرێت لێرەدا ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە فەلسەفەی سیاسی نوێ ئەو بنەڕەتەی سەلماند کە هیچ ناکۆکییەك لەنێوان دابەشکردنی دەسەڵات بەسەر ئۆرگانە جیاوازەکاندا و یەکبوونی فەرمانڕەواییدا نییە. ئەمڕۆکە ئەو بنەڕەتە قبوولکراوە کە دەسەڵات لەنێوان ئەنجوومەنە یاسادانەرەکان و دەسەڵاتی جێبەجێکردن و دیوانی باڵادا دابەشبکرێت. ئەم سێ دەسەڵاتە یەکدی سنووردار دەکەن بەڵام هیچ یەك لەوان خاوەن دەسەڵاتێکی بێ مۆڵەت لە دوو دەسەڵاتەکەی تر نییە. ئەم کارە بەدوو شێوە بە ئەنجام گەیشتووە کە هەریەك لە سێ دەسەڵاتەکە بەپێی بنەڕەتگەلێك کە لە یاسای بنەڕەتیدا هاتووە دەسەڵاتی خۆیانیان لە دەستدایە. یاسای بنەڕەتی دەسەڵاتی هەرسێ دەسەڵاتەکە و ڕێگەچارەکانی ناکۆکیە ئەگەرەکانی نێوان هەرسێ دەسەڵاتەکەی دیاریکردووە. هەریەك بەپێی یاسای بنەڕەتی دەسەڵاتگەلێکی دیاریکراویان هەیە و هەریەك هەمان قازانجیان هەیە لە ملکەچی کردن لە یاساکە هاولاتیان بەپێی تیۆرەکەی هۆبز بە ملکەچی کردن لە فەرمانڕەوا دەستیان دەکەوێت.

ئەمە ئەو پرسە بوو کە دەبوو فەلسەفەی سیاسی نوێ لە هەنگاوەکانی پاشتری گەشەکردنی خۆیدا بکەوێتە چارەسەرکردنیان و هەروەك دەبینین بێنتهام و ڕۆسۆ لەو کەسانەبوون کە هەریەك بەشێوازی خۆیان ئەم لوغزەیان چارەسەرکرد. هەروەها ئەو پرسەیشی کە بە گرێبەستی سپاردنی ماف لە جۆری گرێبەستەکەی هۆبز کە زیان بە کەسێتی تاك دەگەیەنێت یەکێتی و یەکبوون بەرهەمنایەت. ڕۆسۆ ئەم تیۆرەی خستەروو کە بەهای ئەخلاقی دەوڵەت لەوەدایە کە بەسەرتاکدا نەسەپێندرا بێت و لەڕاستیدا هەرکەسە و بەملکەچی لێکردنی ملکەچی لەویستی خۆی کردبێت.

62- John Plamenatz, lidan and Society, London, Longman, 1963, p. 148.

63- Leo Strauss, op. cit. p.150.







بەکورتی ئەوەی کە هۆبز لەتیۆرەکەی خۆیدا بەرامبەر بەوەی کە بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی بەدەستێکی بەخشیبوویە تاکەکان بەدەستەکەی تری لەژێر ناونیشانی پەیڕەویکردن لێی وەرگرتبوونەوە. بەم شێوەیە لوغزێك کەوتبووە بەردەم فەلسەفەی سیاسی نوێ کە دەبوو توانایەکی زۆر بۆ چارەسەرکردنی تەرخانبکرێت(٦٤).

## بە کورتی

بیری سیاسی نوێ کە ماکیاڤیلی بناغەکەی نیشاندابوو هۆبز بینایەکی بە مەزنی ئەو بناغەیە دامەزراند و لە بەرامبەر بیری سیاسی کلاسیکیدا داینا کە دەوڵەت بەهێزێکی دەرەوەی ویستی ڕێکخەری مرۆڤ دادەنا. هۆبز دەوڵەتی بە دامەزرێنداوێکی مرۆیی و وەکو ڕێکییەك دەستنیشانکرد کە تاکەکانی مرۆڤ بۆ بەدیهێنانی پێداویستییەکانی خۆیان دروستیانکردووە. بۆیە ویستی بەرگری لە مەبەستی عەقلانیی دەوڵەت بکات و نیشانیبدات کە دەسەڵاتی سیاسی و ملکەچی لێکردنی پاساوی عەقلانیان هەیە. حکوومەت دامەزراوێکی سروشتی یان خودایی نییە کە بکەوێتە دەرەوەی سنووری پیاداچوونەوە و مرۆڤیش ئەرکدار نییە کە بەشێوەی کاردانەوەیی قبوولێبکات، بەڵکو دەبێت بەپێی خواستی عەقڵ قبوولێبکات و شوێنی بکەوێت.

هۆبز لە دامەزراندنی دەوڵەتدا ویست و ڕەزامەندی و پەیمانی کۆمەڵایەتی بە بنەڕەتگەلێکی لەپێشتر دانا و لە چوارچێوەی سیستەمێکی فەلسەفەی گەورەدا بیری دروستکراوبوونی دەوڵەتی بۆ بەرزترین ئاست فراوان کردەوە. هۆبز لە بەرامبەر بیری کلاسیکیدا کە باسەکانی خۆی لە پاساوە دەستپێدەکات تیۆرەکەی خۆی لە چەمکی ویستەوە دەستپێکرد و ئەم چەمکە بووە چەقی گەورەترین تیۆرە سیاسییەکانی قۆناغی پاشتر.

ئێمە لەم پاژەدا تیۆری ئەرکی هۆبزمان وەکو چەقی فەلسەفەی سیاسی ناوبراو خستووەتەبەر باس و پیشانمانداوە کە چۆن هۆبز پاساوی عەقلانی بۆ مەشروعیەتی دەسەڵاتی دەوڵەت و ئاستی دەسەڵاتی حکوومەت و ئەرکی ملکەچکردنی هاوڵاتیان دێنێتەوە. هۆبز کە خستنەڕووی چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەت لەسەربنەمای حەز و مافی سروشتی مرۆڤەکان لە پاراستنی خود دەکاتە خاڵی دەستپێکی خۆی، هەلومەرجێك بۆ باری بەر لە دامەزراندنی دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی وەکو باری سروشتی وێنە دەکێشێت کە تیایدا مرۆڤەکان لە ترس و نائاسایشیی بەردەوامدا ژیان

64- Leo Strauss, op. cit. p.151.





بەسەردەبەن. چارەسەری ئەم کارە بۆ دەربازبوون لەم بارە ئەوەیە کە هەموان لەمیانەی گرێبەستێکدا مافی پاراستنی خود و سەقامگیرکردنی ئاسایش بۆ دامەزراوێکی دروستکراو (تاك یان دەستەیەك لە تاکەکان — ئەنجوومەن) کە دەکەوێتە دەرەوەی گرێبەستەکەوە بگوێزنەوە. بەم شێوەیە لڤیاتانێك دروستدەبێت کە هەروەکو خودای سەرزەوی دروستکەری ماف و ئەرکی هاوڵاتیانە. گەرچی بەرهەمی ویستی ڕێکخەری تاکە ئەفرێنەرەکانی خۆیەتی بەڵام چیدی ویستێکی تایبەت بەخۆ و جیا لەویستی ئەوانی هەیە. ئیدی هیچ بەرپرسیارێتییەکی لە بەرامبەر هاوڵاتیاندا نییە جگە لە بەرگری کردن لە ئاسایشی ئەوان. و هاوڵاتیانیش هیچ کۆنترۆلێکیان بەسەر ئەم خودای سەرزەوییەوە نییە. بەم شێوەیە هۆبز بەشێکی زۆری ئەوەی کە بەناوی ویستی مرۆییەوە لە خودای ئاسمانی وەرگرتبوو بەخودای سەرزەویی بەخشی. بەم جۆرە جارێکی تر بیری سیاسی تووشی جۆرێك لە نامۆبوون لەخۆ هات، بەڵام جۆرێك کە هەلومەرجێکی نوێ بۆ لێ ڕزگاربوونی فەراهەم بوو. بیری سیاسی نوێی لە ماوەکانی پاشتردا قۆناغ بە قۆناغ خۆی لە نامۆبوون لەخۆ ڕزگار کرد و تەواوی دەسەڵاتی دەوڵەتی بۆ سەرچاوە ڕاستەقینەکەی واتە هاوڵاتیان گەڕاندەوە. لۆك لە یەکەمین هەنگاوی پاش هۆبزدا کەوتە خستنەڕووی ئەو پرسەی کە: ئەوەی کە ڕەهایە بریتییە لە بنەڕەتی فەرمانڕەوایی نەك دەسەڵاتی فەرمانڕەوا. بەشێك لە دەسەڵاتی فەرمانڕەوای گەڕاندەوە بۆ دەستەیەك لە هاوڵاتیان. بەڵام هێشتا بۆ گەیشتن بەوێستگەی مەبەست ڕێگەیەکی دوور و درێژ مابوو.

## پاژی دووەم:

# دەوڵەت وەکو ویستی زۆرینەی موڵکداران

لە پاژی پێشوودا بینیمان کە هۆبز چۆن پاش ئەوەی کە کۆمەڵگای سیاسیی وەکو ئەنجامی ویستی رێکی بەخشی تاکەکان ناساند تەنها رێگەی یەککبوونی ویستە ناکۆکەکانی بە پەیڕەویکردن لە ویستی یەك فەرمانڕەوای رەها لە قەڵەمدا، فەرمانڕەوایەك کە لە دەرەوەی گرێبەستدایە و بەهۆی ئەوەوە ویستە پەرت و بڵاوەکان بوونەتە یەك. هۆبز هاوکات لەگەڵ بەدواداگەڕانی عەقڵانیەتی دەوڵەتدا عەقڵانیەتی فەرمانڕەوای رەهایشی سەلماند. لەم پاژەدا دەبنین کە چۆن لۆك لەگەڵ قبوولکردنی نەخشە و پێش گریمانەکانی هۆبز چەند گۆڕانکارییەکی تیادا ئەنجامدا کە لە روویەکەوە فەرمانڕەوای رەهای گۆڕی بۆ فەرمانڕەوای مەرجدار و لەلایەکی ترەوە هەنگاوێکی تر نەخشەکەی هۆبزی رووەو رەوتی سوودگەرایی بەرەو پێشەوە برد. لۆك مەبەستی کۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ پارێزگاری کردن لە موڵکداری بەرهەم هێنەر بە یەکەوە بەستەوە. هەروەها عەقڵانیەتی بۆ دوو ئاستی جیاواز واتە عەقڵانیەتی موڵکداران و عەقڵانیەتی نەداران دابەشکرد.

بەر لە درێژەدان بە نەخشەکەی پاژی پێشوو خەراپ نییە جۆرێك نەخشەی بۆ چوونەکەی لۆك بخەینەڕوو. دەکرێت بەم جۆرە تیۆرەکەی دەربارەی چۆن و بۆی دەوڵەت کورت بکەینەوە:

١- بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی مرۆڤەکان لە باری سروشتیدا دەژیان (باری سروشتی بارێکی گریمانەییە).

٢- لە باری سروشتیدا مرۆڤەکان لەسەر خواستی عەقڵ لەگەڵ یەکتردا دەژیان بەبێ ئەوەی فەرمانڕەوایەك بەسەر سەریانەوە بێت.

٣- سەرەڕای بۆچوونەکەی هۆبز باری سروشتی ((باری شەڕ)) نییە بەڵکو باری ئازادییە. عەقڵ مرۆڤەکان فێردەکات کە نابێت دەستدرێژی بکەنە سەر گیان و ماڵی یەکتر.





٤- لە باری سروشتیدا موڵکداری بەپێی خواستی خواو لەسەر بنەمای کۆکردنەوەی سامان لە رێگەی کارەوەیە.

٥- بەڵام لە باری سروشتیدا یاسای نووسراو و دادوەری هاوبەش بوونی نییە. بۆیە تاکەکان لەسەر بنەمای گرێبەستی کۆمەڵایەتی هەڵدەستن بە دامەزراندنی دەوڵەت و یاسای هاوبەش.

٦- لە باری نوێدا کە بریتییە لە بارێکی نوێ مافە سروشتییەکان و لەوانەش مافی ئازادی و موڵکداری شێوەیەکی فەرمی لەخۆ دەگرێت.

## فەرمانڕەوای هەتایی و فەرمانڕەوای مەرجدار

لە پاژی پێشوودا بەدرێژی لە تیۆری ئەرکی سیاسی هۆبزمان کۆڵیەوە و وتمان کە دەکرێت ئەم ئەرکە هاوکات لە سێ سەرچاوەوە سەرچاوەی گرتبێت و بە ئاوێتەیەکی ئەرکی فیزیکی (خۆ بەدەستەوەدان) لە بەرامبەر دەسەڵاتی لە پێشتری فەرمانڕەوایەك و ئەرکی عەقڵانی (هەڵسەنگاندنی سوود و زیان و دوورکەوتنەوە لە کردارێك کە بۆ سوودمەندی کەسێك زیانبەخشە) و ئەرکی ئەخلاقی (کرداری ئارەزوومەندانی گواستنەوەی مافی پاراستنی خود بۆ فەرمانڕەوایەك) لەقەڵەمدەدرێت[1]. بە هەموو شێوەیەك تیۆرەکەی هۆبز دەربارەی عەقڵانیەتی ئەرکی سیاسی لە عەقڵانیەتی فەرمانڕەوای رەها کۆتایی هات. لەگەڵ ئەوەی کە فەرزکراوەکانی هۆبز سەبارەت بە ئەرکی سیاسی و پێکهێنانی حکوومەت بووە جێی سەرنجی تەواوی بیرمەندانی پاشتر و هەوێن و سەرچاوەی سەرەکی کامڵبوونی بیری سیاسی بوو لە قۆناغەکانی پاشتردا بەڵام دیکترینی فەرمانڕەوای رەها یاخود فەرمانڕەوای دەسەڵاتخوازی ناوبراو بە توندی کەوتەبەر رەخنەی بیرمەندان. لەسەردەمی خودی هۆبزدا هەموو کۆمەڵ و دەستە سیاسییەکان تەنانەت دەسەڵاتخوازەکانیش رەخنەیان لە تیۆرەکەی گرت و بەتوندی رەتیان کردەوە[2]. لەگەڵ ئەمەشدا هارینگتۆن و لۆك لەو کەسانە بوون کە لایەنە گشتیەکانی تیۆرەکەی هۆبزیان قبوڵکرد و لەسەربنەمای تێڕوانینەکەی ئەو بنەمایەکی نوێیان دەستپێکرد. ئەوان تیۆری دەسەڵاتی فەرمانڕەوای هۆبزیان وەرگرتوو و چەند گۆڕانکارییەکیان تێدا ئەنجامدا کە لەبری حکوومەتی رەها ئەوی بۆ حکوومەتی مەرجدار گونجاو دەکرد.

---

1- Ian Tregenza, op. cit.
2- C. B. Macpherson, op. cit. p.91.

لۆك و هارینگتۆنیش لەسەر ئەو بنەمایە دەستیانپێکرد کە دەبێت لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەسەڵاتی فەرمانڕەوا هەبێت کە هەریەك لە تاکەکان ماف و دەسەڵاتی خۆیانی پێی بسپێرن. بەڵام وتیان پێویست نییە کە دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی بە فەرمانڕەوایەکی هەتایی بدرێت، بۆچی ناکرێت بدرێتە دەستەیەکی هەڵبژێردراو؟ هۆبز لە فەرزکراوەکانی خۆیەوە بە عەقڵانییەتی وەها حکومەتێك (حکومەتی دەسەڵاتخواز) گەیشتبوو بەڵام ئەم جارە لۆك و هارینگتۆن بە هەمان بنەما و ئەو فەرزکراوانەوە تیۆرەکەی هۆبزیان بە نەگونجاو دەبینی. ئەوان دەیانوت بۆچی دەبێت تاکەکان بەگرێ بەستێك کۆببنەوە و بۆ هەمیشە و بێ وەرگرتنەوە دەسەڵات بە تاك یان دەستەیەك بدەن کە لە بەرامبەر ئەواندا هیچ بەر پرسیاریەتێکی نییە و پاش سەقامگیربوون دەبێتە هەتایی و ڕەها؟ لۆك و هارینگتۆن دژی فەرمانڕەوایی هەتایی نەبوون بەڵام فەرمانڕەوای هەتاییان پەسەند نەدەکرد. باری سروشتی بەو شێوەیەی کە هۆبز وێنای کردبوو نەیدەتوانی بە شتێکی دیکەی جگە لە سەقامگیربوونی فەرمانڕەوای ڕەها کۆتایی بێت بەڵام لۆك وێنەیەکی بۆ باری سروشتی بەدەستەوەدا کە بەرەهابوونی بنەڕەتی فەرمانڕەوایی کۆتایی دەهات نەك فەرمانڕەوای ڕەها. کەواتە لۆك بەدەستپێکردن لە بنەماکانی هۆبزەوە تیۆرێکی سیاسی نوێی خستەڕوو کە گەرچی لەڕووی گونجانی لۆژیکییەوە دووربوو لە تیۆرەکەی هۆبزەوە بەڵام لە تێڕوانین بۆ فەرمانڕەوایی ئەرکی سیاسی ئاسۆیەکی نوێی لەبەردەم بیری سیاسیدا کردەوە.

لە تیۆرەکەی لۆکیشدا ئەرکی سیاسی لە ماف و حەزی سروشتیی پاراستنی خودەوە دەردەهێنرێت(٣). لۆکیش لە ئەنجامگیرییەکانی خۆیدا لە تاکەوە دەستپێدەکات و بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت هەنگاو دەنێت. تاکەکان بەپێی سروشت سەربەخۆ و خاوەن ویستن و لەژێر سەرپەرشتی هیچ کەسێکدا نین. جەوهەری مرۆڤ لە هەموو پەیوەندیەك جگە لەو شتەی کە خۆی بە لەبەرچاوگرتن و بەپێی ویستی خۆی دەچێتە ناوییەوە، سەربەخۆیە. مرۆڤ خاوەن هەموو تایبەتمەندییەکانی خۆیەتی و هیچ یەك لەوان قەرزاری خۆی نییە. تاك دەتوانێت هێزی کاری خۆی لەخۆیدا بهێڵێت بەڵام سەبارەت بە تەواوی کەسێتی خۆی ناتوانێت. کۆمەڵگا بریتییە لە زنجیرە پەیوەندییەکی نێوان تاکگەلێك کە خاوەن گیان و ماڵی خۆیانن. دەوڵەت و کۆمەڵگای سیاسی ئامادەسازییەکە بۆ پاریزگاریکردن لە موڵکی تاکەکان (موڵك بە واتا

3- Leo Strauss op. cit, p. 221.





گشتییەکەی واتا گیان و ماڵ و سامان) و ڕێکخستنی کاروبارەکان بەپێی ئاراستەی ئەم مەبەستە. یاسای سروشتی لۆکیش کەم تا زۆر هاوشێوەی یاسای سروشتی هۆبزە. لەباری سروشتیدا هەموو کەسێك مافی پاراستنی خودی خۆی هەیە(٤). ئەم مافە ئامرازەکانی پاراستنی ژیان لەخۆ دەگرێت. سەبارەت بەم بابەتانە هەر کەسە و دادوەری خۆیەتی و ئەمە بەترس و مەترسی و ناسەقامگیری کۆتایی دێت. عەقڵ فەرمان دەدات کە ڕێگەی ئاشتی بگیرێتەبەر و پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنیش تەنها ڕێگەی دابین کردنی ئەم مەبەستەیە(٥). بەڵام لۆك لە دوو خاڵی گرنگدا چەند گۆڕانکارییەکی لەم نەخشەیەدا دروستکرد: یەکەم هەوڵدەدات کە نیشانیبدات بنەڕەتی جێی مەبەستی هۆبز واتا ماف و حەزی پاراستنی خود نەك تەنها نابێت بە حکومەتی ڕەها کۆتایی بێت بەڵکو بەپێچەوانەوە دەبێت بە حکومەتی سنووردار کۆتایی بێت. دوورکەوتنەوە لە دەسەڵاتی ڕەها و زەبر و زۆر باشترین پارێزگاری مافی پاراستنی خودە. هەر شتێك کە لەگەڵ مافی پاراستنی بنەڕەتی پارێزگاریکردن لە خود نەگونجاوبێت، هەر شتێك کە بوونەوەری عاقڵ نەتوانێت پێی ڕازی بێت و ڕەزامەندی بەرامبەر نیشانبدات ناتوانێت عەقڵانی بێت. کەواتە کۆمەڵگایەك کە بە زۆر و زاڵبوون جێگیرببێت کۆمەڵگای عەقڵانی نییە(٦). بۆیە لۆك پێی وایە کە بەگرێ بەست حکومەتێکی سنووردار و پشت بەستوو بە یاسا دادەمەزرێت نەك حکومەتێکی ڕەها یان دەسەڵاتخواز.

## وەرگێڕانی عەقڵانیەتی سروشتی بۆ عەقڵانیەتی بازاڕ

نووسینە سیاسییەکانی لۆکیش وەکو نووسینەکانی هۆبز کەوتۆتە بەر لێکدانەوەی جۆراوجۆر و هەندێ جار دژ بەیەك و ئێمە ناچارین سەرەتا لەنێوان لێکدانەوە جیاوازەکان لێکدانەوەیەك هەڵبژێرین کە نزیکە لە ڕاستییەوە، ئەوکات دەربارەی تیۆرەکەی لۆك لەڕووی چۆن و بۆی دەوڵەت و ناوەڕۆکی دەوڵەتەوە بکەوینە گفتوگۆ. سەبارەت بە لۆك هەندێ کات لێکدانەوەکان دەکەونە جەمسەرگەلێکی بەرامبەر بەیەك. لە جەمسەرێکدا لۆك وەکو تیۆرداڕێژێکی پۆپۆلیزم دەبینین بەو ئاراستەیەی کە لۆك تەواوی جیاوازییەکانی پەیوەست بە

4- John Lock Two Treatises of Government, ed. Peter Laslett, Cambridge, 1960.
5- John Lock , op. cit, p.229.
6- ibid, p. 231.

پایە و پەیوەندی و سامانی بە هەڵوەشاوە زانیوە[٧]. لە جەمسەرێکی تردا لۆك وەکو نوێنەری سەرمایەداری تالانچی و چینی ئەرۆستۆکراتە خاوەن زەوی و شازادە بازرگانییەکان ناسراوە[٨]. هەندێك لەو لێکدانەوانەی کە دەربارەی لۆك خراونەتەڕوو ئەویان داوەتە پاڵ ئەم جەمسەرە، بە توندی تیۆری سیاسی ئەم بیرمەندەیان بە لەلایەن دار لەقەڵەمداوە. لە نێوان ئەم دوو جەمسەرەدا لێکدانەوە گەلێك هەن کە لۆکیان بەلیبرال و تیۆردارێژی کۆمەڵگای بازاڕ داناوە. لێکدانەوە گەلێکی تریش هەن کە لۆکیان بە دیموکراتی رادیکال و تەنانەت چەپگەرا لەقەڵەمداوە[٩]. هەندێ کەسی تریش لۆکیان بە دیموکراتی راستەقینە لەقەڵەمداوە. ئەم راڤەکارانە هەوڵدەدەن لە بەرامبەر تۆمەتی لیبرالی و یان لایەنگری لەسەرمایەداری بەرگری لە لۆك بکەن. ئەو کەسانەی کە خوێندنەوەیەکی لیبرالی باو بۆ لۆك رەتدەکەنەوە ئاماژە بەو خاڵە دەکەن کە کێشەی سەرەکی بەریتانیا لەسەردەمی حکوومەتی چارلزی یەکەم و دووەمدا بریتیی بووە لەستەمی حکوومەتێکی رەها کە بەشێوەی جیاواز و بەوەرگرتنی سەرانە جۆراوجۆرەکان خەڵکی تالان دەکرد. بۆیە دەبێت لەم چوارچێوەیەوە بە وردی بڕوانینە بەرگریکردنەکانی لۆك لە موڵکداری و فرەیی. بەرگریکردنی لۆك لە موڵکداری وەکو بەرگریکردن لە ئۆرگانی موڵکداری نەبووە لە بەرامبەر رەوتە یەکسانی خوازەکاندا بەڵکو ئەو بەرگری کردنە لە بەرامبەر ئیمتیازەکانی پاشا و ئەرۆستۆکراتەکان بووە. ئەو دەیویست ئەو کەسانەی کە سەرانە دەدەن بەشدار بکات لە رێکخستنی سیاسەتی و مافی دەنگدان. بە بۆچوونی ئەوان بەرگریکردنی لۆك لە موڵکداری و ئازادی بە واتای بەرگریکردن لە مافی زۆرینەی خەڵکی لە بەرامبەر پاشاو ئاریستۆکراتەکان بووە کە کەمینەیەکیان پێکدەهێنا. بە پێی دەربڕینی ئەم راڤەکارانە لۆك بەرگری لە موڵکداری خەڵکی کردووە نەك لە موڵکداری تاك و بەرگری لە ((ئازادی خەڵکی)) کردووە نەك لە ئازادی تاك. هەروەها دەڵێن کە لۆك هەموو خەڵکی لە کۆمەڵگای سیاسیدا بە بەشدار زانیوە نەك تەنها زۆرینەیەکی نێوان موڵکدارەکان. بە بۆچوونی ئەم راڤەکارانە بەرگری

7- See: William Blackston, Commenetaries on law of England, Philadelphia, Lippincot, 1959.

8- See: Neal Wood The Politics of Lockes' Philosophy, Berkley, 1986.

9- See: Richard Ashcraft, Revolutionery Politics and Lockes Two Treati[illegible] of Government, Princeton University Press, 1986.





کردنی لۆك لە مافەکانی تاك بەشێکە لە تیۆرێکی گشتی تر لەسەر ئەو بنەمایەی کە نابێت هیچ کەسێك بەبێ مافی نوێنەری سەرانە بیگرێتەوە[١٠].

بەڵام بەپێچەوانەی تیۆری لەم دەستەیەوە هەروەك پاشتر باسیدەکەین لۆك باسی لە موڵکداری تاکە کەسی و پەیوەست بەو لە ئازادی تاکەکەسی کردووە. جگە لەمە دانانی لۆك لە ریزی دیموکراتەکان و چەپگەراکان وتەیەکی زۆر جدی نییە. هەروەها ئەگەر لە بەرامبەر لایەنگرانی فەرمانڕەوایی رەهای رادیکال دابنرێت ئەوا دەبێت لە هەڵسەنگاندنی لەگەڵ یەکسانی خوازەکان[١١]ی سەردەمی خۆی بە کۆنسێرڤەتیڤ [پارێزگاران] دابنرێت. ئەم وتەیە پێویستی بە پێشەکی و روونکردنەوەیەك هەیە کە هەر لەم باسەدا و لە شوێنی خۆیدا دەیخەینەڕوو. ئەوەی لێرەدا جێی مەبەست بووە ئاماژەکردنە بەو لێکدانەوە دژیەکانەی کە بۆ نووسینەکانی لۆك کراون. نووسەر بە نۆرەی خۆی لەگەڵ لێکدانەوەیەکی تیۆری سیاسی لۆك هاوڕایەکە لە تیۆری پرۆفیسۆر ماك فێرسۆن[١٢] و لیۆستراوش[١٣] نزیکترە و دوابەدوای خستنەڕووی ئەم پێشەکییە باسی لێوە دەکەین.

## تیۆری موڵکداری لۆك

تیۆری موڵکداری لۆك دڵی تیۆری سیاسی ناوبراوە هەروەك چۆن تیۆری ئەرکی هۆبز میشکی تیۆری سیاسی ئەو بوو. بۆیە دەبێت بۆ تێگەیشتنی تیۆری سیاسی لۆك خستنەڕووی بۆچوونی ئەو دەربارەی دەوڵەت و موڵکداری بگەڕێنیەوە بۆ تیۆری موڵکداری ناوبراو. لۆك تیۆری موڵکداری خۆی لەسەر ئەو گریمانەیە بنیات دەنا کە خودا بەشێوەیەکی هاوبەش زەوی بەخشیوەتە تاکەکانی مرۆڤ و ئەمانیش دەتوانن ئەوەی کە بۆ پارێزگاری و پاراستنی خود پێویستیان پێیەتی لەم موڵکە هاوبەشەوە بەدەستی بێنن. هەر کەسەو خاوەن هێزی کاری خۆیەتی و بە ئاوێتەکردنی کاری خۆی لەگەڵ ئەم موڵکە هاوبەشە دەیکاتە موڵکی کەسیی خۆی. هەڵبەتە دەبێت لە بەفیڕۆدان دوور بکەوێتەوە و بەشی پێویست بۆ کەسەکانی تریش بهێڵێتەوە. ئەم کارە هاووێنەیە لەگەڵ یاسای سروشت و فەرمانی یاسایەش دەربارەی پاراستنی

10- Jacquelin Stevens "The Reasonablness of John Lockes Mayority" Political Theory Vol. 24, No.3, August 1996, pp. 423-463.

11- Levellers.

12- C. B. Macpherson. Op. cit.

13- Leo Strauss, op. cit.

خوده. گەرچی ئاوێتەکردنی کارو سروشت سەرەتا بە شێوەی کۆکردنەوەی میوەو بەرهەمەکانی سروشت بووە، بەلاّم لۆك پاشتر دەلێت کە تاکەکان دەتوانن زەوی دەستنیشان بکەن و بیخەنەژێر رکێفی مولّکداری خۆیانەوە.

هەروەها دەلێت کە مرۆڤەکان بەشێوەیەکی نێوان خودی لەسەر بەکاربردنی پارە و برەوپێدانی رێککەوتوون. بەلاّم ئایا برەو پەیداکردنی پارە لەباری سروشتیدا روویداوە یان لە باری مەدەنیدا، ئەمە بۆخۆی بابەتێکە کە ناکۆکی لەسەرەو پێویستی بەباسکردن هەیە کە هەر لەم باسەدا دێینەسەری. بەپێی ئاماژە دەتوانین بلێین کە پرۆفیسێۆر ماك فیرسۆن کە تیۆرەکەی لۆکی بە ئاراستەکردنی ئابووری بازاڕی سەرمایەداری هەلسەنگاندووە دەلێت کە لە تیۆرەکەی لۆکدا برەو پەیداکردنی پارەو رێککەوتن لەسەری لە باری سروشتیدا بەئەنجامگەیشتوە. هەروەها بڕوای وایە کە گەرچی لۆك مافی یەکسانی لە مولّکدارییی وەکو خالّی دەستپێکی خۆی سەبارەت بە مولّکداری هەلّبژاردووە، بەلاّم لە کۆتاییدا گەیشتۆتە قبوولّکردنی پەیوەندی نێوان کار و سەرمایە و نکولّیکردن لە مافی کرێکاران لە ئاوێتەکردنی کاری خۆیان لەگەلّ سروشتدا. بەپێی ئەم تێگەیشتنە و بەسەرنجدانی ئەوەی کە کۆمەلّناسی بۆ پارێزگاریکردن لە مولّکداری دروستکراوە و لەو شوێنەوەی کە مولّکداری بەشێوەیەکی نایەکسان دابەشبووە دەبێت لە ئەنجامدا بوەترێت کە تەنها ئەو کەسانەی کە خاوەن مولّکن ئەندام بوونی تەواوی کۆمەلّگای سیاسییان هەیە و نەدارەکان ئەندامی تەواوی کۆمەلّگای سیاسی نین[١٤]. بەم شێوەیە ئەگەر تیۆرەکەی لۆك لە شوێنێکدا (حکوومەتی سنووردار) سەبارەت بە تیۆرەکەی هۆبز پێشکەوتنێك لەخۆ پێشاندەدات ئەوا لە شوێنێکی تر (ئەندامبوونی کۆمەلّگای سیاسی) سەبارەت بەو زۆر لە پاشترە. بەلاّم ئەمە بابەتێکە کە پێویستی بە وردبوونەوەی زیاتر هەیە.

تیۆری مولّکدارییی لۆك لەگەلّ بۆچوونی مامۆستا مەزنەکانی زانستە سروشتییەکانی سەدەی حەڤدەیەم هەم روویەکی هاوبەشی گرنگی هەیە و لە هەمان کاتیشدا رووی جیاوازی هەیە. سەرنجدانی ئەم دوو رووەیە کە ناوەڕۆکی تیۆرەکەی لۆك باشتر روون دەکاتەوە[١٥]. خالّی دەستپێکی گرۆسیۆس و پۆفندۆرف بریتییە لە پێشگریمانەی پەیوەست بە ئازادی مرۆڤ. ئازادی پێویستی بە یەکسانی هەیە. هەرکەسە و لە سنووری خۆیدا فەرمانڕەوایە و نابێت دەستدرێژی بکرێتەسەر سنووری هیچ کەسێك. یاسای سروشتی بۆ هەر کەسێك ئەوەی کە پەیوەستە بەو پێی

14- Jack Lively and Andrew Reeve, op. cit, p. 73.
15- R. H. Cox, Lockeon War peace, oxford, clarendon press, 1960.






دەبەخشێت و ئەوەی کە پەیوەست نییە بەولێی وەردەگرێتەوە[١٦]. لە باری سروشتیدا هەرکەسە و سنوری[١٧] تایبەتی خۆی هەیە. ئەم سنوورە بە Suum ناودەبرێت. بەزاندنی ئەم سنوورە شیاوی گەورەترین سزایە. بەلاّم لە باری سروشتیدا ژیان لە بارێکی ناسەقامگیردابوو و کۆمەلّگای سیاسی بۆ پارێزگاریکردن لە سنووری تاکەکان دروستکرا. پاش پێکهێنانی کۆمەلّگا ئێستا کۆمەلّگا بەزاندنی سنووری کەسەکان سزادەدات. هێزی زالّبوون بە کۆمەلّگا دەسپێردرێت.

لە تیۆرەکەی گرسیۆسدا سنوور واتە هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە کەسێکەوە. لە باری سروشتیدا ئەوەی کە پەیوەستە بە کەسێکەوە بریتییە لە گیان و ئابڕووی ئەوکەسە. هەروەها سنوور کاروکرداری تاکیش لەخۆدەگرێت. دەسەلاّت بەسەر کرداردا شیاوی گواستنەوەیە بۆ کەسێکی تریش. بەم پێیە دەکرێت سنووری تاك سنووردار بێت یاخود بەرەو فراوان بڕوات. ئامرازی ئەم گواستنەوەیەش بریتییە لە ویست. هەموو کەسێك دەتوانێت بەشێك لە دەسەلاّتی سەرکرداری خۆی بۆ کەسێکی تر بگوازێتەوە. بەلاّم دەبێت ویستی لایەنی بەرامبەریش چالاك بێت و ئەو شتەی کە بۆی دەگواسترێتەوە جێی قبوولّی ئەوبێت. ئەمەیش ناوەڕۆکی هەموو گرێبەستێکە. ویستی لایەنەکانی گرێبەست بریتییە لە هێزی پێکهێنەری هەموو گرێبەستێك[١٨].

لە باری سروشتیدا هەموو شتێکی سەرزەوی مولّکی هاوبەشی هەموو مرۆڤەکانە. بەلاّم ئەم بارە سەختە گەلێکی بۆ تاکەکانی مرۆڤ دروستدەکرد. بۆ لەناوبردنی ئەم سەختیانە ئۆرگانی مولّکداری پێکهێندرا. لەگەلّ ئەمەیشدا پێکهێنانی مافی مولّکداری پەیوەستە بەرێکەوتنەوە. بە بۆچوونی گرسیۆس ئەم رێکەوتنە دەتوانێت ناوەکی بێت. کاتێك کە تۆ ((دەستت بەسەر شتێکدا گرتووە)) و خەلّکی ئەم کارەی تۆیان قبوولّکردووە، تۆ ئەو شتەت خستووەتە بەر مولّکداری خۆت. بەلاّم پۆفندۆرف سەبارەت بە پێشەکی و گریمانەکانی سەرەوە لەگەلّ گرسیۆسدا هاوڕایە دەلێت کە دەبێت رێککەوتن روون بێت. هەروەها دەلێت بەبێ رێکەوتن مولّکداری دروستنابێت.

16- Karl olivera, Law as Fact, London, Stevens on 1971, p. 8.
17- Sphere.
18- Karl Oliverra, "Appropriation in the State of nature: Locke on the origin of property" in Jack Lively and Andrew Reeve, op. cit, p. 84.

لەرووی گشتێتییەوە گریمانەکانی لۆکیش وەکو گریمانەکانی گرسیۆس و پۆفندۆرف وایە. ئەویش دەڵێت لەباری سروشتیدا یاسای عەقڵ حوکمڕانە و فێرمان دەکات کە هەمووان یەکسان و ئازادن و نابێت دەستدرێژی بکرێتە سەر گیان و ماڵی یەکتر[19].

هەروەك ئاماژەی پێکرا لۆکیش وەکو گرسیۆس و پۆفندۆرف بڕوای وایە کە خودا بەشێوەیەکی هاوبەش گۆی زەویی بەخشیوەتە مرۆڤ. پرسیار لەوەدایە کە چۆن ئەم موڵکە هاوبەشە دەچێتە شێوەی موڵکی تایبەتییەوە. گرسیۆس و پۆفندۆرف بۆ بەدەستهێنانی موڵکداری ڕێکەوتنیان خستەڕوو. ڕێکەوتن بۆ ئەوە پێویستە کە خەڵکی چاوپۆشی لە مافی خۆیان بەسەر شتێکەوە بکەن کە دەچێتە خانەی موڵکداری کەسێکی ترەوە. بەڵام لۆك لەم بارەیەوە لە گرسیۆس و پۆفندۆرف جیادەبێتەوە. لۆك دەڵێت ئەگەر خودا زەوی و بەروبووم و گیاندارانی بە مرۆڤ بەخشیوە کەواتە دەبێت بکرێ بەشێوازێکیش دەستیان بەسەردا بگیرێت و بخرێنە بەر موڵکدارییەوە. بەڵام ناکرێ بۆ بەموڵك کردنی شتێك ڕەزامەندی هەموو مرۆڤەکانی جیهان بەدەست بهێندرێت[20]. لۆك دەڵێت ئەو شتەی کە تاك کاری خۆی پێوە تێکەڵ کردووە دەکەوێتە سنووری ئەوەوە و دەبێتە موڵکی ئەو. ئەو شتەی کەمن کاری خۆمم پێوە تێکەڵکردووە بووەتە هەڵگری شتێك زیاتر لەوەی کە پێشتر هەبوو. کەواتە ئەو شتەی کە کاری کرێکاری پێوە تێکەڵبووە موڵکی کرێکارە.

لۆك بەڕوونی پرۆسەی موڵکداری ڕوون ناکاتەوە هەربۆیەشە تیۆرەکەی تەم و مژاوییە و لێکدانەوە گەلێکی جۆراوجۆری بۆ کراوە. سەبارەت بەشتە گواستراوەکانیش لۆك نموونە گەلێك دێنێتەوە کە باس لەوە دەکەن دەستگرتن بەسەر شتێکدا وەکو بە موڵك کردنی ئەو شتە وایە: ((ئەو ئالیکەی کە ئەسپەکەی من خواردوویەتی و ئەو گیایەی کە خزمەتکارەکەی من بڕیوێتییەوە))[21]. سەبارەت بە زەوی و شتە ناگواستراوەکانیش لۆك هەمان بۆچوونی هەیە. هەر پارچە زەوییەك هی ئەو کەسەیە کە دەیچێنێت. بەڵام پرسەکە لەوەدایە کە هەرکەسە و دەتوانێت تا چەندە زەوی بۆخۆی دیاری بکات؟ لۆك دەڵێت هێندە کە بتوانێت دایبچێنێت و چوارچێوەکەی دیارییکات و سوود لە بەرهەمەکەی وەربگرێت. کاتێك کە زەوی بەشی پێویست

19- Karl Olivera, "Appropriation in the State of nature: Lockeon the origin of property: in Jack Lively and Andrew Reeve, op. cit, p.84.
20- Ibid, p. 91.
21- Jhon Locke, op. cit, p. 28.



هەبێت ئیدی دەست بەسەراگرتنی لەلایەن منەوە دەستدرێژی کردنە سەر مافی خەڵکی نییە بەڵام کاتێك کە زەوی بەشی پێویست نەبێت ئەوکات چۆن دەبێت؟.

لێرەدا لۆك هەڵدەستێت بە مانۆڕێکی زیرەکانە و لەبری ئەوەی وەڵامێکی ڕوون بۆ ئەم پرسیارە بخاتەڕوو بەدەوریدا دەسووڕێتەوە. لۆك زنجیرەیەك بابەتی نوێ دێنێتە پێشەوە کە بە لەبەرچاوگرتنیان لە کۆتاییدا کۆبوونەوەی زەوی لەبەر دەستی کەسانێك و بێ زەوی بوونی کەسانێکی تر (لە ژێر ناونیشانی کرێکار) بە کارێکی ئاسایی لێکدەدرێتەوە. یەکێك لە پرسەکان پرسی بە فیڕۆدانە. موڵکداریی لەڕادەبەدەر دەبێتەهۆی بە فیڕۆدانی بەرهەم. بەڵام ئەگەر بکرێت بەرهەمەکە بگۆڕدرێتەوە ئەوا ڕێگە لە بە فیڕۆدان دەگرێت. پرسێکی تر داهێنانی پارەیە. پارە کە برەو پەیداکردنی بەرهەمی ڕێکەوتنێکی ناوەکییە ئەو هەلە دەرەخسێنێت کە سامان کۆبکرێتەوە بەبێ ئەوەی کە تێکبچێت، چونکە پارە لە مادەی کانزایی دروستدەکرێت و تێکناچێت. لە تیۆرەکەی لۆکدا بەکارهێنانی پارە شوێنی تیۆری ڕێکەوتنی گرسیۆس و پۆفندۆرف دەگرێتەوە. مۆڵەتی خاوەنداریتی زەوی بە ئاستێك زیاترە لە ڕێکەوتنی ناوەکی لەسەر برەو پێدانی پارەکە هەر تاکێك دەتوانێت زەوی بچێنێت و بەرهەمەکەی بۆ خێزانەکەی تەرخانبکات.

لۆك بنەماکانی تیۆری سیاسی خۆی لەسەرمافی سروشتی دادەمەزرێنێت، بەڵام ئەمە تەنها دیوی دەرەوەی کێشەکەیە. لە ڕاستیدا ئەو ئەنجامانەی کە لۆك لەم بنەمایانەوە بەدەستی دێنێ بۆخۆی هەڵوەشاندنەوەی مافی سروشتییە[22]. بەپێچەوانەی بۆچوونی هەندێك لە توێژەران[23] ناکرێت تیۆری سیاسی لۆك بە فراوانکردنەوەی تیۆری مافی سروشتیی سەدەکانی ناوەڕاست لەقەڵەمبدرێت. تیۆرەکەی لۆك لە چوارچێوەی مافی سروشتی نوێدا دەکرێت هەڵبسەنگێندرێت. لۆك مافی سروشتیی لەگەڵ ڕێك بوونی کۆمەڵایەتی نوێ (سەرمایەداری تازە گەشەکردوو)دا یەکسانی کردووە. هەرچەندە کە هەندێك لە ڕوخساری هزرە باوەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی تیادا بەرچاو دەکەوێت.

لۆك لە دوو بنەڕەتی بەڵگەنەویستەوە واتە ئەوەی کە هەموو کەسێك مافی پاراستنی ژیانی (پاراستنی خود) خۆی هەیە و کاری مرۆڤ پەیوەستە بەخۆیەوە دەگاتە پاساوکردنی موڵکداری

22- See: R. H. Cox Locke of war and peace, oxford University press 1960.
23- See: Scott Swanson "the Medieval foundation of John Lock's theory of natural right" History of political Thought vol XVIII No.3 (autumm 1997), pp. 399-459.





تایبەتی. ئەم دوو بنەڕەتە بۆ خۆیان لە بنەڕەتی مافی ژیان بۆ هەمووانەوە سەرچاوە دەگرن. بەپێی ئەم بنەڕەتە موڵکداری دروست لەرووی رەوابوونەوە گونجاوە لەگەڵ کارێکدا کە تاك دەتوانێت لەسەر شتێکی دەرەکی بە ئەنجامی بگەیەنێت و ئەو ئاستی بەرهەمی کە لێوەی بەرهەمی دێنێت لە ئاستی پێداویستی خێزان زیاتر نەبێت. ئەگەر لۆك ئالێرەدا رابوەستایە بە بەرگریکاری مافی موڵکداری سنووردار لەقەڵەمدەدرا. بەڵام لە سەردەمی لۆکدا ئەو حوکمەی کە دەیوت هەر کەسێك ئەگەر کاری خۆی تێکەڵ بە سروشت بکات ئەوا دەبێتە خاوەنی، لەگەڵ راستییە دەرەکییەکاندا نەدەگونجا. رەنگە لە سەردەمە سەرەتاییەکانی ژیانی مرۆڤ لەسەر زەوی ئەم حوکمە راست بوونێکی دەرەکیی وەربگرتایە. بەڵام لەسەدەی حەڤدەیەم و لە بەریتانیادا بارودۆخەکە بە تەواوی جیاواز بوو، لۆك تیۆرەکەی خۆی لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا رێکخستووە نەك ئەوەی کە خوازیاری گەڕانەوە بێت بۆ سەدەکانی رابردوو.

## عەقڵانیەتی دوو لایەنە

بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو کەسانەی کە لۆکیان خستووەتە ریزی دیموکرات و لیبرالەکانەوە[٢٤] شیکردنەوەی وردی بەرهەمەکانی لۆك دیارخەری ئەوەیە کە ناوبراو عەقڵانیەتێکی دوولایەنە لە کۆمەڵگادا دیاریدەکات کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا ماف و ئیمتیازگەلێکی جیاوازی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە. بۆ روونکردنەوەی ئەم کارەش دەبێت بگەڕێینەوە بۆ دیکترینی رازی بوونی [رەزامەندی] ناوبراو. دیکترینی رازی بوونی لۆك پەیوەندێکی راستەوخۆی هەیە لەگەڵ تیۆری موڵکداری و مافی بەشداری ناوبراودا. بۆ پەیبردن بە تێڕوانینی لۆك سەبارەت بە مافی دەنگدان و ئیمتیازە چینایەتییەکان لە بەشداری سیاسیدا چاوخشانێك بە دیکترینی رازی بوونی ناوبراودا شتەکانی رووندەکاتەوە.

پرسیار لەوەدایە کە رەزامەندی چ کەسانێك مەرجە لە دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسیدا و ئایا مافی رازی بوون لە دامەزراندنی حکوومەتدا مافی دەنگدانی هەمووان لەخۆ دەگرێت یان نا. ئایا لۆك لایەنگری مافی دەنگدانی فراوان و گشتی بوو یان مافی دەنگدانی سنووردار؟.

24- Richard Ashcraft, Simple obection and complex reality; theorizing political radicalism in seventeeth- century England, political studies, Vol 40 (1992). P. 99-115.






ئەو راڤەکارانەی کە لۆکیان وەکو تیۆر دارێژێکی رادیکاڵ و دیموکرات ناساندووە[٢٥] پێوەندێکی راستەوخۆیان لەنێوان دیکترینی ناوبراو سەبارەت بەرەزامەندی[٢٦] و مافی دەنگدانی گشتیدا دۆزیوەتەوە. بەڵام ئەم پەیوەندییە جێی گومانێکی جدییە. جگە لەو ناڕوینانەی کە لە وتەکانی لۆکدا سەبارەت بە رەزامەندی و دابەشبوونی رەزامەندی بۆ رەزامەندی ناوەکی و رەزامەندی ئاشکرا بەرچاو دەکەون، راستییەکەی لەوەدایە کە قبووڵکردنی تیۆری رەزامەندی بە واتای قبووڵکردنی شێوەی دیموکراسی لە حکومەت و مافی دەنگدانی گشتیدا نییە. تەنانەت هەندێ جار لە مێژووی بیری سیاسیدا چەمکی رەزامەندی بۆ پشتگیریکردن لە حکوومەتی رەها بەکاربراوە. لە بەرامبەر لۆکیشدا یەکسانی خوازەکان رەزامەندیان بۆ پشتگیریکردن لە مافی دەنگدانی گشتی بەکاردەبرد. بۆیە ناکرێت لە چەمکی رەزامەندی و رۆڵی ئەم چەمکە لە پێکهێنانی حکوومەتدا حوکم بە دیموکرات بوونی لۆك بدرێت. گەرچی لە هەموو رووەکانەوە بۆچوونەکەی لۆك لەگەڵ بۆچوونەکەی هۆکردا نەدەگونجا و لۆك بە ئاشکرا تیۆری دارێژی حکوومەتی سنووردار و مەرجدار بوو، بەڵام سەبارەت بە چەمکی رەزامەندی لۆك زیاتر لەگەڵ هۆکردا هاوڕابوو تا یەکسانی خوازەکان. بەپێی تیۆرەکەی هۆکر ئەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا دەژین وەکو هەیکەلێکی ساختە corpus Mysticum رەزامەندیمان بەرامبەری نواندووە. ئەم تێگەیشتنە بۆ رەزامەندی تێگەیشتنێکی نادیموکراسیانەیە و بانگەشەکاری ئەوەیە کە تاك بێ ئەوەی نیشانەیەکی ئاشکرا سەبارەت بە راگەیاندنی رەزامەندی ئەو لە ئارادابێت رەزامەندی خۆی بەرامبەر بە ژیان لە دەوڵەتێکدا نیشانداوە.

بەڵام لۆك بەپێچەوانەی هۆکرەوە لایەنگری پاشایەتی رەها نەبوو و گەرچی تیۆری رەزامەندی ناوەکیی ناوبراو قبوڵدەکات بەڵام مەرجگەلێکی لەگەڵدا پەیوەست دەکات کە دەبنە رێگر لەبەردەم رێگەپێدانی دەسەڵاتی رەهای پاشایەتی. جگە لەمە لۆك وەکو هۆبز و بەپێچەوانەی هۆکرەوە رەزامەندی بە رەزامەندی تاك لێکدەداتەوە نەك رەزامەندیی ((هەیکەلە ساختەکە)). لۆکیش وەکو هۆبز تیۆردارێژی تێڕوانینی تاکگەراییە. لەگەڵ ئەمەشدا تیۆرەکەی لۆك لەگەڵ تیۆری یەکسانی خوازەکانیشدا جیاوازن. ئەگەر یەکسانیخوازەکان بخەینەخانەی رادیکاڵ و هۆکریش خانەی راستەکان ئەوا دەبێت لۆك بخرێتە خانەی نێوان ئەم دوو باڵەوە.

25- Ellen wood against democracy: consent representation and suffrage in tow Treatises, History of political thought, vol. XIII. No.4, 1992, pp. 957-686.
26- Consent.

یەکسانیخوازەکان بەڵگەیان دەهێنایەوە و دەیانوت کاتێك کە کەسێك لە فەزای کۆمەڵگای سیاسیدا هەناسە دەدات یاخود لە شەقامەکانی وڵاتدا دەسووڕێتەوە بەواتای ئەوە نییە کە بەرامبەر بە حکوومەت ڕەزامەندیی نواندووە. بەڵام لۆك هەمان نمونەی ئەوانی دەهێنایەوە و بەپێچەوانەی ئەوانەوە دەیوت کە ئەم نیشانەی ڕەزامەندی تاکە[٢٧].

بەڵام لۆك لەلایەکەوە لەگەڵ بۆچوونی یەکسانیخوازە دیموکراتەکان کە لایەنگری مافی دەنگدانی گشتی بوون ناکۆك بوو و لەلایەکی ترەوە لەگەڵ بۆچوونی هۆکریشدا کە لایەنگری تیۆری پاشایەتی ڕەهابوو نەدەگونجا. بۆیە لۆك جیاوازی لە نێوان ڕەزامەندی وەکو سەرچاوەی پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی و ڕەزامەندی وەکو دیاریکەری مەشرووعیەتی حکوومەت و ئەرکی خەڵکی دادەنا. لۆك دەیوت ناکرێ بە قبووڵکردنی ڕەزامەندی یەکەم (ڕەزامەندی وەکو سەرچاوەی کۆمەڵگای مەدەنی) بەبێ چۆن و بۆ ڕەزامەندی دووەم (ڕازیبوون بەو حکوومەتەی کە هەیە) ئەنجامگیری بکرێ. ئەوەی کە خەڵکی بەرامبەر بە سەقامگیری دەوڵەت ڕەزامەندیان نیشانداوە بەو واتایە نییە کە هەموو جۆرە حکوومەتێکیان قبووڵکردووە، لێرەدا لۆك لە هەمان ئەوکاتەی کە لەگەڵ یەکسانیخوازە دیموکراتەکان هاوڕا نەدەبوو لە هۆبز و هۆکر جیادەبوەوە. لۆك ئامادەبوونی تاکی لە کۆمەڵگای سیاسیدا بە واتای ڕازی بوونی ناوەکی بەرامبەر بە سەقامگیربوونی دەوڵەت لێکدەدایەوە[٢٨]، بەڵام بەپێچەوانەی یەکسانیخوازەکان هەبوونی وەها ڕەزامەندیەکی بە واتای پێویست بوونی مافی دەنگدانی گشتی لەقەڵەمنەدەدا.

ماکفیرسۆن جیاوازی نێوان ڕەزامەندی ناوەکی و ڕەزامەندی ئاشکرای نێو تیۆرەکەی لۆك و قبووڵنەکردنی هەبوونی پەیوەندی لەنێوان ڕەزامەندی و مافی دەنگدانی گشتی و لە کۆتاییدا سنووردارکردنی مافی دەنگدان بۆ خاوەن موڵك و سامانەکان بە پەسندکردنی دووجۆر عەقلانیەت لەلایەن لۆکەوە لێکدەداتەوە. پرۆفیسۆر ماکفیرسۆن بەڵگەهێنانەوەکەی لۆك بەم شێوەیە دەخاتەڕوو: ((کاری سەرسوڕهێنەری لۆك ئەوەبوو کە مافی موڵکداریێتیی بەسەر بناغەی مافی سروشتی و یاسای سروشتیدا پەسەندکرد و پاشان تەواوی سنوورداریيەکان مافی سروشتیی لە مافی موڵکداریێتی وەلاوەنا))[٢٩]. ئەم کارەچۆن بە ئەنجام گەیشت؟ بە داهێنانی پارە. لۆك باری سروشتیی بێ پارە و باری سروشتیی لەگەڵ پارە و بەرەو پەیداکردنی پارە و

27- Ellen, Wood, Ibid.
28- John Lock, Two treatises, op. cit, set 119.
29- C. B. Macpherson, op. cit, p. 199.






گرێبەستەکان لێك جیادەکاتەوە. دەوڵەت یان کۆمەڵگای سیاسی تەواو دەکەوێتە قۆناغی سێیەم و لە دوای دوو قۆناغەکەی سەرەوە دێت. یاسای سروشتی ئەو مافە بە مرۆڤ دەدات کە تەنها بە ئاستی پێویست دەست بە خاوەنداریێتی (یان لە ڕاستیدا دەست بەسەراگراتن) زەوی بکات بەجۆرێك کە بەشی پێویست زەوی بۆ خەڵکیش بمێنێتەوە و بەرهەمی بێ سوود لە دەستی چەند کەسێکدا کۆنەبێتەوە و بەفیرۆ نەچێت. بەڵام ئابووری دراوی بوارێکی نوێ دەڕەخسێنێت و هەلومەرجێك پێکدەهێنێت کە سەرچاوە کەڵەکە بووەکان گەندەڵ نەبن. هەروەها زیادبوونی بەرهەمی زەویش ئەو هەلە دەڕەخسێنێت کە کرێکاران و کەسە بێ زەوییەکانیش زیاتر لەوەی کە لەباری سروشتیدا وەدەست دێت داهات بەدەستبێنین. دیاریکردن و پەرەپێدانی[٣٠] زەوی نەك تەنها ئاراستەکردن بەڵکو زۆربوونی زەویشی سوودمەندکردووە. بەم شێوەیە لۆك دەستی لەبنەڕەتە سەرەتاییەکەی خۆی کە دەڵێت مافی خاوەنداریێتی لە تێکەڵبوونی کار لەگەڵ کەرەستەی سەرەتاییدا بەدەستدێت هەڵگرتوە و لەم ڕووەوە تەنانەت ئایزایا بەرلینیش کە ڕەخنە لە بۆچوونەکانی ماکفیرسۆن دەگرێت لەگەڵ بانگەشەکەی ماکفیرسۆندا هاوڕایە[٣١]. لۆك نەك تەنها کاری کەسەکە بەڵکو کاری کرێکارانەی کەسیش پەیوەست بە کەسەکە دەزانێت: ((ئەو ئالیکەی خزمەتکار کۆی دەکاتەوە)). مافی کۆکردنەوەی سەرمایە و بەرفراوانکردنی زەوی کرێکاران دەبەستێتەوە بەخاوەن داراییەکانەوە. لۆك لە هیچ شوێنێکدا ئەمەی بە ئاشکرا نەدرکاندووە بەڵام دەکرێت لە تێگەیشتنی باسکردنی ناوبراو دەربارەی موڵکداری و ڕەزامەندی و پێوەندی ئەم دووە لەگەڵ مافی دەنگداندا وەها ئەنجامێك بەدەستبێنین. بەم پێیە دەکرێت هاوکات لەگەڵ ماکفیرسۆندا وەها ئەنجامگیری بکرێت کە لۆك سنووردداربوونی مافی سروشتی دەربارەی بەرفراوانکردنی زەوی هەڵگرتووە، بۆیە خەڵکیی بۆ دوو چین بەدوو ئاستی عەقلانیەتی دابەشکردووە. بەم شێوەیە بە بۆچوونی لۆك تەنها عەقڵترەکان مافی سروشتیی تەواویان هەیە و کرێکاران لە مافی سروشتیی تەواو بێ بەشن. لە ئاکامدا لۆك کە لە مافی سروشتیی یەکسانەوە دەستپێیدەکات ڕێگەکەی بە جیاوازی سوودمەندبوون لە مافی سروشتی کۆتایی دێت.

30- improvement.
31- Isaiah Berlin "Locke and professor Macpherson" in, Jack Lively and Andrew Reeve, op. cit, p. 73.

بەهەمان شێوە لۆك دوو ئاستی عەقلانیەت لێك جیادەكاتەوە. پێوەری جیاوازی ئەم دوو ئاستە چییە؟ لە راستیدا پێوەرەكە بریتییە لە ئاستی توانایی و سەركەوتن لە كۆكردنەوەی دارایی و بەرفراوانكردن و دەست بەسەراگرتنی زەوی. هەڵبەتە ناكۆكی چەمكی موڵك بەو شێوەیەی كە لە نووسینەكانی لۆكدا بەكاربراوە ئەو بوارە بە رەخنەگران بۆچوونی ماكفیرسۆن دەدات كە تێگەیشتنەكان بخەنەوە بەر تویژینەوە. بۆ نموونە وەها بانگەشە بكەن كە لۆك موڵكی بە واتای ژیان و ئازادی و موڵكەكان بەشێوەیەكی گشتی بەكاربردووە. ئەوە راستە كە لۆك لە چەند شوێنێكی نووسینەكەی خۆیدا موڵكی بەم واتایە بەكاربردووە. بۆ نموونە وتویەتی ئەو شتەی كە تاكەكان پاڵ پێوە دەنێت تاوەكو لە پێناویدا لە بەرامبەر كۆمەڵگای سیاسیدا ئەركدار بن بریتییە لە موڵك[٣٢] (بەواتای گیان و ماڵ و ئازادی)[٣٣]. بەڵام هەندێ كاتیش بە ئاشكرا مەبەستی ئەو لە موڵك بریتییە لە زەوی و شتومەك[٣٤].

## مافی سیاسی و ئەندام بوون لە كۆمەڵگای سیاسیدا

باسەكەی سەرەوە لەو پرسە دێنێتە پێشەوە كە ئایا ئەندام بوون لە كۆمەڵگای سیاسیدا لەگەڵ هەبوونی مافی سیاسیدا پێوەندی راستەوخۆی هەیە یان نا؟ بەرواڵەت بڕوای بە وەها پێوەندییەك نەبوو. لۆك باسی لە مافگەلێكی جیاواز كردووە: مافی پەیڕەویكردن لە فەرمانڕەوایی یاسا و مافی دەنگدان و مافی بەرگریكردن. بنەڕەتی فەرمانڕەوایی یاسا یەكێكە لە بنەڕەتە گرنگەكانی تیۆری سیاسی لۆك[٣٥]. ئەو راڤەكارانەی كە لە تیۆری سیاسی لۆكەوە مافە دیموكراسییەكانیان هەڵێنجاوە بڕواداربوونی لۆك بە مافی پەیڕەویكردن لە فەرمانڕەوایی یاسا یان بە یەكێك لە بەڵگەكان خۆیان ناوبردووە[٣٦]. بەڵام دەتوانین بەرگریكردن لۆك لە فەرمانڕەوایی یاسا تەنها بە بەرگریكردن لە حكوومەتی مەرجدار لەقەڵەمبدەین نەك مافی دەنگدانی گشتی. یەكسانی لە بەرامبەر یاسادا نایەكسانی نێو مافی دەنگدان رەت ناكاتەوە. لەسەردەمی لۆكدا زۆرێك لە دەستووریی خوازەكان جیاوازییان دادەنا لە نێوان فەرمانڕەوایی یاسا و مافی دەنگدانی گشتیدا.

32- Property.
33- Second Treatise Seet, 123.
34- Ibid sect 138-140.
35- Locke, Two Treatises, op. cit, p. II, 192.
36- Martin Hughes, Locke on Taxation and suffrage, History of political thought, Vol XI, 1990, PP. 423-442.



بە بۆچوونی لۆك هەموو خەڵكی ئەندامی كۆمەڵگای سیاسین بێ ئەوەی مافی دەنگدانی یەكسانیان هەبێت. ئەندام بوون پەیوەست نییە بە هەبوونی مافی هەڵبژاردنەوە. لە هیچ شوێنێكدا لۆك ئەندامانی كۆمەڵگای سیاسیی لەگەڵ خاوەن مافی هەڵبژاردنەكان (Electors)دا بەیەك شت لەقەڵەمنەداوە. هەموو هەڵبژێردەرەكان ئەندامی كۆمەڵگای سیاسین بەڵام هەموو ئەندامانی كۆمەڵگای سیاسی بەشێك نین لە هەڵبژێردەرەكان[٣٧].

## عەقڵانیەتی جیاواز، مافی جیاواز

لۆك لە گریمانەكان مافی سروشتی كلاسیكی كە زەوی و بەرهەمەكانی بە موڵكی هاوبەشی هەمووان دەزانێت دەستپێدەكات و لێرەوە دەگاتە جیاوازی سروشتی عەقلانیەت و ماف و ئاراستەكردنی بنەڕەتە ئەخلاقییەكان و پەیوەندییەكانی نێوان كار و سەرمایە. لە راستیدا لۆك عەقلانیەت چینبەندی دەكات. ئەنجامگیرییەكەی بەم شێوەیەیە: سەرەڕای ئەوەی كرێكاران بەشێكی پێویستی ئەندامانی كۆمەڵگای سیاسین بەڵام بە ئەندامی تەواو لەقەڵەمنادرێن. كۆمەڵی كرێكاران و بێ سەرپەناكان ناتوانن ژیانێكی ئەخلاقی تەواویان هەبێت. وەها بڕوایەك لە سەردەمی لۆكدا بڕوایەكی باوبووەو بەشداربوونی لۆك لە وەها بڕوایەكدا ناكرێت بەشتێكی سەیر تەماشا بكرێت. لۆك لەم خاڵەوە دەستی پێ دەكرت كە لەبەرئەوەی كرێكاران بەشێوەیەكی گشتی لە بارێكی ئابووری نالەباردا ژیان بەسەردەبەن بۆیە ناتوانن بەدروست بیربكەنەوە یاخود بچنە ناوكاری سیاسییەوە (مەگەر لە چەند حاڵەتێكی دەگمەندا، ئەویش بەشێوەیەكی سەركێشانە). لۆك مافی شۆڕشكردنیان پێ نابەخشێت[٣٨]. و ئەم مافە بەزۆرینە (كە كرێكاران لەخۆ ناگرێت) دەدات. بەڵام كرێكاران لە ریزی ئەم مافدارانەدانین. لە تیۆرەكەی لۆكدا كرێكاران بابەتی كاری سیاسەتن نەك ئەندامی هەیكەلی سیاسی. لەو شوێنەی كە دەستەكان بۆ گرتنی دەستەی بێل و گاسن بەكاردێن ئیدی سەر بۆ بیركردنەوە و رامان لە چەمكە بێ خەوشەكان[٣٩] بوارێكی زۆری بۆ نامێنێتەوە.

بەهەمان شێوە كۆمەڵی كرێكاران و نەدارەكان ئامادە نین پەیڕەوی لە ئەخلاقی عەقلانیش بكەن. پێویستیان بە باوەڕ هەیە. دەبێت لە رێگەی باوەڕ بە پاداشت و سزای خوداییەوە بەرەو ملكەچی كردن هان بدرێن. لەبەرئەوەی ئەوان ناتوانن ژیانێكی عەقلانیی تەواویان هەبێت

37- Ellen Wood, op. cit.
38- C. B. Macphersone, p. 222.
39- Sublim.





(بەهۆی هەلومەرجی نالەباری ژیانەوە) بەهەمان شێوە ناتوانن ئەندامی تەواوی کۆمەڵگای سیاسیش بن. لۆك ئەم پرسە وەها بە بەڵگەنەویست دەزانێت کە هەست بە بەڵگەهێنانەوە ناکات بۆ پاساو کردنی. وەها وێنایەك لەو سەردەمەدا وێنایەکی باوبوو بۆیە لۆك هەست بە پێویستبوونی لەوە ناکات کە ئەم بابەتە بۆ خوێنەرەکانی خۆی روونبکاتەوە. پێوریتانەکانیش هەژارییان وەکو ناتەواویەکی ئەخلاقی تەماشا دەکرد. بە بۆچوونی کالونیستەکانیش نەدارەکان ئەندامی تەواوی کلیسانەبوون. لەو روانگەیەوەی کە شوێنکەوتووی کلیسابوون بە ئەندام لەقەڵەمدەدران نەك لەو لایەنەوەی کە بەشداربن لە بەڕێوەبردنیدا. لە تیۆرەکەی لۆکیشدا کرێکاران لەو روانگەیەوەی کە شوێنکەوتووی کۆمەڵگای سیاسین بە ئەندام دادەنرێت، بەلاّم خاوەن ڕا نین لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای سیاسیدا.

بنەما تاکگەراییەکان لۆکیان بەرەو جۆرێك مافی سروشتیی دوولایەنە پاڵ پێوە ناوە. وردبینییەکانی لۆك تاکی بە خاوەنی رەهای تواناکانی خۆی[٤٠] و دوور لە هەموو قەرزارباریییەك سەبارەت بە کۆمەڵگا لەقەڵەمداوە. بەلاّم لەم گریمانانەوە بەو شوێنە دەگات کە لە کۆتاییدا ئەو تاکانەی کە بەڕاستی یەکسانن بۆ دوو چین بە مافگەلێکی جیاواز (واتە کەسانێك کە خاوەن موڵکن و ئەو کەسانەی کە بێ بەشن لە موڵك) دابەشبکات. ئەو کەسانەی کە موڵکیان نییە بۆ بەسەربردنی ژیانیان بەستراونەتەوە بە خاوەن موڵکەکانەوە. ئەم بێ موڵکانە ناتوانن گۆڕان لەباری خۆیاندا دروستبکەن. بەم شێوەیە دەکرێ بوترێت کە ئەوان عەقلانیەتێکی جیاواز لە عەقلانیەتی خاوەن موڵکەکانیان هەیە. لۆك کرداری عەقلانی بە هەوڵدان بۆ زاڵبوون بەسەر سروشت و بە موڵك کردنی لەقەڵەمدەدات. سەرەتا ئەم بە موڵك کردنە بەپێی دابین کردنی بژێوی خێزان سنووردارە. ئەوکاتەی کە پارەو بازاڕ بوونیان نییە (بەپێی ڕێککەوتنی ناوەکیی تاکەکان) کۆکردنەوەی ماڵ و موڵك کارێکی ناعەقلانییە. کۆکردنەوەی سامان وەکو گەندەڵکردنی سامان و دەست بەسەراگرتنی لەڕادەبەدەری زەوی وەکو بە بێکار هێشتنەوەی زەوی و دوورخستنەوەی خەڵکی وایە لە کارکردن لەسەر ئەو زەوییە. بەلاّم لەگەڵ پەیدابوونی پارەو گۆڕینەوە بابەتەکە بە تەواوی دەگۆڕێت. ئەو کات عەقلانیەت کۆکردنەوەی پارە (سەرمایە) و خاوەنداریتی زەویش لەخۆ دەگرێت. پارە ئەو سامانەیە کە گەندەڵ نابێت و دەکرێت بەکاربخرێت (بگۆڕدرێت بۆ سەرمایە) و زەویش ئەو سەرمایەیە کە دەکرێت بەرهەمەکەی بە پارە بگۆڕدرێتەوە. لەم قۆناغەدا ئەوانەی کە زەوی و سەرمایەیان کۆکردووەتەوە

40- Olivera, op. cit.





لە بەرامبەر ئەوانەی کە جیا لە فرۆشتنی هێزی کار شتێکی تریان نییە بۆ بەسەربردنی ژیان یاخود پەیوەستن بە دامەزراوە خێرخوازییەکانەوە عەقلانیەتێکی جیاوازییان هەیە.

## دەوڵەت وەکو کۆمپانیای فرۆشتنی پشك

ئەو بۆچوونەی کەپێی وایە لۆك دەوڵەتی وەکو جۆرێك لە کۆمپانیای فرۆشتنی پشك لەقەڵەمداوە لەلایەن ماکفێرسۆن و هەندێك لە رەخنەگرانی ترەوە خراوەتەڕوو. بڕواداربوون بە عەقلانیەتی جیاواز کە لەسەرەوە باسمان لێوە کرد لە کۆتاییدا بەوەها تێگەیشتنێك بۆ عەقلانیەتی دەوڵەت کۆتایی دێت. بەهەمان شێوە ناکۆکی بنەڕەتیی نێوان تیۆری حکومەتی زۆرینە و مافی موڵکداری تایبەتیش جگە لە ئێرە ناچێتەوە شوێنێکی دی. لە هەلومەرجی سەدەی حەڤدەیەمدا تیۆری موڵکداری تایبەتی تەنها لەگەڵ جۆرێکی تایبەتی حکومەتی زۆرینە (زۆرینەیەك کە تەنها خاوەن موڵکەکان لەخۆ بگرێت) کۆدەبوویەوە. بە پیرۆز زانینی موڵکداری و حکومەتی زۆرینە لەگەڵ یەکتردا کۆنابنەوە. ئەگەر ئەو کەسانەی کە خاوەن موڵك (سەرمایە و زەوی و سامان) نین مافی سیاسی تەواویان هەبێت ئیدی چۆن دەکرێ چاوەڕوانی ئەوە بکرێت کە بەردەوام بەرامبەر بە بەپیرۆز زانینی موڵکداری[٤١] بە پابەندی بمێننەوە و لەو هەوڵەدا نەبن بۆ گۆڕینی پەیوەندییەکانی موڵکداری؟ لە بەریتانیای سەردەمی لۆکدا زەوی لە دەستی ئاریستۆکراتە زەویدارەکاندا کۆببوویەوە و شێوەی بەکرێدان و سوود وەرگرتن لە کاری بەکرێ شتێکی باوبوو[٤٢].

لۆك عەقلانیەتی سەردەمی خۆی کە رەنگدانەوەی هەلومەرجی کۆمەلایەتی بوو دەگوازێتەوە بۆ بارێکی سروشتیی گریمانەیی. تاڕادەیەکی زۆر بناغەی ناڕوونی و تێکشێوانەکانی تیۆرەکەی ناوبراو لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. لۆك لەلایەکەوە دەڵێت هەموو مرۆڤەکان عاقڵن بەلاّم لەلایەکی ترەوە ئەنجامگیری دەکات کە دوو ئاستی جیاوازی عەقلانیەت لە ئارادا هەیە: عەقلانیەتی موڵکدارەکان و بێ موڵکەکان. بەهەمان شێوە لۆك هەموو خەڵکی لە مافی سروشتیدا بە یەکسان دادەنێت بەلاّم دوو سیستەمی جیاواز بۆ سوودمەندبوون لە مافی سروشتی دەخاتەڕوو.

41- Wood, op. cit.
42- Wood, op. cit.

بەشێوەیەکی بنەڕەتی مرۆڤ لە تیۆرەکەی لۆکدا بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ و کۆمەڵایەتییە. خاوەن عەقڵ لەو ڕوانگەوەی کە دەتوانێت لە ڕێگەی عەقڵەوەپەی بە یاسای سروشتی کە بۆخۆی لەسەربنەمای عەقلانیەتی سروشتییە ببات و کۆمەڵایەتی لەو لایە نەوەی کە مرۆڤەکان بەر لە دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی و دانانی یاسا دانراوەکانیش لەسەربنەمای یاسای سروشت بەیەکەوە ژیان بەسەردەبن. ئەمانە جیاوازیگەلی سەرەکی لۆکە لەگەڵ هۆبزدا سەبارەت بە بابەتی سروشتی مرۆڤ. تیۆرەکەی لۆك دەربارەی یاسای سروشتی درێژەی ئیلاهیات و باسە پەیڤییەکانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاستە کە تیایدا دەسەڵاتی ڕەهای خوداوەند لەگەڵ پەیوەست بوونی ویستی ئەو بەبوونی سیستەمێکی عەقلانی لە سروشتدا ڕێککەوتبوون[٤٣]. لەگەڵ ئەوەی کە لۆك وەکو هۆبز بڕوای وایە کە لە هەنگاوی یەکەمدا مرۆڤ لەگەڵ حەز و ڕقدا[٤٤] بەرەو پێشەوە پاڵ پێوەدەنرێت بانگەشە دەکات کە مرۆڤەکان دەتوانن بەبێ بەرپاکردنی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی و بە تێگەیشتنی قازانجی یاسا ئەخلاقییەکان وەها یاساگەلێك جێگیر و جێ بەجێ بکەن. هەروەك بینیمان هۆبز پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی بە تەنها مەرجی ئەرکی ئەخلاقی و سیاسی دەزانێت و یاسا سروشتییەکان بۆ مافی پاراستنی خود کە بۆ هەمووان کارێکی بەڵگە نەویستە سنووردار دەکات. بەڵام لۆك دەڵێت کە باری سروشتی یاسایەکی سروشتی هەیە کە بەڕێوەی دەبات و ئەویش بریتییە لە عەقڵ[٤٥]. هەڵبەتە ئەو کەسانەی کە یاساشکێنیش دەکەن هەر لەباری سروشتیدان بەڵام ژمارەیان زۆر نییە و نابنە بەربەست لە بەردەم برەو پەیداکردنی یاسادا.

بەڵام ئەمە تەنها لێکدانەوەیەك نییە بۆ یاسای سروشتی دەیخاتەڕوو. لە چەند شوێنێکی تردا لۆك وێنەگەلێکی مافی سروشتی دەخاتە بەردەست کە جیاوازییەکی زۆری نییە لەوەی کە هۆبز باسی لێوە دەکات. لە پاژی سێی ((دوو نامە دەربارەی حکوومەت))دا دەڵێت لەکاتی نەبوونی دەسەڵاتێکی یاسایی کە ناکۆکی نەیارەکان یەکلابکاتەوە، باری سروشتی دەگۆڕێت بۆ باری جەنگ. لەوەها بارودۆخێکدا لەبەرئەوەی چاودێرێکی ورد بۆ جێ بەجێ کردنی دادپەروەری لە ئارادا نییە هەلومەرجێکی تێك شڵەژاو دروستدەبێت کە تاك ناتوانێت تیایدا بەدروستی سوود لە مافی خۆی وەربگرێت. بەم واتایە ئیدی لێرەدا کێشە کێشەی هەبوونی

43- Francis Oakly, "Lock, natural Law and god- again", History of Plitical Thought, Vol XVIII, 9.4, 1997, P. 624-651.
44- Appetite and owersion.
45- John Locke, op. cit, Siet, 6.






کەمینەی یاسا شکێن نییە بەڵکو کێشەی وازلێهێنانی عەقڵ لەلایەن خەڵکانێکی زۆرەوە لە ئارادایە. وەها باسکردنێك لەباری سروشتی خاڵی ناوەندی دژیەك و ناکۆکی تیۆری سیاسی لۆکە کە کێشەی سەرەکی فەلسەفەی سیاسی ئەو دەخاتەڕوو. لۆك بۆ یاسا و هێنانەوەی بەشە ناکۆکەکانی نێو تیۆرەکەی خۆی ئەم دوو دەربڕینە دژ بەیەکەی بەکاربردووە. دەبوو ئەو لەلایەکەوە هێندە مرۆڤەکان بەخاوەن عەقڵ نیشانبدات کە چیدی پێویست بوونی فەرمانڕەوایی ڕەها لەو جۆرەی کە هۆبز باسی لێوەکردووە لە ئارادا نەمێنێت و لەلایەکی ترەوە بەشی پێویست بە گرفتاری ململانێ نیشانیانبدات کە لە ئەنجامدا بەشێك لە دەسەڵاتی خۆیان بۆ کۆمەڵگای سیاسی بگوێزنەوە. ئەگەر لۆك بە ناڕاستگۆیی (ئاگایانە یاخود نائاگایانە) یان دژیەك بێژی تۆمەتبار نەکەین، بەلای کەمەوە دەبێت بڵێین کە دوو پێناسەی جیاوازی بۆ باری سروشتی کردووە کە لە کۆتاییدا دوو چین بەدوو ئاستی جیاوازی عەقلانیەتی لێوە بەرهەم دێت: چینی خاوەن عەقلانیەتی تەواو (خاوەن داراییەکان) و چینی بێبەش لە عەقلانیەتی تەواو (کرێکارە نەدارەکان).

## هەنگاوێکی تر بەرەو سوودگەرایی

ئەم دژیەکە ناوەندییەی نێو تیۆرەکەی لۆك کە لە وێنەکێشانی ئەو بۆ باری سروشتی ڕەنگدەداتەوە لە پێناسەکردنی بۆ باری مەدەنیش وەدیارکەوتووە. لۆك دەڵێت دەبێ مرۆڤ بۆ پاراستنی خۆی لە نائاسایشییەکانی باری سروشتی بچێتە ناوباری مەدەنییەوە[٤٦]. یان بە واتایەکی تر هەروەکو بەردەوام دەیڵێتەوە مەبەستی مەزنی مرۆڤ لە یەکگرتن لەناو کۆمەڵگای مەدەنی و پێکهێنانی دەوڵەتدا بریتییە لە پاراستنی خاوەن موڵکێتییەکانی خۆی و مەبەست لە خاوەن موڵکێتی گیان و ئازادی و موڵکەکانە. ئەگەر بەم واتا گشتییە خاوەن موڵکێتی وەربگرین ئەوا هەموو کەسێك بەڵگەیەکی هەیە بۆچوونە ناوی. بەڵام لۆك ئەم پێناسەیە دەبەزێنێت و لە زۆر شوێندا مەبەستی لە خاوەن موڵکێتیماڵ و سامان (سەرمایە)ە. بەم شێوەیە لۆك نا ڕاستەوخۆ باس لە دوو مافی سروشتی و عەقلانیەت دەکات. لەکاتێکدا کە بەشێوەیەکی فەرمی بڕوای بە عەقلانیەتی گشتی و مافی یەکسانی هەیە و خاڵی دەستپێکردنی لێرەوە دەستپێدەکات بەڵام لە درێژەی باسەکەدا بەرەو عەقلانیەتی جیاواز ئاراستەکەی دەگۆڕێت.

46- Leo Strauss, op. cit, p. 224.

واپێدەچێت کۆمەڵگای سیاسی بەو شێوەیەی کە لۆك باسی لێوە دەکات دوو دەستەی ئەندامی هەبێت. دەستەیەك کە ئەندامی تەواون و دەستەیەکی تر کە ئەندامی تەواو نین. کرێکاران ئەندامی تەواوی کۆمەڵگای سیاسی نین بەڵکو تەنها شوێنکەوتووی ئەون، بەلاّم خاوەن موڵکەکان کە هەم شوێنکەوتوو و هەم خاوەن بەشن لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای سیاسیدا بە ئەندامی تەواو لەقەڵەمدەدرێن. مافی بەڕێوەبردنی حکوومەت بۆ خاوەن موڵکەکانە، بەلاّم ئەرکی ملکەچیکردن لە حکوومەت بۆ هەموانە، چ خاوەن موڵك بن یاخود نەبن. لە تیۆری سیاسی لۆکدا یەکسانی هەموو مرۆڤەکان دەربارەی مافی پاراستنی خود بە تەواوی مافی تایبەتی مرۆڤە خاوەن عەقڵترەکان ڕەت ناکاتەوە. بە بۆچوونی لۆك ئەم مافە تایبەتەی مرۆڤە خاوەن عەقڵترەکان دەبێتەمایەی ژیان خۆشی هەموان لە کۆمەڵگادا. لە ڕاستیدا پارێزگاریکردن لە موڵکداری و پشتگیریکردن لە ئەندامە خاوەن موڵکەکانی کۆمەڵگا لە بەرامبەر نەدارەکاندا پشتگیری کردنە لە چالاکەکان و خاوەن عەقڵەکان لە بەرامبەر سستەکان و بێکارەکان و هاوئاراستەیە لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵگاو باشەی هاوبەشدا. لۆك هۆکاری هەژاری بۆ شتێکی دیکەی جیا لە گەندەڵی ئەخلاقی و ناڕێکی ناگەڕێنێتەوە و بڕوای بە خێرایی کارکردن هەبوو بەرامبەر بەنەدارەکان(٤٧). کەواتە دەکرێ بوترێت کە لە هەنگاوی یەکەمدا مەبەستی کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لە پارێزگاریکردن لە موڵکداری. موڵکداری دامەزراوەیەکی مافی سروشتییە. مرۆڤەکان بەر لە چوونە ناو کۆمەڵگای سیاسی و کۆمەڵگای مەدنی خاوەنی موڵکدارین. لە هەنگاونان بۆ ناو کۆمەڵگای مەدەنی موڵکدارییەکەیان دەبێتە کارێکی پشت ئەستوور بە یاسای دانراو.

ئەگەر مەبەستی دەوڵەت شتێکی دیکەی جیا لە ئاشتی و ئاسایش و باشەی هەموان نییە، ئەگەر ئاشتی و ئاسایش مەرجی پێویستی زۆربوونە و زۆربوونیش یەکسانە بە باشەی گشتی، بەم شێوەیە ئەگەر مەبەستی حکوومەت بریتییە لە زۆربوون و ئەگەر زۆربوون ئازادی و کۆکردنەوەی سامان دەگرێتەوە و ئەگەر کۆکردنەوەی سامان سوودەکەی بە هەموان دەگات، لەم حاڵەتەدا بۆچی مەبەستی کۆمەڵگای مەدەنی تەنها پاراستنی موڵکداری نەبێت؟ ئەویش موڵکداریی بەرهەم هێنەر. بەلاّم لۆك تەنها هێندە ناڵێت. لۆك تەنها ناڵێت کە مەبەستی حکوومەت پاراستنی موڵکدارییە بەڵکو دەڵێت موڵکداری لە پێشترە لە کۆمەڵگای سیاسی و

47- A. L. Beir "utter strangers to morality and religion: John Locke on the poor", Eighteenth Century Life, Vol, 12, No.3, 1988, pp. 28-41.





لە هەندێ ڕووەوە سەربەخۆیە لە کۆمەڵگا(٤٨). ئەو موڵکدارییەی کە یاسای دانراو خستویەتییە بەر خاوەنداریێتی تاکەوە لە هەمان کاتدا بەر لە باری مەدەنیش بوونی هەبووە. ئەمەیش کێشەیەکە کە دەبێتە مایەی تێڕوانینێکی دوولایەنە بۆ عەقڵانیەت. لۆك نایەوێت بە قازانجی موڵکداری تایبەتی بۆ کۆمەڵگا پاساو بۆ پارێزگاریکردنی دەوڵەت لە موڵکداری تایبەتی بهێنێتەوە. بەلاّم لە هەموو ڕوویەکەوە تیۆرەکەی ڕێگەیەکی زۆری بەرەو سوودگەرایی بڕیوە. بەبێ سوود نەبوو کە پاشتر سوودگەرایی بەتەواوی بیری مافی سروشتیی وەلاوەنا.

چواندنی دەوڵەتی جێ مەبەستی لۆك بە کۆمپانیای فرۆشتنی پشك لێرەوە سەرچاوەی گرتووە. دەوڵەتی جێ مەبەستی لۆك زۆرینەی خاوەن موڵکەکان لەخۆدەگرێت کە بڕیارەکانیان نەك تەنها خاوەن موڵك و سەرمایەکان بەڵکو کرێکارەکانیشیان ئەرکدار دەکات. بەتەواوی وەکو ئەو بڕیارەی کە کۆمپانیاکانی فرۆشتنی پشك دەریدەکەن. کرێکاران ناتوانن بە هەمان ئاستی خاوەنەکانی کۆمپانیا لە بڕیار وەرگرتنەکانی پەیوەست بە کۆمپانیا بەشداربن. دەکرێت بوترێت جەختکردنەوەی لۆك لەسەر موڵکداریی ناسنوورداری تاکەکەسی بەشێوەیەکی فەرزکراو فۆرمی دەوڵەتەکەی ناوبراویش دیاریدەکات. ئەگەر بڕیار وابێت کە تاك سەبارەت بە موڵکداری مافگەلێکی هەبێت کە زۆرینە نەتوانن یاسای بۆ دابنێن، لەم حاڵەتەدا ناکرێت بەواتای وشەکە باس لە فەرمانڕەوایی زۆرینە بکردرێت. تیۆری فەرمانڕەوایی زۆرینە و قبوڵکردنی مافی موڵکداری تاکەکەسی لە کاتێکدا دەتوانێت ناوەرۆکی چینایەتی کۆمەڵگا بپارێزێت کە تەنها خاوەن موڵکدارییە تایبەتەکان لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگادا بەشداربن(٤٩). لۆك هەموو شێوەیەکی تری بە جیاواز لە بنەڕەتی موڵکداری تاکەکەسی دەبینی. ناکرێت ئەوبۆچوونەی هەندێك لە ڕاڤەکارانیش قبوڵبکرێت کە دەڵێت لۆك لە باری سروشتیدا مافی موڵکداریی پێ قبووڵە بەلاّم دەڵێت کۆمەڵگای سیاسی دەتوانێت لەباری مەدەنیدا سەبارەت بە موڵکداری بڕیار بدات(٥٠).

لە ڕوویەکی تریشەوە مەشروعیەتی تیۆری فەرمانڕەوایی زۆرینەی لۆك جێی باس و هەڵوەستەیە. بۆچی دەبێت دەسەلاّتی زۆرینە یەکسان بێت بەدەسەلاّتی تەواوی کۆمەڵگا؟ ئایا هەرگیز زۆرینە هەڵە ناکەن؟ بۆچی دەبێت ئەو بڕیارەی کە زۆرینە دەریدەکەن بۆ هەموان پێویست بێت پابەندی پێوەبکەن. هەبوونی وەها پرسیارگەلێك بوو کە لەرێڕەوی پاشتری بیری

48- Leo Strauss, op. cit, p. 244.
49- Jacqueline Stevens, op. cit.
50- Leo Strauss, op. cit, 235.

سیاسیدا بیری لۆکیان بەرەو بوارگەلێکی نوێ و لەوانە بەرەو سوودگەرایی پاڵ پێوەنا. لە روانگەتدا وەڵامی لۆك بۆ پرسیارەکەی سەرەوە (بۆچی دەبێت ئەو بڕیارەی کە زۆرینە دەریدەکەن بۆ هەمووان پێویست بێت کە پابەندی پێوەبکەن؟) شتێکی دیکەی جیا لەمە نەبوو کە پەیڕەویکردن لە زۆرینە ئاشتیی کۆمەڵگا و بەرژەوەندی گشتی بەسوودە، چونکە دەسەڵاتی یاسایی خستووەتە شوێنێکەوە کە دەسەڵاتی پێویست لەوێدا کۆکراوەتەوە. کاتێك کە زۆرینە هاوڕابن لەگەڵ حکومەتدا، حکوومەت سەقامگیر و پایەدار دەبێت. بەم شێوەیە دەکرێت لەم تێڕوانینەی لۆکەوە جۆرێك لۆژیکی سوودگەرایانە وەدەست بهێنرێت(٥١). وەکو ئەوەی کە بۆ نموونە بڵێین ئەگەر بڕیار وایە لە نێوان دوولای جیاوازدا واتە دیاریکردنی چارەنووسی خەڵکی لەلایەن زۆرینە یان کەمینە یەکیان هەڵبژێرین ئایا باشتر نییە کە لای یەکەم هەڵبژێرین؟ ئەگەر قبووڵبکەین کە خەڵکی لەسەربنەمای قازانجی کەسی دەنگدەدەن ئایا لەم حاڵەتەدا پەنابردن بۆ مافی زۆرینە بۆ مەبەستی بڕیاردان (بەلای کەمەوە لە شێوەی سەرەتاییدا) خۆشبەختی زۆرترین ژمارە ناگەیەنێتە ئەوپەڕی؟ خودی لۆك وەها تێڕوانینێکی پەسەندنەدەکرد(٥٢). بەڵام ڕێڕەوی بیری سیاسی بە لۆژیکی تایبەتی خۆی بەرەو ئەم ئاراستەیە هەنگاوی نا. لۆك زۆرتر حەزی دەکرد پەنا بۆ ماف و عەقڵ بەرێت تا بۆ قازانج، هەربۆیەش بۆ خاوەن زەوی و سەرمایەکان کە بواری بیرکردنەوەیان هەبوو زیاتر لە کرێکاران کە ((بۆ تێربوون کاریان دەکرد)) و بواری وەرگرتنی زانست و فێربوون و بیرکردنەوەیان نەبوو بەشی زۆرتر لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا دیاریدەکات.

## مافی سروشتی و سنووردار‌بوونی دەسەڵاتی دەوڵەت

لۆك و هاوبیرەکانی کە نەیاندەتوانی دەوڵەتی دەسەڵاتخوازی هۆبز قبووڵبکەن هەوڵیاندا تا سنووری نێوان یاسا و مافی تاك دیارییکەن و ئەم دووە لێك جیابکەنەوە. وەکو تەواوی مرۆڤگەراکان، بەتایبەتی ڕۆشنگەرەکان کێشەی جیاکردنەوەی سنووری ماف و دەسەڵات بۆ ئەوان کێشەی بوون و نەبوون بوو. لۆك و هۆگۆ گرسیۆس بۆ سنووردارکردنی بواری دەسەڵاتی

51- Jean Condovcet Selested Writings, ed. Kenneth Michael Baker, Indianapolis, Bobbs- Merrill, 1976, p.34.
52- See: John Locke, "Essays on the law of nature" ed by von Leyben, Oxford clarendon press 1954, sixth essay.





دەوڵەت سوودیان لە چەمکی مافی سروشتی وەرگرت. بەم کارە بنەڕەتی ئازادی مرۆڤیان گەڕاندەوە بۆ مافگەلێك کە پێشتر بوونیان هەبووە. بەواتایەکی تر نەیانتوانی بنەڕەتی ئازادی مرۆڤ لە ویستی مرۆڤەوە دەربهێنن. وەکو زانراوە مافی سروشتی لە تێگەیشتنی کۆندا سنووری بۆ هەموو دەسەڵاتەکان دانابوو.

دەوترا کە هەموو حکوومەتەکان پەیڕەوی ئەم یاسایەن. بەپێی ئەم تێڕوانینە مافی سروشتی هاو وێنەیە لەگەڵ یاسای سروشتی یاخود یاسی خودایی کە تەواوی دروستکراوە خاوەن عەقڵەکان لە پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا پەیڕەوی لێدەکەن. هەروەك بینیمان هۆبز ئەم یاسایانەی بە زۆرەکی نەدەزانی مەگەر ئەو کاتەی کە پاش پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی فەرمانڕەوا جێبەجێکردنیان بکاتە کارێکی پێویست.

مافی سروشتی کە لە بنەڕەتدا لە قوتابخانەی هەیوانییەکانەوە هاتبوو لە ماوەی سەدەکانی ناوەڕاستدا لەگەڵ ئیلاهییاتی مەسیحی و تیۆری عەقڵی سروشتی ئاوێتە ببوو، بەبێ لەبەرچاوگرتنی هەموو شتێکی تر ئەو کەم و کورتییە گەورەیەی هەبوو کە جارێکی تر عەقڵ لەگەڵ عەقڵی میتایی پێکەوە بلکێنێت، وەها شتێك نەیدەتوانی ببێتە جێ پەسەندی تیۆر دارێژە نوێیەکانی خاوەن بۆچوونە مرۆڤگەرایی و ڕۆشنگەرییەکان. هەربۆیە هۆگۆ گرسیۆس هەوڵیدا کە مافی سروشتی لە عەقڵی مرۆییەوە دەربهێنێت. بەم شێوەیە هەوڵیدا کە مافی سروشتی بەرەو سنووری عەقڵی تیۆریی بەرێت تاوەکو پەیوەندی ئەو لەگەڵ ویستی خوداییدا لێك بپچڕێت. لۆك یاسای سروشتی لەگەڵ ویستی خوداوەندا پێکەوە گرێدا بوو(٥٣). تیۆرەکەی ئەو درێژەی تیۆری پەیڤبێژە نۆمینالیستەکانی کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست بوو کە بڕوایان وابوو کە خوداوەند دەسەڵاتێکی زاڵبووە(٥٤) کە ئازادە لە خواستنی هەر یاسایەك کە دەیەوێت، هەروەك چۆن ئازادە لەوەی کە هەرچییەك دەیەوێت، دروستیبکات. بەڵام لە ئافراندنی بوونەوەری خاوەن عەقڵ و ئازاد کە لەبەردەم خۆشی و ناخۆشیدایە خواستی ئەو لەسەر ئەوەیە کە ژیانی ئەو بەپێی ڕێسا و یاساگەلێك بێت، هەروەك چۆن لەکاتی ئەفراندندا مادەکەی ئەوی پابەندی یاساکانی جووڵەکردووە(٥٥). گریسیۆس بۆ لێك پچڕانی پەیوەندی نێوان مافی سروشتی و مافی مرۆڤ لەگەڵ ویستی خودادا ئەو بۆچوونەی هێنایە بەرباس کە تەنانەت سەربەخۆ لە

53- Franscis Oakles, op. cit.
54- Omnipotent.
55- Ian Harris, the Mind of John Locke: Astudy of political theory in its intellectual setting (Cambri dge 1994), pp.316-390.

دەسەلاتی خودا بەر لە دەسەلاتی ئەو مافی سروشتی بوونی هەبووە. لە بەرامبەر مافی سروشتیی کلاسیکیدا مافی سروشتیی جێی مەبەستی گریسیۆس بە مافی سروشتیی نوێ ناوبراوە، بەلام گریسیۆس نەیتوانی بەبێ رووبەڕووبوونەوەی دژیەکی لۆژێکی بیگۆڕێت بۆ دیکترینێکی سیاسی. ئەم ناکۆکییەش بریتی بوو لە دژیەك بوونی بنەڕەتی شیاوی پێشبینی کردنی مافی سروشتی لەگەڵ تیۆری ناسینی لۆکدا کە زۆربەی روشنگەرەکان پەسەندیان کردبوو. بەپێی تیۆری ناسینی لۆك هەموو وێنا و پشت راستییەك لە هەستەکانەوە سەرچاوە دەگرێت و هیچ بۆچوونێکی زاتی لە ئارادا نییە. وەها دژیەکبوونێك بریتی بوو لە گرنگترین ئاستەنگێك کە تیۆری مافی مرۆڤ و داواکارییەکانی رۆشنگەرەکان رووبەڕووی دەبووەوە.

رۆشنگەرەکان لەلایەکەوە دەیانوت کە دەکرێت لەسەر بنەمای عەقڵی مرۆیی کۆمەڵگا نوێژەن بکرێتەوە و دەوڵەتێکی عەقلانی دابمەزرێندرێت. بەم شێوەیە ئەوان عەقڵیان بە لە پێشتر لە ئەزموون و هەموو جۆرە تاقیکردنەوەیەکی ئەزموونی دادەنا. بەلام لەلایەکی ترەوە دەیانوت کە هەموو وێناکان و تێگەیشتنەکانی مرۆڤ لە ئەزموونەوە بەرهەمدێن. لە کۆتاییدا ئەوان عەقلانیەتیان کە دامالراو بوو لە ئەزموون و پاساوی عەقلانی خستە شێوەی ئایدیۆلۆژییەکەوە. لۆك و روشنگەرەکان کە لە عەقڵی مرۆییدا بەدوای سەرچاوەی مافی سروشتی و سنوورداربوونی دەسەلاتی حکوومەتدا دەگەڕان نەیانتوانی لەگەڵ تیۆری ناسینی هۆبز و لۆکدا بیگونجێنن. بۆ وەدیهاتنی وەها گونجانێك تیۆرێکی نوێی ناسین پێویست بوو فەلسەفە و مەعریفەناسی کانت بوو کە وەها شتێکی رەخساند. مەعریفەناسی کانت بەخستنەڕووی تیۆری عەقڵی پەتی رێگەی بۆ وەها پێشکەوتنێك کردەوە، لە کاتێکدا کە مەعریفەناسیی دامەزراو لەسەر ئەزموونگەرایی هۆبز و لۆك نەیدەتوانی وەها دژیەکبوونێك چارەسەر بکات و وەها ئاستەنگێك لابەرێت.

کانت سەبارەت بە مولکداریش دەڵێت کە تەنها لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەکرێت دامەزراوێك بوونی هەبێت، چونکە مەشروعییەتی مولکداری پەیوەستە بەوەی کە تەواوی ئەو کەسانەی لە دەوروبەری تاکدا ژیان بەسەر دەبەن دەست لە مافی خۆیان هەڵگرن سەبارەت بە سوود لێوەرگرتنی ئەوشتە. سەرەتا دەبێت یەکگرتنێك لەنێوان ویستەکان بوونی هەبێت تاوەکو جێ بەجێ کردنی ویستی کەسێکی دیاریکراو بەسەر شتێکەوە بە مەشروع لەقەڵەمبدرێت. کانت ئەو بەڵگەهێنانەوەی لۆك کە پێیوایە مولکداری بریتییە لە تێکەڵکردنی کاری کەس لەگەڵ شتێك بە بەڵگەیەکی ناتەواو و وەرگرتنەوەی خوازراوی دەزانێت. کانت دەڵێت دەکرێت



بپرسین کە تاك بەجێی مافێك کاری خۆی تێکەڵ بە شتێك کردووە و ئەوشتەی خستۆتە خانەی مولکداری خۆیەوە[٥٦]؟ ویستی یەك لایەنە ناتوانێت بچێتە شێوەی یاسای زەرووری و گشتییەوە. بەمشێوەیە مولکداری تایبەتی ناکرێت بە مافی سروشتی لەقەڵەمبدرێت. گەرچی تیۆری مافی سروشتی هەوڵدەدات کە مافێك بۆ خەڵکی لەبەرچاو بگرێت کە هیچ کەسێك و هیچ دامەزراوەیەك نەتوانێت بیبەزێنێت، لە بەرامبەردا شتێکی گرنگتریان لێوەردەگرێتەوە و ئەویش بریتییە لە ئازادی ویست بۆ رێکخستنی کاروبارەکان و هەروەها چەمکی راستەقینەی رەزامەندی و رێککەوتن لە پێکهێنانی حکوومەتدا. لێرەشدا تیۆرەکەی گریسیۆس و لۆك و رۆشنگەرەکان دژیەکێکی گەورەی تێدایە. کاتێك کە رەزامەندی و رێککەوتن ناوەڕۆکی کۆمەڵگای مەدەنی بێت ئیدی شوێنێك بۆ یاسای سروشتی نامێنێتەوە. رەزامەندی و رێککەوتن واتە ئەوەی کە دادپەروەری و نادادپەروەری و رەواو ناڕەوا بەو شێوەیە کە تاکەکانی مرۆڤ چۆن پێناسەی دەکەن. کاتێك کارێك دروست و عەقلانییە کە کۆمەڵگای سیاسی بە دروست و عەقلانی لەقەڵەمیدابێت ئەمە هەمان ئەو بنەڕەتەیە کە تیۆری ئەرکی هۆبز لە کۆتاییدا پێیدەگات. بەلام لە یاسای سروشتیدا دادپەروەری و نادادپەروەری بوونیان هەیە تەنانەت ئەگەر مرۆڤەکانیش نکوڵییان لێبکەن. لەبەر ئەمەیە کە دەڵێین لۆك شتێکی زیاتر لەوەی کە بەدەستێك دەیبەخشێتە مرۆڤەکان (ماف و ئازادییە سروشتیەکان) بەدەستەکەی تری لێیان وەردەگرێتەوە (ویستی ئازاد بۆ رێکخستنی کاروبارەکان بەپێی رەزامەندی تەواو).

## بە کورتی

هۆبز تەواوی بواری کۆمەڵگای مەدەنی گۆڕیبوو بۆ بواری حکوومەت و لۆك ویستی بەشێك لە بواری کۆمەڵگای مەدەنی لە حکوومەت وەربگرێتەوە. لۆك لە هەمان بنەما و گریمانەکانی هۆبزەوە واتە ویست و هاوکاری عەقڵ بۆ پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی لەسەربنەمای ماف و حەزی سروشتیی پاراستنی خود دەستیپێکرد. بەلام لۆك بە ئەنجامگەلێکی جیاواز گەیشت، واتە لەبری حکوومەتی رەها گەیشتە حکوومەتی سنووردار و مەرجدار. هۆکارەکەیشی جگە لە هۆکارە دەرەکییەکان و بۆچوونە بڕواییەکان (تا ئەو جێیەی کە پەیوەست دەبێت بەخستنەڕووی ئێمە لەم کتێبەدا) ئەوەبوو کە لۆك دژ یەکبوونێکی لۆژیکیی لەنێوان پێشەکی و

[٥٦] داجر اسکورتن، کانت، ترجمه علی بابا، تهران، طرح نو، ١٣٧٥.





گریمانەکانی هۆبز و ئەو ئەنجامانەی کە لەوانەوە بەدەستیهێنابوو دەبینی. تێپەڕین لەوەی کە تیۆری سیاسی هۆبز تا چ ئاستێك (بەلای کەمەوە گەلێك زۆرتر لە تیۆرەکانی لۆك) خاوەن گونجانی ناوەکییە، لۆك وەها رای خۆی دەردەبڕێت کە ئەو بنەما و گریمانانە لەگەڵ ئەنجامە بەدەست هاتووەکانی هۆبزدا ناگونجێت کە مرۆڤەکان کۆببنەوە و بۆ رێکخستنی پاراستنی خود فەرمانڕەوایەکی رەها دروستبکەن کە هیچ فشارێکی لەسەر نییە و هیچ کۆنترۆڵێکیان بەسەریەوە نەبێت. لۆك بەپێچەوانەی وێناکەی هۆبز و ئەنجامگیرییەکەی ئەوەوە بڕوای وابوو کە عەقڵ فەرمان دەدات کە فەرمانڕەوایەك بەدەسەلاتی سنووردار و مەرجدار جێگیر بکەن، هەڵبەتە ئەمە رەهابوونی فەرمانڕەوایی (نەك رەهابوونی فەرمانڕەوا) رەت ناکاتەوە. کەواتە دەبێت فەرمانڕەوایی رەها بەلاّم فەرمانڕەوا سنووردار بێت.

لۆك زیاتر مافی پاراستنی خودی بۆ مافی بەدەستهێنانی بێ سنووری سامان گواستەوە. ئەو کە دەیویست لەسەربنەمای مافی سروشتی (نەك سوود و باشەی کردەیی بۆ کۆمەڵگا) مەشروعیەتی موڵکداری بسەلمێنێت لەبەر بڕواداربوونی بە موڵکداریی بێ سنوور بەناچاری رووە و مافی سروشتی دوولایەنە و عەقلانیەتی دوولایەنە پەلکێش کرا: ئاستێك لە عەقلانیەت و مافی پەیوەست بەوەی کە پەیوەند بوو بە خاوەن موڵك و سەرمایەکانەوە و ئاستێکی تر کە گونجاو بوو لەگەڵ نەدار و کرێکارەکاندا. لۆك لە درێژەی ئەنجامگیرییەکانی خۆیدا و لەگەڵ بەرگریکردن لە فەرمانڕەوایی یاسا و یەکسانی هەمووان لە بەرامبەر یاسادا تێگەیشتنێکی بۆ یاسای دانراو خستەڕوو کە یاسای بەویستی زۆرینەی خاوەن موڵکەکان سنووردار کرد.

هۆبز یاسای بۆ ویستی کەسی فەرمانڕەوا گواستبووەوە بەلاّم رەهابوونی ویستی فەرمانڕەوا بە یەکسانیی ویستی هاولاّتیان هەڵدەسەنگێندرا. بەلاّم گەرچی لۆك لەلایەکەوە ویستی فەرمانڕەوای سنووردار و مەرجدار کرد لەلایەکی ترەوە ویستی هاولاّتیانی لە پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای سیاسیدا لێك جیاکردەوەو بۆ دوو ئاستی جیاواز دابەشکرد. ئەم کارەی لۆك گە رەنگە بۆخۆی بەو سروشت پاکییەش نەبێت، لە نایەکسانی عەقلانیەتی تاکەکان و بەدرێژەی ئەم نایەکسانییە لە بەشداری سیاسی و مافی سیاسیدا رەنگیداوەتەوە. بێ بەش بوون یاخود بەهرەمەندبوون لە موڵکداری تایبەتی ئاستی دابەشکردنی تاکەکانە بۆ خاوەن عەقڵ و کەم عەقڵەکان. خاوەن عەقڵەکان خاوەن ئەندامێتی تەواوی کۆمەڵگای سیاسی و خاوەن مافی دەنگدان و مافی بەرگرین و کەم عەقڵەکان ئەندامی ناتەواوی کۆمەڵگای سیاسی و بێ بەشن لە مافی بەشداری و دەنگدان. بەم شێوەیە لۆك لەگەڵ






سنووردارکردنی حکوومەت مافی دەنگدانیش سنووردار دەکات. خاوەن موڵکە تایبەتییەکان فەرمانڕەوا دیاری دەکەن بەلاّم ئەرکی ملکەچی لێکردنی هەموو خەڵکی دەگرێتەوە و لەوانەیش کرێکاران و نەدارە بێبەشەکانی مافی دەنگدانیش. ئەگەر لە تیۆرەکەی هۆبزدا مەبەستی دەوڵەت بریتی بێت لە پاراستنی ئاسایش ئەوا لە تیۆرەکەی لۆکدا بریتییە لە پاراستنی ئاسایشی موڵکە تایبەتییەکان.

تیۆرەکەی لۆك دەربارەی عەقلانیەتی دەوڵەت وەکو پاراستنی ئاسایشی موڵکداری و پەلکێشکردنی لۆك بە قبووڵکردنی ناوەکیی جۆرێك عەقلانیەتی دوولایەنە بۆ ئەندامانی کۆمەڵگای سیاسی دەربڕی دژیەکێکی گەورەیە لەناو فەلسەفەی سیاسی ناوبراودا کە لەلایەکەوە لە بنەماو گریمانەکانی هۆبز کە لەسەر مافی پاراستنی خود دامەزراوە دەستپێدەکات و لەلایەکی ترەوە دەیەوێت بەبێ پەنابردن بۆ بنەڕەتی سوود لەسەربنەمای مافی سروشتی موڵکداری تایبەتی و کۆبوونەوەی زەوی و سەرمایەی پێویست بەو بسەلمێنێت. لەراستیدا لۆك لایەنی سوودگەرایانەی ئەو تێڕوانینەی کە هۆبز دابینابوو لەدوا ویستگەی مەبەست و سنووری قوتابخانەی سوودگەرایی نزیککردەوە.

لەلایەکی ترەوە دانانی بنەڕەتی سنووردارbوونی دەسەلاّتی حکوومەت لەسەرمافی سروشتی و عەقڵی سروشتی لەگەڵ تیۆری ناسینی لۆك کە هەست و ئەزموونی بەسەرچاوەی هەموو مەعریفەیەك لەقەڵەمدەدا دژیەکێکی تری لەبیری لۆك و رۆشنگەرەکان کە بەرگریکاری مافی سروشتی بوون ئاشکرا دەکرد. پێویست بە تیۆرێکی نوێ لە مەعریفەناسیدا هەبوو بۆ گونجاندنی مافی سروشتی لەگەڵ فەرمانی عەقڵدا: مەعریفەناسیی کانت. بەلاّم میراتگرە راستەوخۆکانی لۆك واتە لایەنگرانی سوودگەرایی ناچارانە بەیەکجاری عەقڵیان خستە خزمەتی حەزو ئارەزووەکانەوە و روویان کردە تێڕوانینێکی ئامێری بۆ عەقڵ.

# بەشی دووەم

## عەقلانیەتی دامەزراو لەسەر سوود و قازانج

**((کۆمەڵگای سیاسی یانەیەکی قازانجە بەرامبەرەکانە)).**

**مارشال**

هۆبز و لۆك مامەڵەیان لەگەڵ جۆرێك لە بیری سیاسیدا دەکرد کە بەرەو دیاریکردنی سەرچاوە و ناوەڕۆکی حکوومەت لە مافی سروشتی پاراستنی خود هەنگاوی دەنا. دوابەدوای ئەو دژواریانەی کە لەگەڵ ئەم تێڕوانینە بۆ دیاریکردنی سروشتی ئەرکی سیاسی و ناوەڕۆکی دەسەلاتی سیاسی هاوکات بوون سوودگەرایی بە ئیلهام وەرگرتن لە روویەکی تری بیری هۆبز کە بە نۆرەی خۆی لەبیری لۆکدا پەرەی پێدرابوو روویکردە بنەڕەتی سوود و باشەی کەسیی بۆ روونکردنەوەی کرداری تاك و بنەڕەتی سوودی هەموان بۆ دیاریکردنی فاکتەری هەبوونی دەوڵەت. سوودگەرایی روویکردە ئەو بەڵگەهێنانەوەیەی کە فاکتەری بوونی کۆمەڵگا و رێکبوونی بریتییە لە سوودبەخش بوونی بۆ حاڵی مرۆڤ، چونکە ئەگەر بە حاڵی خۆیانەوە وازیان لێ بهێندرێت ناتوانن وەکو مرۆڤ پێداویستییەکانی خۆیان دابینبکەن. کەواتە ئەوشتەی کە تاك لەناو کۆمەڵگادا رادەگرێت بریتییە لە سوودی تاکەکەسی ئەو و بەهەمان شێوەش ئەو شتەی کە تەنها مایەی رێکبوونی سیاسییە بریتییە لە سوودی هەموان.

لە جۆری بیری هۆبز و لۆکدا تەنها یەك جار و لەکاتی بەستنی گرێبەستی کۆمەلایەتیدا رەزامەندی تاکەکان لە دامەزراندنی حکوومەتدا بەرچاو کەوتبوو ئەمە بەکەم و کورتییەکی گەو[illegible] بیری ئەوان لەقەڵەمدەدرا. سوودگەرایی بە پەنابردن بۆ بنەڕەتی سوودمەندی و





رزگارکردنی دیکترینی گرێبەستی کۆمەلایەتی هەوڵیدا کە بەشداری سیاسی بە پێویستییەکی بەردەوام لەقەڵەمبدات. بەلاّم هەر وەك دەیبینین لەم کارەدا بە ئەنجامی تەواو نەگەیشت و روونکردنەوەی بەڵگەداری ئەم پێویستییەش بەجۆرێکی تری بیری سیاسی سپێردرا کە لە بەشی سێیەمدا باسی لێوە دەکەین. لەگەڵ ئەمەشدا سوودگەرایی بەجیاکردنەوەی بواری کۆمەڵگای مەدەنی لە بواری دەوڵەت بەنۆرەی خۆی دەستکەوتێکی گرنگی بەخشییە رەوتی فەلسەفەی سیاسی نوێ.

**پاژی سێیەم:**

## عەقلانیەتی سوودی کۆمەلایەتی

هەروەك باسمانکرد هـۆبز و لـۆك لـە چـەمکی ((باشـەی هاوبـەش)) کـە نـاوەڕۆکی بـیری کلاسیکی بوو دوورکەوتنەوە. ئەوان هەلسەنگاندنە بەهاییەکان و لەوانـەیش ئـەخلاقییان دایـە پال میکانیزمی حەز و ئارەزوو. لە ئەنجامدا بەتێبینی کردنی ئەوەی کە بابەتی حەزەکانیان بـە جیـاواز و نـاکۆك لـەنێوان مرۆڤەکانـدا دیـاریکرد ئیـدی بەیـەك باشـەی بینـراو[1] بـەواتا کلاسیکییەکەی بۆ هەموان رازی نـەبوون. کاتێـك کـە عەقلانیـەت بـەواتا کلاسـیکییەکەی وەلاوەنرا ئیدی قەزاوەتی ئەخلاقی نەیدەتوانی لەخۆگری لایەنی گشتی بـەواتا کۆنەکـەی بێـت. هۆبز کە لە چەمکی ((باشەی هاوبەش))ی کلاسیکی دوورکەوتبووەوە نەیدەیوست لە قەزاوەتی ئەخلاقیدا بەتیۆری هۆشگەرایی[2] بگات. بەلام ئەنجامی کردەیی بۆچـوونەکەی ئـەو وەهـابوو. لەئاکامدا شوێنکەوتوانی ئەنجامگەلێکیان لە تیۆرەکەیەوە بەدەستهێنا کە ئەو بۆخـۆی، خـۆی بەدوور دەگرت لە قبوولکردنیان. شـوێنکەوتوانی لـەبری پـشت بەسـتن بـە ئەنجامـەکانی ئـەو جەختیان لەسەر گریمانە و بنەڕەتە فەرزکراوەکانی[3] ئـەو کـردەوە و بینایـەکی نوێیـان لەسـەر بناغەکەی ئەو دامەزراند. ئەم بۆچوونە بەخێرایی گەشەیکرد کە خۆشی و خۆشبەختی بابەتێکە کە پەیوەست دەبێت بەتاکەوە. ئێستاکە هۆبز عەقلی خستوەتە خزمەتی حەزەکانەوە چ کەسێك باشتر لە خودی تاك دەتوانێت دیاری بکات کە خۆشی و خۆشـبەختی ئـەو لـە چـیدایە؟ وەهـا ئەنجامگیریگەلێك لە پێشەکییەکانی هۆبزەوە تێڕوانینی سوودگەرایی هێنایە پێشەوە.

1- objective good.
2- Subjectivism.
3- Premises.






بەلام هێشتا عەقل پێگەیەکی گەورەی هەبوو لەبیری هۆبزدا. راستە کە عەقل لە بەرامبەر حەزدا بێتوانایە بەلام هەر لەبەرئەوەی کە لەلایەکەوە بێتوانایە لەلایەکی ترەوە دەبێتـە خـاوەن توانایەکی زال. بەواتایەکی تر عەقل لە تیۆرەکەی هۆبزدا بـارێکی پارۆدۆکـسیکالی[4] هەیـە. عەقل بێتوانایە چونکە لە سیستەمی جیهانـدا هـیچ پـشتیوانێکی نییـە. جیهـانی دەکەوێتـە دەرەوەی دەسەلاتی عەقل. بەلام هەر ئەم کارە ئەو بوارە بـە عـەقل دەدات کـە خـۆی دەسـت بەدروستکردنی ئازادانە[5] بکات و بە پێشکەوتنی بێسنوور بگات لە زالبون بەسەر سروشـتدا. عەقل لە بەرامبەر حەزدا بێتوانایە بەلام ئەگەر لەگەل بەهێزترین حەزدا واتـا پاراسـتنی خـود (یان روە نێگەتیڤەکەی واتا هەلاتن لە مەرگی ناسروشـتی) بکەوێتـە هاوکـاری دەگۆڕێـت بـە توانای زال. عەقلگەرایی هۆبز لەسەر ئەو بڕوایە دامەزراوە کە بەپێی سروشت بەهێزترین حـەز تەنها ئەو حەزەیە کە دەتوانێت ((ببێتە سەرچاوەی کۆمەلگا گەورە و پایەدارەکان)). کەواتە لە کۆتاییدا بەهێزترین حەز بریتییە لە عـەقلانیترین حـەز[6]. ئـەم حـەزە سەرچـاوەی دەولـەت و کۆمـەلگای مەدەنییـە. هـۆبز بەپێـچەوانەی ماکیاڤیلییـەوە قبوولینـەدەکرد کـە جەوهـەری کۆمەلگای مـەدەنی بریتییـە لـەوەی کـە لەسـەر خەراپـەکاری بونیـاد بنرێـت. لەڕوویەکـەوە دیکترینی باری سروشتی هۆبز رەت کردنەوەی بانگەشەکەی ماکیاڤیلییە. هـۆبز ئـەو بۆچـوونە کلاسیکییەی قبوولکردووە کە دادپەروەری تەنها لە کۆبوونەوەوە بەرهەم نایەت بەلکو مافێکی سروشتییە. هۆبز لـە بەرامبـەر فەلـسەفەی کلاسـیکیدا کـە بـە بۆچـوونی ئـەو لەرادەبـەدەر بەرزەفڕبوو جەختی لەسەر ئەو بنەڕەتە کردەوە کە مافی سروشتی لـە حـەزە سـەرەتاییەکانەوە ئەنجامگیری بکرێت نەك لە مەبەستی خوازراوی مرۆییەوە. کاتێك کە حکوومەت دامەزرا ترس لە مردنی ناسروشتی دەگۆڕێت بۆترس لە حکوومـەت و حـەزکردن بـە پاراسـتنی خـود بـەرەو بوارێکی نوێ دەکرێتەوە و دەگۆڕێت بۆ هۆکاری پاراستنی ئاسایش[7]. ئەوەیکە زیاد لە هەموو شتێك ئارەزوو دێنێتەدی بریتییە لە توانا. هۆبز لـەبری گـەورەیی و شـکۆمەندیی ماکیـاڤیلی توانای کردە چەقی سەرەکی فێرکردنەکانی خۆی.

4- Paradoxical.
5- Free constructs.
6- Bruce Douglass "The common good and the public interest" political Theory vol. 8, No. I, February 1980, pp. 103-117.
(٧) ر. ك. لئواستراوس، فلسفه سیاسی چیست، ترجمه فرهنگ رجایی، تهران، انتـشارات علمـی و فرهنگـی، ١٣٧٣.

لۆك بناغەی نەخشەكەی هۆبزی پەسەند كرد، بەلاّم لە هەندێ خالّدا چەند گۆڕانكاریەكی تیادا ئەنجامدا كە هەنگاوێكی تر ئەم ڕەوتەی بەرەو سوودگەرایی پالّ پێوەنا. لۆك بەو ئەنجامە گەیشت كە ئەوەی كە مرۆڤ لە بنەڕەتدا بۆ پاراستنی خود پێویستی پێیەتی سامان و خاوەندارێتییە نەك چەك و تفەنگ. لە دیكترینەكەیدا حەزكردنی بە پاراستنی خود بۆ حەزكردن بە كۆكردنەوەی سامان و مافی پاراستنی خود بۆ مافی بەدەستهێنانی بێسنووری سامان دەگۆڕێت. ئەنجامەكانی ئەم گۆڕانە بچووكە زۆر گەورەن. لۆك باشتر لە هۆبز پرۆژەكەی ماكیاڤیلیی كە باس لە پێویستیی دۆزینەوەی جێنشینێكی نا ئەخلاقی بۆ ئەخلاقیات دەكات بەرەو پێشەوەبرد. ئەم جێنشینە شتێكی دیكەی جیا لە كۆكردنەوەی سامان و تەماحكاری نییە. لە دیكترینەكەی لۆكدا ڕووبەڕووی حەزێكی خۆویستانە دەبینەوە كە تێركردنی پێویستی بە ڕژانی خوێنی كەسێك نییە و ئەنجامەكەشی باشبوونی هەلومەرجی گشتیی لێ دەكەوێتەوە. سەرمایەداری دەبێتە شوێنگرەوەی فەزیلەتی ناشیرینی ڕۆمی و بازرگانیش شوێنگرەوەی فەزیلەت.

ئەم دابەزینەی پلەوپایەی مرۆیی بووە هۆی بەرزبوونەوەی دەنگی ناڕەزایی توندی ڕۆسۆ، بەلاّم شوێنكەوتوانی سوودگەرایی تەنانەت لەو سنوورانەش كە لۆك پێیی گەیاندبوو زیاتر بەرەو پێشەوە ئاراستەیان كرد. ئەوان ڕەگەزی چێژگەرایی[٨] نێو تیۆرەكەی لۆكیان تا ئاستی سنووری لۆژیكی خۆی بەرەو پێشەوەبرد. ئەو شتەی كە بەواتا دروستەكەی باش یان خەراپە شتێك نییە جگە لە چێژ و ئازار. هۆبز ژیانی عەقلانّی بەو ژیانە پێناسە كرد كە لەژێر دەسەلاّت ترس لە ترسە، ئەو ترسەی كە ئێمە لەترس ڕزگار دەكات. لۆك كە لەم بۆچوونەوە ئیلهام وەردەگرێت ژیانی عەقلانّی لەگەلّ نێوانكاری ئازارێك كە ئازارێك چارەسەر دەكات بە یەك شت لەقەلّەمدەدات. ئەو ئازارەی كە ئازار چارەسەر دەكات بریتییە لە كارو كار ڕەتكردنەوەی سروشتە. ڕەتكردنەوەی سروشت بە شادی كۆتایی دێت چونكە باری سروشتی بریتییە لە باری دامان. هەنگاونان بەرەو خۆشی بەدیهێنان و بەكردەیی كردنی ئازادییە. كەواتە بۆ پشتگیریكردنی ئازادی مافی سروشتی پێویستی نییە.

8- hedonism.





## قازانج لە بری ماف

هیۆم قازانجی لە بەرامبەر ئەركی ئەخلاقی كە ئەركێكی دروستكراو و كۆمەلاّیەتی بوو دانا. قازانج پێویستی بە پالّپشتی فەرمانڕەوایەكی دروستكراو نییە. هیۆم لە مشتومڕیكدا دژ بە تیۆری گرێبەستی لۆك وتی كە پێویست بەوە ناكات بناغەی ئەركی سیاسی لەسەر گرێبەستی سەرەتایی دابنێین. وەفاداربوون بەرامبەر بە پەیمان كە بناغەی سەقامگیری و پایەداربوونی گرێبەستی كۆمەلاّیەتییە بنەڕەتەكەی دەگەڕێتەوە بۆ قازانج و سوودمەندی. هیۆم دەیوت كە دیكترینەكەی لۆك زنجیرەیەك پێچ و خەمی ناپێویستی تێدایە لە كاتێكدا كە دەكرێت ڕاستەوخۆ پەنا بۆ بنەڕەتی سوود ببردرێت. بەلاّم هێشتا هیۆم هێندەی بێنتهام بەرەو پێشەوە هەنگاوی نەناوە. مەبەستی هیۆم لە سوود بریتییە لە قازانجی كۆمەلّگا و دەلّێت هەموو كەسێك بە لەبەرچاوگرتنی قازانجە درێژخایەنەكانی خۆی بەدوای سودو قازانجدا دەگەڕێت. سودمەندی لای هیۆم بەواتای جۆرێك باشەی گشتییە. حكوومەت و یاساكان و دامەزراوەكانی دەولّەت بۆ باشەی گشتی كە لەماوەیەكی درێژدا لەگەلّ قازانجی هەموو تاكەكان یەكدەگرێتەوە، دادەمەزرێت[٩].

بیری نوێ لەم قۆناغەی پێشكەوتنی خۆیدا دەیویست كە بەتەواوی تیۆری مافی سروشتی لە بەرنامەی خۆی وەدەربنێت. چەمكی مافی سروشتی كە تائەوكات هۆبز و لۆك هەریەك بەشێوەیەك[١٠] لە فەلسەفەی سیاسی خۆیاندا پارێزگارییان لێكردبوو چەند ناكۆكییەكی هەبوو لەگەلّ پرۆژەی بیری نوێدا. دەرهێنانی حكوومەت و ئازادی لە مافی سروشتییەوە چەمكی ڕازیبوونی لاواز دەكرد، لەكاتێكدا كە فەلسەفەی نوێ دەیویست بە تەواوی دەولّەت و كۆمەلّگای مەدەنی بخاتە سەرچەمكی ڕەزامەندی و ڕێككەوتن. ئەگەر بڕیار وابێت كە ئێمە بەشێوەیەكی سروشتی مافێكمان لەسەر ئازادی هەبێت لەم حالّەتەدا بەشی ئێمە و ویستی ئێمە تاڕادەیەك كەم دەبێتەوە. سوودگەرایی و ڕۆسۆ هەریەك بەشێوەیەكی جیاواز ئەم گرفتەی بیری نوێیان لە قۆناغە سەرەتاییەكانی گەشەكردنیدا چارەسەركرد. سوودگەرایی هەولّیدا بەدەستپێكردن لە دەروونناسی تاكەوە یەكسانی ئازادی بخاتە جێی مافی سروشتی. هۆبز و لۆك

(٩) جان راونر ((فایدەگرایی كلاسیك)) در مایكل ساندل، لیبرالیسم و منتقدان ان، ترجمە احمد تدین، تهران، انتشارات علم و فرهنگی، ١٣٧٤، ص٧٠.

(١٠) لە شێوەی مافی پاراستنی خود كە مافێكی سروشتییە.

بەدەستپێکردن لە مافی سروشتییەوە مافیان بە لەپێشتر دانابوو لە باشە[11]، بەلاّم سوودگەرایی بەلابردنی مافی سروشتی باشەی کەسییان بە لەپێشتر دانا لە ماف. بەم شێوەیە ماف پێناسە کرا بەو شتەی کە باشە دەگەێنێتە ئەوپەڕی. هۆبز بەدەستپێکردن لە مافی سروشتی و لەراستیدا بە لەپێشتر دانانی ماف کۆمەڵگای مەدەنی کردبووە مەیدانی سیاسەت و حکوومەت. سوودگەرایی لە هەولّ دابوو بە لەپێشتر دانانی باشەی کەسیی کۆمەڵگای مەدەنی لە حکوومەت جیابکاتەوە و کارەکەی لۆك بگەێنێتە سنووری لۆژێکی خۆی. هۆبز بەلڤیاتانەکەی خۆی مەیدانی ئەخلاق و مافی تێکەڵ بە یەککردبوو. بێنتهام ویستی کە فەرمانڕەوایی بۆ بواری یاسایی و سیاسی سنووردار بکات و یاسا و رێسا ئەخلاقییەکانی بەیەك شت لەقەڵەمنەدەدا.

رێسا ئەخلاقییەکان بەنۆرەی خۆیان گەیشتن بەخۆشی بەرەو پێشەوە دەبن. لەکاتی ناکۆکی نێوان یاسا و رێسا ئەخلاقییەکان ئەوەی کە خۆشی زیاتر دابین دەکات بەسەرچاوە دادەنرێت.

رۆسۆ بەشێوەیەکی تر دیکترینی پەیوەستە بە حەز و ئارەزوو و قازانجی گۆڕی و بەشیکردنەوەی عەقلانی- مێژوویی بەو ئەنجامە گەیشت کە حەز و قازانجەکان بەو جۆرەی کە لە ماکیاڤیلییەوە تا ئادەم سمیت باسیان لێوەکردووە سروشتی نییە و زیاد لەوەی کە چەند خەسڵەتێکی چەسپاو بن دروستکراون. ئەمانە لە نێو رەوتی ئەو رووداوانەی کە هاتوونەتە رێی مرۆڤ سەریانهەڵداوە. هیگڵ و مارکس بەهاو ئاراستە لەگەڵ تیۆرەکەی رۆسۆدا ئەم بۆچوونەیان درێژەپێداو بووژاندیانەوە[12]. بۆ رۆسۆ ئەخلاق وەکو باشەیەکی سەربەخۆ لە سیاسەت و تایبەت بە ژیانی ناوەوەی مرۆڤەکان کارێکی بڕوا پێنەکراو بوو. پێوەری بالاّی ژیانی ئەخلاقی لای رۆسۆ بریتییە لە شار و کۆمەڵگای مەدەنی[13]. رێگەچارەی کێشەکانی مرۆڤ و لەوانەیش نایەکسانی کە گرنگترینی ئەو کێشانەیە لە سیاسەتدا حەشار ماوە. سیاسەت رێگەچارەی کێشەی مرۆڤە. کۆمەڵگا لەو فۆرمەی ئێستایدا قووڵترین برینەکانی لە جەستەی مرۆڤدا دروستکردووە و تەنها کۆمەڵگا دەبێت ئەم برینانە ساڕێژ بکات. بۆ دوورخستنەوەی خراپە لە جیهان دەبێت سیستەمی جیهان بگۆڕدرێت.

یەکسانی حکوومەت و فەرمانڕەوایی کێشەیەکی تر بوو کە دەبوو بیری سیاسی نوێ بەسەریدا زالّبێت. لە تیۆرەکەی هۆبز و تارادەیەکیش لە تیۆرەکەی لۆکدا جیاوازی لەنێوان حکوومەت و

11- Good.

12- Harvey Mansfield "Self- interest rightly understood" political Theory, vol23, No II, February 1995, pp. 48-66.

13- Lucio Colletti, From Rousseau to Lenin, engtrans. By Judith Merrington and Judith White, Wrfold, Lowe and Brydone, 1, p.144.





فەرمانڕەواییدا نییە. لەم قۆناغەی گەشەکردنی بیری نوێدا سوودگەرایی لەلایەك و رۆسۆ لەلایەکی ترەوە هەریەك رێگەچارەیەکیان بۆ ئەم کێشەیە دۆزییەوە کە پاشتر دەربارەی دەدوێین.

## سوودی کەسیی وەك سەرچاوەی حکوومەت

هۆبز دەیویست لە تیۆرەکەی خۆیدا پرسی مەشرووعیەتی حکوومەت و سوودمەندییەکەی لە یەك شوێندا بچەسپێنێت، بەلاّم بەپێی گریمانە و رێڕەوی بەڵگەهێنانەوەکانی خۆی تەنها یەکەمیانی پێ چەسپاو دووەمیانی بە ناتەواوی هێشتووە. بیرمەندانی سوودگەرایی بەڵگەیان هێنایەوە کە هۆبز بابەتی ماف و قازانجی تێکەڵ بەیەك کردووەو بە جەختکردن لە سەرماف و مەشروعیەتی دەوڵەت گەیشتۆتە تیۆری حکوومەتی رەها. هیۆم هەوڵیدا کە بە جەختکردنەوە لەسەر قازانج پرسی دەوڵەت ئاراستە بکات و لەم رێگەیەوە بگاتە حکوومەتی مەرجدار. هیۆم چاوی لە بابەتی گرێبەستی کۆمەلاّیەتی کە بە بۆچونی ئەو دیارینەدەکرد پۆشی و رووی کردە بابەتی سوود و قازانج. بە بۆچوونی ئەو کاتێك کە هاولاّتیان پەیڕەوی لە حکوومەت دەکەن لەبەر ئەوە نییە کە پەیمانیان بەستووە وەها بکەن، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بە قازانجی ئەوانە حکوومەتێك هەبێت و حکوومەتیش بوونی نابێت مەگەر ئەو کاتەی کە پەیڕەوی لێبکرێت. هیۆم بەڵگەدێنێتەوە کە ئەرکی پەیڕەویکردن لە حکوومەت ئاسانتر لە ئەرکی وەفاداربوون بەرامبەر بە پەیمان روون دەکرێتەوە. وەفاداربوون بەرامبەر بە پەیمان فەزیلەتێکی دروستکراوە کە بناغەکەی دەگەڕێتەوە بۆ قازانجی کەسی بەهۆی برەو پەیداکردنی گشتییەوە بە فەزیلەت لەقەڵەمدراوە.

هیۆم بە جەختکردنەوە لەسەر قازانج لایەنی عەقلانیەتی تیۆری گرێبەستی کۆمەلاّیەتیی بەنزمترین ئاستی خۆی کەم کردەوە و وتی کە کۆمەڵگای رێکخراو بەهۆی سوودمەندبوونی بۆ حالّی مرۆڤ هاتۆتە بوون و ئەم کۆمەڵگایە لەسەربنەمای سوودی هەستپێکراو دامەزراو. سەرەتا حکوومەت لەرێگەی پرۆسەیەکی پلە بەپلەوە دروستبووە و هەست بەسوودی بەردەوامی کراوە. بەم شێوەیە هێشتا تیۆرەکەی ئەو چەند پێوەندێکی لەگەڵ تیۆری گرێبەستی کۆمەلاّیەتیدا هەیە و هیۆم بەپێچەوانەی شوێنکەوتوانی لەوانەش بێنتهام و میل، بانگەشەکانی گرێبەستی کۆمەلاّیەتی لە ئاستە هەموارەکەیدا قبوولّ دەکات[14]. راستییەکە سوود و بەرژەوەندی کەسیی مرۆڤ بەرەو ناو کۆمەڵگای رێکخراو پەلکێشدەکات، چونکە تاك لە کۆمەڵگادا باشتر دەتوانێت پێداویستییەکانی

14- Brian Barry, op. cit.

خۆی دابینبکات بەلاّم ئەم بە تەنها بەس نییە. دەبێت چەند گرێبەستێك بۆ دامەزراندن و ڕێکخستنی مافی دارایی لە نێوان مرۆڤەکاندا هەبێت. گرێبەستێك لەلای هەموو ئەندامانی کۆمەڵگادا هەیە کە سەقامگیری دەبەخشێتە خاوەندارێتی دەرەکی. ئەم گرێبەستە بریتییە لە هەمان هەستی گشتی هاوبەش (عەقڵی ساخڵەم)، ئەو هەستەی کە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگادا دەگواسترێتەوە بۆ یەکدی و هانیان دەداتی کە کردارەکانیان بەپێی ڕێساگەلێك ڕێك بخەن.

بەهەمان شێوە هیوم هێرش دەکاتە سەر تیۆری مافی سروشتی و هەڕەشەی شێواندنی لێدەکات. بەشێوەیەکی گشتی هیوم لەو بیرمەندانەیە کە لە بناغەوە فەلسەفەی سەدەی حەڤدەیەم و هەژدەیەمیان دایە بەرهێرشێکی وێرانکەر. ڕۆسۆ درێژە بەکارەکەی ئەو دەدات و لە ئاکامیشدا کانت فەلسەفەیەکی نوێ بنیاتدەنێت(١٥). هیوم لە ((نامەیەك دەربارەی سروشتی مرۆیی)) ڕەخنە لە دیکترینەکانی تیۆردارێژانی مافی سروشتی دەگرێت. ڕەخنەکەشی ئەوەیە کە تیۆردارێژانی مافی سروشتی هەوڵدەدەن بە ئاماژەکردن بە هەندێك لەبیر و ڕاو کردارەکانی نێوان مرۆڤەکان، بەتایبەتی حەزی پاراستنی خود و مەشروعیەتی ئەخلاقیی بەرگریکردن لە خود ڕووبەڕووی بۆچوونی گومانگەراکان ببنەوە. هیوم جەختی دەکردەوە کە ئەم بەڵگانە ناتوانن هاوکاری دەربڕینی بۆچوونە ئەخلاقییەکانی تاك بکەن. ناکرێت لەو ڕاستییەوەی کە هەموان بەشێوەیەکی تایبەت بیردەکەنەوە یاخود کاردەکەن بەو ئەنجامە بگەین کە منیش دەبێت وابکەم. بەم شێوەیە تەواوی سیستەمی تیۆری مافی سروشتی نوێ کە پشت بە یەکسانی دەروناسی و کەلتووری مرۆیی دەبەستێت جێی ڕەخنەیە.

ڕۆسۆش ئاماژە بەوە دەکات کە ناکرێت بڵێین دەبێت مرۆڤەکان لە ((باری سروشتی))دا خاوەن ماف یاخود ئەرکی ئەخلاقی بن. ئەخلاق دروستکراوی مرۆڤە لە کۆمەڵگای سیاسیدا، هەروەك ڕۆسۆ دەڵێت چەمکی ((ئەخلاقیاتی سروشتی)) چەمکێکی پارادوکسیکییە (ئەگەر سروشتە ئیدی ئەخلاق نییە). مرۆڤ تەنها لە کۆمەڵگادا خۆی وەکو بونەوەرێکی خاوەن ماف و ئەرك هەستپێدەکات. مرۆڤی تەنهای وەکو ڕۆبینسۆن کروزۆ پابەندی ڕەچاوکردنی هیچ شتێك نییە. لەگەڵ ئەمەیشدا ڕۆسۆ ڕوانگەکەی هیوم بەرەو بوارێکی بەرزتر سەردەخات کە لە سنووری سوودگەرایی دوور دەکەوێتەوە. لە تیۆرەکەی هیومدا مرۆڤی ئەخلاقی ئەو مرۆڤەیە کە بە ئەزموون فێردەبێت چ جۆرە کردارێك لە کۆمەڵگادا سودمەند یان زیانبەخشە و بەم شێوەیە لە کۆمەڵگادا فێری کرداری

١٥- ...چارد تاك، هابز، ترجمه حسین بشیریه، تهران، طرح نو، ١٣٧٦، ص ١٤١.





بە باش و بە ناشیرین دانان دەبێت. هیوم ئەوە قبوولدەکات کە مرۆڤ لە کۆمەڵگادا فێری حەز گەل و بە باشتر دانانێك دەبێت کە ناکرێت لە دەرەوەی کۆمەڵگادا فێریان ببێت، بەلاّم لێرە زیاتر بەرەو پێشەوە ناچێت. هیوم وەکو ڕێسا گەلێك کە کاری ئێمە ئاسان دەکەنەوە باس لە ڕێسا ئەخلاقییەکان دەکات، وەك بڵێی ڕۆڵی سەرەکی بنەڕەتە ئەخلاقییەکان ئەوەیە کە بواریان پێدەدەن بەسەرکەوتنێکی زیاترەوە بەدوای ئامانجەکانی خۆماندا بگەڕێین. بەلاّم ڕۆسۆ دەڵێت کە کۆمەڵگای ئێمە دەگۆڕێت بە جۆرێك کە ئەگەر لە دەرەوەی کۆمەڵگەدا بوباین وەها گۆڕانێك پێشبینی نەدەکرا. مرۆڤ بە گۆڕانی بۆ بونەوەرێکی ئەخلاقی حەز گەلێك بەدەستدێنێت کە ئەگەر بوونەوەرێکی ئەخلاقی و کۆمەلاّیەتی نەبووبا وەها حەزگەلێکی بەدەستنەدەهێنا. خۆشبەختی مرۆڤی ئەخلاقی و کۆمەلاّیەتی لەدوا تێرکردنی حەزگەلێك لە دوای حەزگەلێکی تر نییە بەڵکو لە ژیانێکی خاوەن بە پەیوەندیگەلێکی دروستی لەگەڵ خەڵکی و لەگەڵ خود دایە(١٦).

هیوم لەسەربناغەی هۆکاری ملکەچیکردن بڕوای بە حکومەتی مەرجدار و سنووردار هەیە. لە هەنگاوی یەکەمدا مرۆڤەکان بۆ ئەوە ملکەچی دەکەن کە بە قازانجیانە وابکەن. کاتێك کە بە قازانجیان نەبێت خۆ بەدوور دەگرن لە ملکەچیکردن. خەڵکی بەو هۆیەی کە حکومەت بەباش دەزانن ستەمیش بە ناشیرین لەقەڵەمدەدەن. بۆیە کاتێك حکومەت ستەمیان لێبکات بە قازانجی خۆیان دەزانن کە ملکەچی لێنەکەن یاخود تەنانەت زۆر چالاکانە بەرامبەری ڕابوەستن، هیوم ئاشکرای دەکات کە نەریتی ملکەچیکردن ڕێسایە و ملکەچینەکردن کارێکی ریزپەڕە. تەنها لە بەرامبەر ستەمی توندا خەڵکی سەرپێچی لە ملکەچی دەکەن. تیۆرەکەی هیومیش دەربارەی مەشروعیەتی حکومەت لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراوە. ڕەنگە فەرمانڕەواکان لەبەر چەند هۆکارێك بانگەشە بۆ حکومەت بکەن: میرات و پلەو ناونیشان یان هەر شتێکی تر. ئەمانە ئەرکی ملکەچی دیاری ناکەن ڕەنگە چەندین کەسی جیاواز هەبن کە بانگەشە و توانایی حکومەتیان هەبێت. هاولاّتیان لە ملکەچیکردن بۆ هەریەك لەوان قازانجی یەکسانیان دەبێت. و سوودی گشتی حکومەت ملکەچی دەگۆڕێت بۆ فەزیلەتێك. ئەوە زۆر گرنگ نییە کە کام فەرمانڕەوا ناونیشان و نازناوی شکۆدارتری هەیە بۆ حکومەت کردن. ئاگاهی دادپەروەری فەرمان دەدات کە بێ ئەوەی سەبارەت بە سەرچاوەی سەقامگیری حکومەت دوو دڵی نیشان بدەین ملکەچی لەو حکومەتە بکەین کە حاڵی حازر لە وڵاتدا بەر قەرارە. مرۆڤی خاوەن عەقڵ ملکەچی لەو حکومەتە دەکات

16- John Plamenatz, op. cit, p.367.

که ئێستا له وڵاتەکەیدا هەیە بەبێ ئەوەی زۆر بیر لە ریشە و سەرچاوەکەی بکاتەوە. لە کرداردا حکوومەتەکان لە کێشمەکێشی نێوان کۆمەڵگا جیاوازەکانەوە سەرچاوەیان گرتووە نەك لە ململانێی ناوخۆیان(١٧). شێوەی دروستبوونی حکوومەت جیاوازە لە مەشروعیەتی حکوومەت. عەقلانیەتی حکوومەت لە سوودەکەیەوە بەرهەمدێت. هۆبز بەبێ سوود ئەو هەمووە خۆی سەرگەرمی دیاریکردنی عەقلانیەت و مەشروعیەتی حکوومەت کردووە. هیۆم بەپێچەوانەی هۆبزەوە کە ملکەچیکردنی دەبەستەوە بە دەسەڵات و بەڵگەی دەهێنایەوە کە دەسەڵات پەیوەستە بە ملکەچیکردنەوە. هەربۆیە ئەو دەوڵەتەی کە هیۆم باسی لێوە دەکات دەوڵەتی سنووردارە چونکە پەیوەستە بە هۆکاری ملکەچیکردن و ملکەچیکردنیش لەسەربنەمای سوودمەندی دامەزراوە.

لەراستیدا تیۆرەکەی هیۆم پردێکە لەنێوان تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی و تیۆری سوودگەرایی هیۆم لەلایەکەوە وەکو بناغەی حکوومەت جەخت لەسەر ملکەچیکردن دەکاتەوە و لەلایەکی ترەوە وەکو بناغەکانی یاسا و دادپەروەری باس لە پەیمانەکان دەکات و بە ئاشکرا دەڵێت کە ئامرازی پێکەوە لکێنەری کۆمەڵگا بریتییە لە تێگەیشتنی باو بۆ دادپەروەری و قازانجە هاوبەشەکان و دەوڵەت لەناو وەها بارێکدا سەریهەڵداوە. سوودمەندی لای هیۆم هاو واتایە لەگەڵ جۆرێك باشەی گشتیدا و دامەزراوە سیاسییەکان بۆ وەدی هێنانی ئەم باشە گشتییە کاردەکەن. بەم شێوەیە لە تیۆرەکەی هیۆمدا لەپێشتر بوونی ماف و دادپەروەری زۆر بەو توندییە نەکەوتونەتە ژێر پرسیارەوە کە پاشتر لەلایەن بێنتهام و جێمزمیلەوە کەوتە ژێر پرسیارەوە(١٨). دادپەروەری لەپێشترە لە حکوومەت بەلاّم ئەم دادپەروەرییە پەیوەست نییە بە ((یاسای سروشت))ەوە. نایەکسانییە کۆمەڵایەتییەکان پەیوەستن بەو نەریت و پەیمانانەوەی کە لەسەرەتادا بەهۆی سوودمەندبوونیان قبوولکراون. بەهەمان شێوە رێکیی کۆمەڵایەتیی دامەزراو لەسەر نایەکسانی کۆمەڵایەتیش بەسوودە بەگشتی دەکرێت قبوولبکرێت. بەلاّم رەخنەیان لەم بۆچوونەی هیۆم گرتووە کە ناکرێت لەو پێشەکییانەی کە دەڵێن رەنگە نایەکسانییەکان بەسوود بوبێتن بەو ئەنجامە بگەین ئەو نایەکسانییانەی کە بەدوای ئەوانیشدا هاتوون بەسوودن و دەکرێت قبوڵبکرێن. شوێنکەوتووە هزرییەکانی هیۆم کە روانگەکەی ئەویان تاسنووری لۆژیکیبوونی گەشەپێدا هەستیان بە ناکۆکییەکانی تیۆرەکەی کرد و لەو بنەماو پێشەکییانەوەی کە ئەو داینابوون بە ئەنجامگەلێکی نوێ

17- John Plamenatz, op. cit, p. 313.

(١٨) راولز، پێشوو، ص ٧١.





گەیشتن. بێنتهام و میل توانییان تیۆرێکی سیاسی بەرچاو لەسەربنەما هزرییەکانی هیۆم دابمەزرێنن و ئەو بنەمایانە بەرەو مەیدانگەلێکی نوێ ئاراستە بکەن.

## بە کورتی

هۆبز و دوابەدوای ئەویش لۆك چەمکی باشەی هاوبەشیان(١٩) کە لەبیری کلاسیکیدا وەکو جۆرێك پێوەر بۆ ئەخلاق و سیاسەت کاری پێدەکرا، وەلاوەنا. بەم شێوەیە ئیدی نەدەکرا قەزاوەتی ئەخلاقی بەهەڵگری لایەنی گشتی و خاوەن پێوەری بینراو لەقەڵەمبدرێت. بەلاّم هۆبز لە هۆشگەرایی لەنێو ئەخلاق بەدوور دەگرت و هەروەك بینیمان لەکۆتاییدا ویستی فەرمانڕەوای کردە بناغەی یاسا و ئەخلاق. بەلاّم هیۆم و لایەنگرانی سوودگەرایی هەر زوو جەختیان لەسەر لایەنی سوودگەرایانەی تیۆرەکەی هۆبز کردەوە و عەقڵ کە پێگەیەکی گرنگی هەبوو لە بیری هۆبزدا لە پایەکەی خۆی داگیرا. ئەوان باشە و قازانجیان لەبری یاسای سروشتی بەکارهێناو عەقڵیان خستە خزمەتی حەزەکانەوە. هیۆم لە رەتکردنەوەی دیکترینەکەی هۆبز و لۆکدا وتی پێویست بەوە ناکات کە عەقلانیەتی ئەرکی سیاسی لەسەر گرێبەستی کۆمەڵایەتی دابمەزرێنین. پابەندبوون بە پەیمان کە پایەداربوونی گرێبەستی کۆمەڵایەتی لەخۆ دەگرێت ریشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ قازانج و سوودمەندی ئەم کردارە نەك یاسای سروشتی. دەکرێت لەبری ئەو پێچ و خەمانەی کە بۆ ئاراستەکردنی گرێبەستی کۆمەڵایەتی و مەشروعیەتی حکوومەت لەتیۆرەکەی هۆبز و لۆکدا بوونیان هەیە، راستەوخۆ پەنا بۆ بنەڕەتی سوودمەندی ببردرێت.

سوود لە تیۆرەکەی هیۆمدا سوودی کۆمەڵایەتییە و هێشتا وەکو بێنتهام نەگەیشتۆتە بنەڕەتی گەڕان بەدوای چێژی تاکەکەسیدا. هیۆم دەڵێت حکوومەت و یاسا و دامەزراوە حکومییەکان لەبەرئەوەی لەماوەیەکی درێژدا لەگەڵ قازانجی تاکەکاندا یەك دەگرنەوە و بەم پێیە هاوئاراستە دەبن لەگەڵ قازانجی کۆمەڵایەتیدا، دادەمەزرێن. هیۆمیش وەکو کانت دەیویست بەنۆرەی خۆی مافی سروشتی لە چوارچێوەی تیۆری سیاسی وەدەربنێت. هۆبز و لۆك لە تیۆرەکەی خۆیاندا مافیان بەسەر قازانجدا بە لەپێشتر دانابوو. بەلاّم هیۆم و شوێنکەوتوانی پێیان وابوو کە قازانج لەپێشترە لە ماف. ئەوان توانییان بە لەپێشتر دانانی قازانج بەسەرمافدا بواری کۆمەڵگای مەدەنی لەبواری حکومەتی جیابکەنەوە. هۆبز و کەمێکیش پێشتر لەو لۆك بواری کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەتیان تێکەڵ بە

19- Common good.

یەکتر کردبوو. ئەم لایەنە کە پاشتر لە سوودگەراییدا بەخێرایی گەشەیکرد بە پێشکەوتنێکی گرنگ لە کامڵبوونی بیری سیاسیدا لەقەڵەمدەدرێت، چونکە پاشتر هیگڵ سەنتێزی ئـەم دووە (دەوڵـەت و کۆمەڵگای مەدەنی)ی خستە بەردەست کە ناکۆکییەکانی تیۆری مـافی سروشـتی و سـوودگەرایی هەردوو پێکەوە چارەسەرکرد.

هیۆم پێی وابوو کە هۆبز ماف و قازانجی تیکەڵ بەیەك کردووە و بە جەخت کردنەوە لەسەر ماف و مەشروعیەتی دەوڵەت گەیشتۆتە حکوومەتی رەها لە کاتێکدا ئەگەر قازانج بە لەپێشتر دابنـێین دەگەینە حکوومەتی مەرجدار. دەسەڵاتی مەشروعی دەوڵەت پاساو نییە بۆ ملکەچیکردن بـەڵکو کرداری ملکەچیکردن بۆخۆی پاساوە بۆ دەوڵەت. لەبری ئـەوەی بڵـێین دەوڵـەت خـاوەن دەسـەڵاتی مەشروعە بۆیە ملکەچی لێدەکرێت دەبێت بڵێین لەبەرئـەوەی خـەڵکی بـەهۆی قـازانجی خۆیانـەوە ملکەچی لە حکوومەت دەکەن بۆیە حکوومەت خاوەن دەسەڵاتە.

لە تیۆرەکەی هیۆمدا بنەڕەتی قازانجی کۆمەڵایەتی شوێنی گرێبەسـتی کۆمەڵایـەتی گرتـەوە. هیۆم لایەنی عەقڵگەرایانەی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی بۆ نزمترین ئاست هێنایە خوارەوە و وتی کـە حکوومەت لەرێگەی پرۆسەیەکی پلە بەپلەوە دروست بـووە و بـەهۆی سـودی بـەردەوام و هەسـت پێکراوییەوە لەلایەن خەڵکییەوە قبوڵکراوە. تەنانەت ئەو گرێبەستانەشی کە لـە نێـوان خەڵکیـدا کاری پێدەکرێت بەهۆی هەستێکی گشتیی هاوبەشەوە لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگادا بەهێزتر بووە.



## پاژی چوارەم:

## عەقڵانیەتی سودی گشتی

سوودگەرایی بەو شێوەیەی کە لە تیۆرەکەی بێنتهامدا پەرەی پێدرا لە دوو بواری گرنگـەوە هاوکارییەکی بەرچاوی پرۆژەی بیری نوێی کرد سەبارەت بە عەقڵانیـەتی دەوڵـەت. یەکـەم لـە جیاکردنەوەی چـەمکی فـەرمانڕەوایی لـە حکوومـەت و دووەم لـە شـیکردنەوەی کۆمـەڵگای مەدەنی وەکو چوارچێوەی ململانێ و رکەبەریی قازانجـەکان. جیاکردنـەوەی بـواری کۆمـەڵگای مەدەنی لە بواری حکوومەت دەستکەوتێکی گەورە بـوو کـە هاوکارییـەکی زۆری کـامڵبوونی تیۆری دەوڵەتی کرد لە قۆناغەکانی پاشتردا.

بێنتهام بە تێڕوانینی تایبەتی خۆی ئەو خاڵەی سەلماند کە فەرمانڕەوایی ناکۆك نییە لەگەڵ دابەشکردنی دەسەلات لەنێوان دامەزراوە جیاوازەکاندا. هۆبز دابەشکردنی دەسەڵاتی بە ناکۆك دەزانی لەگەڵ چەمکی فەرمانڕەواییدا. هەربۆیەش لە تیۆرەکـەی ئـەودا فـەرمانڕەوا لـە یـەك شوێندا خاوەن هەر سێ دەسـەڵاتی یاسـادانان و چـاودێریکردن و جێبەجێکردنیـشە. هەڵبەتـە مافی سروشتی دەسەڵاتی حکوومەتی بە چەند سنوورێکی دیاریکراو سنووردار دەکرد. لۆکیش بۆ سنووردارکردنی دەسەڵاتی حکوومەت پەنای بـۆ مـافی سروشـتی بردبـوو، بۆیـە کەوتەبـەر رەخنـەی هیـۆم و بیرمەنـدانی دی. هـەروەها بـیری مـافی سروشـتی لەگـەڵ مەعریفەناسـی ئەزمونگەری لۆکیشدا لەناکۆکیدا بوو. بەپێی مەعریفەناسی لۆك هیچ شتێك لە هۆشدانییە کە لە رێگەی ئەزموونەوە بەرهەمنەهاتبێت، لەکاتێکدا کە مافی سروشتی باسی کـارێکی پێـشتر دەکات. بەهەمان شێوە هیۆم پەیوەندی نێوان ((هەیە)) و ((دەبێت))ی رەتکردبوەوە و بەڵگـەی هێنایەوە کە تێپەڕین لە ((هەیە)) وە بۆ ((دەبێت)) بناغەیەکی لۆژیکیی نییە بۆیە ناکرێت لە تیۆری مافی سروشتییەوە بگەینە رێکیی دیاریکراوی دەوڵەت.





کێشەیەکی تر ئەوەبوو کە بیرۆکەی مافی سروشتی و ئەو حکوومەتەی کە لەسەربنەمای ئەو لەلایەن هۆبز و لۆکەوە پێشنیار کرابوو بنەڕەتی ڕەزامەندی و ڕێکەوتنی لە پێکهێنانی دەوڵەتدا کە چەقی بیری سیاسی نوێ بوو سەبارەت بە عەقلانیەت، لاواز دەکرد. هۆبز بنەڕەتی رازیبونی بەرەو تیۆری حکوومەتی دەسەڵاتخواز راکێشابوو. لەلایەکی ترەوە هیۆمیش بە جەختکردنەوە لەسەر چەمکی ملکەچیکردن وەکو بناغەی دەسەڵاتی حکوومەت رۆڵێکی کاردانەوەیی بۆ رەزامەندی لەبەرچاوگرتبوو. بێتنهام ئەم دوو ناکۆکییەی بیری پێشوەکانی چارەسەر کرد و نیشانیدا کە دابەشکردنی دەسەڵات ناکۆك نییە لەگەڵ بنەڕەتی فەرمانڕەواییدا، هەروەها بنەڕەتی رەزامەندیشی لەخۆ سپاردن بە فەرمانڕەوای رەها (لە تیۆرەکەی هۆبزدا) و ملکەچیکردنی کارلێکراو[1] (لە تیۆرەکەی هیۆم) دورخستەوە. بەم شێوەیە بنەماکانی تیۆری دیموکراسی پلۆرالیستیی نوێیی دارِشت.

## قەیرانی دیاریکردنی کۆمەڵگا لەسەربنەمای مافی سروشتی

هەروەك ئاماژەی پێکرا لە سەدەی حەڤدەیەمدا فەلسەفەی سیاسی و تیۆری دەوڵەت بووە قوربانیی وەرچەرخانێکی گەورە و هەنگاوێکی نوێ. هۆبز فەلسەفەی سیاسی پێش خۆی بە نازانستی لە قەڵەمداو خۆی بۆ دامەزراندنی فەلسەفەی سیاسی لەسەربنەمای زانست ئامادەکرد. جەوهەری بۆچوونەکەی، بەتایبەتی ئەو پێشەکی و گریمانانەی کە ئەو بۆ شیکردنەوە و پاسا و هێنانەوە بۆ کۆمەڵگای ڕێکخراو و عەقلانیەتی دەوڵەت خستییەروو هێشتاش پێگەیەکی بەرزی هەیە لە تیۆرداڕێژی سیاسیدا و بیرمەندە نوێخواز و داهێنەرەکان بەردەوام دەگەڕێنەوە بۆی و ئەنجامگەلێکی نوێی لێوە بەدەست دێنن. تا بە ئەمرۆش بواری لێکدانەوە و تێگەیشتنی نوێ بۆ بۆچوونەکانی و بەدواداگەڕانی هێڵی پەیوەست بوونی ناسراوترین هزرە سیاسییەکان لەگەڵ فەلسەفەی ئەودا کاری تیادا دەکرێت[2]. بەم شێوەیە سەدەی هەژدەیەم بە نۆرەی خۆی جۆش و بزاوتنێکی نوێی لە فەلسەفەی سیاسیدا دەستپێکرد و بیرە سیاسییەکانی بەرەو مەیدانگەلێکی نوێ پەلکێشکرد. سەدەی هەژدەیەم (سەدەی رۆشنگەری) پرسگەلێکی نوێی لە بەرامبەر خۆیدا دانابوو. رەوتی سوودگەرایی یەکێك بوو لەو رەوتانەی کە هەندێك لە گرنگترین پرسە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی سەدەی رۆشنگەریی

1- Passive obedience.

2- Charles Tara Hon, op. cit.






خستەروو و چارەسەر کرد. یەکێك لەو پرسانە بریتی بوو لە لەدەستدانی تێگەیشتنی زانستی بۆ ناوەڕۆکی مرۆڤ[3] و کۆمەڵگا، یەکێکی تر بریتی بوو لە پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی کە لە ئەنجامی داڕوخانی بنەماکانی بیروبڕوا ئەخلاقییەکانی پێشتر دروستببوو. بزووتنەوەی رۆشنگەری بەتەواو پشتی لە بنەما ئەخلاقییەکانی مەسیحییەت کردبوو و لەگەڕاندابوو بەدوای بنەماگەلێکی نوێدا. هەروەك باسکرا بیرۆکەی یاسای سروشتی و مافی سروشتی تووشی قەیران هاتبوو و لە ئاست وەڵامی پرسە نوێیەکاندا نەبوو.

بەم شێوەیە بوو کە سوودگەرایی لەلایەك و رۆسۆ و مونتسکیۆ لەلایەکی ترەوە لە گەڕاندابوون بەدوای بنەماگەلێکی نوێدا. هەوڵدان بۆ دامەزراندنی زانستی کۆمەڵگا یەکێك بوو لە گرنگترین هەوڵەکانی چەرخی رۆشنگەری. وەها هەوڵێك لەژێر کاریگەری نموونەی زانستی سروشتی و شێوازەکانی لێکۆڵینەوە و لەوانەیش بیکۆن و نیوتندابوو. ئەم هەولانە خستنەڕووی نمونەگەلێکی جیاوازی لێکەوتەوە و دوو نمونەی سەرەکیی نێوانیان بریتی بوون لە نمونەکەی مۆنتسکیۆ کە بە پەیڕەوی کردنێکی ورد لە شێوازەکەی بیکۆن دەیویست بە لێکۆڵینەوەی ئەزموونی لە مێژووی مرۆڤ هەندێك لە یاساکانی کۆمەڵگای مرۆیی بەشێوەی ئیستقرایی بدۆزێتەوە. نمونەکەی تر کارەکەی رۆسۆ بوو کە دەیویست وەکو یەك گشت یاساکانی کاملبوون و پێشکەوتنی مرۆڤ بدۆزێتەوە و یاخود بەلای کەمەوە نەخشەی جوولەی مێژوویی مرۆڤ بەدرێژایی کات [سەردەم] بدۆزێتەوە. کارەکەی لەلایەن ئادەم سمیت و ئۆگەست کانت و هیگڵ و مارکسەوە درێژەی پێدرا. نمونەی سێیەم نمونەیەك بوو کە روانگەی سوودگەرایی دیاریدەکرد. ئەم نمونەیەی بەدوای بنەڕەتێکی رێکخەری ناوەندیدا بوو کە کرداری مرۆڤ و جولەیی کۆمەڵایەتی دیاری بکات، دروست هەر بەو شێوەیەی کە تیۆری کێش و راکێشەر جوولەی تەنە فیزیکییەکانی روون دەکردەوە[4]. ئەم نمونەیە هێز و توانای هاندەری تاکی بەکلیلی زانستە کۆمەڵایەتییەکان دەزانی نەك کردنەوەی کلافەی پێچاوپێچی مێژوو. بەپێی تیۆری سوودگەرایی ئەم هێز و توانا هاندەرە بریتییە لە گەڕان بەدوای خۆشی و دوورکەوتنەوە لە ئازار.

بێنتهام دیکترینی ئەخلاقی خۆی لەسەر ئەم بنەمایە دامەزراند. سەرچاوەی بەها ئەخلاقییەکان لە تیۆرەکەی بێنتهامدا بریتییە لە هەمان خۆشی و ئازار. خۆشی و ئازار نەك

3- Alan Coddington, "Utilitarianism Today", political Theory, vol 4, No. 2. May 1976, pp. 213-226.

4- Jack Lively and Andrew Reeve Modern political Theory From Hobbes to Marx, London, New York, Routledge, 1989, p.184.

تەنها بزوێنەری کرداری مرۆڤە بەڵکو پێوەری دروست و نادروست و باشە و هەڵەیشە. بێنتهام لە کتێبی ((پێشەکییەك بۆ بنەڕەتەکانی ئەخلاق و کاری یاسادانان))دا بەم شێوەیە باس لەم بنەڕەتە دەکات: ((مرۆڤ لەژێر دەسەلاّتی چێژ و ئازاردایە. سروشت مرۆڤی خستوەتە ژێر دەسەلاّتی حکوومەتی دوو بەگەوە: چێژو ئازار. ئەم دووە دیاری دەکەن کە ئێمە دەبێت چی بکەین و چی دەکەین. لەلایەکەوە پێوەری رەواو نارەوا و لەلایەکی ترەوە زنجیرەی هۆ و هۆکردەکان پەیوەست بە فەرمانی ئەوانە. ئەمانە دەربارەی ئەوەی کە ئەنجامی دەدەین و ئەوەی کە دەیڵێین و ئەوەی کە بیر لێدەکەینەوە زاڵن بەسەرماندا. هەموو هەوڵێك بۆ لەناوبردنی کۆت و زنجیری ملکەچیکردن جگە لە ئاشکراکردنی شتێکی تری لێناکەوێتەوە))[٥].

بەم شێوەیە بێنتهام تیۆری ئەخلاقی خۆی بەستەوە بە تیۆری دەروونناسییەوە. بەر لە ئەو هۆبز بەدەستپێکردن لە دوو خاڵی دەروونناسی و مافی سروشتییەوە (هەروەك بینیمان) بە فەرمانڕەوایی رەها وەکو یاسادانەری ئەخلاقی و یەکسانی یاسا و ئەخلاق گەیشتبوو، بەلاّم بێنتهام بەدەستێکردن لە دەروونناسیی بەبێ مافی سروشتی گەیشتە پلۆرالیزم و لیبرال دیموکراسی.

بێنتهام دەیویست تەواوی وێنا ((بەتاڵ))ەکان یاخود هەروەك هەندێ جار خۆی دەیوت ((وێنا میتافیزیکییەکان)) لە هەڵسەنگاندنی ئەخلاقییاتی خۆی وەلاوەبنێت. لەم رووەوە تیۆرەکەی ئەو بە درێژەی پرۆژەی بیری نوێ لەقەڵەمدەدرێت. ئەو نەیدەویست دروستی کردارێك یان باشی مەبەستێك بەشتێکی دیکەی جیا لە چۆنیەتی خودیی شتەکان کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ لە هەستەکاندا رەنگ نەداتەوە و راستەوخۆ لەرێگەی عەقڵەوە شیاوی دەرك پێکردنە، لەقەڵەمبدات[٦].

## سودمەندی و سیاسەت

بەر لە باسکردنی وتەکانی بێنتهام لە بارەی بەرەو پێشبردنی پرۆژەی فەلسەفەی سیاسی نوێ خەراپ نییە سەرەتا بە کورتی چەقەکانی تیۆرەکەی بخەینەڕوو: ١- هێزی پاڵنەری تاك بریتییە لە گەڕان بەدوای شادومانی و دوورکەوتنەوە لە ئازار. ٢- خۆشی و ئازار نەك تەنها بزوێنەری مرۆڤن بەڵکو پێوەری دروست و نادروستیشن. ٣- ئەوەی کە مرۆڤ بەرەو ناو

5- Jermy Bentham. Principles of morals and legislation, New York, Routledge and Compamy, 1961, p.17.
6- John Plamenatz, Man and Society, Vol 2, London, New York, Longman, 19[illegible], p. 213.





کۆمەڵگا رادەکێشێت بریتییە لە سوودی کۆمەڵگا. ٤- ئەگەر هەر کەسە و بەدوای قازانجی خۆیدا بگەڕێت قازانجی تەواوی کۆمەڵگاش دەستەبەر دەبێت. ٥- بەهەمان شێوە کە قازانجی تاك بۆ ئەو گرنگە قازانجی کۆمەڵیش بۆ کۆمەڵگا گرنگە. قازانجی کۆمەڵگا زۆرترین قازانجی زۆرترین ژمارەی هاولاّتیانە کە دەبێت ببێتە بناغەی سیاسەتی گشتی.

بێنتهام بە تێڕوانینی نۆمینالیستی خۆی هەوڵیدا دەوڵەت وەکو هەیکەلێکی ئەفسانەیی لە ئەفسانە دابماڵێت. دەوڵەت لە تیۆرەکەی ئەودا بریتییە لە کۆمەڵێکی تاکەکان و نابێت قازانجی گشتی شتێکی دیکەی جیا لە کۆی ژمارەیی قازانجە تایبەتەکان (قازانجی تاکەکان) بێت. بێنتهام هەوڵدەدات لەو دیوی کۆی تاکە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگاوە خۆی لە دانەپاڵی هەموو کەسێتییەکی جیاکراوە بۆ دەوڵەت و کۆمەڵگا بەدوور بگرێت، وادەزانێت کە دانەپاڵی کەسێتییەکی جیاکراوە بە دەوڵەت ئەنجامگەلێکی نادروست و زیانبەخشی لێدەکەوێتەوە[٧].

سودمەندی گشتی چەقی تیۆری سیاسی بێنتهام پێکدەهێنێت، هەروەك چۆن بناغەی تیۆرە ئەخلاقییەکەیەتی. بەپێی بۆچوونی بێنتهام سوودمەندی گشتی پێوەرێکە و دەبێت یاسادانەر بیکاتە سەر مەشقی کاری خۆی. ئەو فۆرمۆلەی کە بێنتهام بۆ ئەم مەبەستە سوودی لێوەردەگرێت بەم شێوەیەیە: زۆرترین خۆشیی زۆرترین ژمارەی تاکەکان. ئەم فۆرمۆلە نارونییەکی زۆری تیادایە و دۆزینەوەی واتایەکی ورد بۆی و دەرهێنانی بنەڕەت و رێسایەکی روون لێیەوە کارێکی زۆر دژوارە. لەراستیشدا هەوڵێکی زۆر بۆ لابردنی ناڕوونی و دۆزینەوەی خواست و پێویستییەکانی بە ئەنجام گەیشتوە کە خودی شوێنکەوتوانی ئەم قوتابخانەیە بەشدارییەکی بەرچاویان تیایدا هەبووە. لە رواڵەتدا دەبێت ئەم فۆرمۆلە بناغەی یاساکان و بنەمای رێسا کۆمەلاّیەتییەکان بێت. کێشەکە لەوەدایە کە ئەگەر یاسادانەر بیەوێت ئەم فۆرمۆلە بکاتە رێسای کاری خۆی دەبێت چ بکات؟ دژواری لێرەدا راست دەبێتەوە کە سوودی گشتی یاخود سوودمەندی گشتی لە کۆکردنەوەی سوودە تایبەتەکانەوە بەدەستدێت. بۆ گەیشتن بەسوودی گشتی دەبێت سوودی یەك بەیەکی ئەندامانی کۆمەڵگا بەیەکەوە کۆبکەینەوە. بەپێی سەرچاوەی نۆمینالیستیی بێنتهام ((کۆمەڵگا)) چەمکێکی ساختەیە[٨] و باسکردن لە سوودی کۆمەڵگا جگە بەشێوەی کۆکردنەوەی ژمارەیی سوودی یەك بەیەکی ئەندامانی شتێکی بێ واتایە. هەندێك لە

7- J. W. Gunn, "Jermy Bentham and public interst" in Jack Lively and Andrew Reeve, Modern Political Theory, London, Routlede, 1991, p. 201.
8- Fictional.

راڤەکاران لێکدانەوەیەك بۆ تیۆرەکەی بێنتهام دەخەنەڕوو کە باس لە خودی ئاستەنگەکە ناکات، بۆ نموونە دەڵێن بەبڕوای بێنتهام لە هەنگاوی یەکەمدا سوودی گشتی بریتییە لە بەرەو پێشبردنی سوود و قازانجی هاوبەشی ئەندامانی کۆمەڵگا. یەکێك لە نموونە بەرزەکانی ئەم سوودە هاوبەشە بریتییە لە ئاسایشی موڵکداری. هەموو سوودمەند دەبن کە ئاسایشی ماڵ و موڵکیان بپارێزرێت. بەڵام ئەم خوێندنەوەیە بۆ بێنتهام کێشەیەکی تر دەخاتەڕوو ئەویش ئەوەیە کە لەم حاڵەتەدا بێنتهام تا چ رادەیەك بەرامبەر بە فۆرمۆلەکەی کە بە ئاشکرا واتای کۆکردنەوە و لێکەمکردنی سوودی یەك بەیەکی تاکەکانی لەخۆیدا هەڵگرتووە بە پابەندی ماوەتەوە. فۆرمۆلی ((زۆرترین خۆشیی زۆرترین ژمارە)) جگە لەمە دەتوانێت چ واتایەکی تریشی هەبێت؟ وتەکەی بێنتهام تەنها ئەوە نییە کە هەموو کۆمەڵگایەك پێویستی بە یاساگەلێك هەیە بۆ پارێزگاری کردن لە موڵکداری، بەڵکو جگە لەمە دابەشکردنی نایەکسانی موڵکە تایبەتییەکانیش لەخۆدەگرێت (هەڵبەتە لە ماوەیەکی دووردا رێگە بە هەنگاوگەلێك دەدات بۆ دووبارە دابەشکردنەوەی).

کێشەیەکی تر ئەوەیە کە دیار نییە بنەڕەتی سوودی گشتی تا چ رادەیەك واتای دابەشکردنی سامان بەدەستەوە دەدات و لێرەدا دەبێت تاکوێ سوود و قازانجی زۆرینە لەبەرچاو بگیرێ و دەبێت تاکوێ پشتگیری لە هەوڵی هاوئاستکردنی سامان بکردرێت. دەکرێت بەم شێوەیە واتای فۆرمۆلی زۆرترین خۆشیی زۆرترین ژمارە لێکبدرێتەوە کە مەبەست لەمە زۆرترین خۆشیی زۆرینەیە. بەڵام بێنتهام بە ئاشکرا وەها تێگەیشتنێك رەتدەکاتەوە. لەسەردەمی بێنتهامدا فۆرمۆلێکی تر لە ئارادا هەبوو کە باس لە زۆرترین خۆشیی زۆرینە دەکرد، بەڵام بێنتهام لەگەڵیدا هاورانەبوو[9].

## دەوڵەت وەکو پاسەوان

ئەگەر سودمەندی گشتی بە بنەڕەت دابنێین دەبێت حکومەت لەکاتی یاسادانادا چوار مەبەستی سەرەکی لەبەرچاو بگرێت: ١- بەرقەرارکردنی ئاسایش. ٢- دابین کردنی لایەنی کەمی بژێوی بۆ هەمووان. ٣- بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان. ٤- لەبەرچاوگرتنی یەکسانی. بەڵام حکوومەت نابێت راستەوخۆ بۆ دابینکردنی ئەم مەبەستانە دەستبەکاربکات. کاری حکوومەت ئەوە نییە کە خەڵکی بۆ هەوڵدان لەپێناو بژێوی هانبدات یاخود بە بەرنامەکانی بووژانەوەی ئابووری هەوڵ بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان، کاری حکوومەت تەنها بریتییە لە پاراستنی

9- Jeremy Benthan, Economic Writings, ed. Werner Stark, Allen and Unwin, [illegible] III, p. 215.





ئاسایشی موڵکداری و مسۆگەرکردنی سوودمەندبوونی ئەندامانی کۆمەڵگا لە بەرهەمی کارەکانیان. دابینکردنی ئاسایشی موڵکداری بیرۆکەی گەشەکردنی ئابوری و گەیشتن بە مەبەستەکانی سەرەوە مسۆگەر دەکات. ئەو دەوڵەتەی کە بێنتهام باسی لێوە دەکات دەوڵەتی سنووردارە. دەوڵەتی جێ مەبەستی شوێنکەوتوانی سوودمەندی ئەو دەوڵەتە سنووردارەیە کە وەکو دەوڵەتی پاسەوان[10] باسیان لێوەکردووە. سوودگەرایی لە چەند روویەکی جیاوازەوە پێوەندی لەگەڵ ئابووریی کلاسیك کە خوازیاری کەمترین دەستێوەردانی دەوڵەتە لە ئابووریدا، هەیە. خۆشی و شادی نەتەوەیی لە خۆشی و شادی تاکەکانەوە دروستبووە، بەڵام تەنها هەندێك لە خۆشی و شادییەکان پەیوەست دەبن بە بەرپرسیارێتی حکوومەتەوە. زۆرێك لە خۆشی و شادییەکان ئەوانەن کە تاك بەبێ دەستێوەردانی دەوڵەت و بەشێوەیەکی ئازاد لێیان بەهرەمەند دەبێت، زۆرێك لەو چالاکیانەی کە خۆشی و خۆشبەختی خەڵکیی تیادایە بە ئازادانە لەبەردەستی هەمواندایە و پێویست بەوە ناکات کە هیچ پلەو پایەیەکی گشتی دەستی تێوەر بدات. خەڵکی لەگەڵ ئەوەی کە کار و شادی خۆیان درێژە پێدەدەن شادی و خۆشی نەتەوەییش زیاتر دەکەن.

بەم جۆرە تیۆرەکەی بێنتهام لەم رووەوە بەدورنییە لە تەمومژ و ناکۆکی. هەندێك تیۆری ((سوودی هاوبەش))ی بێنتهامیان بە تیۆری ویستی گشتی رۆسۆ چواندووە. بەڵام بێنتهام سەرەرای ئەوەی کە سوودی گشتی بەکۆی سوودە تایبەتەکان دەزانێت هەندێك لە سوودەکان بەسوودی هاوبەشی هەمووان و پەیوەست بەهەموو تاکەکان لەقەڵەمدەدات. بۆ نموونە ئەو سوودانەی کە لە مەبەستەکانی حکوومەتن و هەروەك پێشتر باسمانکرد بریتین لە ئاسایش و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیان و دابینکردنی بژێوی بۆ هەمووان و یەکسانی. ئەگەر لە روانگەی بێنتهامیشەوە دابینکردنی ئاسایشی موڵکداری و هەبوونی مافی دەنگدانی گشتی بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانە بە بەس بزانین دووبارە کێشەکی تر دەمێنێتەوە کە دەبێت وەڵام بدرێتەوە. بێنتهام بە ئاشکرا باس لە ((سوودە شوومەکان)) دەکات. سوودە شوومەکان ئەوانەن کە کاریگەری خراپیان هەیە بۆ سەر باشە و خۆشیی گشتی.

لەگەڵ ئەمەیشدا نابێت تێگەیشتنێکی نادورستمان هەبێت بۆ ئەم وتەیەی بێنتهام. ئەو لەژێر ناونیشانی ((سوودە شوومەکان)) ئاماژەی بە ئەو گرووپە خاوەن پایە و تواناییانە دەکرد

10- Night Watchman.

که دەیانتوانی سوود و قازانجی خۆیان دەربڕن لەکاتێکدا که له بەرامبەردا گرووپگەلێکی تر بێ بەش بوون لەوەها توانایەك. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیه و رەخساندنی بوار بۆ هەمووان لەپێناو دەربڕینی سوودەکانی خۆیان بێنتهام هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵە تایبەتەکان و دابینکردنی هەلومەرجی مافی دەنگدانی گشتیی خستەڕوو. لەراستیدا ئەوەی کە بێنتهام دەیەوێت بیڵێت ئەوەیه کە هەموو سوودەکان توانای دەرکەوتن و دەربڕینی خۆیانیان هەبێت. بێنتهام بانگەشەی ئەوەی نەدەکرد هەموو تاکێك بەقیمەتی باشەی کەسی خۆی خوازیاری زۆرترین باشەی زۆرترین ژمارەی خەڵکییە. هەروەها بێنتهام وەکو نۆمینالیستێك لەبیری نەدەکرد کە کۆمەڵ یاخود کۆمەڵگا لە کۆمەڵە تاکێك پێکهاتوە و جگە لەمە ناسنامەیەکی جیای نییە. ئەو کۆمەڵگای وەکو بکەرێکی سیاسی و خاوەن ویستی تایبەت بەخۆی تەماشا نەدەکرد. بۆیە چەمکی ((ویستی گشتی)) نامۆیە بەروانگەکەی ئەو. ئەوەی کە ئەو بەسوودی هاوبەش باسی لێوە دەکرد لایەنگەلێك بوو کە شیاوی بچوککردنەوە و گواستنەوە نەبوو بۆ سوودی تایبەتی تاکەکان. لەمەش تێپەڕین ئەوەی کە زیاتر بێنتهامی سەرگەرم کردبوو ئەوەبوو کە هەموو سوود و قازانجەکان بتوانن خۆیان دەربڕن و مافی دەنگدانی گشتیی بە چارەسەری هەموو کێشەکانی نەبوونی هاوسەنگی سیاسی دەزانی.

## دیموکراسی نوێنەران ئامرازی دەستەبەرکردنی زۆرترین خۆشیی زۆرترین ژمارە

لایەنگرانی سوودگەرایی سیستەمی دیموکراسیی نوێنەرییان بەشێوەی خوازراوی حکوومەت لە قەڵەمدا[11]. بەڵگەهێنانەوەی ئەوان بۆ سەلماندنی خوازراوبوونی دیموکراسی جیاوازە لە بەڵگەهێنانەوەی لیبرالەکانی تر. بەدوو شێوە باس لە خوازراوبوون و زەروورەتی دیموکراسی دەکرێت. یەکەم: مرۆڤەکان هەندێك مافی بنەرەتییان هەیە کە بە هەنگاو ناونیشیان بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی بەردەوام پارێزگاری لێدەکەن و یەکێك لە ئەرکەکانی دەوڵەت بریتییە لە پارێزگاریکردن لەم مافانە. دووەم: مرۆڤەکان قازانجگەلێکیان هەیە کە باشترین دادوەر دەربارەیان بریتییە لە قازانجەکانی خۆیان، هەروەها مافی یەکسانیان هەیە بۆ بەدواداچوونی قازانجەکانی خۆیان. لە بەڵگەهێنانەوەی یەکەمدا یەکسانی ماف بنەڕەتی دانراو فەرزکراوە

11- Ross Harrison, Bentham, London, Routledge and Kegan Paul, 1983.





بەلام لە بەڵگەهێنانەوەی دووەمدا لێکچوونی سروشتیی مرۆڤەکان بە بنەڕەتی دانراو لەقەڵەمدراوە. سوودگەرایی زیاتر پەیوەستە بە بەڵگەهێنانەوەی دووەمەوە. هەڵبەتە ئەم دوو بەڵگەهێنانەوەیە یەکتر پێشێل ناکەن، بەلام بنەماکانی تیۆری سوودگەرایی لەگەڵ بەڵگەهێنانەوەی دووەمدا دەگونجێن.

بەڵام هیچ یەك لەدوو گریمانەکەی سەرەوە بەو واتایە کۆتاییان نایەت کە دیموکراسی تەنها فۆرمی دروست یان شیاوی حکوومەت یاخود تەنانەت باشترینێتی. هەڵبەتە ئەگەر مافی بنەڕەتی مرۆڤ بە لەخۆگری ئەو مافەیش دابنێین کە جگە بەرەزامەندی خۆی نابێت بچێتەژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەت و ملکەچی لە دەوڵەت بکات و لەکاتێکدا کە چەمکی رەزامەندی وەکو لۆك و هیۆم لە واتاکەی خۆی بەتاڵ نەکەینەوە لەم حاڵەتەدا دەکرێت بەو ئەنجامە بگەین کە دیموکراسی تەنها فۆرمی حکوومەتی رەوایە. لەکاتێکدا کە دەکرێت جۆرێك مافی سروشتی سەبارەت بە ئازادی پشتگیری لێ بکرێت بێ ئەوەی رەزامەندی هاوڵاتیان لەخۆ بگرێت. هەروەك ئاماژەی پێکرا بەپێی پێش گریمانەکەی لۆك مرۆڤ دەتوانێت لەژێر دەسەلاتی حکوومەتێکی رەوادا ژیان بەسەر بەرێت بەبێ ئەوەی رەزامەندی ئەو لەبەرچاو گیرابێت. ئەگەر جۆرێك مافی سروشتی سەبارەت بە ئازادی هەبێت و ئەگەر بەراستی حکوومەت ئەم مافەی دابینکردبێت لەم حاڵەتەدا تاك بەبێ ئەوەی رازی بووبێت یان نەبووبێت دەبێت ملکەچی لە دەوڵەت بکات. لۆك و ئەو هاوشێوانەی لۆك کە لە ئازادی سروشتی مرۆڤەوە مافی رازی بوونی تاك بە پەیڕەوی کردن لە دەوڵەتیان هەڵدەهێنجا لە ئەنجامگیریەکەی خۆیاندا بەهەڵەدا رۆیشتون. ئەوانە بەم ئەنجامگیریە هەڵەیە خاڵە سەرەکییەکانی جیاوازی نێوان دیموکراسی و ستەمکاریان تێکەڵ بەیەکتر دەکرد[12].

بیرمەندانی پەیوەست بەتێڕوانینی سوودگەرایی بە وەلاوەنانی دیکترینی مافی سروشتی و ئازادی سروشتی و هەوڵدان لە ناتەواوبوونی بەڵگەهێنانەوەکەی سەرەوە پەنایان بۆ بنەڕەتی یەکسانی ماف وەکو بناغەی ئازادی و دیموکراسی برد. ئەم بنەڕەتە لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراوە کە هەرکەسە و باشترین دادوەری خۆشی خۆیەتی و نابێت خۆشی خەڵکانی تر بە لەپێشتر لە خۆشی ئەو تەماشا بکرێت. بەم شێوەیە یەکسانی ماف ئەو پێگەیەی لەدیکترینی سوودگەراییدا هەیە کە چەمکی مافی سروشتی لای لۆك و تەوژمی رۆشەنگەری هەیبوو. بەڵام

12- John Plamenatz, op. cit, p. 333.

ئەم پێشگریمانەیە (یەکسانی سروشتی) بەجۆرێك دەگاتەوە پێشگریمانەی یەکسانی سروشتیی هۆبز و بۆخۆی ڕوویەکی تری مافی سروشتییە[١٣].

بەڵام خودی هۆبز و بیرمەندانی پاش ئەو لەم گریمانەیەوە نەگەیشتبوونە لەپێشتر بوونی دیموکراسی بەسەر فۆرمەکانی دیکەی حکوومەتدا. بەبیری لۆك و ئەو بیرمەندانەی کە هاوبەش بوون لە تێڕوانینی ئەودا نەگەیشتبوو کە دەکرێت بەشێوەیەکی لۆژیکی لەم یەکسانییە سروشتییەوە بگەنە لە پێشتربوونی دیموکراسی. بەهەمان شێوە ئەو کەسانەی کە بە پەنابردن بۆ مافی سروشتی بە قازانجی لەپێشتر بوونی حکوومەتی پاشایەتی بەسەر دیموکراسیدا بەڵگەیان دەهێنایەوە وایان نەدەزانی کە بەم بەڵگەهێنانەوەیە نکۆڵیان لە یەکسانی مافی تاکەکان کردووە. شانازی ئەم بیرە دەگەڕێتەوە بۆ بێنتهام کە بەدوو پێشگریمانە دەربارەی یەکسانی سروشتی گەیشتە لەپێشتربوونی حکوومەتی دیموکراسی. هەروەك باسکرا ئەم دوو پێشگریمانەیە بریتین لە: ١- خۆشبەختی هەموو کەسێك هێندەی خۆشبەختی خەڵکانی تر جێی گرنگییە. ٢- هەرکەسە و بۆخۆی باشترین دادوەرە دەربارەی قازانجەکانی خۆی[١٤].

ئێستاکە سودگەرایی لەسەربنەمای پێشگریمانەی دەروونناسی دەگاتە بنەڕەتەکانی دیموکراسی، لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئایا کاتێك ئەو کەسانەی کە بەکاری یاسادانان هەڵدەستن بەردەوام ئەو کەسە خۆپەرستانەی پێشتر نین کە بەدوای قازانجەکانی خۆیاندا بگەڕێن؟ ئەگەر وەهایە چۆن دەتوانن سوودو قازانجی گشتی لەبەرچاو بگرن؟ یاسادانان تەنها کاتێك بەپێی سوودو قازانجی گشتی بڕیار وەردەگرێت کە قازانجی کەسیی خۆی لەگەڵ قازانجی گشتیدا یەکبگرێتەوە. کەواتە بۆچی دەبێت لە هەموو کاتێکدا یاسادانەر پەیڕەوی لەبنەڕەتی سوودمەندی گشتیی بکات؟ سەرەتا بێنتهام بابەتی بوونی یاسادانەری بێ لایەنی خستەڕوو، یاسادانەرێك کە کار بۆ قازانجی گشتی دەکات. بەڵام پاشتر ئەوەی قبوولکرد کە ناکرێت فەرمانڕەوا و یاسادانەرەکان لە فەرمانی گشتی دەربارەی خۆپەرستی مرۆڤ جیابکرێنەوە. لێرەدا بوو کە پێویست بوونی یاسای بنەرەتیی خستەڕوو. دەبێت یاسای بنەڕەتی هەلومەرجێك دروستبکات کە فەرمانڕەوای خۆپەرست خوازیاری قازانجی گشتی بێت. ئەم کارە یەکێکە لە بنەماکانی دیموکراسی نوێنەری. وادانراوە کە ئەگەر فەرمانڕەواکان لە خوارەوە لەلایەن

---

13- Ross Harrison, op. cit, p. 150.

14- Bhikhn Parek, "Bentham's Theory of Equality", Political Studies, Vol. 18, 1970, p. 478-495.






خەڵکییەوە کۆنترۆڵ بکرێن بەپێی مەرامی سوودی کەسی پەیماندار دەبن بە فەرمانڕەوایی کردن بەپێی قازانجی گشتی. بەواتایەکی تر قازانجە خۆپەرستانەکانیان لەگەڵ هەنگاونان بە ئاراستەی قازانجی گشتی هەماهەنگ دەبێت. بەم شێوەیە تەنها کاتێك سوود و بەرژەوەندی گشتی بەکردەیی دەبێت کە هەموو کۆمەڵگا لە ڕێگەی دیموکراسی نوێنەرییەوە حکوومەتیان خستبێتەژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە[١٥]. بەڵام بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە خودی بێنتهام تاچ رادەیەك هاورابوو لەگەڵ دیموکراسی پلۆرالیستیدا، خراپ نییە سەرەتا بزانین دیموکراسی نوێنەری تا چەندێك لەگەڵ دیکترینەکەی بێنتهام واتە زۆرترین سوودمەندی بۆ زۆرترین ژمارە دەگونجێت؟ دەکرێت لێرەوە باسەکە دەستپێبکرێت کە ئەگەر مەبەستی حکوومەت ئەوە بێت کە هاوکاری خەڵکی بکات تاوەکو ئەوەی دەیانەوێت بەدەستی بێنن، لەم حاڵەتەدا دەبێت وتوێژیان لەگەڵدا بکات و بۆچوونەکانیان وەربگرێت. بەڵام ئایا دەکرێت بە بەرپاکردنی هەڵبژاردن و ژماردنی دەنگەکان بەم مەبەستە بگەین؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە هەڵبژاردن و دەنگدان شێوازێکی کارا نییە بۆ پەیبردن بە پێداویستییەکانی خەڵکی لە ڕێگەی گەیشتن بە شادی و خۆشبەختی. لەو پێشەکییەوەی کە هەرکەسە و خۆی باشترین دادوەرە دەربارەی قازانجەکانی خۆی ناتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە ئەو سیاسەتەی تاك لە هەڵبژاردندا دەنگی پێدەدات باشترین گونجانی هەیە لەگەڵ دابینکردنی قازانجەکانی ئەودا. هەروەها ناتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە ئەو ڕەوتە یاخود ئەو پارتەی کە زۆرترین دەنگ بەدەست دێنێت بە تەواوی ئەو لایەنەی کە زۆرترینی ئەو شتانەی بۆ خۆشبەختی خەڵکی پێویستە بۆیانی فەراهەم دەکات. بەرێگەی یەکەم ناتوانین بڵێین ئەو حکوومەتەی کە لە بەرامبەر خەڵکیدا بەرپرسە تارادەیەکی زۆر بەپێی قازانجی گشتی یاخود قازانجی هاوبەش کاردەکات. هەڵبەتە لەسەربنەمای یەکێك لە بنەماکانی دیکترینی سوودگەرایی دەربارەی عەقلانیەتی دەوڵەت دەکرێت چەند بەڵگەیەك بدۆزێتەوە بۆ پشتگیری کردن لە دیموکراسی ناڕاستەوخۆ (دیموکراسی نوێنەری) یەکێك لەو بەڵگە هێنانەوانە: کاری حکوومەت ئەوەیە کە هاوکاری خەڵکی بکات تاوەکو ئەوەی کە دەیانەوێت نەك ئەوەی کە فەرمانڕەواکان دەیخوازن، بەدەستی بێنن. بەڵام ئەم تێڕوانینە ناکۆك وەردەچێت لەگەڵ بۆچوونەکەی بێنتهامدا کە دەڵێت کاری حکوومەت بریتییە لە خۆشبەخت کردنی خەڵکی یان زۆرترین خۆشی بۆ خەڵکی. هەروەها ئەم تێڕوانینە ئەو بانگەشەیەش ڕەت

---

15- Jack Lively and Andrew Reeve, op. cit, p. 192.

دەکاتەوە کە خۆشی کۆمەڵگا بەکۆی خۆشی تاکەکان لەقەڵەمدەدات. ئەو هەلومەرجەی کە خۆشی و خۆشبەختی دابین دەکات لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر دەگۆڕێت. دەکرێت بوترێت هەندێك هەلومەرج بەردەوام تێکدەری خۆشبەختییەو دەبێت لێی دوور بکەوینەوە، یاخود هەندێك هەلومەرج بەردەوام بە سوودن بۆ خۆشبەختی. بۆ نموونە ئەوەی کە هەموو خەڵکی پێویستیان بە خۆراك و شوێنی حەوانەوە (ماڵ) هەیە. بەڵام ناکرێت لەگەڵ بێنتهامدا بوترێت کە هەرچی خواستەکانی مرۆڤ زیاتر دابینبکرێت خۆشبەخت تر دەبێت[١٦].

پێویستناکات بۆ بەرگریکردن لە دیموکراسی نوێنەری سەبارەت بە دابینکردنی خۆشبەختیی خەڵکی شتێك بڵێین. هەڵبەتە ناڵێین کە خەڵکی نابێت بۆ خۆشبەختی خۆیان هیچ داواکاریەکیان لە حکوومەت هەبێت. بەڵکو دەڵێین کاری راستەقینەی حکوومەت ئەوەیە کە تا ئەو جێیەی کە دەکرێت خواستەکانی خەڵکی بێنێتەدی، جا چ دابین کردنی ئەم خواستانە خۆشبەختی خەڵکی زیاد بکات یان نا کاری حکوومەت ئەوەیە کە خواستەکانی ئێستا و ئاینده و تەنانەت خواستە ئەگەرییەکانی خەڵکیش دابینبکات. بەم شێوەیە ناکرێت تەنها لەم بنەرەتەوە بگەینە دیموکراسی نوێنەری. پێویست ناکات کە حکوومەت حەتمەن دیموکراتی بێت تاوەکو خواستەکانی خەڵکی دابینبکات. حکوومەتێکی نادیموکراتیش دەتوانێت کار بۆ دابینکردنی خواستەکانی خەڵکی بکات. هێندە بەسە کە حکومەت بەجۆرێك دەستنیشانی بکات کە خەڵکی چ خواستگەلێکیان هەیە. لەم حاڵەتەدا پێویست بەوە ناکات کە حکوومەت لە بەرامبەر خەڵکیدا بەرپرس بێت تاوەکو وەڵامی خواستەکانیان بداتەوە. بۆ ئەنجامگیری کردنی خوازراوبوونی دیموکراسی دەبێت بنەرەتی دووەم بۆ بنەڕەتی یەکەم زیاد بکرێت، ئەم بنەڕەتە بریتییە لەوەی کە حکوومەت ناتوانێت بزانێت کە چ داوایەکی لێدەکرێت و خەڵکی چ داوایەکیان لێی دەبێت. بۆیە بۆ وەڵامدانەوەی خواستەکانی خەڵکی یان دەبێت بڕواو هەستی خەڵکی کۆنترۆڵ و ئاراستە بکات یاخود لە بەرامبەریاندا بەرپرس بێت. ئەمڕۆکە لە هەموو سیستەمە دیموکراسییەکاندا چەندین جۆر ئۆرگان و رێکخراو دامەزراون کە وەکو نێوانکار لە نێوان خەڵکی و فەرمانڕەواکاندا کاردەکەن. کاری تایبەتی ئەم ئۆرگان و رێکخراوانە بریتییە لە فۆرمۆلبەندی کردنی داوا و خواستەکانی خەڵکی و فشار خستنە سەر حکوومەت بۆ وەڵام دانەوەیان. ئەزموون پاڵپشتی بۆچوونەکەی رۆسۆیە کە تەنها بەرێکخستنی خەڵکی ویستی

16- Lively and Reeve, op. cit, p. 192.





سیاسی[١٧] بەدەست دێنن[١٨]. ئەم دامەزراو و رێکخراوانە پێشەوا گەلێکیان هەیە کە کاریان بریتییە لە چاودێریکردنی کارکردنی حکوومەت لە بەشە جیاوازەکاندا. ئەم رێکخراوانە راشکاوی و وردییەکی زیاتر دەبەخشنە داواکانی خەڵکی و بەم شێوەیە رێگە بۆ حکوومەت خۆشدەکەن کە پەی بەخواستەکانی خەڵکی ببات.

بەم شێوەیە دیموکراسی نازانێت کە خەڵکی چ خواستگەلێکیان هەیە بەڵام دەتوانێت هەلومەرجێك دروستبکات کە حکوومەت بتوانێت پەی بە خواستەکانیان ببات. بەڵام ناکرێت لەم پرسەوە بگەینە زەرورەتی دیموکراسی نوێنەری، چونکە تەنها دیموکراسی نوێنەری نییە کە دەتوانێت وەها بوارێك بڕەخسێنێت. زۆرێك لە پێشکەوتنخوازە نادیموکراتەکانیش ئەم بنەڕەتە پەسەند دەکەن. جگە لەمە تواناگەلێك هەن کە دەکرێت لە رێگەیانەوە خەڵکی بەرەو ئەوەی کە فەرمانڕەواکان دەیانەوێت یاخود تەنانەت ئەوەی کە ((قازانجە شوومەکان)) زەمینەی بۆ دەرەخسێنێت پاڵ پێوەبنرێت. هەروەها دیار نییە کە دیموکراسیی دەنگدەرە خۆپەرەستەکان تا چ ئاستێك زۆرترین خۆشی بۆ زۆرترین ژمارە دابین دەکات. ئەگەر ئامانجی حکوومەت دابینکردنی زۆرترین خۆشی بۆ زۆرینە بێت دەتوانێت وەها مەبەستێك بێنێتەدی، بەڵام هەروەك باسکرا بنەڕەتی سوودمەندی گشتی واتای زۆرینەگەرایی ناگەیەنێ. کاتێك کە هەندێك لە لایەنگرانی سوودگەرایی هەوڵیاندا بەسەر ئەم ناکۆکییەدا زاڵببن بەناچاری تایبەتمەندیگەلێکی تیۆری دیموکراسی بێنتهامیان بەدەستەوەدا کە ئەوی لە دیموکراسیی جۆری رۆسۆیی نزیك کردەوە. پێویستی وەلاوەنانی ناکۆکییەکان هێندە گرنگ نەبوو کە لێهەڵاتنێك لە هەوڵ و بەدواداچوونەکان نەبێت تەنانەت ئەگەر ئەم هەوڵە دیموکراسی بێنتهامی بەرەو ئۆردوگای بەرامبەر واتە تیۆرەکەی رۆسۆ پاڵ پێوە بنێت. دووبارە رەخنەگرانی سوودگەرایی بەڵگەیان هێناوەتەوە کە ئەگەر مافی دەنگدانی گشتی کاری پێبکرێت، زۆرینەی هەژار دەسەڵاتی سیاسی دەگرنە دەست. ئەوکات ئەگەر ئەم زۆرینەیە وەها کار بکات کە تیۆری سوودگەرایی دەڵێت، واتە ئەگەر بۆ زیادکردن و کەڵەکەکردنی قازانجەکانی خۆی کاربکات بەشێوەیەکی ئاسایی بەرەو دووبارە دابەشکردنەوەی سامان هەنگاو دەنێت و ئەمەش لەکەدارکردنی ئەو شتە لەخۆ دەگرێت کە سوودگەرایی بە پێویستی سەرەکی قازانجی گشتی واتا ئاسایش لە قەڵەمی دەدات. بۆ وەڵامدانەوەی ئەم کێشەیە وردە وردە لایەنگرانی سودگەرایی کەوتنە خستنەڕووی

17- Political Will.
18- Lively and Reeve, op. cit, 247.

ئەو بۆچوونەی کە بە ئاشکرا بلێین لە سیستەمێکی دیموکراسیدا دەنگدەدان قازانجی گشتی لەوانەش پاراستنی ئاسایشی موڵکداری پشتگوێ ناخەن. بەم شێوەیە ئەوان لە پێگەکەی ڕۆسۆ نزیك بوونەوە: حکوومەتی دیموکراسی پەیماندار دەبێت بە قازانجی گشتی چونکە شوێنکەوتووی ویستی گشتییە و ئەمەش بۆخۆی ڕەنگدانەوەی باشەی هاوبەشە.

بەڵام ئەم گۆڕێتی ئاراستەیە وەکو ئامادەکردنەوەی دووبارەی پارادۆکسی تیۆرە ئەخلاقییکەیانە[19]. ئەگەر لایەنگرانی بێنتهام بڵێن مرۆڤ وەکو دەنگدەر یاخود ڕۆڵبینی ئەخلاقی[20] دەبێت بەبێ لەبەرچاوگرتنی باشە و خۆشی خۆی بەدوای باشەی گشتیدا بگەڕێت ئەوا بڕیاریکیان داوە کە لەگەڵ سەرەنجدانی گریمانەی بنەڕەتی دەروونناسی ئەواندا یەك ناگرێتەوە. لە ئەنجامدا بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە ئەم بۆچوونە خرایەڕوو کە جیاوازییەك هەیە لەنێوان قازانجی راستەقینە و درێژخایەنی تاکو قازانجی رواڵەتی تاك. لەکاتێکدا کە رەنگە ناکۆکی هەبێت لەنێوان قازانجی راستەقینە و ماوە کورتی تاك لەگەڵ قازانجی کۆمەڵگا. لەم کاتەدا قازانجی درێژخایەنی تاك ناکۆکی نییە لەگەڵ قازانجی کۆمەڵگادا. بەم شێوەیە دەنگدەرە خاوەن عەقڵ و وردەکارەکان بە باشتری دەزانن کە قازانجە ماوە کورتەکان خۆیان بۆ قازانجە درێژخایەنەکان کە هەماهەنگە لەگەڵ قازانجی کۆمەڵگادا بکەنە قوربانی. بەم شێوەیە بوو کە سوودگەرایی گەیشتە بیری دیموکراسیی روناکبین[21].

## تیۆری فەرمانڕەوایی

تیۆرەکەی بێنتهام دەربارەی فەرمانڕەوایی[22] و جیاکردنەوەی چەمکی فەرمانڕەوایی لە حکوومەت[23] بەدەستکەوتێکی نوێ دادەنرێن لە پێشکەوتنی فەلسەفەی سیاسیدا. لەروویەکەوە تیۆرەکەی بێنتهام چارەسەرکردنی نەگونجانی تیۆرەکەی هۆبز لەلایەك و تیۆرەکەی لۆك لەلایەکی ترەوە بوو. کۆمەڵێك لە بیرمەندان کە لە چوارچێوەی یاسای سروشتیدا تیۆر

---

[19] ئەو پارادۆکسەی کە دەڵێت دەبێت هەموو کەسێك بەدوای ئەو شتانەدا بچێت کە لە راستیدا بە دوایاندا دەچێت هەروەها ئەو یاسا ئەخلاقیەی کە: ١- لەراستیدا هەرکەسە و بەدوای خۆشی خۆیدا دەگەڕێت.
٢- دەبێت تاکەکان بەدوای خۆشی گشتیدا بگەڕێن: Coddington, op. cit.

20- Moral Actor.
21- enlightened democracy.
22- Soveriegnty.
23- Government.






داڕێژییان دەکرد وەها بەڵگەیان دەهێنایەوە کە دەکرێت پاشایەتی رەها بێت بەڵام دەسەڵاتی بێسنووری نییە. ئەوان ڕەخنەیان لەو بەڵگەهێنانەوەیەی هۆبز دەگرت کە دەیوت یاسای فەرمانڕەوا یاسای سروشتیش لەخۆ دەگرێت و دەیانوت کە هۆبز ئەخلاق و مافی تێکەڵ بە یەکدی کردووە. بێنتهام هەوڵیدا کە فەرمانڕەوایی لە چوارچێوەی سیاسی و یاساییدا سنووردار بکات هەروەك بینیمان لە تیۆرەکەی ئەودا یاسا و ڕێسا ئەخلاقییەکان یەك شت نین. بێنتهام بە پێچەوانەی هۆبزەوە هیچ پەیوەندییەکی پێویست لەنێوان رەهابوونی فەرمانڕەوایی و ملکەچی کردنی رەها لە فەرمانڕەوا بەدیناکات. مەبەست لەرەهابوونی فەرمانڕەوایی بریتییە لە دەسەڵاتی تەواوی دەسەڵاتی یاسادانەری کە هیچ پەیمانێك بەشێوەیەکی راشکاوانە سنوورداری ناکات، بەڵام ئەوەی کە دەسەڵاتی یاسادانەری خاوەن فەرمانڕەوایی باڵایە بەو واتایە نییە کە دەبێت هەموو دەنگپێدراوەکان، خۆیشی جێ بەجێ بکات و یاخود هەروەها هاوبەش بێت لە کاری دادوەری کردن سەبارەت بەو.

بەم پێیە جێگیربوونی دەسەڵاتی یاسادانەری و جێبەجێکاری و دادگایی لە چەند دەستێکی جیاواز بەواتای دابەشبوونی فەرمانڕەوایی و دەرچوونی لە رەهابوون نییە، تەنانەت ئەگەر دەسەڵاتی جێبەجێکاری و تەنانەت ئەگەر جێبەجێکاری و دادگایش لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانەری وەکو خاوەن دەسەڵاتی باڵا دیاری نەکرابێتن. تیۆرەکەی بێنتهام تیۆری فەرمانڕەوایی مۆنتسکیۆ و هۆبزی چاك کردەوە. مۆنتسکیۆ رازی نەبوو بە مافی دانانی یاسای بنەڕەتی و دیاریکردنی سنووری بەرپرسیارێتی دوو دەسەڵاتەکەی تر بۆ دەسەڵاتی یاسادانەری. سیستەمی فەرمانڕەوایی جێ مەبەستی مۆنتسکیۆ سیستەمێك نەبوو کە تیایدا یەك یاسای بنەڕەتی بوونی هەبێت کە ماف و بەرپرسیارێتی هەرسێ دەسەڵاتەکەی لەسەربنەمای یاسای کۆکراوە دیاری کردبێت. جێکردنەوەی دەسەڵاتەکان لای مۆنتسکیۆ لەسەربنەمای نەریت بوە و ئەم بنەڕەتەی لە خوێندنەوە ئەزموونییەکانەوە وەدەستهێنابوو.

هەروەها بێنتهام بەپێچەوانەی هۆبزەوە دەسەڵاتی باڵای یاسادانەری بە ناکۆك نابینێت لەگەڵ جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا. لەو رووەوە دەسەڵاتی یاسادانەری دەسەڵاتی باڵا و خاوەن فەرمانڕەواییە کە هیچ کەسێك مافی نافەرمانی کردنی نییە لە یاسا دانراوەکانی. دەسەڵاتی یاسادانەری بەستراوەتەوە بەو بنەڕەتە ئەخلاقییەی کە ئەرکدادە بۆ باشەی گشتی بڕیار بدات. لەرووی یاساییشەوە خاوەن ئەو دەسەڵاتەیە کە تاکەکانی ناو سنوورەکەی ئەو پابەندن بە پەیڕەویکردن لە یاساکان. دەسەڵاتی یاسادانەری خاوەن فەرمانڕەوایی باڵایە چونکە هیچ

پەیمانێك نییە کە ئەم دەسەڵاتە ناچار بکات کە بڕیار و یاساکان خۆی لەگەڵ ئەودا بگونجێنێت. دەسەڵات تەنها لەم رووەوە بێسنوورە نەك لە روویەکی ترەوە. بەم شێوەیە دابەش کردنی دەسەڵات لەنێوان پایە جیاوازەکاندا هیچ ناکۆکییەکی نییە لەگەڵ فەرمانڕەواییدا. پەرلەمان دەتوانێت لەڕووی یاساییەوە دەسەڵاتی باڵا و فەرمانڕەوا بێت لە هەمان کاتدا خەڵکیش ئازادیگەلێکی زۆریان هەبێت. ئازادی پەیوەستە بە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسەڵات لەنێوان دامەزراوەکان و ئازادی چاپەمەنییەکانەوە. بێنتهام لەگەڵ مۆنتسکیۆ هاوبڕوایە کە بۆ پاراستنی ئازادییەکانی دەسەڵات دەبێت نەك تەنها بە ئەخلاق و بیروڕای گشتی بەڵکو بە دەسەڵات سنووردار بکرێت بەڵام بەپێچەوانەی مۆنتسکیۆوە بەڵگەدێنێتەوە کە سنووردارکردنی دەسەڵات بە دەسەڵات بەواتای رەتکردنەوەی فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی باڵا نییە. دەسەڵاتی یاسادانەری دەسەڵاتی فەرمانڕەوایە بەڵام دەسەڵاتی مونۆپۆلستێك نییە. لێرەدا بێنتهام هەستا بە ریفۆرمکردنی تیۆرەکەی هۆبز کە ئەو کات ببووە بار بەسەر بیری سیاسییەوە. رۆسۆ بەشێوەیەکی تر و بە تیۆری ویستی گشتی پرسی فەرمانڕەوایی چارەسەرکرد و پاشتر بە درێژی لێی دەدوێین.

## بەکورتی

دەستکەوتی گرنگی بێنتهام لە دوو بواردا بەدیارکەوت. یەکەم ئەوەی کە بە پەرەپێدانی تیۆرەکەی لۆك دەربارەی فەرمانڕەوایی و حکوومەت توانیتی ئەم دوو سنوورە لە یەك جیابکاتەوە و دووەم ئەوەیکە بەدرێژەپێدانی تێڕوانینەکەی هیۆم دیدی سوودگەرایی کامڵکرد و لەم رێگەیەدا بەتەواوی سنووری کۆمەڵگای مەدەنیی لە سنووری حکوومەت جیاکردەوە. بێنتهام بە شێوازەکەی خۆی سەلماندی کە چەمکی فەرمانڕەوایی هیچ ناکۆکییەکی لەگەڵ بنەڕەتی دابەشکردنی دەسەڵات لەنێوان دامەزراوە جیاوازەکان و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکاندا نییە. بەم شێوەیە ئەو بنەڕەتەی کە مۆنتسکیۆ بە گەڕانەوە بۆ نەریتی بەریتانیا بە ئەزموون پێی گەیشتبوو بێنتهام بەشێوەیەکی تیۆری بەڵگەی بۆ هێنایەوە.

بێنتهام بە درێژە پێدانی تێڕوانینەکەی هیۆم کە لە قازانجی کۆمەڵایەتیدا بەدوای عەقڵانیەتی دەوڵەتدا دەگەڕا هەوڵیدا کە بەیەك بنەڕەتی رێکخەر کە کرداری تاك و کۆ دیاری دەکات سەرچاوە و ناوەڕۆکی حکوومەت روون بکاتەوە. بێنتهام هێزی رێکخەری کرداری تاکی بە ئەوپەڕگەیاندنی خۆشی تاك و بنەرەتی رێکخەری حکوومەتی بەوە ئەوپەڕگاندنی خۆشی





زۆرترین ژمارەیان بەواتایەکی تر خۆشی گشتی و سوودمەندی گشتی خستەڕوو[٢٤]. بێنتهام بنەڕەتی سوودمەندیی بە چەقی کرداری مرۆڤ و پێوەری دروست و نادروست ناساند و بەم جۆرە ئەخلاقی لەسەر دەروونناسی دامەزراند. بەم شێوەیە بێنتهام و سوودگەرایی سەرەڕای مەیدان گرتن لە بەرامبەر یاسای سروشتی و مافی سروشتی جارێکی تر بەشێوەیەکی نەستیانە (بەلای کەمەوە لە دەربڕینی هۆبزیدا) گەڕانەوە بۆ بنەڕەتەکانی. بێنتهام بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەیەوێت تەواوی وێنا میتافیزیکییەکان لە هەڵسەنگاندنی خۆی وەلاوە بنێت و تەنها چۆنیەتی زاتی شتەکان وەکو بزوێنەری کرداری تاك تەماشا بکات. بەم شێوەیە ئەولایەنی چێژگەرایانەی تیۆرەکەی هۆبز و لۆکی گەیاندە لێواری لۆژیکی خۆی. بنەڕەتی سوودمەندی گشتی چەقی بۆچوونی بێنتهامە لە تیۆرداڕێژی سیاسیدا. ئەو فۆرمۆلەی کە لە بەکاربردنی ئەم بنەڕەتە لە کاری سیاسەت و حکوومەتدا بەدەستدێت بریتییە لە قازانجی زۆرترین ژمارە. بەڵام ئەم فۆرمۆلە زۆر ناروونەو لە مەیدانی بەراوردکردندا نەگونجانگەلێکی زۆر وەدیار دەخات و پێنووسگەلێکی زۆر بۆ روونکردنەوەی ناوەڕۆکەکەی و ئاراستەکردنی نەگونجانەکانی دەستیان بەکارکردووە. ئێمە وتمان لە کۆتاییدا بۆ دابینکردنی زۆرترین خۆشی بۆ زۆرترین ژمارە کاری دەوڵەت سنووردار دەبێت بە پارێزگاریکردن لە موڵکداری کە وەك بڵێی بە گەشەسەندنی ئابووری و بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی و خۆشگوزەرانی گشتی کۆتایی دێت. بەم جۆرە بێنتهام بەشێوەیەکی تر لە تیۆرەکەی لۆك نزیك دەبێتەوە کە عەقڵانیەتی دەوڵەت بە پاراستنی موڵکداری و فەرمانڕەوایی زۆرینە لێکدەداتەوە. بەڵام بێنتهام بەپێچەوانەی لۆکەوە بڕوای بە عەقڵانیەتی دوولایەنە و مافی بەشداری دوولایەنە و هەربۆیەش مافی دەنگدانی سنووردار نییە. بێنتهام لە بۆچوونی خۆیدا زیاتر دیموکرات و بەپێی هەلومەرجی ئەو کات رادیکاڵە و مافی بەشداری گشتی لە تیۆرەکەی ئەودا بەدەست دێت.

بێنتهام جگە لە بنەڕەتی سوودمەندی ناوەڕۆکی دەوڵەتی خوازراوی خۆی لەو حوکمەوە ئەنجامگیری دەکات کە مرۆڤەکان مافی یەکسانیان هەیە لە بەدواداچوونی قازانجەکانی خۆیاندا هەروەها لە دادوەری کردن لەبارەی قازانجەکانی خۆشیان باشترین دادوەرن. بەم شێوەیە ئەو خوازراوبوونی ئازادی لە یەکسانی مافی بەدواداچوونی خۆشی و خوازراوبوونی دیموکراسیی لە یەکسانی و ئازادییەوە ئەنجامگیری دەکات. دیموکراسی یەکێکە لەو فۆرمانەی کە خەڵکی لە

---

24- Amnon Goldwoth, "The Meaning of Bentham's greatest happiness principle", Journal of History of Philosophy, No. 7, 1869, p. 315-321.

خوارەوە فەرمانڕەواکان (کە وەکو هەموو خەڵکی خەریکی کەڵەکەکردنی سوودەکانی خۆیانن) کۆنترۆڵدەکەن.

بەڵام ئەو بۆچوونەی بێنتهام هەڵسەنگێندراوە و ڕەخنەی لێگیراوە کە ناکرێت لەبنەڕەتی هەموو کەسێك باشترین دادوەری قازانجەکانی خۆیەتی و ئەو حوکمەی کە حکوومەت دەبێت زۆرترین خۆشی بۆ زۆرترین ژمارە لەخۆ بگرێت بگەینە خوازراوبوونی دیموکراسیی وەکو باشترین فۆرمی حکوومەت. بەبێ لەبەرچاوگرتنی  کێشەکانی دی دەکرێت بڵێین ڕەنگە فۆرمەکانی تری حکوومەتیش هەمان مەبەست وەدی بێنن. ئەگەر پرسی ناوەندی تیۆری بێنتهام و سوودگەرایی بەم دوو بنەڕەتە دابنێین کە ١- هەموو کەسێك بەدوای باشەی خۆیدا دەچێت. ٢- دەبێت تاکەکان بەدوای باشەی گشتیدا بچن، لەم حاڵەتەدا ڕووبەڕووی پارادوکسێك دەبینەوە کە بۆ چارەسەرکردن و گەڕانەوە بۆی لە تیۆری ویستی گشتی ڕۆسۆ و دیموکراسی ڕۆسۆیی نزیك دەبینەوە.

بەهەرحاڵ ئەو دەستکەوتە مەزنەی کە بواری حکوومەتی بە چوارچێوەی سیاسی و یاسایی سنووردارکرد و سنووری کۆمەڵگای مەدەنی لەو جیاکردەوە بە پێشکەوتنێکی نوێ لەقەڵەمدەدرێت لەبیری سیاسی نوێدا.





## پاژی پێنجەم:

# عەقڵانیەتی بازاڕ

جێمزمیل تیۆرەکەی بێنتهامی تا سنووری لۆژیکیەتی خۆی بەرەو پێش بردو گەیشتە زیادەڕەوترین بۆچوون دەربارەی ((دەوڵەتی لایەنی کەم)). لە ڕاستیدا دەوڵەت لە تیۆرەکەی جێمزمیلدا ڕۆڵێکی دیکەی جیا لەوەی نییە کە تاکەکان دەربارەی بەدواداچوونی خۆشی و قازانجی کەسیی خۆیان لە سنوور بەزاندن دووربخاتەوە. لە تیۆرەکەی بێنتهامدا نەگونجان هەبوو لە نێوان تیۆری سیاسی و تیۆری ئابووریدا، وەك بڵێی هەردووکیان لە یەك بنەماگە لەوە دەستیان پێکردبوو. لەکاتێکدا کە لە بواری ئابووریدا بەدواداچوونی خۆشییە کەسییەکان لەگەڵ یەکتردا هەماهەنگ دەبن و لە بواری سیاسەتدا پێویستمان بەدەوڵەتێك دەبێت بۆ هەماهەنگ کردنی قازانجە گشتییەکان. بەواتایەکی تر لێرەدا هەبوونی مامەڵەیەکی دوولایەنە بەرچاودەکەوێت. جێمزمیل ڕوانگەی ئابووری کلاسیك و نموونەی ئابووری کلاسیکی بۆ بواری سیاسەت بەگشتی کرد. بەم شێوەیە کتێبەکەی ئەو ((دەربارەی حکوومەت)) بریتییە لە تەواوکەرێك بۆ ئابووری کلاسیك لە بواری سیاسەتدا.

جێمزمیل وەکو هۆبز و بێنتهام تەواوی ئابووریناسە کلاسیکەکان لەو گریمانەیەوە دەستپێدەکات کە مەبەستی سروشتی هەموو کەسێك ئەوەیە کە خۆشی و خۆشبەختی خۆی بگەیەنێتە ئەوپەڕی. بە واتایەکی تر تیۆری سیاسی ئەویش لەسەربنەمای تیۆری دەروونناسی دەربارەی سروشتی مرۆڤ دامەزراوە. ئەو هاوکات لەگەڵ ئابووری کلاسیکیدا دەڵێت ئەو جیهانەی کە ئێمە تیایدا دەژین جیهانی سەرچاوە دەگمەنەکانە، بۆیە دەبێت ئێمە بۆ بەدەستهێنانی ئامرازی خۆشی کاربکەین. کار ئازارە، بەڵام ئازارێك کە بۆ لابردنی ئازارەکانی تر پێویستە. لەوێوەی کە کار بریتییە لە ئازار مرۆڤ حەزناکات جگە لە ئاستی ناچاری کاربکات. بۆیە تاك حەز دەکات تا ئەوجێیەی کە دەکرێت بەرهەمێکی زۆرتر لە کارەکەی خۆیەوە بەدەستبێنێت.

ئێستا کە بازاڕی کار ئەوە لەخۆ دەگرێت هەموو کەسێك تا ئەوجێیەی کە دەکرێت زۆرترین بەرهەمی گونجاو لەکارەکەی خۆیەوە بەدەستبێنێت کاری سەرەکی حکوومەت تەنها ئەوەیە کە جوولەی ئازادی بازاڕ دەستەبەر بکات[١]. ئەمەیش پێویستی بە کۆنترۆڵکردنی پارەی باو و ڕێگرتن لە فێڵ و ساختەکاری هەیە. لە بنەڕەتدا حکوومەت ڕۆڵێکی زۆر زیاتر لەمەی نییە.

بەڵام سەقامگیربوونی حکوومەت و کارپێکردنی دەسەڵات بەهۆی یەکێکی تر لە باشەکانی مرۆڤەوە هەڕەشە لە باری کۆمەڵگا دەکات. ئەم سروشتە بریتییە لەوەی کە مرۆڤ دەیەوێت هەتا بێ کۆتایی باشەی خۆی زیاد بکات. بەتایبەتی ئەم کارە سەبارەت بە زیادکردنی دەسەڵات گرنگییەکی زۆرتری هەیە. وەها تێڕوانینێك ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ بیری هۆبز کە دەڵێت تەماحکاری مرۆڤ لە تێربوون نایەت و دەسەڵات لە جیهاندا پڕە لە کێبەرکێ و ڕکەبەری بۆ مسۆگەرکردنی بەدەستهێنانی خۆشیگەلێکی زۆرتر لە ئایندەدا. بەسەرنجدانی ئەم بنەڕەتە ئێستا پرسیار ئەوەیە کە چۆن دەکرێت دەسەڵات بدرێتە دەست مرۆڤگەلێکی خۆپەرست و چاوەڕوانی ئەوە بکرێت کە بۆ قازانج و تەماحی خۆیان کاری پێ نەکەن؟ وەڵامی جێمزمیل بۆ ئەم پرسیارە ئەوەیە کە دەبێت حکوومەت بدرێتە دەستی کەسانێك کە نەتوانن جگە بۆ قازانجی گشتی کاری پێبکەن. و ئەم مەبەستە بەدیموکراسی نوێنەریی بەدەستدێت. لە دیموکراسی نوێنەریدا نوێنەرەکان هاوکات لەگەڵ قازانجە کەسییەکانی خۆیان هەوڵ بۆ بەرژەوەندی گشتیش دەدەن. هەروەك باسمانکرد بێنتهامیش هەمان بۆچوونی هەبوو.

ئەم بەڵگەهێنانەوەیە پرسیارگەلێکی نوێ دەورووژێنێت و چەند پارادۆکسێکی لە خۆیدا هەڵگرتووە. لەوانە ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە مەبەست لە ((قازانجی گشتی)) چییە؟ نوێنەرەکان دەبێت چۆن بەدوایدا بچن؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە لە چوارچێوەی تیۆرەکەی جێمزمیلدا دەبێت سیستەمی سیاسی وەکو بازاڕ و کرداری دەنگدەرەکان و هەڵبژێردراوەکان وەکو کرداری فرۆشیاران و کڕیارانی شتومەك تەماشا بکرێت[٢]. دەنگدەر لە بازاڕی سیاسەتدا خوازیاری ڕەوت و بەرنامەیەکە کە دەگونجێت لەگەڵ قازانجی ئەودا، واتە قازانج و سوودی ئەو دەگەیەنێتە ئەوپەڕی. بەهەمان ئەو شێوەیەی کە لە بازاڕی ئابووریشدا بەدوای ئەو شتەوەیە کە دەگونجێت لەگەڵ زۆرترین قازانجی ئەودا، واتە سوود و قازانجی ئەو دەگەیەنێتە ئەوپەڕی. لە

1- Alan Rayn. "Two Concepts of Political and Democracy: James and John Stuart Mill" In Lively and Reeve, op. cit, p. 255.
2- Ibid, p. 224.





دیموکراسی نوێنەریدا ئەو کەسانە بەنوێنەر هەڵدەبژێردرێن کە کار بۆ بە ئەوپەڕگەیاندنی قازانجی دەنگدەرەکان دەکەن. بەم شێوەیە کاری دەوڵەت و سیاسەتیش بەگشتی بریتییە لە هەماهەنگ کردنی چالاکی ئەو خۆپەرستانەی کە هەموو شتێك لەبەرچاو دەگرن و حیسابی بۆ دەکەن.

ئەم تێڕوانینە بۆ ناوەڕۆکی سیاسەت و بەشداری لە بەرامبەر تێڕوانینەکەی هیگڵ و ڕۆسۆ رادەوەستێت کە هەر لە بناغەوە جیاوازە لەگەڵ وەها ڕوانگەیەکدا[٣]. بە بۆچوونی هیگڵ و ڕۆسۆ بەشداری تاك لە سیاسەتدا بۆ وەدەستهێنانی سوود و قازانج نییە بەڵکو بۆ وەدیهێنانی خود[٤] و خۆ وەدیار خستنە. ئەوان وەکو ڕەنگدانەوەی ویستی ئەخلاقی و شوێنی دەرکەوتنی خۆ وەدیارخستن و خۆ دەربڕین[٥] تەماشای دەوڵەت دەکەن. هەربۆیەش ڕۆسۆ قبووڵناکات کە تاك چەند نوێنەرێك هەڵبژێرێت تاوەکو لەبری ئەو ئەو بهێننەدی.

بە بۆچوونی جێمزمیل و ڕوانگەی دیموکراسی بازاڕی بەشداری سیاسی بە گۆژمەیەك لەقەڵەمدەدرێت بۆ تاك. دەنگدان شتێکی هاوشێوەی کڕین و فرۆشتنە. ئێمە دەبێت بۆ بەدەستهێنانی زانیاری دەربارەی کاندیدکراوەکان و بەرنامەکان و سیاسەتەکانیان وزەو توانا وەگەڕبخەین، واتە کاربکەین. کارکردن و وەگەڕخستنی وزە و توانا وەکو ئازار وایە و لەو لایەنەوەی کە دەبێت چاوپۆشی لە بەکاربردنی هەمان وزەو توانا بکەین لە شوێنێکی تردا کە شادییەکی ڕاستەوخۆتر دەبەخشێت ئەمە گۆژمەیەك بۆ ئێمە لەخۆ دەگرێت. بەم پێیە تاك توانای خۆی بۆ بەشداری لە هەڵبژاردن وەگەڕناخات مەگەر ئەوکاتەی کە دڵنیا بێت لەوەی بەشدارینەکردنی قازانج گەلێکی گرنگ لەدەستدەدات. لە ڕوانگەی جێمزمیلەوە خەڵك کارێك لەبەرخودی کارەکە ئەنجامنادەن بەڵکو لەبەر ئەوشتەی کە لە بەرامبەر کاردا بەدەستی دێنن دەچنە ژێرباری کارەوە. بەواتایەکی تر لەکاتێکدا تاك هەڵدەستێت بە بەشداری سیاسی کە ئەم بەشدارییە زیاتر لە کارەکانی دی سوودی پێ ببەخشێت. هەربۆیەش جێمزمیل مافی دەنگدان بۆ ئافرەتان لەبەرچاو ناگرێت. کاتێك کەسێك هەیە کە چاودێری لە قازانجەکانی تۆ بکات ئیدی پێویست بەوە ناکات کە تۆ خۆت توشی چالاکی و بەشداری سیاسی بکەیت. ئەگەر کارو هەوڵی تۆ لە شوێنێکی دیکەی جیا لە سیاسەت سوودێکی زیاتری هەبێت بۆت بەشێوەیەکی سروشتی وە باشتری دەزانێت کە کاری خۆت لەوێدا وەگەڕ بخەیت. بەڵام بە بۆچوونی ئێمە دەکرێت

3- An Thory Downs, An Economic Theory of Demoeracy, New York, Harper, 1957.
4- Self – realization.
5- Self – expression.

لەم تێڕوانینەوە بەو ئەنجامە بگەین کە ((سیستەمی نوێنەرایەتی)) بەشـێوەیەکی لـۆژیکی تـەنها سیستەمێك نییە کە گونجاو بێت لەگەڵ مەبەستی بە ئەو پەڕگەیاندنی سوودی تاکەکان.

لە تیۆرەکەی جێمزمیلدا کاری دەوڵەت جیا لەوە نییە کـە پارێزگـاری لـە تـاك بکـات لـە بەرامبەر سنوور بەزاندن و کێشە بۆ دروستکردنی تاکەکانی تردا. هەر لەبەر ئەمەیشە کـە زۆر جـەخت لەسـەر رێکخـستنی رێـساکانی کـار دەکاتـەوە. لـەو جێیـەوەی کـە کـار ئـامرازی فەراهەمکردنی هەلومەرجی خۆشییە ئەو بابەتە گرنگییەکی زۆری دەبێت کە هـەموو کەسـێك بەشی خۆی لەم ئامرازی خۆشی بەدەست هێنانە وەربگرێت[٦]. لەبەرئەوەی بەشی هەر کەسـێك لەم ئامرازی خۆشی و خۆشبەختییە لە رێگەی کارەوە بەدەستدێت، بۆیـە دەبێـت ئاسـتی ئـەو خۆشی و چێژەی کە بەر ئەو دەکەوێت یەکسانبێت لەگەڵ ئەو کارەی کە ئەنجامیدەدات. ئەگـەر کەسێك کەمتر لە ئاستی ئەو کارەی کە ئەنجامیـداوە ئـامرازی خۆشـبەختی بەدەسـت بێنێـت ئەوەی کە لێی دەمێنێتەوە لەلایـەن کەسـێکی تـرەوە دەسـتی بەسـەردادەگیرێت. بـەپێی ئـەم تێڕوانینە خۆشی و خۆشبەختی گشتی کۆمەڵگا بەو شێوەیە دابیندەبێت کـە هـەموو کەسـێك زۆرترین سوود لە کارەکەی خۆیەوە بەدەستبێنێت.

جێمزمیل بەڵگە دێنێتەوە کە خـاوەن تواناکـان زیـاتر لـە بەشـی خۆیـان چـاوەڕوانی سـوود وەرگرتنن لە کارەکانیان، بۆیە ئەگەر هەر بەو حاڵە بهێڵرێنەوە لاوازەکان لە بەرهەمی ئەو کـارەی کە بەشی خۆیانە بێ بـەش دەکـەن. کەواتـە لـە روویەکـەوە دەوڵـەت هـاو وێنەیـە لەگـەڵ ئـەو عەقڵانیەتەی کە بەرگری لە بەرهەمی کاری تاکـەکان بکـات لـە بەرامبـەر تـەماحکاری خـاوەن تواناکاندا. بەڵام سەیر لەوەدایە کە جێمزمیل نەك تەنها موڵکدارییە بە شێوێنەری ئـەم مەبەسـتە نەدەزانی بەڵکو بەهاو وێنە و پێویستی دەزانی بۆ ئەو. سەرئەنجام لەو پێـشەکیانەی سـەرەوە بـەو جێیە دەگات کە یەکێك لە رۆڵە سەرەکییەکانی دەوڵەت بریتییە لە پارێزگاریکردن لە موڵکداری.

لێرەدا ئەم پرسیارە دێتە ئاراوە کە ئایا بۆی نییە حکوومەت خۆی ببێتە هـۆی ئـەوەی کـە هەندێك خاوەن تواناتربن لە هەندێکی تر و بەم شێوەیە کۆمەڵێك رێگەیان بۆ خۆش ببێـت کـە دەستبگرن بەسەر بەرهەمی کاری هەندێکی تردا؟ بەپێی تێڕوانینی بازاڕی بۆ سیاسەت ناتوانین وەها ئەگەرێك بەدوور بزانین. وەچنگهێنانی توانا و دەسەڵات شتێکە لە تێربوونی نایەت. ئـەو کەسانەی کە خاوەن توانا و دەسەڵاتن بەردەوام لە هەوڵی خراپ سـوود لێوەرگرتنیـدان، تـەنها

6- James Mill, Essay an Government, ed C. V. Shiellds, Indiana polis, Bobbs-Merrill, 1955, p 49.



کاتێك نەبێت کـە بەشـێوەیەك دەخرێنـە ژێـر کۆنترۆڵـەوە. جێمزمیـل بـیری لـە چارەسـەرێك کردووەتەوە بۆ ئەم کارە کە بەشێکە لە دیکتەرینی دیموکراسی نـاوبراو. بەڵگـە دەهێنێتـەوە کـە کاریگەرترین شێوەی سنووردارکردنی توانا و دەسـەڵاتی دەوڵەمەنـدەکان ئەوەیـە کـە توانـا و دەسەڵات لەو خەڵکەوە بەدەستبێنن کە توانا و دەسەڵاتەکەیان بەسەردا جێبەجێ دەکەن. ئەگەر دەوڵەت بریتییە لە هەوڵێك بۆ رێگرتن لە روتاندنەوەی لاوازەکان لەلایەن خاوەن تواناکان، ئەوا دیموکراسی هەوڵێکە بۆ بەکارهێنانی دروستی دەسەڵاتی دەوڵـەت و رێگـرتن لـە روتاندنـەوەی هاوڵاتیان لەلایەن فەرمانڕەواکان چونکە حەزی مرۆڤ بۆ بەدواداچوونی کالاّ و دەسەڵات شـتێکە لە تێربوون نایەت[٧].

لە تیۆرەکەی میلدا دیموکراسی بۆ باشکردن و رێکخـستنی موڵکـداری و دابەشـکردنی بـە قازانجی نەدارەکان نییە بەڵکو تەنها بۆ رێگرتنە لە خراپەی حکوومەت. جێمزمیل ئەو بابەتەی بە بەڵگەنەویست لەقەڵەمدەدا کە ئەگەر کرێکاران مافی دەنگدان بەدەست بێـنن پـەیڕەوی لـە چینی ناوەراسـت دەکـەن. ئـەو چـینی ناوەراسـتی بـە خـاوەن فەزیلـەتی عـەقڵانی و توانـای بەڕێوەبردنی سیاسیی کۆمەڵگا دادەنا. بە بۆچـوونی ئـەو رابـەریکردنی چـینی ناوەراسـت لـە کۆمەڵگادا بە قازانجی چینی کرێکارانە[٨]. بیری لەو ئەگـەرە نـەدەکردەوە کـە رەنگـە لـەکاتی فراوانبوونی مافی دەنگدان دووبەرەکی بکەوێتە نێوان دەنگدەرەکانەوە. ئەویش وەکـو بێنتهـام پارت و گرووپبەندییە سیاسییەکانی بە نوێنەری ((قازانجی شـوم)) لەقەڵەمـدەدا نـەك قـازانجی سیاسیی هاوبەش. هەروەها بڕوای وابوو کە دەکرێت بـە پەرەپێـدانی پـەروەردە و فراوانکردنـی رۆشنبیری گشتی بەردەوام دیموکراسی باشتر و باشتر بکرێت و ئاستێکی بـێ سـنوور هـەوڵ بـۆ ریفۆرم کردنی بدرێت. فێرکردنی مرۆڤەکان بۆ ژیان بەسەربردن لە سـایەی دیموکراسـی کـارێکی شیاو و خوازراوە، چونکە مرۆڤەکان لە سایەی وەها حکوومەتێکدا خۆشبەخت تر دەبن.

تیۆری دیموکراسـی بـازاڕی جێمـزمیلیش رووبـەرووی هـەمان ئـەو پارادۆکسەبووەوە کـە تیۆرەکـەی بێنتهـام تووشـی هـاتبوو. جێمـزمیلیش وەکـو بێنتهـام بەدواداگـەڕانی خۆشـی تاکەکەسیی بە هاووێنە دەبینی لەگەڵ فەراهەم بوونی خۆشی گشتیدا. میل و بێنتهام دەیانوت هەرکەسە و خۆی باشترین دادوەری قازانجەکانی خۆیەتی و باشـتر لـە خـەڵکی دی (لەوانـەیش دەوڵەت) دەستنیشانی دەکات کە چۆن خۆشی و خۆشبەختی ئەو بەرهەمدێت. بەم پێیە ئەگـەر

7- James Mill, op. cit, p. 58.
8- Alan Ryan, op. cit, p. 230.





له بواری ئابووریدا ڕێگه به هەموو کەسێك بدرێت که بەدوای مەبەستەکانی خۆیدا بگەڕێت ئەوا خۆشی هەمووان و خۆشبەختی گشتیش دابین دەبێت. بەلاّم لە بواری سیاسەتدا هەر لەخۆوە هەماهەنگی قازانجەکان بەرهەمنایەت. دەبێت دەوڵەت بۆ دابینکردنی خۆشبەختی گشتی ڕێگه لە دەستدرێژی تاکەکان بۆ سەریەکتر بگرێت. میل بە هەمانشێوە ئازادیشی دەگۆڕی بۆ ئامراز: ئامرازی دابینکردنی خۆشی تاك و خۆشبەختی گشتی. شتێکی بەڵگەنەویستە کە کاتێك ئازادی وەکو ئامرازی دابینکردنی خۆشی بێت لەکاتی پەیدابوونی شوێنگرەوەیەکی دی بۆ ئەو بەجۆرێك کە خۆشی تاکەکان دابینبکات، دەتوانین چاوپۆشی لەو بکەین. فەرمانڕەواکانیش دەتوانن بۆ دابینکردنی خۆشی و خۆشگوزەرانی ئابووری ئازادییەکانی خەڵکی پێشێلبکەن. تیۆری دیموکراسی بازاڕ ناتوانێت وەها ئەگەرێك ڕەت بکاتەوە. ئەم پارادۆکسە هاندەری کانت و ڕۆسۆ بوو کە هەریەك بە شێوەیەك لە تیۆرەکانی خۆیاندا ئازادییان گۆڕی بۆ شتێکی جەوهەری. کانت ئەم تیۆرەی خستەروو کە تاکەکان ئامراز نین، بەڵکو مەبەستن[٩].

**باشه و قازانج لە بەرامبەر ماف- کەم و کورتییەکانی تێڕوانینی سوودگەرایی**

کەم و کورتیی تیۆری دیموکراسی بازاڕ لە پێشگریمانە سەرەتایی و بنەما تیۆرییەکانی سوودگەراییەوە سەرچاوە دەگرێت. بەپێی تێڕوانینی سوودگەرایی بەدواداگەڕانی خۆشی و خۆشبەختی تاکەکەسی و بنەڕەتی بە ئەو پەڕگەیاندنی چێژ و تا ئەو پەڕ کەمکردنەوەی ئازار مەرامی کرداری مرۆڤ و بناغەی ڕێسا ئەخلاقییەکان نیشاندەدات. بەلاّم هەروەك زۆرێك لە ڕەخنەگران وتویانە ئەم بنەرەتە شتێکی دیکەی جیا لە دووبارە بێژییەکی[١٠] ناو بەتاڵ نییە[١١].

مرۆڤ بەدوای خۆشیدا دەگەڕێت، بەلاّم خۆشیی چییە؟ خۆشی بریتییە لە گەیشتن بەوەی کە مرۆڤ دەیەوێت و دورکەوتنەوە لەوەی کە مرۆڤ نایەوێت. لە ڕاوڵەتدا ئەم وتەیە زیاد لەوەی بەپێی بانگەشەی لایەنگرانی سوودگەرایی بەگشتی کردنێکی ئەزموونی بێت شتێکی دووبارە بێژییە: مرۆڤ ئەوەی کە دەیەوێت، دەیەوێت و ئەوەی کە نایەوێت، نایەوێت. بەم شێوەیە ئەگەر چێژگەرایی دەروونناسی ناوەڕۆکێکی دیاریکراو بۆ بابەتی چێژ و ڕق بەدەستەوە نەدات

٩- رابرت نوزيك، معدوديتهاي اخلاقي و عدالت توزيعي، در مايكل ساندل، پێشوو لاپەڕە ١٦٨.
10- Tautology.
11- Lively and Reeve, op. cit, p. 185.





دەگۆڕێت بۆ بنەڕەتێکی ناو بەتاڵ. بەواتایەکی تر دەبێت دیارییبکات بەکردەوە خەڵکی چ ئامانجگەلێك بۆ خۆیان دەستنیشان دەکەن. ئەوەی کە سوودگەرایی وەکو پرسێکی دیار ئاماژەی پێدەکات ئەوەیە کە مرۆڤی خۆپەرست و وردبینەکان وەکو نموونەیەك دەناسێنێت و چەند ئەنجامگیرییەك لە کردارەکانی ئەوەوە بەدەست دێنێت. بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە بێنتهام و میل تا چەندە بەرامبەر بەم پێشگریمانەیە بە پابەندی ماونەتەوە، ئەم پرسە لە ئارادایە کە تا چەندە وەها گریمانەیەك دەربارەی تاکی وردبین و قازانجخواز و خوازیاری زۆرترین خۆشی دەتوانێت ئاڵۆزی ورووژان و بەجۆش هێنانە مرۆییەکان و هاوکردارییە کۆمەلاّیەتییەکان دیارییبکات[١٢]؟

جگە لەمە ئەگەر تیۆری دەروونناسی و تیۆری ئەخلاقیی دیموکراسی بازاڕ پێکەوە لەبەرچاوبگرین تیۆری ئەخلاقی بەزیادە دێتە پێش چاو و شتێکی نوێ ڕوون ناکاتەوە. ئەگەر چێژ و ئازار بە ئێمە دەڵێت کەچی بکەین لەم حاڵەتەدا ئەوەی کە بە حوکمی فەرمانەکانی بنەڕەتی دەروونناسی ئەنجامی دەدەین هەمان ئەو شتەیە کە پێویستە لەڕووی ئەخلاقییەوە پێویستە ئەنجامی بدەین. هەر کارێك کە ئەنجامی دەدەین و دەمانەوێت ئەنجامی بدەین دروستە. هیچ یەکسان بوونێك لەنێوان حەز و وەزیفە و قازانج و ئەرکدا نییە و ئەگەر وەها یەکسان بوونێك دێتە ئاراوە یەکسان بوونێکی درۆیینە. جێمزمیل و بێنتهام قبوڵناکەن کە تیۆرە ئەخلاقییەکەیان شتێکی زیادەیە. بێنتهام دەیەوێت جیاوازی لەنێوان قازانجی تاکەکەسی و ئەرکی ئەخلاقیدا دابنێت و سوودمەندی تاکەکەسی لە سوودمەندی گشتی جیابکاتەوە. سوودمەندی تاکەکەسی بریتیە لە بە ئەوپەڕگەیاندنی خۆشی تاکەکەسی و سودمەندی گشتیش بریتیە لە بە ئەوپەڕگەیاندنی خۆشی کۆمەڵگا. لە ڕاوڵەتدا تیۆری دەرووناسی لەسەر ئەو بانگەشەیە دامەزراوە کە بەدواداگەڕانی سودی کەسیی بزوێنەری سەرەکی کردارە، لە کاتێکدا کە تیۆری ئەخلاقی بە ئەوپەڕگەیاندنی سودمەندی گشتی وەکو زەمینەی بەلێندانە ئەخلاقیەکانی تاك دەناسێنێت[١٣]. هەروەها ناکرێت لەڕووی ئەخلاقیەوە پاساو بۆ ئەوە بهێنرێتەوە کە بۆچی دەبێت وەکو لە پێشتربوون بەها بە لەپێشترییەکانی بدرێت[١٤]. هەروەها ڕەنگە تایبەتی بە دیموکراسی بێت کە باس لە تێرکردنی سەلیقە و قازانجی زۆرینە بکەین بەلاّم

12- Social Interaction.
13- Lively and Reeve, op. cit, p. 186.
14- Bruce Douglass, op. cit.

ناتوانین لەڕووی ئەخلاقیەوە ئەمە بە بەڵگەهێنانەوەیەکی بڕوا پێهێنەر لە قەڵەم بدەین. بەهەمان شێوە لە تێڕوانینی سودگەراییدا پرسی ماف شتێکی روشاوە. سودگەرایی چەمکی باشە لەبری چەمکی ماف دادەنێت و ئەوکات هێندە بە سنورداری تەماشای چەمکی باشە دەکات کە بابەتی مافەکان و باری شکان هەڵنەگریان کاڵ دەبێتەوە و لە کۆتاییدا دەگۆڕێت بۆ کارێکی لاوەکی و پێکەوەیی و وەرگیراوە[١٥] وایدابنێن بۆ نیشتەجێ کردنی خەڵکی لە شوێنێك و بۆ ڕێگرتن لە کاری رقاوییان کە ئاژاوەیەکی گەورەتری بەدواوەیە وەها بە قازانج بێت کە تاکێکی بێ تاوان لە سێدارە بدرێت. ئایا بەپێی بنەڕەتی سودگەرایی ناتوانین مۆڵەتێك بۆ وەها لە سێدارەدانێکی نارەوا دەربکەین؟ لە رواڵەتدا دەرکردنی مۆڵەتی وەها لە سێدارەدانێك لەگەڵ بنەڕەتی سودمەندی گشتیدا ناگونجێت[١٦]. لە ئەنجامدا تاك دەگۆڕێت بۆ ئامرازێك نەك وەکو ئەوەی کە پاشتر کانت باسی لێوە دەکات بۆ مەبەست.

ناکۆکی ئەگەریی نێوان ڕێسا و یاسا و پێویستییەکانی کاری تاکەکەسی ڕوویەکی تری تیۆری دەروونناسی و تیۆری ئەخلاقی بێنتهامە. بۆ نموونە بەپێی سوودمەندی گشتی پارێزگاریکردن لە موڵکداری تایبەتی یەك ڕێساییە و رەنگە بەم بەڵگە هێنانەوەیە پاساو بۆ بەرگریکردن لەو ڕێسایە بهێنرێتەوە کە ئەم بنەڕەتە لە ماوەیەکی درێژخایەندا قازانجی هەموان بەرەو پێشەوە دەبات و بنەڕەتێکی هاو وێنەییە لەگەڵ قازانجی هاوبەش و قازانجی گشتیدا. بەڵام وای دابنێین کەسێك دەیەوێت لە هەلومەرجێکی بە پەلە و پێویستدا بەدزینی نانێك گیانی خۆی رزگاربکات. ئەم دزییە لە ماوەیەکی کورتدا هاووێنەییە لەگەڵ قازانجی کەسیدا. ئایا کەسی ناوبراو مافی ئەوەی هەیە سەرپێچی لە ڕێسای گشتی بکات و بۆ قازانجی کەسی خۆی پەنا بۆ دزیکردن بەرێت؟ مەگەر سوودگەرایی بۆخۆی ناڵێت کە سوودمەندی پێوەری تەواوی فەزیلەتەکانە[١٧].

## یەکسان بوونی دادپەروەری و قازانج

تێڕوانینی سودگەرایی دەبێتە هۆی یەکسانبوونی دادپەروەری و قازانج و ماف و باشە. یەکێك لە لایەنە سەرەکییەکانی بنەڕەتی سوودمەندی ئەوەیە کە لە کۆکردنەوەی سوودمەندییە

15- Derivative.

١٦- رابرت نوزيك، پێشوو.

17- Ross Harrison, op, cit, p 169.





تایبەتەکانەوە بەدەستدێت. سوودمەندی ڕێسا کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان تەنها لە ڕێگەی کۆکردنەوەی کۆی کاریگەرییەکانیان لەسەر قازانجی یەك بەیەکی ئەندامانی کۆمەڵگا بەدەستدێت. ئەگەر وەکو تێڕوانینی نۆمینالیستی تەماشای کۆمەڵگا بکەین ڕێگەیەکی جیا لە ئارادانییە، مەگەر ئەوەی کە بیرمەندانی سوودگەرایی گونجانی ناوەکی تێڕوانینەکەی خۆیان بکەنە قوربانی. بە هەموو شێوەیەك پرسی دادپەروەری لە روانگەی سوودگەراییدا هیچ پاساوێکیی نییە کە سوودی زۆرتری لایەك زیانی لایەنەکانی تر پڕ بکاتەوە. بەهەمان شێوە کە دەکرێت دەستدرێژی کردنە سەر ئازادیی چەند کەسێك بەهۆی ئەوباشە گەورەترەی کە بۆ ژمارەیەکی زۆری تاکەکان هەیەتی، پاساوی بۆ بهێنرێتەوە[١٨]. هەڵبەتە فەرمانەکانی دادپەروەری کە لە عەقڵی سەخڵەمەوە سەرچاوە دەگرن لەو شوێنەوەی کە بە سوودن شیاوی راسپاردنن، بەڵام ناکرێت وەکو بنەڕەتی یەکەمینی ئەخلاق تەماشا بکرێن، چونکە بە هەمان ئەو شێوەیەی کە تاك بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشییەکانی خۆی کاری عەقڵانی دەکات کاری کۆمەڵگاش بۆ بە ئەو پەڕگەیاندنی هەڵسەنگاندنی بێ خەوشی خۆشییەکانی تەواوی ئەندامانی خۆی کارێکی عەقڵانییەوە رەوایە.

بەم پێیە سروشتیترین شێوەی سوودگەرایی ئەوەیە کە بنەڕەتی هەڵبژاردنی عەقڵانی خۆمان دەربارەی کۆمەڵگاش بەکاربەرین. بەم تێڕوانینە پێگەی چاودێرێکی بێ لایەن دێتەئاراوە، یاسادانەرێك کە چاوەڕوان دەکرێت لە چوارچێوەی سیستەمێکی پێکەوە بەسراوی سەرتاسەریدا ڕێکخستنی دابینکردنی خواستی تاکەکان فەراهەمبکات و لەم ڕێگەیەوە هەموو تاکەکان لە ناو یەك سیستەمدا بەیەکەوە ببەستێتەوە. ئەم یاسادانەرە گریمانەییە دەکەوێتە هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی بەهێزی و بێ هێزی ئارەزووەکانی تاکەکان و بۆ هەریەکەیان کێشێك دیاریدەکات و ڕێساگەلێکی پێویست بۆ تێرکردنی خواستەکان و پێکەوە گونجانیان فەراهەمدەکات. لەم ڕووەوە بڕیاری یاسادانەر بە تەواوی هاوشێوەی بڕیاری ئەوخاوەن کارەیە کە کار بۆ بە ئەو پەڕگەیاندنی سوودی دامەزراوەکەی خۆی دەکات. کاری دەوڵەت بریتییە لە کار پێکردنی وەها بەڕێوەبردنێك.

ئەم تێڕوانینە پەیوەندی راستەوخۆی نییە بە روانگەی دادپەروەریخوازانەوە. لە روانگەی هەق و دادپەروەریدا هەموو کەسێك سەبارەت بە ئازادی و دادپەروەری مافگەلێکی هەیە کە خۆشی و باشەی خەڵکی دی هەرکێشێکیشی هەبێت و تەنانەت ئەگەر پەیوەستیش بێت بە تەواوی کۆمەڵگاوە

١٨- جان راولز، روباروى حق باخير، در مايكل ساندل، پێشوو، ل ٦١.

ناتوانێت رێگری بەهرەمەندبوون بێت لەم مافە. ئەوەی کە بەهۆی بەهرەمەندبوونی کۆمەڵێکی گەورەتر کەسێك ئازادی یان مافی خۆی سەبارەت بە دادپەروەری و مامەڵەی دادپەروەرانە لەدەستبدات لەگەڵ بنەڕەتی دادپەروەریدا ناگونجێت. لە کاتێکدا کە لە روانگەی سوودگەراییدا سوودی کۆمەڵێك و زیانی کۆمەڵێکی تر یەکدی هەڵدەسەنگێنن. لەم رووەوە سەبارەت بە قوتابخانەی مافی سروشتی نوێ و گرێبەستی کۆمەڵایەتی سوودگەرایی هەنگاوێك بەرەو دوا گەڕاوەتەوە. باری سەرەتا (ئەو بارە سروشتییەی کە هۆبز باسی دەکات) ئاماژەیەکە بۆ لە پێشتربووونی عەقلانیی یەکسان بوونی لایەنەکانی گرێبەست. بەڵام سوودگەرایی گرنگی بەدیکترینی دادپەروەری نادات. هاوەڵاتی سوودگەرایی فەرمانەکانی دادپەروەریان بەرێساگەلێکی پێکەوەیی و ناوەڕۆکی دادەنا[19].

سوودگەراکان دەڵێن مرۆڤەکان ئۆرگانەکان دادەمەزرێنن تاوەکو ئەوپەڕی خۆشی و خۆشبەختی بەدەست بهێنن. و هیچ بیر لە سەرچاوەی ئەم ئۆرگانانە یاخود چۆنیەتییەکەیان ناکەنەوە، بەڵکو بیر لە کاریگەرییەکەیان دەکەنەوە لەدابینکردنی کۆمەڵی خۆشی و خۆشگوزەرانی. بەشێوەیەکی تایبەتی و راستەوخۆ خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی بە پلەی یەکەم پەیوەستە بە خۆشی یان ناخۆشی تاکەکانەوە. بۆیە تەنانەت ئەگەر خۆشی هەندێك مایەی جیاکارییە لە دژی هەندێکی تر و ئەگەر ئەم کۆمەڵە سنوورداربوونی ئازادی کەسەکانی تر بۆ زیادکردنی رێزی خۆیان بەڕەوا دەزانن دەبێت کۆمەڵگا تەنانەت ئەم خواستگەلانەش لە لێکدانەوەکانی خۆیدا لەبەرچاوبگرێت، بەڵام ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە لە پێشتربوونی ماف بەسەر باشەدا هەیە پێیان وایە کە بەهیچ شێوەیەك ناکرێت مافی تاك بکرێتە قوربانی بۆ خۆشگوزەرانی هەمووان[20] یان خۆشی کۆمەڵێکی گەورەتر[21].

کۆمەڵگاخوازان و لەوانەیش رۆسۆ بەڵگەهێنانەوەی تایبەتی خۆیان هەیە بۆ رەتکردنەوەی ئەم تێڕوانینە سوودگەرایانەیە. ئەوان دەڵێن چەمکی باشە و دادپەروەری ناتوانێت پێشتر لە فۆرم وەرگرتنی دیاریکراوی کۆبوونەوەی سیاسی و بەر لەو بوونی هەبێت.

١٩- هەمان سەرچاوە، ل ٦٤.

20- general welfare.

21- Chantal Mouffe "Rawels: Political Philosophy with out Politics" in David Rasmussen, ed. Universalism vs Communitarianism England, Mit Press [illegible] p. 221.





## ((دەستی نەبینراو)) و دەستی بەهێز

تیۆری سوودگەرایی بێنتهام و میل دەستەویەخەی نەگونجانێکی ناوەکی گرنگ بوو. هەروەك باسکرا ئەوان خوازیاری کەمترین دەستێوەردانی دەوڵەت بوون لە ئابووریدا. بڕوایان وایە کە لە بواری ئابووریدا چالاکی تاکەکان بۆ بەدواداچوونی قازانجی کەسیی خۆیان باشەی گشتی دابینەدەکات. بەواتایەکی تر لەگەڵ ئادەم سمیتدا بڕوایان بە ((دەستی نەبینراو)) هەیە کە بە شێوەیەکی خۆڕسکی چالاکی مرۆڤی خۆپەرست و دووربین هەماهەنگ دەکات. بەڵام هەر ئەم مرۆڤە دەبێت لە بواری سیاسەتدا بەپێی گرێنتییەکی یاسایی واداکار بکات کە لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بە سوودمەند لەقەڵەمدرابێت. بەم شێوەیە لە بواری ئابووریدا بە شێوەیەکی سروشتی بەڵام لە بواری سیاسەتدا بەشێوەیەکی دروستکراو هەماهەنگی دروستدەبێت. بیرمەندانی سوودگەرایی کە خۆیان رۆڵێکی تریان هەبوو لە دامەزراندنی ئابووری کلاسیکدا وەکو راستییەکی رێسا بەخش تەماشای بازاڕیان دەکرد و ئەنجامگەلێکی کۆمەڵایەتی خوازراویان بۆ گۆڕینەوەی ئازاد لە بەرچاو دەگرت. بەڵام لە چوارچێوەی سیاسەتدا دەبێت یاسادانەر دەستی هەبێت لە پارێزگاریکردن لە ئاسایشی موڵکداری. ئەم دەستێوەردانە تەنها بۆ فەراهەم کردنی پێش زەمینەی چالاکیی ئابووری نییە، بەڵکو بۆ دیاریکردنی قازانجی گشتیشە. هەرچەندە کە قازانجی گشتی زیاتر ئاراستەی ئاستنگەکانی بەرەوپێشبردنی زۆرترین خۆشیی زۆرترین ژمارەی هاولاتیان بێت تا دەستکردن بەدەستێوەردانی پۆزەتیف. بەڵام لە راستیدا ئەم بەرپرسیارێتییە ئاستێکی بەرچاوی دەسەلاتی حکوومیی لە خۆیدا هەڵگرتووە[22]. بەم جۆرە لە تیۆری سوودگەراییدا پەیوەندی نێوان هەماهەنگ بوونی سروشتیی قازانجەکان لە بواری ئابووری و هەماهەنگ بوونی دروستکراوی قازانجەکان لە بواری سیاسیدا پەیوەندییەکی سستە.

## بە کورتی

جێمزمیل تێڕوانینەکەی بێنتهامی هەڵبژارد و هەر بەو شێوەیەی کە بێنتهام کارەکەی هیوّمی هەنگاوێك بەرەو پێشەوە بردبوو ئەویش کارەکەی بێنتهامی هەنگاوێك بەرەو سنووری لۆژیکیەتی تێڕوانینی سوودگەرایی بەرەو پێشەوە برد. تیۆرەکەی جێمزمیل بە ((دیموکراسی بازاڕ)) ناوبراوە. لە تیۆرەکەی بێنتهامدا ناهەماهەنگی هەبوو لە نێوان بواری ئابووری و بواری سیاسەتدا، ناهەماهەنگیرەکەیش بەم شێوەیە بوو لە کاتێکدا کە لە بواری ئابووریدا قازانجەکان بە شێوەیەکی

٢٢- ریچارد تاك، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١١.

سروشتی بەرەو هەماهەنگی دەچن لە بواری سیاسەتدا ناهەماهەنگی هەیە و دەبێت ئامرازێکی دروستکراو (حکوومەت) قازانجەکان هەماهەنگ بکات. جێمزمیل هەوڵێکی بێ ئەنجامی بۆ چارەسەرکردنی ئەم ناهەماهەنگییە دەستپێکرد. هەولێدا کە نموونەی تیۆریی ئابووری کلاسیك بۆ بواری سیاسەتیش بەگشتی بکات. دەکرێت تیۆری سیاسی ئەو دەربارەی عەقلانیەتی دەوڵەت بە تەواوکەرێك بۆ ئابووری کلاسیك لە بواری سیاسەتدا لەقەڵەمبدرێت.

جێمزمیل وەکو تەواوی پێشینانە نۆمینالیستەکانی خۆی هەر لە هۆبزەوە هەتا بێنتهام لەم پێش گریمانەیەوە دەستپێکرد کە مەبەستی سروشتیی تاك ئەوەیە کە خۆشی و خۆشبەختی خۆ بگەیەنێتە ئەوپەڕی. ئەو جیهانەی کە ئێمە تیایدا دەژین جیهانی سەرچاوە دەگمەنەکانە، بۆیە دەبێت بۆ دابین کردنی ئەم مەبەستە کاربکەین. کاریش هاوئاستی ئازارە، بەڵام ئازارێك کە بۆ وەلاوەنانی ئازارەکانی تر و گەیشتن بە خۆشی پێویستە. ئێستا کە کار بریتییە لە ئازار تاك چاوەڕوانی ئەوەیە تا ئەو جێیەی کە دەکرێت زۆرترین بەرهەم لە کاری خۆیەوە بەدەستبێنێت. بەم پێیە دەبێت کاری حکوومەت بریتیبێت لە فەراهەم کردنی هەلومەرجێك کە هەموو کەسێك زۆرترین سوود لە کارەکەی خۆیەوە بەدەستبێنێت. مرۆڤ بوونەوەرێکی زێدەخوازە، هەڵبەتە ئەمەش بەهۆی ناپاکی سروشتی ئەوەوە نییە بەڵکو بەهۆی پێویست بوونی رکەبەرییە. هەربۆیە مرۆڤەکان بۆ زۆرترکردنی قازانجەکانی خۆیان رووەدەکەنە زیاتر وەدەستهێنانی دەسەڵات. سەرەکیترین کاری دەوڵەت بریتییە لە مسۆگەرکردنی جووڵەی ئازادی بازاڕ کە ئەمە بۆ خۆی پێویستی بە رێگرتن لە دەستدرێژی تاکەکان بۆ سەر ئازادی یەکتر و دابینکردنی گرێنتی گرێبەستە تایبەتەکان و کۆنترۆڵی پارەی باوی وڵات، هەروەها پارێزگاری کردن لە ئۆرگانی موڵکداری هەیە. باشترین فۆرمی حکوومەت بۆ دابین کردنی ئەم مەبەستە حکوومەتی دیموکراسی نوێنەرییە. لەوێوەی کە نوێنەرەکانیش وەکو تەواوی تاکەکان بوونەوەرگەلێکی زێدەخوازن رەنگە بۆ رووتاندنەوەی خەڵکی سوود لە دەسەڵاتی دەوڵەت وەربگرن، بۆیە دەبێت دەسەڵات لە بریکاردراوگەلێك وەربگرێت کە لە بەرامبەریاندا بەرپرسیار و لەلایەن ئەوانەوە لەژێر کۆنترۆڵدا بێت. میل نەك تەنها دەوڵەت بەڵکو بەشداری سیاسیشی هەر بەم شێوەیە دیاریدەکرد. دەنگدان وەکو هەموو کڕین و فرۆشتنێکی بازاڕ هەم هەڵگری تێڕوانینێکە بۆ لێکدانەوەی سوود و زیان و هەم گوژمەیەك و تاك بەو هۆیەوە ناچار دەبێت بەدانی ئەم گوژمەیە رێگە لە زیانێکی گەورەتر بگرێت. بۆیە ئەگەر لە بەشدارییەوە سوودێکی چنگ نەکەوێت هەست بە هیچ هۆکار و پاڵنەرێك ناکات بۆ بەشداریکردن (کە بۆ خۆی وەکو هەموو کارێکی تر هەڵگری ئازارە).






تیۆرەکەی جێمزمیل زێدەرەوترین ئەنجامگیرییە لە بنەماکانی سوودگەرایی. بەڵام پارادۆکسی ئەم تێڕوانینە (کە بریتییە لە هەماهەنگ بوونی سروشتیی قازانجەکان لە بواری ئابووریدا و پێویست بوونی هەماهەنگی دەستکرد لە بواری سیاسەتدا)ی چارەسەر نەکرد. بەهەرحاڵ لە تیۆرەکەی جێمزمیلیشدا دەبێت دەوڵەت بە ئامرازی سیاسی (دەسەڵات) قازانجەکان هەماهەنگ بکات، تەنانەت ئەگەر ئەم کارە بە واتای پارێزگاریکردن لە موڵکداری تایبەتی و رێگرتن لە دەستدرێژیکردنی تاکەکان بۆ سەر مافی یەکترییش بێت. جگە لەمە دیار نییە کە چۆن پاراستنی موڵکداری لەگەڵ زۆرترین سوود وەرگرتن لەکار یەکدەگرێتەوە. بەهەرحاڵ هەوڵەکانی جێمزمیل بۆ گواستنەوەی نموونەی ئابووریی کلاسیك بۆ بواری سیاسەت نەك تەنها گونجانەکانی تێڕوانینی سوودگەرایی چارەسەرنەکرد بەڵکو کەم و کورتیگەلێکی زیاتری لەم تێڕوانینە (بەتایبەتی لە بواری بەشداری سیاسی)دا ئاشکرا کرد کە کاردانەوەی ستوارت میلی وروژاند.

## پاژی شەشەم:

# عەقڵانیەتی ئازادی تاکەکەسی

**ئەو خەڵکانەی کە خۆیان حکوومەتی خۆیان بەڕێوە نابەن بەڵکو کەسانێکی تـر بـەڕێوەی دەبەن لە رووی ئەخلاقی و عەقڵانییەوە بەرەو لەناوچوون دەچن.**

**ستوارت میل**

ئەو رەخنانەی کە ئاراستەی بنەما تیۆرییەکانی دەوڵەتی سوودگەرایی کرا سـتوارت میلـی بەرەو چاکسازی کردنێك تیایدا راکێشا. ئەم چاکسازییانە سوودگەرایی بەرەو پێگەگەلێکی نوێ برد. ئەم چاکسازییانە بەقیمەتی لاوازکردنی پێشوەختی گونجانی ناوەوەی سوودگەرایی کۆتـایی هات و بەرەو رێڕەوێکی نوێ رێنمـاییکرد کـە زیـاتر لـە روانگـەی رۆسـۆ دەربـارەی دەوڵـەت (هەڵبەتە نەك بنەماکانی تیۆری رۆسۆ) نزیـك بـوو. بـەبڕوای بێنتهـام و جێمزمیـل خۆشـی و خۆشبەختی تاکەکانی کۆمەڵگا گـەورەترین و گـرنگترین بـەهابوو. ئـەوان جـەختییان لەسـەر خوازراوبوونی چـێژ دەکـردەوە و هـەموو رێگەیـەکیان بەدروسـت دەزانـی بـۆ بەدەسـتهێنانی. هەرشتێك کە خۆشی ژمارەیەکی زۆرتری خەڵکیی لەگەڵدا بووایە ئەوان پـشتگیریان لێـدەکرد. بەرای ئەوان بەشداری جەماوەری و بەرفراوان بوونی فێرکردنی گشتی تەنها رێگەیەکی بەسوودە بۆ گەیشتن بە خۆشی گشتی نەك شتێکی تر[1]. ئەگەر رێگەگەلێکی تری جیا لـە دیموکراسـی و بەرزکردنەوەی ئاستی فێرکردن هەبووایە بۆ دابین کردنی خۆشیی زۆرترین ژمـارە ئـەوا لەلایـەن ئەوانەوە شیاوی قبوڵ کردن بوو. بە واتایـەکی تـر بـەڕای ئـەوان دیموکراسـی و بەرزکردنـەوەی رۆشنبیری گشتی بۆ خۆیان واتایەکی تایبەتیان نییە. ئەگەر رێگەیەکی کەم تێچووتر هەبووایـە

---

١- ایزایابرلین، ((جان استوارت میل و غایات حیات))، چـهار مقالـه در بـاره ازادی، ترجمـه علـی موحـد، انتشارات خوارزمی، ل ٣١٠.





ئەوان پێشوازییان لێدەکرد. کاتێك کە دەتوانێت بە نرخێکی هەرزانتر شتێك بکڕێت ئیدی بۆچی بە نرخێکی گرانتر بیکڕێت؟.

بەڵام ستوارت میل ناوەڕۆك و مەبەستێکی تری بۆ دیموکراسی لەبەرچاو دەگرت. لەکاتێکدا کە جێمزمیل چاوەڕوانی دەکرد دیموکراسی بنەڕەتی سوودمەندی بکاتە رێـسای کـار و ئەمـەی بەگرێنتییـەك دادەنـا بـۆ حکوومـەتی بـاش، کوڕەکـەی (سـتوارت میـل) بـەهای بـۆ کـارە فێرکردنییەکەی دیموکراسـی و توانـای ئـەو لـە بەرزکردنـەوەی چـۆنیەتی ژیـانی هاوڵاتیـان و باشـکردنی سروشـتییان دادەنـا. بـەبڕوای ئـەو سروشـتی سـەرەکی دیموکراسـی بریتییـە لـە پەروەردەکردنی هاوڵاتیگەلێکی سەربەخۆ و خوازیاری قازانجی گـشتی. سـتوارت میـل بـڕوای وابوو جیاوازی مرۆڤ لە گیاندار و ئەوە نییە کە مرۆڤ خاوەن عەقڵە و گیاندار بێ بەشە لـەوەها بەهرەیەك، بەڵکو لەوەدایە کە مرۆڤ دەتوانێت هەڵبژێرێت. مرۆڤ دەبێت بتوانێـت هەڵبـژێرێت نەك ئەوەی بۆی هەڵبژێرن. مرۆڤ دەبێـت بـەدوای ئامانجـەکانی خۆیـدا بگـەرێت نـەك ئـەوەی ئامرازێك بێت بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانی خەڵکی. دەبێت هەموو کەسـێك بتوانێـت لـە هـەر رێگەیەکەوە کە دەیەوێت بەدوای ئامانجەکانی خۆیدا بچێت. جۆراوجـۆری رێگـەکان بـە واتـای دەوڵەمەندبوونی ژیانە.

لە بەرامبەر تیۆرەکەی جێمزمیلدا ستوارت میل رۆڵێکی نوێی بۆ دەوڵـەت دیـاریکرد. لـە تیۆرەکەی ستوارت میلدا رۆڵی دەوڵەت تەنها بە ئەوپەڕگەیانـدنی شـادیی تـاك نییـە، بـەڵکو بریتییە لە باشکردنی بەردەوامی چۆنیەتی ژیانی ئەو. ستوارت میل بەرەو جۆرێك مرۆڤگەرایی ئەخلاقی دەچوو کە زۆر دوور بوو لە تێڕوانینی دامەزرێنەرانی سـوودگەراییەوە. بەپێـچەوانەی پێشینانی ئازادیی بەواتای نەبوونی سنوورداری تەماشا نەدەکرد. هەروەك بینیمـان جێمزمیـل ئـازادیی بـە نـەبوونی سـنوورداری لەبـەردەم تـاك بـۆ بەدواداگـەڕانی خۆشـییەکانی خـۆی لێکدەدایەوە. بەڵام ستوارت میل ئازادیی بەکارێکی پێویست بۆ بـەدیهاتنی مـەزنی و بـاڵایی تاك لەقەڵەمدەدا.

هەروەك ئاماژەی پێکرا بێنتهام و جێمزمیل بەدەستپێکردن لەو گریمانەیەی کـە مرۆڤـەکان تێکڕا باشترین دادوەری قازانجەکانی خۆیـانن بـەو ئەنجامـە گەیـشتن کـە دیموکراسـی نوێنـەری باشترین فۆرمی حکوومەتە. ئەوان بەم شێوەیە لە بنەماکانی خۆیانەوە ئەنجامگیریان کرد کە لە هەموو شوێنێك و هەموو کاتێکدا مرۆڤەکان بە حکوومـەتی دیموکراسـی بـارودۆخێکی باشـتر بەدەستدێنن. هەروەها هیچ باسیان لەوە نەدەکرد کە چ شـتێك خـەڵکی بـۆ دیموکراسـی شـیاو

دەكات. تەنها بەڵگەیان دەهێنایەوە كە دیموكراسی باشترین فۆرمی حكوومەتە چونكە باشتر لە فۆرمەكانی دیكەی حكوومەت ئەوە مسۆگەر دەكات كە فەرمانڕەوا خۆپەرستەكان لە بەدواداچوونی خۆشبەختی خۆیاندا بە شێوەیەك حكوومەت بكەن كە خۆشی و خۆشبەختی هاوڵاتیانیش لەخۆ بگرێت[٢]. بەڵام بەرای ستوارت میل لە هەنگاوی یەكەمدا دیموكراسی بەو هۆیە فۆرمی عەقلانیی حكوومەت نییە كە قازانجە خۆ پەرستانەكانی خەڵكی هەماهەنگ دەكات، بەڵكو لەو رووەوە خاوەن عەقلانیەتەكە خوو رەوشتی ئەو مرۆڤانەی لە سایەی ئەودا ژیان بەسەردەبەن چاكساز دەكات. بەرزترین بەهای دیموكراسی نوێنەری لەوەدایە كە فەزیلەت و هۆش و عەقڵی خەڵكی ساخڵەم دەكات. دیموكراسی نوێنەری خەڵكی بە بەرپرس تر و رەخنەگرتر و خاوەن گیانێكی بە كۆمەڵیی زیاتر رادەهێنێت. خەڵكی لە چوارچێوەی سنووورداری خێزان دەردەهێنێت و هۆشەكی بوون و هەروەها هەستی هاوخەمی نێوان بەرفراوانتر دەكات. ئەو خەڵكانەی كە خۆیان حكوومەتی خۆیان بەڕێوە نابەن بەڵكو خەڵكی بەڕێوەیان دەبەن لەرووی ئەخلاقی و عەقلانییەوە بەرەو لەناوچوون دەچن. لەگەڵ ئەمەیشدا ستوارت میلیش وەكو پێشینانی خۆی بڕوای وابوو كە حكوومەتی نوێنەری تەنها بەكەڵكی نەتەوە پێشكەوتووەكان دێت. نەتەوە دواكەوتووەكان دەتوانن بە شكست خواردن لە بەرامبەر داگیركەرە خاوەن ژیارەكاندا بكەونە سەر رێگای پێشكەوتن[٣].

## بەرژەوەندی هەمیشەیی لەبری باشەی كاتی

گەرچی لە رواڵەتدا ستوارت میل لە هەمان بنەما بێنتهامییەكانەوە دەستپێدەكات و بەڵگەهێنانەوەكەی دەربارەی بنەڕەتی سوودمەندی بەڵگەی ئەم راستییەن، هەروەك بە ئاشكرا دەڵێت خۆشی هەر كەسێك باشەیە بۆ ئەو كەسە و خۆشی گشتیش باشەیە بۆ هەموو كەسەكانی كۆمەڵگا، لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا ئەوەی كە زیادی دەكاتە سەر ئەم بنەڕەتە چوارچێوەی سوودگەرایی بێنتهامی سەرەوژێر دەكات. یەكێك لە زیادكردنەكانی ستوارت میل بریتییە لە جیاوازی چۆنیی نێوان جۆرەكانی چێژەكان. بێنتهام تەنها لەبەر پایەدارتربوون و

2- Alan, Rayan, op. cit, p. 237.

٣- جان استوارت میل، رساله درباره ازادی، ترجمه جواد شیخ الاسلامی، تهران، شركت انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٥، ل٤٥.





دڵنیابوون و بەردەست تربوون چێژە روحییەكانی بە لەپێشتر دادەنا لەچاو چێژە جەستەییەكاندا. بەواتایەكی تر ئەو لەبەر لەپێشتربوونە دەرەكییەكان نەك دیارخەرە ناوەكییەكان چێژە روحییەكانی بە لەپێشتر لە چێژە جەستەییەكان لەقەڵەمدەدا. بەڵام ستوارت میل بڕوای وابوو كە هەندێك لە چێژەكان خوازراوترن لە هەندێك چێژی تر. ئەو دەیوت هەڵەیە ئەگەر بەهەمان شێوەی تەماشاكردنی چەندێتییەكانی چێژ تەماشای چۆنیەتییەكانی بكەین[٤]. هەندێك لە جۆرەكانی چێژەكان خوازراوتر یاخود بە بەهاترن لە هەندێكی تر. ئەم بۆچوونە لەگەڵ بۆچوونەكەی بێنتهامدا ناگونجێت و گەرچی رەنگە دروستتریش بێت بەڵام بەپێی لەبەرچاوگرتنی بنەماكانی سوودگەرایی لۆژیكی تر نییە. ستوارت میل بە خستنەرووی ئەو بابەتەی كە سوودمەندی بەواتای بەرژەوەندی هەمیشەیی مرۆڤ وەكو بوونەوەرێكی پێشكەوتن خوازە لە سوودگەرایی دوركەوتەوە[٥]. ستوارت میل وەها خوازیاری دیموكراسییە كە بنەرەتەكانی سوودگەرایی بەجێ دەهێڵێت و لەراستیدا بەرەو جۆرێك سوودگەرایی نەرمتر دەچێت كە تیایدا چاكسازكردنی بەرەبەری چۆنیەتی ژیانی تاك زیاتر لە كۆكردنەوەی خۆشی گرنگیی پێدەدرێت. پێوەری بێنتهام بۆ جیاكردنەوەی چێژەكان پێوەرێكی چەندی بوو (توند، بەردەوام، ئەگەر)، بەڵام ستوارت میل ئەم هەڵسەنگاندنە چەندییەی رەت كردەوە: ((باشتروایە سوقرات بێت و بێبەخت تاوەكو بەراز و خۆشبەخت)). هەروەها لە رووپەكی تریشەوە هەڵهێنجانێكی نوێ بۆ سوودگەرایی زیاد دەكات، ئەو هەڵهێنجانە نوێیە ئەوەیە كە سوودمەندی مرۆڤ بە بەدواداگەڕانی راستەوخۆی خۆشی بەدەستنایەت، بەڵكو كاتێك بەدەستدێت كە مرۆڤ خوازیاری ئامانج و ئارمانگەلێكی جیا لە خۆشی یان چێژی كەسیی بێت. لە وتارێكدا دەڵێت: ((بە بۆچوونی من سوود یاخود خۆشبەختی ئامانجێكی بە مەبەست ئاڵۆز و نارۆنە و ناتوانین بەدەستی بهێنین مەگەر لە رێگەی ئامانجە پاژییە جۆراوجۆرەكانی ترەوە نەبێت كە بەزۆری خەڵكی سەبارەت بەم ئامانجانە یەك بۆچوونیان هەیە، لە كاتێكدا كە سەبارەت بە ئامانجی سەرەكی هیچ هاوراییەك لە ئارادانییە[٦].

٤- فردریك كاپلستون، پێشوو، ل ٤٣.

5- J. S. Mill Utilitarianism, Liberty and Representative Government (London Evryman edition), p. 74.

٦- ایزایا برلین، پێشوو، ل ٢١٥.

ستوارت میل ئامانجگەلێك بۆ مرۆڤ لەبەرچاو دەگرێت کە بێنتهام و جێمزمیل پەسەندی ناکەن. لەوانەیش ئەوین و رق و حەزکردن بە دادپەروەری و ئازادی و حەزکردن بە کار و جوانی و فیداکاری. لەبیری ستوارت میلدا خۆشبەختی واتە ئەوەی کە تاك بتوانێت بە ئارەزووەکانی خۆی بگات بە هەموو جۆرەکانیەوە. لەم بارەیشەوە ستوارت میل لە روانگەی بێنتهام دوور دەکەوێتەوە، چونکە بەرای بێنتهام خۆشی رێساییەکی روون و براوەیە بۆ کار و ئەگەر جیا لەمە بێت بەهای خۆی لە دەست دەدا. بەبڕوای ستوارت میل ئازادی تاکەکەسی و جۆراوجۆری و دادپەروەری بەرزترین بەهاکانن.

بەم شێوەیە سوودگەرایی لە دەربڕینە باشترەکانی خۆیدا هەست بە کەمکردنەوەی جەختکردنەوە لەسەر سوودمەندی بەوێنەی باشە و بە ئەو پەرگەیاندنی باشەی هەمووان وەکو مەبەستی دەوڵەت و جەختی لەسەر چەمکی پێشکەوتن و ئازادی وەکو جەوهەری دەوڵەت کردەوە. گەرچی ستوارت میل لە کتێبی ((ئازادی))دا ئاشکرای دەکات کە سوودمەندیی کردووەتە بناغەی باسەکەی خۆی بەلاّم زۆر زوو بۆ بەرگریکردن لە ئازادی تاکەکەسی لە سوودگەرایی دوور دەکەوێتەوە و سوودمەندیی جێ مەبەستی خۆی بە بەرژەوەندی هەمیشەیی مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی پێشکەوتنخواز دەخاتە روو[7]. تەنانەت لە ئاراستەی پێشکەوتنەوە رێکییش دەخاتە بەر سەرنج و تێبینی. بەم جۆرە تەنها لە پەیوەندی لەگەڵ هەلومەرجی پێشکەوتندا بەهای رێکی هەڵدەسەنگێندرێت. ستوارت میل پێشکەوتنیش لەگەڵ بوژانەوەی ئابووریدا بە یەکسان دانانێت و جەختدەکاتەوە کە پێشکەوتن بریتی نییە لە کۆکردنەوەی برێکی زۆری شتومەکە بەکاربەرەکییەکان. پێشکەوتن لە هەنگاوی یەکەمدا بریتییە لە بەرزبوونەوەی ئاستی چۆنیەتی ژیانی مرۆڤ و چاکسازکردنی باری ئەو لە کۆمەڵگادا.

هەڵبەتە جێمزمیلیش جەختی لەسەر چەمکی پێشکەوتن بە واتای چاکسازکردنی کەسێتی مرۆڤ دەکردەوە، بەلاّم هەروەك ئاماژەی پێکرا پێشکەوتنی کەسێتی مرۆڤ تەنها لە بەرخودی خۆی ئامانج نەبوو بۆ ئەو بەڵکو زیاتر ئامراز بوو. پێشکەوتنی جێ مەبەستی جێمزمیل بریتی بوو کۆمەڵگا قبوڵ کردنی تاك لە دنیایەکی پیشەسازی و گۆڕانی بۆ مرۆڤێکی خاوەن عەقلاّنیەتی ئامێری. لە روانگەکەی ئەودا هیچ باس لە پەروەردەکردنی مرۆڤە هەستیار و ئازاو خاوەن بیری بەهێز و کەسێتیی دەوڵەمەند و گونجاو نەکرابوو. لەکاتێکدا کە لە بۆچوونی

7- Lively and Reeve, op. cit. p. 104.





ستوارت میلدا پەروەردەکردنی وەها تایبەتمەندیگەلێك بە گرنگ لەقەڵەمدەدرا[8]. ئەو پەروەردەکردنی کۆمەڵێك لە مرۆڤە بازرگانەکان بە شکەستی تەواو دادەنێت بۆ کۆمەڵگای پێشکەوتوو. کەواتە دەبێت سوودمەندی بە دامەزراو لەسەر قازانجی هەمیشەیی مرۆڤ وەکو بونەوەرێکی پێشکەوتنخواز تەماشا بکرێت.

لەسەرهەمان بنەما تێڕوانینی ستوارت میل بۆ بەشداری سیاسیش لە چاو تێڕوانینی بێنتهام و جێمزمیل وەرچەرخانێکی گرنگی بڕیوە. بەرای جێمزمیل دەنگدان واتە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی شتێك کە دەبێت لە هەڵبژاردنی سیاسیدا بۆ بەدەستهێنانی قازانجی دیاریکراو هەوڵی بۆ بدرێت. بەلاّم بەڕای ستوارت میل دەنگدان واتە هەوڵدان بۆ بەرەو پێش بردنی دەستهاتەکانی خود سەبارەت بە کۆمەڵگا و پرس و بەهاکانی و وەدەستهێنانی تواناگەلێکی نوێ. بینیمان کە دەکرێت لەسەربنەمای بنەڕەتە فەرزکراوەکانی جێمزمیل ئەنجامگیری بکەین کە مرۆڤی خاوەن عەقڵ دەتوانێت لە چەند کاتێکدا بەبێ بەشداریکردن لە سیاسەتدا کاری خۆی ئەنجامبدات. رەنگە هەلومەرجەکە بەجۆرێك بێت کە مرۆڤێکی بی مەیل بەرامبەر بە سیاسەت بەبێ تێکەڵبوونی یان بەشداری راستەوخۆی سیاسی بەدوای قازانجەکانی خۆیدا بچێت بەتایبەتی کاتێك کە تێچوونی بەشداریکردن لە سیاسەت زیاترە لەو سوودەی کە لە بەشداری کردنەوە بەدەستدێت.

هەربۆیە ستوارت میل ناچار بوو بۆ سەلماندنی خوازراوبوونی بەشداری بەسەر چەند بەشێك لە گریمانەکانی سوودگەراییدا باز بدات. بەپێچەوانەی تیۆرەکەی بێنتهام و جێمزمیل لە تیۆرەکەی ستوارت میلدا بەشداری سیاسی وەکو لایەنێك لە ژیانی کۆمەلاّیەتی بەدیار دەکەوێت کە هیچ شتێك ناتوانێت شوێنی بگرێتەوە. ستوارت میل وەکو هیگڵ بەو بڕوایە گەیشت کە مرۆڤ تەنها کاتێك بەشی پێویست پەرۆشی خۆیەتی کە بەهەمان ئاست پەرۆشی خەڵکیش بێت و دووركەوتنەوە لە گۆڕەپانی ژیانی هاوبەش چەندە بۆ کۆمەڵگا زیانبەخشە هێندەیش زیان بەتاك دەگەیەنێت[9]. بۆ گەیشتن بەوەها ئەنجامێك کە ستوارت میل لەرووی چۆنیەتییەوە جیاوازی لە نێوان چێژەکاندا دادەنێت و رایدەگەیەنێت کە ئەو چێژەی کە لە کارێکی بەهادارەوە بەرهەمدێت زیاتر لە چێژی بەرهەمی کارێکی بێ بایەخ خاوەن بەهایە.

8- John Plamenatz, Man and Society, Vol 2, London, New York, Longman, 1992, p. 262.
9- Alan Rayn, op. cit, p. 241.

کاتێك كە دەڵێین لەرووی چێژەوە جۆرێك چێژ بەرزترە لە چێژێکی تر لە راستیدا مەبەستمان ئەوەیە کە هەندێك لە جۆرە چالاکییە خۆشی دروستکەرەکان بەشێوەیەکی زاتی بە بەهاترن لە جۆرەکانی تر. رامانێکی زیاتر لە واتای ئەم بە لەپێشتر دانانە نیشانیدەدات کە لە راستیدا ئێمە بەو شێوەیەی کە پێویستە ئاماژەمان بە هەندێك ئامانجی مرۆیی کردووە. بۆ نموونە کاتێك کە دەڵێین چێژی بەرهەم هاتوو لە کاری دروستکەر زیاترە لە چێژی بەرهەم هاتوو لە کاری تێکدەر، پەنامان بۆ پێوەرێکی دەرەوەی خۆمان بردووە. ستوارت میل بێ ئەوەی خۆی بە ئاگا بێت چووەتە ناو مەیدانێکی جیاواز لە مەبەستی بێنتهام[10]: جۆری چێژ دەگەڕێندرێتەوە بۆ سەرچاوەکەی. چێژە باشترەکان پەیوەستن بە سەرچاوەی خاوەن بەهاترەوە بەرزترین بەهاکانیش ئەوانەن کە باشترین مرۆڤەکان بەدەستیان دێنن. باشترین مرۆڤەکانیش مرۆڤگەلێکن پەیماندار و خاوەن عەقڵ و چالاك[11]. هەروەك تێبینی دەکرێت سوودگەرایی کە دیویست لەلایەنی عەقڵگەرایانەی بیری نوێی قۆناغی کلاسیك (عەقلانیەتی ماف) دوور بکەوێتەوە و لەلایەنە ئەزموونگەراکانیدا نقومببێت و عەقلانیەت بۆ بەها ئامێرییەکەی بچووك بکاتەوە جارێکی تر لە تیۆرەکەی ستوارت میلدا دەگەڕێتەوە بۆ دیارخەری عەقڵگەرایی. لێرەدا ستوارت میل بە پێچەوانەی پێشینانی چاو لە بەرێوەبردن و سەرپەرشتی هەمیشەیی چینی ناوەڕاست دەپۆشێت و قبوولدەکات کە دەبێت مرۆڤ لە گشتی بوونی خۆیدا ببێتە خاوەن چارەنووسی خۆی. لە هەموو هەلومەرجێکدا جیا لەمە ژیان واتای راستەقینەی خۆی لەدەستدەدات. بیری ستوارت میل لە عەقلانیەتی قازانجەوە هەنگاوێك بەرەو عەقلانیەتی عەقڵ دەچێت.

## ئەخلاق وەکو بەرهەمی ژیانی کۆمەڵایەتی

لەگەڵ ئەوەی کە تەواوی بۆچوونی ستوارت میل رووە و تاکە و بڕوای وایە کە لە بنەڕەتدا کاری دەوڵەت بریتییە لە هاوکاریکردنی تاکەکانی تاوەکو ئاسانتر بە ئامانجەکانی خۆیان بگەن، بەڵام ئامانجە باشەکان بە بەرهەمی پێشکەوتنی کۆمەڵگا و شارستانیەتی مرۆڤ لەقەڵەمدەدات. بۆیە دەوڵەت بە واتای کۆمەڵگای رێکیدار کارەکەی زیاترە لەوەی کە تەنها هاوکاری تاکەکان بکات تاوەکو بەوەی کە دەیانەوێت بگەن. کۆمەڵگا تواناکانی تاکەکان بەهێز

١٠- فردریك کاپلستون، پێشوو، ل ٤٧.

11- Alan Rayn, op. cit, p. 243.






دەکات و کەسێتیان دەوڵەمەند دەکات و لە سنووری سروشتی ژیانیان زیاتر بەرەو پێشەوەیان دەبات. کۆمەڵگا ئایدیال و ئامانج بۆ تاکەکان دیاری دەکات. ستوارت میل رایدەگەیەنێت کە ئەخلاق بەرهەمی ژیانی کۆمەڵایەتییە و ژیانی کۆمەڵایەتی هۆشی مرۆڤەکان دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە و رۆڵێکی گەورەی هەیە لە چاکسازی و ئاراستە وەرگرتنیاندا. ئەم تێڕوانینە بە تەواوی لە تێڕوانینەکەی جێمزمیل کە سنووری زیادەڕۆیی سوودگەرایی دیاریدەکات جیاوازە. لە تیۆرەکەی جێمزمیلدا ئەخلاق بەرهەمی ترسانە لە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە بە ئەزموون لە ئەنجامی کاردانەوەی نالەباری خەڵکی لە ئێمەدا دروستبووە. بەڵام بە بۆچوونی ستوارت میل ئەخلاق هەستێکی ئاوێتە و ئاڵۆزە کە لە هەست و سۆزی هاوخەمی و خۆشەویستی و ترس و مەزنی خود و بیر و باوەڕە ئاینییەکانەوە پێکهاتووە. ئەخلاق بەرهەمی ژیانە لە پاڵ خەڵکی نەك تەنها تێرکردنی پێداویستییە ماددییەکان و هیچی تر.

لە نووسینەکانی میلەوە وەها هەستپێدەکرێت کە بڕوای وایە حەقیقەتێکی بەرچاو و شیاوی هەست پێکردن و بژاندن لە بەهادارییەکاندا هەیە، بەڵام پەی بردن بەم حەقیقەتە بەرچاوە پێویستی بە ئازادی و بە تایبەتی ئازادی باس و رەخنەگرتن هەیە لە کۆمەڵگادا. تەنها لە وەها کۆمەڵگایەکدا حەقیقەتی بەرچاو بەدەستدێت[12]. ئەم بەشە لە روانگەی ستوارت میلیشدا زۆر نزیکە لە روانگەی رۆسۆ و هیگڵ و ئەو کەسانەی کە لە بەشی پاشتردا باسیان لێوەدەکەین. دەکرێت بڵێین ستوارت میل لەم روانگەیەوە زیاتر لە کۆمەڵگاگەراکان نزیکترە تا تاکگەراکان. تیۆرەکەی ستوارت میل کە لەلایەکەوە لە کۆمەڵگاگەراکان نزیکە بەڵام لە پێش گریمانەکاندا پشتی بە بنەڕەتەکانی سوودگەرایی بەستووەو دژ یەکێك لە تێڕوانینی ئەودا دەخاتەروو[13]. سەبارەت بە فەزیلەت دەڵێت کە ئەم چۆنیەتییە ئامرازی گیشتنە بە خۆشی و خۆشبەختی و لە هەنگاوی یەکەمدا وەها مەبەستێکە کە بە خوازراو دێتە پێش چاو. بەڵام هەندێ کات مرۆڤ فەزیلەتی لەبەرخودی فەیلەت دەوێت نەك بۆ گەیشتن بە خۆشی و چێژێکی تر. لەوەها حالەتێکدا فەزیلەت بۆخۆی بەشێکە لە خۆشی و خۆشبەختی و لەم رووەوە فەزیلەت لێرەدا ئامانجە نەك ئامراز[14]. ستوارت میل دەیەوێت بەم دەربڕینە فەزیلەت لەگەڵ گریمانەکانی سوودگەرایی بگونجێنێت، بەڵام لە چوارچێوەی تەسکی سوودگەرایی زیاتر بەرەو

١٢- ایزیابرلین، چهار مقاله درباره ازادی، پێشوو.

13- Rebert Wolff, The Poverty of Liberalism, Boston, Beacon Press, 1968, p. 50.

14- John Plamenatz, Ibid, p. 262.

پێشەوەی دەبات و دەڵێت مرۆڤی کۆمەڵایەتی فەزیلەتی لەبەرخودی فەزیلەت دەوێت. بەپێی بۆچوونی ستوارت میل مرۆڤ نەك تەنها خوازیاری دادپەروەرییە بەڵکو بەهەمانشێوە خوازیاری دادپەروەر بوونیشە. هیۆم دادپەروەریی بە فەزیلەتێکی ساختە ناوبردبوو و روونی کردبووەوە کە چۆن مرۆڤ فێر دەبێت بەهاو ئەرزشی بۆ دابنێت. هەروەك ئاماژەی پێکرا بە بڕوای هیۆم ئەو ئەزموونەی کە مرۆڤ لەرەوتی ژیانەوە بەدەستیدێنێت فێریدەکات کە هەبوونی ڕێساگەلێك بۆ کردار بە قازانجی ئەو و هەمووانە. قبوولکردنی وەها ڕێساگەلێك سوودبەخشە بۆ ژیان. خەڵکی بە ئەزموون تێدەگەن کە ئەم ڕێسایانە خوازراون، بۆیە پێشێلکردنیان بە کارێکی ناشیرین دادەنێن و ڕەچاوکردنیان بە کارێکی پەسەندکراو لەقەڵەمدەدەن. بەم شێوەیە ئەوان بڕوا بە خوازراوبوونی دادپەروەری دەهێنن و قبوولیدەکەن. خوازراوبوونی دادپەروەری بەو واتایەی کە هیۆم باسی لێوەدەکات واتە ئەوەی کە خوازیاری ئەوەین کە خەڵکی ملکەچی لێبکەن. بەڵام ستوارت میل کاتێك کە دەڵێت دادپەروەری لەبەرخودی دادپەروەری خوازراوە (مرۆڤ نەك تەنها دادپەروەری بەڵکو خوازیاری دادپەروەر بوونیشە) لە بەڵگەهێنانەوەکەی هیۆم زیاتر هەنگاوی ناوە. ئەوەی کە ئەو دەیڵێت زیاتر لەو حوکمەی کە دەڵێت مرۆڤ لە کۆمەڵگادا فێردەبێت کە هەندێك لە کردارەکان پەسەند بکات و هەندێکی تر ڕەتبکاتەوە. ستوارت میل دەڵێت مرۆڤەکان لە کۆمەڵگادا فێردەبن کە نەك تەنها بیر لەوەی کە ئەنجامیدەدەن بەڵکو بیر لە بوونیشیان بکەنەوە.

## ڕێزداری وەکو مەبەستی ژیان

ستوارت میل بە هێنانە پێشی بنەڕەتی چۆنیەتی لە هەڵسەنگاندنی چێژو خۆشی[15] وەرچەرخانێکی چۆنیی لە تیۆری سوودگەراییدا دروستکرد، هەرچەندە کە بەم کارە زۆرێك لە پێگەکانی سوودگەرایی دامەزراند. بەخستنەرووی تیۆرگەلێکی نوێ دەربارەی ئەخلاق و مەبەستی دەوڵەت رووی کردە ئەو بنەڕەتەی کە شەرەف و ڕێزداری مرۆڤ مەبەستی ژیانە نەك سوودمەندی. ئازادییش پێگەیەکە بۆ هەوڵدان لەپێناو بەرزبوونەوەی نەفس و خۆ پەروەردەکردن. ئامانجی خۆ پەروەردەکردن و وەدیهێنانی نەفس نەیاندەتوانی شوێنێکی شیاویان هەبێت لە تیۆری

15- Stuart Mill. Op. cit, ch 2.



ئەخلاقی بێنتهام و جێمزمیلدا. لە تیۆرەکەی ئەواندا ئامانج و مەبەستی مرۆڤ بریتییە لە بەدواداگەڕانی چێژ و دووركەوتنەوە لە ئازار نەك وەدیهێنان و بەرزکردنەوەی نەفس.

ستوارت میل بە هێنانە ناوی وەها چۆنیەتیگەلێك بۆ نێو تیۆری ئەخلاقەکەی خۆی بەتەواوی پێوەرەکانی سوودگەرایی سەرەو ژێر کرد. بەوەها روانگەیەك دەوڵەت لە دامەزراوەیەك بۆ دابینکردنی زۆرترین قازانج بۆ زۆرترین ژمارە دەگۆڕێت بۆ دامەزراوەیەك بە مەبەستگەلێکی ئەخلاقییەوە. بەوەها تێگەیشتنێك ئامانجی دەوڵەت لە بنەڕەتی دابینکردنی سوودمەندیی گشتییەوە دەگۆڕێت بۆ بنەڕەتی پەروەردەکردنی فەزیلەت لە تاکدا[16]. تا ئەو جێیەی بەرەوپێش دەچێت کە دەڵێت ناکرێت بەشێوەیەکی لۆژیکی ئەرکی گشتی لە ماف و قازانجی تایبەتییەوە هەڵبهێنجرێت. ناکرێت بەپێی بنەڕەتی سوودمەندی هەستی پەیمانداریی ئەخلاقی دیاریبکرێت.

ئازادی کە بۆ دامەزرێنەرانی تێڕوانینی سوودگەرایی ئامرازە نەك ئامانج و شوێنکەوتووی بنەڕەتی سوودمەندییە نەك مەبەستێکی سەربەخۆ، بۆ ستوارت میل پرسێکی بنەڕەتییە و دەگۆڕێت بۆ مەبەستێك. ئەو کە بڕوای وایە عەقڵی مرۆڤ دەتوانێت کۆمەڵگا بگۆڕێت، جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکاتەوە کە باسی ئازاد دەتوانێت بیری مرۆڤ بکاتەوە و پڕ بەرهەمی بکات. لە هەلومەرجی باسی ئازاد و هەمەلایەنەدا بیرێك توانای مانەوەی دەبێت کە سەبارەت بە بیرەکانی تر بەهایەکی زیاتری هەیە. کاتێك کە ستوارت میل تا ئەو جێیە بەرەو پێشەوە دەچێت کە دەوڵەت بە بەرهەمی ویست دەزانێت نەك قازانج، توندتر لە هەموو لایەنەکانی تر هەڕەشەی تێکشکاندن لە چوارچێوەکانی سوودگەرایی دەکات بەتایبەتی کە بانگەشەی ئەوە دەکات ئەگەر ویست و کەسێتی لە تیۆری دەوڵەت وەدەربێنین تیۆری میکانیستی دەوڵەت دەبێتە شتێکی کەم و کورت و ناتەواو.

هەروەها ستوارت میل یەکێکە لە بیرمەندە پاشترەکانی سوودگەرایی و مێژوو دێنێتە ناو سنووری باسەوە و لە گۆشەیەکی ترەوە لە لقی عەقڵگەرایانەی نێو فەلسەفەی سیاسی و پێگەی هیگڵ و ڕۆسۆ نزیکدەبێتەوە. بێنتهام مێژووی لە باسەکەی خۆی وەلاوە ناو دەیوت کە دیکترینەکەی ئەو داماڵراوە لە کات و خاوەن کۆنتەینێکی گشتییە. ستوارت میل رەخنە لەو تێڕوانینە دەگرێت و دەڵێت گریمانەی ئابووریی کلاسیك ئێستا لە رابردوو دەپچڕێنێت. کاتێك

16- C. L. Wayper, op. cit, p. 112.





که چوارچێوەی مرۆڤ بریتییە لە گەردی نایەکسانیی کەڵەکەبووی ماوەی مێژوو ئیدی چۆن دەکرێت بوترێت مرۆڤەکان بە هەلومەرجی یەکسانەوە دەچنە نێو رکەبەری؟ لەم چوارچێوەیەدا زەوی و پیشەسازی و زانست دەکەونەوە دەست کەمینەیەکەوە و رکەبەری رکەبەریەکی تەواو نییە. هەربۆیە ستوارت میل کەمتر لە بێنتهام و جێمزمیل لایەنگری لە مولکداری دەکات.

## کەم و کورتییەکانی تیۆری ستوارت میل

ستوارت میل چاکسازیگەلێکی زۆری لە تێڕوانینی سوودگەرایی سەبارەت بە دەوڵەت و ئەخلاق کرد، بەلام نەك تەنها ئەم چاکسازییانەی بەقیمەتی تێکدانی گونجانی تیۆری سوودگەرایی بەڵکو بە قیمەتی ناکۆکی ناوەکیی تیۆرەکەی خۆیشی بەئەنجامگەیاند، بەبێ ئەوەی بتوانێت بەم هەمووە وەڵامێکی رازیکەر بۆ بابەتی ناوەڕۆك و مەبەستی دەوڵەت بدۆزێتەوە. ئەو رەگەزە نوێیانەی کە ئەو هێنایە ناو تێڕوانینی سوودگەراییەوە تیۆرەکەی ئەوی دەربارەی ناوەڕۆك و رۆڵی دەوڵەت و ئازادی و بەرزبوونەوەی تاك تووشی ناکۆکییەکی زۆرکرد[١٧]. ئاماژەکردن بە هەموو ئەو ناکۆکییانە بۆ خۆی باسێکی درێژە و زۆر لەگەڵ بابەتی ئەم کتێبەدا ناگونجێت. ئێمە بە ئاماژەکردن بە بەشێکی ئەو ناکۆکییانە کە پەیوەندییەکی راستەوخۆیان هەیە بە باسەکەی ئێمەوە باسەکە کورت دەکەینەوە.

ئەم باسە بە ئاماژەکردن بە بنەماکانی گریمانەکەی ستوارت میل دەستپێدەکەین. پێناسەی ستوارت میل بۆ قازانجی گشتی یەکێك لە ناکۆکییەکانی تیۆری ناوبراو لە گرنگترین بەشی تیۆری دەوڵەتی ئەودا ئاشکرا دەکات. ستوارت میل دەڵێت تەنها بەڵگەی بۆ ئەو بانگەشەیەی کە شتێك خوازراوە ئەوەیە کە خەڵکی دەیانەوێت. بۆ ئەوەی بڵێین خۆشبەختیی گشتی خوازراوە هێندە بەسە بڵێین کە هەموو کەسێك خوازیاری خۆشی خۆیەتی. لەوێوەی کە خۆشی هەر کەسێك باشە بۆ ئەو کەسە دەکرێت بڵێین کە خۆشی گشتیش باشە بۆ هەمووان. بە بۆچوونی ئێمە و هەروەك رەخنەگران ئاماژەیان پێکردووە ئەم بەڵگەهێنانەوەیە سەفسەتەیە. سەفسەتەیە ئەگەر بڵێین لەبەرئەوەی کە خۆشی هەموو کەسێك خوازراوە بۆیە خۆشی گشتیش خوازراوە. هەرشتێك کە خۆشبەختی تاکەکان زیاد بکات خۆشبەختی گشتیش زیاد دەکات، بەلام پێچەوانەی ئەم کێشە دروست نییە، واتە دیار نییە هەر شتێك کە خۆشی گشتی زیاد دەکات

17- C. L. Way per, op. cit, p. 125.





خۆشییەك بە یەکی تاکەکانیش زیاد بکات[١٨]. بەڵگەهێنانەوەکەی ستوارت میلیش سەبارەت بەوەی کە دەبێت هەموو کەسێك خۆشی هەمووان بۆ خۆشی خۆی داوا بکات هیچ پاڵپشتییەکی لۆژیکیی نییە. جگە لەمە ئەگەر مرۆڤ تەنها خوازیاری خۆشی بێت (کە تەنها کاری باشە) کەواتە هەرچییەك کە مرۆڤ بیەوێت باشە. بە قبوولکردنی وەها حوکمێك باشبوون واتای خۆی لە دەستدەدات، چونکە ئەگەر کردارێك نەتوانێت خراپ بێت بەدڵنیاییەوە ناتوانێت باشیش بێت. باش و خراپ لە بەرامبەریەکدا هەڵدەسەنگێندرێن.

دیکترینەکەی ستوارت میل دەربارەی جیاکردنەوەی خۆشییەکان لە رووی چۆنیەتییەوە لەگەڵ بەرگریکردن لە بنەڕەتی یەکسانیی مافەکان یەك ناگرێتەوە. ئەگەر بۆچوونەکەی ستوارت میل کە بەپێچەوانەی بێنتهام و جێمزمیل لە رووی چۆنیەتییەوە جیاوازی لە نێوان خۆشییەکان دادەنێت قبوولبکەین بەوێ دەگەین کە خۆشیی ئەوانەی کە توانا و لێهاتوویی بەرزتریان هەیە بەهادارترە لەوانەی کە تەنها خۆشییەکی نزم و نابڵندیان هەیە. و ئەگەر ئەمە قبوولبکەین ئیدی ناتوانین پاسا و بۆ یەکسانی مافی تاکەکان بهێنینەوە.

بۆچوونی ستوارت میل دەربارەی ئازادیش لەگەڵ تەواوی بەشەکانی تیۆرەکەیدا ناکۆکە. ستوارت میل دەڵێت: ئەوەی کە مرۆڤ چی دەکات هێندەی ئەوە گرنگە کە بڵێین مرۆڤ چییە. بە واتایەکی تر ئەوەی کە مرۆڤ ئازاد بێت هێندەی ئەوەی کە مرۆڤ لە چ هەوێنێکە جێی گرنگییە. ستوارت میل جەخت لەسەر ئەو دووە دەکاتەوە و هەروەها ئەوەیشی کە ئازادی نەبوونی سنووردارییە. ئێستا ئەم پرسیارە دێتەئاراوە کە چۆن دەکرێت دوو مەبەست بەیەکەوە بگونجێندرێن؟ چۆن دەکرێت کە مرۆڤ تا ئەو جێیەی کە دەکرێت ئازاد بێت و لە هەمان کاتدا بەدوور بێت لە بەد سروشتی؟ ناتوانین بە سیستەمی هزریی سوودگەرایی رێگەچارەیەك بۆ ئەم ئاستەنگە بدۆزینەوە. میل دەڵێت تەنها مەبەستێك کە دەکرێت بۆ ئەو لە کۆمەڵگای شارستانیدا سوود لە هێز وەربگیردرێت لە دژی ویستی کەسێك ئەوەیە کە ئەو کەسە لە زیان گەیاندن بە خەڵکی دووربخرێتەوە و رێگەی لێبگرێت. بەم شێوەیە ستوارت میل سنووری کۆنترۆڵی کۆمەلایەتی لەسەربنەمای پێناسەی چوارچێوەی تایبەتی واتە ئەو چوارچێوەیەی کە دەبێت تیایدا پارێزگاری لە تاك بکرێت لە بەرامبەر سنووربەزاندنەکانی خەڵکیدا دیاریدەکات. ئەم بنەڕەتە زۆر مشتو مڕ هەڵگرە. لەوانە ئەم پرسە دێتە ئاراوە کە چۆن دەبێت جیاوازی لە

18- John Rees and Jack Leevely (eds), Utilitarian Logic and Politics, Oxford, Clarendon Press 1978, pp. 99-129.

نێوان کرداری ڕووەو خودی تاك و کرداری ڕووەو خەڵکی دابنێین. ئەگەر هێڵـی جیاکـەرەوە لـە نێوان ئەو کردەوانەی کە کاردەکەنە سەر بکەری کردارەکە و ئەو کردارانەی کە کاردەکەنە سـەر خەڵکی دیاری بکـەین هـیچ هاوکارییـەکی دیـاریکردنی سـنووری کـۆنترۆڵی کۆمەڵایـەتیمان نەکردووە. هیچ کردار یـان کۆمەڵـە کردارێـك نییـە کـە تـەنها کاریگاتـە سـەر بکەرەکـەی. دیاریکردنی سنووری چێوارچێوەی تایبەتی و چوارچێوەی گشتیی ژیـان کـارێکی دژوارە. هـەر کارێك کە تاك ئەنجامیدەدات ڕەنگە بەجۆرێك کاریگاتە سەرباری خەڵکی. لایەنە تاکەکەسـی و کۆمەڵایەتییەکانی ژیان وەها تێکەڵ بە یەکترن کە جیاکردنـەوەیان لـە یەکـدی کـارێکی لـەواو نییە[19].

## ئازادی و دیموکراسی

چەمکی ئازادی بەو جۆرەی کە ستوارت میل (و تەواوی لایـەنگرانی سـوودگەرایی) باسـی لێوە دەکەن زیاتر چاوی بڕیوەتە چوارچێوەی چاودێری و کۆنترۆڵ تا سەرچاوەکەی. پەیوەندییەکی پێویست لـە نێـوان ئـازادی تاکەکەسـی و حکوومـەتی دیموکراسـیدا بـوونی نییـە، لـە ڕووی لۆژیکییەوە ئەوەی کە دەوڵەت تاکوێ دەست لە ژیانی تـاك وەردەدات جیـاوازە لـەوەی کـە چ کەسێك حکوومەتی بەسەردا دەکات.

بە هەمان ئەو شێوەیەی کە دیموکراسی دەتوانێـت هاووڵاتیـان لـەو ئازادییـە زۆرانـەی کـە هاووڵاتیانی کۆمەڵگاکانی تر هەیانـە بـێ بـەش بکـات ڕەنگـە دیکتـاتۆرێکی بـیر ئـازادیش سنوورێکی بەرفراوانی ئازادی بۆ هاووڵاتیـان لەبەرچـاو بگرێـت (وەکـو پـرۆس لـە سـەردەمی فردریکی گەورە یاخود نەمسا لە سەردەمی جـۆزێفی دووەم)[20]. ئـازادی لـەم واتایـەدا هـیچ پەیوەندییەکی نییە لەگەڵ دیموکراسیدا. وێڕای ئەوەی کە ئاشنایە بـە هێـز و توانـای مێـژوو و ڕۆڵی کۆمـەڵگا، بـەڵام هێـشتاش هەڵـسەنگاندنێکی دروسـتی نییـە بـۆ ڕۆڵـی دروسـتکەری کۆمەڵگا. لەلایەکەوە جەخت لەسەر ڕۆڵی کۆمەڵگا دەکاتەوە[21] و لەلایەکی ترەوە بەرگری لـە سەربەخۆیی تاك دەکات. بێ ئەوەی بتوانێت ئەم دووە لە یەك سیستەمی تیۆریی هەماهەنگـدا

١٩- ایزیابرلین، ((جان استوارت و غایات حیات))، چهار مقاله دربـاره ازادی، ترجمـه محمـد موحـد، تهـران، خوارزمی، ١٣٦٨، ل ٣٢٨.

٢٠- مایکل ساندل، پێشوو، ل ٣٥- ٣٦.

21- Robert Wolff, op. cit, p. 36.






تێکەڵ بەیەك بکات. ستوارت میل لە بەشێکی تیۆرەکەی خۆیدا دەڵێـت کۆمـەڵ و کۆمـەڵگا ڕێگە لە تاك دەگرن لە خراپ بەکارهێنانی مافی دەنگدانی خـۆی و بـەکارهێنانی بـۆ قازانجـە خۆپەرستانەکانی. واتای ئەم وتەیە ئەوەیە کە لە ڕاستیدا کۆمەڵگا باشترە لەو تاکانەی کە ئەو کۆمەڵگایە دروستدەکەن. چۆن دەکرێت ئەو هەمووە باس لـە خـود ڕێـسایی تـاك بکرێـت لـە کاتێکدا کە دەوترێت تاك ئەوکاتەی کە خود ڕێسایی خۆی لەدەستدەدات دەتوانێت باش بێت؟.

هەروەك پاشتر دێینە سەری ڕوونکردنەوەی وەها پەیوەندیگەلێك لەنێوان تاك و کۆمەڵگا لە فەلسەفەی هیگڵ و ڕۆسۆدا دێتەدی. لە فەلسەفەی هیگڵدا مرۆڤ وەکـو ئەنـدامی کۆمـەڵگا و وەکو بوونەوەرێك کە لە پەیوەندیگەلێکی دیاریکراودا لەگەڵ مرۆڤەکانی تر ژیان بەسەر دەبـات و دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی خاوەن ئامانج و بوونەوەرێکی ئـەخلاقی، وەکـو کەسـێکی خـاوەن قازانج و خاوەن ئایدیالگەلێکی پایەدار وێنایەك بۆخۆی دەدۆزێتەوە. نـەك بـەهۆی ئـەوەی کـە هەڵگری یەك لەدوای یەکی زنجیرەیـەك خواسـتگەلی بەرێکەوتـە، بـەڵکو بـەهۆی ئـەوەی کـە کەسێتییەکی ئەخلاقی و خاوەن ژیانێکی کامڵ و گونجاو لەگەڵ پێـوەرە دیارەکانـە هەسـت بـە پێویست بوونی ئازادی دەکات. تاك لەناو کۆمـەڵگادا کـە بۆخـۆی سیـستەمێکی ئەخلاقییـە دەگۆڕێت بۆ کەسێتییەکی ئەخلاقی. لەو ڕووەوەی کە کەسێتییەکی ئەخلاقییە ئازادی بـۆ ئـەو بە خاوەن بەها لەقەڵەمدەدرێت. بەم شێوەیە تاك لەناو دەوڵەت وەکو سیستەمێکی ئـەخلاقی و بەپێی دیسپلینی نەریت و یاساکان دەگۆڕێت بۆ تاکی ئەخلاقی.

## بە کورتی

بـیری سـتوارت میـل بـە خـاڵێکی وەرچـەرخان دادەنرێـت لـە سـوودگەراییدا کـە وێـڕای چاکسازکردنی بابەتە ناوەکییەکانی ئەم تێڕوانینە پێشوەخت سەبارەت بە تێڕوانین بۆ دەوڵـەت و بەشداری گونجانی ناوەکیی ئەوی لەکەدار کرد. بێنتهام و جێمزمیل سـەرەکیترین بـەهایان بـە خۆشبەختی و ڕۆڵی دەوڵـەتیان بـەدابینکردنی زۆرتـرین خۆشـبەختی بـۆ زۆرتـرین ژمـارە لـە قەڵەمدا. بەڕای ئەوان بەشـداری سیاسـی تـەنها یـەکێك بـوو لـە ڕێگـە سوودبەخـشەکان بـۆ دابینکردنی خۆشبەختی، نەك لەمە زیاتر. ئەگەر ڕێگەیەکی تر بـۆ دابینکردنـی خۆشـبەختیی زۆرترین ژمارەی خەڵکی هەبێت لۆژیکییـە کـە دەکرێـت چاوپۆشـی لـە دیموکراسـی بکرێـت. ستوارت میـل بـە بیـانووی وازلێهێنـانی گونجـانی نـاوەوەی تێڕوانینـی سـوودگەرایی تیـۆری ((دیموکراسی بازاڕی))ی وازلێهێناو حکوومەتی دامـەزراو لەسـەر دیموکراسـیی نـەك هـەر بـە

گرێنتیەك بۆ کارکردنی خوازراوی بازاڕی ئازادی بەڵکو بـە ئامادەسـازییەك بـۆ بەرزکردنـەوەی چۆنیەتی ژیانی هاووڵاتیان و دەوڵەمەندکردنی ژیانی کۆمەڵایەتیان لە قەڵەمدا. ستوارت میـل بە جیاکاری نێوان خۆشـییە چـەندییەکان و خۆشـییە چـۆنییەکان کەوتـە روونکردنـەوەی ئـەو بابەتەی کە رۆڵی دەوڵەت بریتی نییە لە کۆکردنەوەی خۆشبەختییەکانی تاکەکان بەڵکو بریتیـە لە باشکردنی بەردەوامی چۆنیەتی ژیانیان لـە رێگـەی دابینکردنـی هەلومـەرجی بەشـداری و پەروەردە و فێرکردن.

ستوارت میل بە پێچەوانەی باوکی (جێمزمیل) ئازادیی بە واتا نێگەتیڤەکـەی واتـە لابردنـی ئاستەنگەکانی رێگەی ئازادیی تاکەکان لە پێناو کارئاسانی بۆ گەڕان بەدوای خۆشبەختی کەسیدا لێکنەدایەوە، بەڵکو بە کارێکی پێویستی دەزانی بۆ وەدیهاتنی کاری بەرزبوونەوەی تاك.

بە بۆچوونی ستوارت میل دیموکراسی لە هەنگاوی یەکەمدا لەبەرئـەوە فـۆرمی عـەقلانیی دەوڵەت نییە کە قازانجی خۆپەرستانەی تاکەکان هەماهەنگ دەکات، بەڵکو لەو رووەوە خـاوەن عەقلانیەتە کە خوو رەوشتی ئەو مرۆڤانەی کە تیایدا ژیان بەسەر دەبەن باشدەکات. دیموکراسی خەڵکی بە بەرپرس تر و بزواوتر و خاوەن و رەیەکی گرووپیی زۆرتر رابهێنێت. ئـەو خەڵکانـەی کە خۆیان حکوومەتی خۆیـان ناکـەن بـەڵکو خـەڵکی حکوومـەتیان بەسـەردادەکەن لـە رووی عەقلانی و ئەخلاقییەوە بەرەو لەناوچوون دەچن.

ستوارت میل وەها خوازیار و شیفتەی دیموکراسییە کە رەچاوی گونجانی ناوەوەی تیۆرانینـی سوودگەرایی و دوورکەوتنەوە لە بنەماکانی تیۆرەکانی خۆی ناکـات. لەگـەڵ ئـەوەی کـە لـەم بنەڕەتـەوە دەسـتپێدەکات کـە خۆشـبەختی هـەموو کەسـێك باشـە بـۆ ئـەو کەسـە دەگاتـە خوازراوبوونی دادپەروەری و ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆڵی کۆمـەڵگا لـە ئـازادی و عەقڵـدا و بـۆ گەیـشتن بـەم بابەتانـە بنـەڕەتی سـوودمەندی وەکـو بەرژەوەنـدی هەمیـشەیی مـرۆڤ وەکـو بوونەوەرێکی پێـشکەوتنخواز دەناسـێنێت. ئـەو بەپێـچەوانەی پێـشینانی پێـشکەوتن وەکـو کۆمەڵگا خوازی تاك لە دنیای پیشەسازی و گۆڕانی مرۆڤ بە تاکێکی خاوەن عەقلانیی ئامێری تەماشا ناکات، بەڵکو پێشکەوتن بە پەروەردەکردن مرۆڤگـەلێك بـە کەسـێتی دەوڵەمەنـد و هەمەلایەنە لەقەڵەمدەدا.

بەلاّم هەرچی وەها ئامانجگەلێك بە خوازراوتر رابگەیەنین بە هەمان ئەندازە زیاتر لـە پـێش گریمانەکانی سوودگەراییەوە دوورکەوتوینەتەوە. لە راستیدا ستوارت میل بە قبوولکردنی دیـار خەریکی چۆنیی بـۆ چـێژەکان پـەنای بـۆ پێـوەرێکی دەرەکـی بـردووە بـۆ هەڵـسەنگاندنیان.





قبووڵکردنی بەهای چۆنی بۆ چێژەکان بە لەبەرچاوگرتنی پلەوپایـەی مـرۆڤ واتـا وەردەگرێـت و ئەمە واتە گەڕانەوە بۆ سەرچاوەیەکی دەرەکیی بۆ چێژ. بەهەمانشێوە جیاکاریی چـۆنیی نێـوان چێژەکان لە بەشێکی تری بنەما تیۆرییەکانی ستوارت میل لەگەڵ بنـەڕەتی یەکـسانیی مـافی تاکەکان یەك ناگرێتەوە. لەگەڵ ئەوەی ستوارت میل لەسەر بەهای ژیانی کۆمەڵایەتی و رۆڵـی هێزە مێژووییەکان لە کەسێتی تاك راوەستاوە، هێشتا هەڵسەنگاندنێکی دروستی نییە بۆ رۆڵی کۆمەڵگا. روونکردنـەوەی پەیوەندییـەکانی تـاك و کۆمـەڵگا لەگـەڵ بنـەما نۆمینالیـستی و تاکگەرایی و چـێژگەرایانەکانی سـوودگەرایی ناگونجێـت. دیـاریکردنی ئـەم پەیوەندییانـە بـە تیۆرانینی کۆمەڵگاگەرایانەی هیگڵ و رۆسۆ دێتەدی. لە تیۆرەکەی ئەم بیرمەندانەدا تاك لەناو کۆمەڵگادا کە بۆخۆی سیستەمێکی ئەخلاقی و عەقلانییە دەگۆڕێت بۆ کەسێتییەکی عەقلانی و ئەخلاقی و ئازادیش لەم پێوەندییەدا دەگۆڕێت بە بەها بۆ ئەو.

# بەشی سێیەم

# عەقلانیەتی ویستی عەقلانی

**کۆمەڵگا لەو فۆرمەی ئێستایدا قووڵترین برینەکانی لەسەر جەستەی مرۆڤ دروستکردووە و ئەوە کۆمەڵگایە کە دەبێت ئەم برینانە تیمار بکات. ئێستا ئەو بەرپرسیارێتییە لە ئەستۆی سیاسەتدایە کە کۆمەڵگایەکی نوێ لەسەربنەمای عەقڵی بە کۆمەڵ بوونیادبنێت.**

ڕۆسۆ

بۆ چوونی سوودگەرایی تێڕوانینی هۆبز و لۆك کە لەسەربنەمای لەپێشتربوونی ماف لە دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی بوو، لە کۆتاییدا بە عەقلانیەتی دەسەلات لە ڕێکخراوی دەوڵەتدا بەکۆتا دەگەیشت و لەبری ئەورۆی دەکردە لەپێشتر بوونی قازانج لە دروستبوون و فۆرم وەرگرتنی دەوڵەتدا. تێڕوانینی بیرمەندانی سوودگەرایی سەبارەت بە دەوڵەت کە ئێمە بە عەقلانیەتی ئازادی و عەقلانیەتی قازانج باسمان لێوەکرد ڕووە و ئەو واتایە بوو کە ڕەگەزی عەقڵگەرایانەی بیری هۆبزی بە تەواوی لێ دووربخاتەوە و لایەنی قازانجگەرایانەی ئەوی کردە بناغەی تیۆری دەوڵەت. بیرمەندانی سوودگەرایی بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە دەیانەوێت دەوڵەت وەکو دامەزراوەیەك ((ئەفسانە داماڵێ)) بکەن و بیگەڕێننەوە بۆ شوێنی ڕاستەقینەی خۆی کە ڕۆڵێکی دیکەی جیا لە پێشگیری کردنی تاکەکان لە کەوتنە بەرامبەر و سەرڕێی





یەکتری نییە. ئەوان ئازادیان بەواتای ئازادبوون لە بەدواداگەڕانی زنجیرەیەك خواستگەلی بەرێکەوت و جیا لە هەلومەرجی بینراو و بەها کۆمەلایەتییەکان لێکدایەوە[1].

لە بەرامبەر تێڕوانینی سوودگەراییدا سیستەمێکی هزریی نوێ گەشەیکرد کە بە سەرەکی کردنی لایەنی عەقلانیی بیری هۆبز و دورخستنەوەی لایەنی دەسەلاتخوازانەی دەوڵەتی بە بەرهەمی درەوشانەوەی عەقڵ و ئازادی ئەخلاقی و ویستی عەقلانی لەقەڵەمدەدا و بەڵگەی دەهێنایەوە کە تاك تەنها لەناو کۆمەڵگا و دەوڵەت ئەویش دەوڵەت لەڕووی کامڵ و عەقلانیەکەیدا کە بەرهەمی ویستی مرۆڤە بە ئازادی و هۆشیاری ئازادی دەگات. لەم تێڕوانینەدا دەوڵەت وەکو ئەو ئامێر و کەرەستەیە نییە کە بۆ خزمەتکردنی ئامانجێکی دیاریکراو دروستکراوە، بەڵکو وەکو ئۆرگانیزمێك شیکراوەتەوە کە بەرهەمی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسی مرۆڤ و ڕەنگدانەوەی خود ڕێسایی ئەخلاقیی ئەوە.

لەم تێڕوانینەدا ئازادی ئەخلاقی واتە ئازادی بەو شێوەیەی کە لە کۆمەڵگادا بەدەستدێت و لەپێشترە لە ئازادی سروشتی. هەروەها لەم تێڕوانینەدا دەوترێت کە ئازادی تاك و دەسەلاتی حکومەت لە بەرامبەر یەك ڕاناوەستن. لە چوارچێوەی ئەم ڕوانگەیەدا بوو کە هیگڵ تایبەتمەندی دەوڵەتی عەقلانیی دیاریکرد.

1- Ernest Cassirer, op. cit, p. 145.

## پاژی حەوتەم:

# عەقلانیەتی ویستی عەقلانی
# مرۆڤی کۆمەلأیەتی و مرۆڤی سروشتی

ئەو مۆدیلەی روونکردنەوە کە هەولیدا لە بری دامەزراندن لەسەر ماف (مافی سروشتی) عەقلانیەتی دەولەت لەسەر قازانج و باشە دابمەزرێنێت بە نۆرەی خۆی لە روونکردنەوەی ناوەڕۆکی دەولەتدا تووشی ناهاوسازییەکی گرنگ هات. ئەم مۆدیلەی روونکردنەوە کە لە بەرامبەر روونکردنەوەی دامەزراو لەسەر ماف و مافی سروشتی بەناوی رووبەڕووبوونەوەی میتافیزیك هاتبووە گۆڕەپانەکەوە بۆخۆی تووشی داوی میتافیزیکی ((دەستی نەبینراو)) هات. روونکردنەوەی سوودگەرایانە کە لە قازنج و باشەی تاکەوە دەستیپێکردبوو بەبێ پەنابردن بۆ ((دەستی نەبینراو)) نەیدەتوانی بگاتە قازانجی هاوبەش. بۆیە ناچار بوو کە ئەم رایە بخاتەڕوو کە گەرچی لە کۆمەلگادا هەموو کەسێك تەنها بەدوای قازانجی خۆیدا دەچێت، بەلأم لە کۆتاییدا ((دەستی نەبینراو))ی ململانێ و بازاڕ قازانجە تایبەتییە ناکۆك و دژبەیەکەکان لەگەلّ یەکتردا ((هەماهەنگ)) دەکات و خۆشبەختی گشتی بەدیاری دەهێنێت. تەنها هێزێك کە دەتوانێت مرۆڤەکان بە یەکەوە ببەستێتەوە و بیانخاتە ناو پەیوەندییەوە لەگەلّ یەکتر بریتییە لە قازانجی تایبەتی خۆیان و ((باشە))ی کەسیی ئەوان. هەرکەسێك کە خەلّکی فەرامۆشدەکات و تەنها دەڕوانێتە خۆی لەبەر ئەمە ئەم خۆپەسەندانە بەپێی هەماهەنگییەکی دیاریکراو کار بە سوودی بەرامبەر دەکەن. کۆمەلگای مەدەنی کە بەم شێوەیە دروستدەبێت تەنها ((رێگەیەك))ە کە پێشکەوتن و شارستانیەت دابیندەکات.

رۆسۆ لەو کەسانەیە کە رەخنەی لەم تێڕوانینە گرت و رەوتێکی نوێی بیری سیاسیی دامەزراند. رۆسۆ لە رەخنەی تێگەیشتنی سوودگەرایی بۆ کۆمەلگای مەدەنی دەلێت شاکاری سیاسیی سەدەی ئێمە ئەوەیە کە دەلێت زانست و هونەر و بازرگانی و هەموو ئەو پەیوەندییانەی





کە کۆمەلگا بەیەکەوە دەبەستێتەوە لە قازانجی کەسییەوە سەرچاوە دەگرێت. ئایا ئەوە شتێکی سەیر نییە کەوا وێنابکەین مرۆڤەکان بێ ئەوەی بەردەوام لە هەولی لەناوبردن و هەلّخەلّەتاندنی یەکتردا بن نەتوانن لە پالّ یەکدا ژیان بەسەربەرن. پێمان دەلّێن نابێت ساتێك بێ ئاگابین تاوەکو پەی بەوە نەبەن کە بەڕاستی هەین، چونکە لە هەر شوێنێکدا کە دوو کەس لە ئێمە قازانجی هاوبەشمان هەبێت سەدەها هەزار کەسی تر لە بەرامبەر ئەم قازانجەدا رادەوەستن، کەواتە تەنها رێگەی سەرکەوتنی ئێمە ئەوەیە کە هەمووان فریوبدەین و هەمووان رووت بکەینەوە[1].

رۆسۆ نەك تەنها رەخنە لە کۆمەلگای دامەزراو لەسەر قازانج دەگرێت و دەربڕینی دامەزراو لەسەر قازانج پەسەند ناکات لە دەربڕینی دامەزراو لەسەر مافیش زیاتر هەنگاو دەنێت، گەرچی لە چەند خالێکدا هاورایە لەگەلّ دەربڕینی دووەمدا. یەکێك لەو خالانە بریتییە لە دیکترینی گرێبەستی کۆمەلأیەتی کە رۆسۆ لەوەوە دەستپێدەکات بەلأم سنووری ئەو بەجێ دێلّێت و دەگاتە چەمکی ((ویستی گشتی)) کە سنوورێکی نوێیە لە فەلسەفەی سیاسیدا و روانگەیەکی نوێ لەبەردەم فەلسەفەی سیاسیدا دەکاتەوە، روانگەیەك کە دەستپێکێکی نوێیە بۆ کانت و هیگلّ و تەنانەت مارکسیش. هەروەك روونی دەکەینەوە چەمکی ((ویستی گشتی)) بنەماکانی بیری بە عەقلانی کردنی کۆمەلگای فەراهەم کرد. گرێبەست بەو شێوەیەی کە هۆبز و لۆك لێی تێدەگەیشتن لە کۆتاییدا بە دەولەتێکی سنوورداریی خاوەن ئەرك و کارێك لە ئاستی پاراستنی ئاسایش و گرێنتی کردنی گرێبەستە تایبەتەکان کۆتایی دێت، لە کاتێکدا کە ویستی گشتی کە لەناو ((گرێبەستی کۆمەلأیەتی))دا دروست بوو رێگەی بۆ دەولەتی زۆرینە و پشت ئەستوور بە عەقلانیەتی بە کۆمەلّ کردەوە.

گەرچی هەندێك لە رەخنەگران پێش گریمانەکانی لۆك بە جیاواز دەزانن لە پێش گریمانەکانی هۆبز بەلأم هەندێك لە گەورەترین خاوەن راکان پێش گریمانەکانی هەردووکیانیان بەهاو شێوە دادەنا[2]. بە قبوولکردنی بۆچوونی ئەم راڤەکارانە دەکرێت بوترێت بەپێی بۆچوونی هۆبز و لۆك باری سروشتی لە هەموو رووبەکەوە بارێکی ناخۆشە و تیایدا تەماح و لووتبەرزی و ستەم ئاسایشی تاکەکان دەخاتە مەترسییەوە. بەم پێیە مرۆڤەکان بڕیاردەدەن بەشێك لە ئازادییە بێ

1- Lucio Colletti, from Rousses to Lenin, trans. John Merrington and Judith White, Norfold, low and brydone, p. 144.
2- Leo Strauss, op. cit, p. 221.

سنوورەكانی خۆیان كە لەباری سروشتیدا هەیانە بە كەسێكی شیاو یان یاساگەلێكی تر بسپێرن و دەسەلاتێكی هاوبەش دابمەزرێنن. دەكرێت لەم تیۆرەدا ئەو ئەنجامانەی خوارەوە بە دەستبێنین:

١- باری كۆمەلایەتی كە لە گرێبەستەوە سەرچاوە دەگرێت لەرووی پاراستنی مافی تاكەكانەوە زۆر جیاواز نییە لە باری سروشتی تەنها ئەوە نەبێت كە ئێستا ئەو مافانە لەلایەن خەڵكییەوە بە فەرمی ناسراون و بە یاساگەلێكی دانراو پابەندراو پشتگیریی لێكراوە، و چەسپاوە. بۆیە هەركاتێك كە دەوڵەت دەستدرێژی بكاتە سەر مافەكانی سنووری تایبەتی لە رووی لۆژیكەوە گرێبەستی پێشێلكردووە و مەشروعیەتی خۆی لەدەستداوە.

٢- وەها گرێبەستێك كۆمەڵگایەك دروستناكات بەڵكو دەوڵەت و لە راستیدا كۆمەڵگایەكی فەرمی و یاسایی دروستدەكات. ئەم كۆمەڵگایە مەیدانێكە بۆ ركەبەری نێوان قازانجە تایبەتییەكان. لە راستیدا هەموو كەسێك لەگەڵ گرێبەستدا بەم بنەڕەتە رازیبووە كە دەبێت بەدوای قازانجەكانی خۆیدا بچێت. خاڵی پەیوەندی نێوان تاكەكانیش جیا لەم خاڵە نییە. كەواتە خاڵی هاوبەشی ویستی گشتی كارێكی نێگەتیڤە و واتایەكی تری ئەم وتەیە ئەوەیە كە بوونی كۆمەڵگا پەیوەستە بە سەقامگیری حكوومەتەوە.

٣- بناغەی ئەو بینایەی كە بەم شێوەیە دروستدەكرێت لەسەر موڵكداری تایبەتییە. بەڕای لۆك موڵكداری پەیوەندییەكی لێكنەپچڕاوەی هەیە لەگەڵ ئازادیدا. بۆیە یەكسانی مرۆڤەكان تەنها دەتوانێت یەكسانییەكی فۆرماڵی بێت.

بەلاّم تیۆرەكەی رۆسۆ جیاوازە لەو تێگەیشتنەی كە لەسەر نومینالیزم دامەزراوە. لێرەدایە كە تیۆرەكەی رۆسۆ هەم لە گرێبەستی دامەزراو لەسەر مافی سروشتی و هەم لە تیۆری سوودگەرایی جیادەبێتەوە. بە بۆچوونی رۆسۆ دروستكردنی كۆمەڵگا دروستكردنی قازانجی هاوبەش و بە كۆمەلایەتی كردنی قازانجەكانە. ئەگەر قازانجی هاوبەش سنوورداربێت بەوەی كە هەموو لایەنەكانی گرێبەست رێكبكەون كە هەر كەسێك بەرێگەی خۆیدا بڕوات لە راستیدا ئیدی كۆمەڵگایەك لە ئارادا نییە، بەڵكو تەنها كۆمەلێكی فۆرماڵی دروستدەبێت. لە راستیدا مرۆڤەكان وەكو پێشتر لە ((باری سروشتی))دا ماونەتەوە، لە كاتێكدا كە گرێبەست بۆ پارێزگاری لێكردنی مرۆڤە سروشتییەكان نییە بەڵكو بۆ دابڕانی ئەوە لە باری سروشتی و دروستكردنی بوونەوەرێكی نوێ لێی: ((بوونەوەرێكی سروشتی)) و بوونێكی ئەخلاقی لەبری بوونێكی فیزیكی. لە بنەڕەتدا ئەم بە كۆمەلایەتی كردنە لە سنووری ئەخلاقی و سیاسی بە ئەنجامدەگات نەك لە





سنووری ئابووریدا[٣]. چەمكی مافی سروشتی ( لە واتای نوێ و جێ مەبەستی هۆبز و لۆك) و چەمكی باری سروشتیی باو خاڵی دەستپێكی رۆسۆ بوون بۆچوونە نێو سنووری نوێی رەخنە و هەڵسەنگاندن[٤]. رۆسۆ لەگەڵ هۆبزدا هاوڕابوو كە دەبێت مافی سروشتی سەرچاوەكەی لە بنەڕەتگەلێكدا بێت كە لە پێشترە لە عەقڵ، واتە سەرچاوەكەی حەزگەلێكە كە تایبەت نییە بە مرۆڤەوە. هەروەها لەگەڵ هۆبزدا هاوڕابوو كە بنەمای مافی سروشتی لە مافی پاراستنی خودی دامەزراو لەسەر ئەو بنەڕەتەیە كە هەموو كەسێك مافی داوەریكردنی هەیە سەبارەت بە پاراستنی خودی خۆی. هەر بۆیەش بە بۆ چوونی ئەو ژیان لە باری سروشتیدا هاوكاتە لەگەڵ دوورە پەرێزیدا. رۆسۆ ئەم چاكسازییەی هۆبز لە مافی سروشتی (كە مافی سروشتی كلاسیكیی گۆڕی بۆ مافی سروشتی نوێ) پەسەند دەكات. هەروەها رۆسۆش وەكو هۆبز هەوڵدەدات بەو شێوەیەی كە هەیە بەدوای بناغە و بنەماكانی دادپەروەریدا بگەڕێت لە مرۆڤدا نەك بەو شێوەیەی كە دەبێ هەبێت. لە ئەنجامدا ئەویش وەكو هۆبز فەزیلەت دەگوازێتەوە بۆ فەزیلەتی كۆمەلایەتی. بەلاّم رۆسۆ لە دوو خاڵی گرنگدا لە هۆبز جیا دەبێتەوە. رۆسۆ دەڵێت ئەو فەیلەسوفانەی كە لە بنەماكانی كۆمەڵگایان كۆڵیوەتەوە هەموو هەستیان بەوە كردووە كە دەبێت بگەڕێنەوە بۆ باری سروشتی و لەوێوە بەدوای خاڵی دەستپێكی باری مەدەنیدا بچن. بەلاّم راستییەكەی ئەوەیە كە هیچ یەك لەوان بەڕاستی نەگەڕاونەتەوە بۆ باری سروشتی بەو شێوەیەی كە هەبووە، بەڵكو گەڕاونەتەوە بۆ مرۆڤی مەدەنی و مرۆڤی خاوەن ژیاریان لەگەڵ مرۆڤی سروشتی تێكەڵ كردووە. ئەوان مرۆڤی خاوەن ژیاریان وێنەكێشاوە لە كاتێكدا كە وایاندەزانی وێنەی مرۆڤی سروشتیان كێشاوە. ئەوان بەو شێوەیەی كە ئێستا هەیە تەماشای مرۆڤیان كردووە، لە كاتێكدا كە كارەكانیان و ئەنجامگیرییەكانیان لە حاڵەتێكدا مەعقوڵە كە وایدابنێن بەشێوەیەكی سروشتی مرۆڤ كۆمەلایەتییە. دەكرێت بەم گریمانەیە سنووری نێوان سروشتی و گرێبەستی دیاری بكەین. دەتوانین بەشتێكی حەتمیی دابنێین كە بەلای كەمەوە ئەو حەزانەی كە سەربەخۆ لە كۆمەڵگا بوونیان هەیە سروشتین.

بەلاّم كاتێك كە هۆبز چەمكی كۆمەڵگاخوازی مرۆڤ رەتدەكاتەوە دەبێت قبووڵبكات زۆرێك لەو حەزانەی كە لە مرۆڤدا گەشەدەكەن (بۆ نموونە لووتبەرزی) بەلای كەمەوە بە شێوەیەكی نا راستەوخۆ لەژێر كاریگەری كۆمەڵگا و هەربۆیەش پەیمانەكان Convention دایە. رۆسۆ بە

3- Lucio Colletti, op. cit, p. 174.
4- John Plamentas, Man and Socity, Vol I, p. 365.

قبوولکردنی گریمانە پێشەکییەکانی هۆبز ئەنجامگەلێکی نوێیان لێوە بەدەستدێنێت کە تیۆرەکەی ئەو بەرەو ڕێگەیەکی نوێ و جیاواز لە هۆبز ڕێیمانی دەکەن. ڕۆسۆ دەڵێت تیۆرەکەی هۆبز زۆر ناهاوسازە چونکە بەگەڕانەوە بۆ مرۆڤی کۆمەڵایەتی وێنەی خەسڵەتەکانی مرۆڤی سروشتیی دیاریکردووە. عەقڵیش شتێکی کۆمەڵایەتییە، چونکە پەیوەستە بە شوناس و چەمکەکانەوە و بۆیە پێویستییەکی زمانە[٥]. لەبەرئەوەی کە زمان سروشتی نییە، کەواتە عەقڵیش سروشتی نییە. بەم پێیە پێناسەی کلاسیکی بۆ مرۆڤ وەکو گیانداریکی وتەبێژ (یان گیانداری خاوەن عەقڵ) پێناسەیەکی دروستنییە و ناکۆکییەکی لە ناوخۆیدا هەڵگرتووە. چونکە ئیدی گیانداران ناتوانن وتەبێژ (خاوەن عەقڵ) بن. جگە لەمە لەبەرئەوەی مرۆڤی سروشتی بێ بەشە لە عەقڵ بۆیە بە دوورە لە ناسین و زانستێك دەربارەی یاسای سروشتی کە وەکو یاسای عەقڵ تەماشا دەکرێت. بەم حاڵەوە دەکرێت بوترێت مرۆڤ لە باری سروشتیدا سەربەخۆیە[٦].

مرۆڤی سروشتی بێ بەشە لە ئەخلاق. مرۆڤی سروشتی نزمترە لە مرۆڤ. دەبێت لەبەر ڕووناکی کە بنەڕەتە لە بۆ چوونەکەی ڕۆسۆ دەربارەی ئەوەی کە مرۆڤ بە شێوەیەکی سروشتی باشە تێبگەین کە مرۆڤ بەشێوەیەکی سروشتی نزمترە لە مرۆڤ. مرۆڤ لەرووی سروشتەوە باشە، بەو واتاییەی ئەو دەتوانێت باش یاخود خراپ بێت. هیچ دامەزراندن و بیناییەکی سروشتی سەبارەت بە مرۆڤ بوونی نییە. هەموو شتێکی مرۆڤ پەیوەستە بە دروستکردن و گرێبەستەوە. بەشێوەیەکی بێ سنوور مرۆڤ بە سروشت کەماڵخوازە. هیچ ئاستەنگێکی سروشتی نییە کە مرۆڤ لە پێشکەوتنی بێ سنوور دووربخاتەوە. یاخود ڕێگری توانایی ئەو بێت لە ڕزگاربوون لەشەڕخوازی. ئەم بیرە بوو کە پاشتر مارکس بۆ بوارگەلێکی نوێ گشتاندی: مرۆڤ بە سروشت ئەو شتەیە کە دەمانەوێت لە ئەو دروستیبکەین.

## سیاسەت ئامرازی بونیادنانی کۆمەڵگای عەقڵانی

لێرەوەیە کە ڕۆسۆ سیاسەت بە ئامرازی چارەسەرکردنی گرفتی مرۆڤ لەقەڵەمدەدا. سیاسەت ڕێگەچارەی کێشەی مرۆییە. کێشەی سەرەکیی کۆمەڵگا بریتییە لە نایەکسانی

٥- پاشتر ئەم تیۆرییە لەلایەن بیرمەندانی مارکسیستەوە پەرەی پێدراو پاولف بە دەروونناسیی دامەزراو لەسەر فیزیۆلۆژی بەوردی خودی ئەوی خستەڕوو.

6- Julio Simon "Natural freedom and moral autonomy: Emileas parent, teacher and citizen" History of political thought, vol XVI. No I, spring 1995, pp. 21-36.



کۆمەڵایەتی. دەبێت لە ڕێگەی سیاسەتەوە کۆمەڵگا بگۆڕدرێت تاوەکو ئەرکی ئەخلاقیی سەرکەوتنی باشە بەسەر خراپە بە ئەنجامبگات[٧]. بەم شێوەیە ڕۆسۆ نەك تەنها جەخت لەسەریەکبوونی ئەخلاق و سیاسەت دەکاتەوە بەڵکو سیاسەت بە لەپێشتر لە ئەخلاق دادەنێت و دەیەوێت کە سیاسەت ئەخلاق بونیاد بنێت. بەم جۆرە ڕۆسۆ لەم بارەیەوە نەك تەنها بەجۆرێکی تر پشتگیری لە بۆ چوونەکەی لۆك (کە پێشتر باسمان لێوەکرد) دەکات بەڵکو لە هەمان کاتدا ڕاستیشی دەکاتەوە.

بەم جۆرە ڕۆسۆ ئەخلاق بەواتای شتێکی لەناوخۆ و لەپێشتر لە سیاسەت و سەربەخۆ لێی و سنووردار بە ژیانی ناوەوەی مرۆڤ ڕەتدەکاتەوە و لە شار و کۆمەڵگای مەدەنیدا بە دوای پێوەری ژیانی ئەخلاقیدا دەگەڕێت[٨]. جارێکی تر ڕۆسۆ گەڕایەوە بۆ یەکسانی چەمکی هاوڵاتی و دەوڵەت بەو شێوەیەی کە خوازراوی فەیلەسوفە کلاسیکییەکانی یۆنان بوو و پاشان بووە نموونەیەك بۆ تیۆرەکەی هیگڵ. لەپێشتر بوونی فەزیلەتی سیاسی بەسەر فەزیلەتە ئەخلاقییەکان کە ماکیاڤیلی خستبوویەروو پاش تێپەڕاندنی چەند قۆناغێك لە تیۆرەکەی ڕۆسۆدا بنەمایەکی لۆژیکی بەهێزی وەدەستهێنا. بەسەرنجدانی ئەوەی کە مەسیحییەت چەندین سەدە بانگەشەی بۆ لە پێشتربوونی واتایی بوون دەکرد، لەپێشتر بوونێك کە ڕۆسۆ بۆ سیاسەت لەبەرچاوی دەگرت ئەمە دەربڕی گۆڕانێکی قووڵە لە تەواوی تێڕوانینەکان بۆ ژیان. ئەم بیرە نەك تەنها تێگەیشتنی مەسیحیی بۆ دابەزین[٩] و گوناهی یەکەم بێ بەهاکرد بەڵکو بناغەی مەسیحییەتی سکیولاری[١٠] و قوتابخانەی مافی سروشتیی سەرەوژێر کرد[١١]. جیاوازی نێوان ئەخلاق و یاسا کە بەپێی ئەو ئەخلاق پەیوەست دەبێت بەدنیای ناوەوە و یاسایش تەنها پەیوەست دەبێت بە دنیای لێکدانەوە دەرەکییەکان وەلاوەنرا. لەم خاڵەوە بوو کە پاشتر کانت نەخشە گەورەکەی خۆی دەربارەی عەقڵی کردەیی دەستپێکرد.

بەهەرحاڵ ڕۆسۆ جیاکاری لیبراڵ مەسیحیی کلاسیکیی نێوان ((مرۆڤی بە فەزیلەت)) و ((هاوڵاتی باش)) (ئەو جیاکارییەی کە بە شێوەیەکی نەریتی دەبووە ڕێگر لەبەردەم یەکسانی

7- Lucio Colletti, op. cit.

8- Etudes Surle "contrat social" de J. J. Rousseau (proceeding of the seminer held at Dijon 3-6 may 1962) paris 1994, pp. 177-190.

9- Fall.

10- Secular Christianity.

11- Lucio Colletti, op. cit.





سیاسەت و ئەخلاق)ی وەلاوەنا. بەپێی بۆ چوونی زۆربەی راڤەکاران رۆسۆ پرسی خراپەی لە سنووری تیۆدیسە[12] یان حیکمەتەوە بەرەو سنووری سیاسەت برد. ئیدی خراپە نەدارییە پاڵ ویستی نادیاری خودا بەڵکو درایە پاڵ کۆمەڵگا. رۆسۆ بەرپرسیارێتییەکەی ئاراستەی خاڵێك کرد کە تا ئەوکات هیچ کەسێك دەرکی پێ نەکردبوو. رۆسۆ بکەرێکی نوێی بۆ بەرپرسیارێتی ئەخلاقی دروستکرد. ئەم بکەرە مرۆڤ بە تەنها نییە بەڵکو کۆمەڵگای مرۆییە. ئەنجامی ئەم پێشەکییانە ئەوەیە کە بۆ وەلاوەنانی خەراپە لە جیهان دەبێت رێکخراوی کۆمەڵگا بگۆردرێت و ئەمەش واتە شۆرش[13]. کۆمەڵگا لەو فۆرمەی ئێستایدا قوولترین برینەکانی لەسەر جەستەی مرۆڤدا دروستکردووە و تەنها خۆیشی دەبێت ئەم برینانە تیمار بکات. لە ئێستا بەدواوە ئەم بەرپرسیارێتییە لە ئەستۆی کۆمەڵگادایە. ئەمە رێگەچارەی رۆسۆیە بۆ تیۆدییە و دەستکەوتی ئەوە بۆ بیری نوێ. هەر ئەم بیرە بوو کە لە فەلسەفەی هیگڵ و کانتگەرا نوێیەکان بەشێوەیەکی نوێ پەرەی پێدرا. ئەم بیرەی رۆسۆ ئەو بە تەواوی لە هەموو شێوەکانی بیروباوەرە کلاسیکییەکان مافی سروشتی و تێڕوانینی سوودگەرایی جیادەکاتەوە.

وێڕای ئەوەی کە بیروباوەرێکی ئایینی هەبوو بەڵام ئەم بیرەی رۆسۆ ئەوی خستەلایەنی بەرامبەری کلێسا. بەم تێڕوانینە ئیدی ئازاد بوون لە سنووری سیاسەتدا بەدەستدەهات نەك لە سنووری ئایین. ئەم بیرە رۆسۆ لە رۆشنگەرەکانی سەدەی هەژدەیەمیش جیادەکاتەوە. رۆشنگەرەکان پێیانوابوو کە دەکرێت لەرێگەی پێشکەوتنی بەرە بەرەوە کەم و کورتییەکانی کۆمەڵگا پڕ بکرێنەوە. بەڵام رۆسۆ گوناهێك لە کۆمەڵگادا دەبینێت کە بە گۆڕینی بنەماکانی کۆمەڵگا چارەسەر دەبێت[14].

بەبڕوای رۆسۆ هەڵەی هۆبز لەوەدابوو کە وایدەزانی مرۆڤ بەر لە بە کۆمەڵایەتی بوون و پێش کۆمەڵگا بوونەوەرێکی عەقلانییە و دەتوانێت پەیمان ببەستێت و گرێبەست رێك بخات. مرۆڤ لە پرۆسەی گەشەی کۆمەڵگادا بە گەشەی هزری و هۆشەکی دەگات. هۆشی مرۆڤ بە گونجاو لەگەڵ شێوەی دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی گەشەدەکات. پێشکەوتنی هۆش کارێکی پێویستە، چونکە هەلومەرجی دابینکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ دەگۆڕێت و وەرچەرخانی بەسەردادێت. مرۆڤ ناچارە بەداهێنان کردن. رووداوەکانی ژیان بە تێگەیشتن و

12- Theodicy.
13- Ernst Cassirer, op. cit, p. 145.
14- Ibid.






ناسینی دەکەن. ئەم حاڵەتانەیە کە لە باری سروشتییەوە بەرەوباری کۆمەڵایەتیی دەبەن. پێشکەوتنی شارستانییەت چرکە بەچرکە تایبەتمەندییە پێش مرۆییەکانی مرۆڤ لە ئەو دوور دەخاتەوە. ئەمانە ئەنجامی پێویست بوونی بەدەستهێنانی ئەزموونن. لە کۆمەڵگادا عەقڵی ناکامڵ بەرەو کامڵبوون دەچێت و لەسەر ئەم بنەمایەیە کە لە ئەنجامدا مرۆڤ دەتوانێت مافە گشتییەکان لەسەر بناغەیەکی بەهێز بونیاد بنێت. مافی سروشتی لەسەربنەمای عەقڵی کۆمەڵایەتییە نەك مافی سروشتی.

## دەوڵەت وەکو دامەزراوەیەکی ئەخلاقی

دەوڵەت هەر بەو شێوەیەی کە دامەزراوەیەکی عەقلانییە دامەزراوەیەکی ئەخلاقیشە. تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆ لەلایەکی ترەوە بۆ چارەسەرکردنی کەم و کورتییەکانی تیۆری گرێبەستی هۆبز و لۆك سەبارەت بەرەزامەندی وەکو سەرچاوەی مافی گشتی پەروەردە ببوو. بەپێی تیۆرەکەی هۆبز کاتێك کە لایەنەکانی گرێبەست رازیبوون بەرامبەر بەسەقامگیرکردنی ئیدی لەوە بەدواوە بەکارهێنانی زەبر و زۆر لەلایەن فەرمانڕەواوە پاساوێکی عەقلانیی هەیە، چونکە تاکەکان لەسەروبەندی بەستنی گرێبەستەکەدا رەزامەندیان بەرامبەر نیشانداوە. بەپێی تیۆرەکەی لۆکیش تاکەکان لەکاتی بەستنی گرێبەستەکەدا رەزامەندیان بەرامبەر بە بەکارهێنانی زەبر و زۆر لەلایەن زۆرینەوە نیشانداوە و لەسەر رێککەوتوون. بەم شێوەیە لە تیۆرەکەی لۆکیشدا سوود وەرگرتن لە زەبر و زۆر پاساوی ئەخلاقیی هەیە. بەڵام رۆسۆ ئەم پاساوانەکە پشت بە گرێبەستی کۆمەڵایەتی دەبەستن بە بەس نازانێت. رۆسۆ دەیەوێت لە قۆناغەکانی پاشتر واتە لە تەواوی ساتەکانی کاری دەوڵەتیشدا پاساوی ئەخلاقی بۆ بەکارهێنانی زەبر و زۆر بدۆزێتەوە. ئەم کارەیش پێویستی بەوەیە کە رەزامەندی تاکەکان لە کاری حکوومەتدا بەشێوەی بەشداری بەردەوامی لێبێت و هەمیشە بەردەوامیی هەبێت. رۆسۆ لە هیچ ساتێك لە ساتەکانی ژیانی تاك ملکەچیکردن بۆ زەبر و زۆر بە شتێکی پاسا و دراو و رێگە پێدراوی ئەخلاقی لەقەڵەمنادات[15]. لە کاتێکدا کە لە تیۆرەکەی هۆبز و لۆکدا ویستی خەڵکی لە پێکهێنانی حکوومەتدا لەبەرچاوگیرابوو بەڵام لە درێژەی کاری حکوومەتدا

١٥- و. ت. جونز، خداوندان اندیشه سیاسی، جلد دوم، ترجمه علی رامین، تهران، انتشارات امیرکبیر، ١٣٦٢، ل٣٤٥.

فەرامۆش کرابوو. بە بۆچوونی رۆسۆ رەزامەندی سەرەتایی دەربارەی گرێبەستی پێکهێنانی حکوومەت لەرووی ئەخلاقییەوە نابێتە پاسا و بۆ هەنگاوەکانی پاشتری فەرمانڕەوا.

تیۆرەکەی لۆك تەنانەت ئەگەر لە رەخنەکەی سەرەوەیش رزگاری بێت دیسانەوە ئەگەری لە خۆگرتنی ئەو گرفتانەی هەیە کە رەنگە زۆرینە ستەم لە کەمینە بکات. لەم حاڵەتەدا بابەتی رێککەوتن و رەزامەندی لەکەدار دەبێت. ئەمە کێشەیەك بوو کە دەبوو بیری سیاسی نوێ رێگەچارەیەکی بۆ بدۆزێتەوە. لەلایەکەوە گرێبەستی کۆمەڵایەتی و ویستی گشتی رۆسۆیش هەوڵێك بوو بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە[١٦]. پرسی رەزامەندی و رۆڵی ئەو نەك تەنها لە پێکهێنانی حکوومەت بەڵکو لە مانەویشیدا یەکێك بوو لەو فاکتەرانەی کە رۆسۆی بەرەو تیۆری ویستی گشتی رێنماییکرد. رۆسۆ دەڵێت لە هەرحاڵەتێکدا ئەگەر تاك بۆ ساتێك بەزەبر و زۆر ناچار بە ملکەچی بکرێت ئەوا لەرووی ئەخلاقییەوە هیچ ئەرکێکی لە ئەستۆدا نابێت بۆ ملکەچیکردن. کاتێك کە زەبر و زۆر سەرچاوەی ملکەچیکردن بێت لەگەڵ لە ناوچوونی لەرووی لۆژیکییەوە پێویستی بوونی ملکەچیکردن کۆتایی پێ دێت. لەم رووەوە رۆسۆ دەستەواژەی ((ماف))ی بەکارهێنانی زەبر و زۆر کە لە تیۆرەکەی هۆبز و لۆکدا بەرچاو دەکەوێت بەدەستەواژەیەکی ناکۆك و بێ واتای لەقەڵەمدەدا. بەبڕوای رۆسۆ زیادکردنی چەمکی ((ماف)) بۆ وشەی زەبر و زۆر (مافی سوود وەرگرتن لە زەبر و زۆر) لێکدانێکی ناهاورەگەزە. رۆسۆ جەخت لەسەر ئەو خاڵە دەکاتەوە کە ماف و زەبر و زۆر لەرووی جۆرەوە لێك جیاوازن.

ئێستاکە زەبر و زۆر ناتوانێت شیاوی پاسا و بۆ هێنانەوە بێت ئیدی چ شتێك دەتوانێت دەوڵەت بگۆڕێت بۆ دامەزراوەیەکی ئەخلاقی؟ بڕوای رۆسۆ وایە کە پاسا و هێنانەوە بۆ بەکاربردنی زەبر و زۆر پێویستی بە رەزامەندی تاکەکان هەیە، بەڵام نەك تەنها لە کاتی بەستنی گرێبەستدا بەڵکو لە ویستێکی گشتیدا کە بەردەوامی هەبێت. لە گرێبەستی جێ مەبەستی رۆسۆدا هەموو کەسێك بوون و توانای خۆی دەخاتە ژێر رابەرایەتیکردنی بالای ویستی گشتییەوە و وەکو بەشێکی جیا نەکراوەی کۆمەڵێك قبووڵدەکرێت. بەم گرێبەستە هەیکەلێکی ئەخلاقی و بە کۆمەڵ دروستدەبێت کە دەبێتە شوێنگرەوەی یەك بەیەکی تاکەکان. ئەم هەیکەلە ژیان و ویستی تایبەت بەخۆی هەیە. تاکەکان تەنها لە رێگەی بەشداری لە ژیانی

١٦- هەمان سەرچاوە، ل ٣٤٠.





هاوبەشدا دەتوانن کەسێتی دەوڵەمەند و تەواوی ئەخلاقیان هەبێت[١٧]. ئەم هەیکەلە هەیکەلێکی ئۆرگانیکییە و تاکەکان وەکو بەشە جۆراوجۆرەکانی ئەم هەیکەلەن. لەگەڵ پێکهێنانی ئەم هەیکەلەدا پێوەرە ئەخلاقییەکان شوێنی حەزەکان و ئەرك شوێنی هەواو هەوەس و دادپەروەری شوێنی غەریزە دەگرنەوە لە پەیوەندی تاکەکاندا. تاکەکان وەکو ئەندامانی ئەم هەیکەلە ئیدی تەنها بەدوای حەزە نەفسانییەکانەوە نین بەڵکو بەشدارن لە ژیانێکی عەقلانیدا. تاکەکان لە دوورەوە خاوەن ئازادی و دەسەڵاتی خۆیانن، یەکەم لەو رووەوەی کە شوێنکەوتووی ویستی کەسێکی ترنین و دووەم لەو رووەوەی کە شوێنکەوتوو و شکەست خواردووی حەزە نەفسییەکانی خۆیان نین.

کەواتە بە گرێبەستی کۆمەڵایەتی و بەشداری لە ویستی گشتی مرۆڤە بە عەقلانیترین کار هەڵساوە. وەها کارێك تەنانەت لە سەرنجی سوودگەرایانەیش بەدوورنییە. بەم شێوەیە مرۆڤ سوودێکی بەرچاو بەدەستدێنێت. جگە لەمە رۆسۆ وەکو هۆبز و لۆك لە بنەڕەتدا مرۆڤ بە بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ لەقەڵەمدەدات کە دەتوانێت بیر لە سوود و زیانی خۆی بکاتەوە و بۆ دابینکردنی هەنگاوی پێویست بنێت. مرۆڤ بە بەشداریکردن لە ویستی گشتی دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ کە کاروکردەوەکانی بەپێی فەرمانی عەقڵە نەك پاڵنەری غەریزەکان[١٨]. رۆسۆ بە پێچەوانەی لۆك وەها بەڵگە دێنێتەوە کە ئەم بوونەوەرە بەر لە گرێبەستی بەشداری لە ویستی گشتی بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ و ئەخلاقی نییە. لە تیۆرەکەی رۆسۆدا مرۆڤ بەر لە گرێبەست (کە راستییە عەقلانی و ئەخلاقییەکەی جێی مەبەستە نەك راستییە مێژووییەکەی) بوونەوەرێکی ناتەواوە. بەشداری لە ویستی گشتی بەشدارییەکی بەردەوامە و بەشێوەییەکی بەرە بەرە نەك کتوپڕ سروشتی مرۆڤ دەگۆڕێت. تاك لە رێگەی بەشداریکردن لە کۆمەڵگا دەگاتە گونجانی ئەخلاقی و تەنانەت دەروونیش[١٩]. بەم ئاراستەیە ئەو کێشەیەش چارەسەر دەبێت کە چۆن مرۆڤە نیوە ئاژەڵەکان دەتوانن گرێبەستێك ببەستن. چونکە بەم شێوەیە رۆسۆ گرێبەستی کۆمەڵایەتی دەگۆڕێت بۆ کامڵبوونی بەرە بەرەی زانیارییە ئەخلاقییەکان و توانایە واتاییەکانی مرۆڤ.

17- John Plamenarz, op. cit, p. 366.

١٨- و. ت. جونز، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٢.

19- Lively and Reeve, op. cit, p. 366.

## بەشداری و تێڕوانینی ئۆرگانیستی بۆ دەوڵەت

دەکرێت لەبیری سیاسی نوێدا تێڕوانین بۆ دەوڵەت لە دوو ڕەوتی سـەرەکیدا پۆلینبکرێـت. دوو تێڕوانینی عەقلانییەتی دامەزراو لەسەر ماف و عەقلانیەتی دامەزراو لەسەر قـازانج کـە لـە دوو بەشی یەکەمدا باسیان لێوەکرا پەیوەستن بە ڕەوتێك لە هـزرەوە کـە دەولـەت بـە ئامادەسـازی و تێڕامان و میکانیزمێك بۆ ئامانجە تایبەتەکان لەقەڵەمدەدا. ڕەنگە ئەم ئامانجە تایبەتانە بـریتین لە دابینکردنی ئاسایش یـاخود بەدەسـتهێنانی سـوود و قـازانجی گـشتی. لـەوەها تێڕوانینێکـدا دەوڵەت وەکو ئامێرێك یان کەم تازۆر وەکو کەرەستەیەك بـۆ ئامانجگـەلێکی دیـاریکراو تەماشـا دەکرێت. بەڵام ڕەوتێکی تری بیری سیاسی هەیە کە تیایدا دەوڵەت نـەك وەکـو ئامێرێـك بـەڵکو وەکو ئۆرگانیزمێکی زیندوو سەیردەکرێت کە لە ڕەوتی کامڵبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسـیی مرۆڤدا گەشەی کردووە. لەوەها ڕوانگەیەکدا دەوڵەت وەکو یەك گشت تەماشـا دەکرێـت کـە بـە پێچەوانەی ڕوانگەی پێشوو کۆی ژمارەیی تاکـەکان نییـە بـەڵکو چـۆنیەتییەکی جـودا و خـاوەن شوناسێکی تایبەت بەخۆیەتی. لەم ڕوانگەیەدا لێکچوونێکی بەرچاو لە نێوان گەشە و کامڵبوونی بوونەوەری زینـدوو وەکـو بـەرزترین ڕەنگدانـەوەی ژیـان و کـامڵبوونی دامـەزراوە سیاسـییەکان بەدیـدەکرێت. هـەر بـەو جـۆرەی کـە پێـشکەوتنی شارسـتانییەت پێویـستی و چـالاکییە کۆمەڵایەتییـەکان پـەرە پێـدەدات، هاوکـات لەگـەڵ ئـەودا دەولـەتیش ئـالۆزتر دەبێـت و دەسەڵاتەکەیشی بەرەو زیادبوون دەچێت. لەم جۆرە تێڕوانینەدا بەشێوەیەکی دەوڵەت و کۆمـەڵگا بەجودا لە یەکتر تەماشا ناکرێن و بەپێچەوانەی تیۆری میکـانیزمی دەربـارەی دەولـەت مـەرز و سنوورێکی دوور لە پەڕینەوە لەنێوان دەوڵەت و کۆمەڵگادا دیاریناکرێـت. دەوڵەتـەکان جیـاوازن بەهەمان ئەو شـێوەیەی کـە کۆمـەڵگاکان بەشـێوەگەلێکی جیـاواز قۆناغـەکانی ئاوێتـەبوونیان تێپەڕاندووە.

هەروەها ئەم دوو ڕەوتە بـەدوو ڕوانگـەی جیـاواز دەربـارەی فـۆرم و ڕێکخـستنی دەولـەت و ناوەرۆکی بەشداری دیاریدەکرێن. ڕوانگەی یەکەم دەوڵەت تەنها بەخراپەیەکی پێویست و لە چـەند ڕوویەکـەوە بـە ئـەنجامی بەدییـەکانی سروشـتی مـرۆڤ لەقەڵەمـدەدات نـەك بـە بەرهـەمی فەزیلەتەکانی. بەبڕوای هۆبز هەموو ئەرك و فەزیلەتەکانی مـرۆڤ لەنیگـەرانی ئـەو بەرامبـەر بـە پاراستنی خود بۆیەش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەنیگـەرانی ئـەو بەرامبـەر بـەدوربینی سەرچـاوە دەگرێت. لە سوودگەرایی بێنتهـام و جێمـزمیلیش دەولـەت تـەنها بـۆ ڕێگـرتن لـە دەسـتدرێژی تاک[illegible] بۆ سەر ئازادی خەڵکی واتە بۆ کارێکی نیگەتیڤ و نەرێنی دروسـتکرابوو. بـەڵام ڕۆسـۆ





بڕوای وابوو کە قازانجە کەسییەکان ناتوانن زنجیرەییەکی بەهێز بن بۆ پێکەوە لکاندنی کۆمـەڵگا و ناتوانێت قووڵایی ڕەگ و ریشەی کۆمەڵگا نیشانبدات. لەگەڵ ئەمەیشدا خۆی بەدوور دەگرت کـە وەکو فەیلەسووفانی کلاسیك قبووڵبکات کە لەرووی سروشتەوە مـرۆڤ بوونـەوەرێکی سیاسـییە و حەز و هەستەکانی مرۆڤ هیچ ڕۆڵێکیان نییە لەدروستبوونی کۆمـەڵگادا. هـەروەها بـە دروسـتی سەرنجی ئەو خاڵەی دابوو کە ئەگەر وەکو فەیلەسـووفە کلاسـیکییەکانی کۆمـەڵگا بـە سروشـتی بزانین ئەوا لەم حاڵەتدا شوێنێکمان بۆ ویستی تاکەکان لە پێکهێنانی کۆمەڵگادا نەهێشتووەتەوە، لە کاتێکدا کە بیری نوێ وەکو بەردی بناغەی دەوڵەت جەخت لەسەر ویـست دەکاتـەوە. کەواتـە ڕۆسۆ نەیدەتوانی سەبارەت بە سیاسی بـوونی سروشـتی مـرۆڤ بـۆ بـیری کلاسـیکی بگەڕێتـەوە. لەلایەکی ترەوە ئەگەر وەکو هۆبز و لۆك و بێنتهـام شـوێنێکی زۆرتـری بـۆ قـازانج و دووربینـی دیاریدەکرد دەبوو بەشێوەیەکی ڕەها بە تیۆری لەپێشتربوونی تاك بەسەر کۆمەڵگادا و ڕاوەسـتانی تاك لە بەرامبەر دەوڵەت بگەیشتایە. بـەم شـێوەیە بـوو کـە ڕۆسـۆ لەلایەکـەوە چـەمکی بـاری سروشتی هەڵبژارد بەڵام لەلایەکی ترەوە حەزی پاراستنی خودی بەتەنها حەزی زاڵـی سـەرکرداری مرۆڤ دانەنا.

ڕۆسۆ وەکو هۆبز و لۆك لەم گریمانە پێشەکییەوە دەستپێدەکات کە لە باری سروشتیدا هـەموو مرۆڤەکان یەکسان و ئازادن و ئەوەی کە سەرەکیترین حەز بریتییە لە حەزی پاراستنی خود. بـەڵام ڕۆسۆ دەڵێت ئاگری حەزی پاراستنی خود بە ئاوی هەستی هاوخەمی هـەموار دەبێـت[20]. ڕۆسـۆ دەڵێت دوو بنەڕەت مرۆڤ و مەبەستی مرۆڤ پێناسە دەکەن و دەڵێت دەکرێت ئەمە لـە ڕامـان لـە سەرەتاییترین و سادەترین کرداری گیانی مرۆڤەوە بەدەستبهێنرێت. بـە بۆچـوونی ڕۆسـۆ ئـەم دوو بنەڕەتە لە پێشترن لە عەقڵ. یەکێك لەم دوو بنەڕەتە ئەو شتەیە کە ئێمە بـەرەو پاراسـتنی خـود ڕادەکێشێت و ئەوی تر ئەو شتەیە کە هەستی ڕقلێبوونەوە لە ئێمەدا دەورووژێنێـت بەرامبـەر بـە ئازار و لەناوچوونی بوونەوەرێکی تر، بەتایبەتی مرۆڤەکانی تر[21].

لە دیکترینەکەی هۆبز و لۆکدا باری سروشتی پێوەرێکی نیگەتیڤە. بـاری سروشـتی هاوکاتـە لەگەڵ وەها دژ یەکێکی ناوەکیدا کە تەنها یەك ڕێگەچارەی گونجاوی هەیە، ئەویش لڤیاتانـە. لـە دیکترینەکەی ڕۆسۆدا بەپێچەوانەی ئەمەوە باری سروشتی لە دژییەکی نـاوەکی بـەدوورە. ڕووداوە

20- Leo Struass, op. cit, p. 282.
21- J. I. Macadam "The discourse on inequality and the social contract" in Lively and Reeve, op. cit, p. 117.

بەرێکەوتەکان بوونە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ لە باری سروشتی دەربچێت بۆیە لە قۆناغەکانی دوایی باری سروشتیدا کۆمەڵگای مەدەنی بووە شتێکی پێویست. یەکێك لە وەرچەرخانە گرنگەکانی باری سروشتی بریتی بوو لە لاوازبوونی هەستی هاوخەمی. بەهۆی پەیدابوونی تەماحکاری و لووتبەرزییەوە هەستی هاوخەمی بەرەو لاوازبوون چوو. لە ئەنجامی ئەم وەرچەرخانانەدا بەردەوام پاراستنی خود بەرەو دژوارتر دەچوو. سەرئەنجام لە ساتێکی قەیراناویدا پێویست بوونی شوێنگرەوەییەکی دروستکراو بۆ هەستی هاوخەمی هاتە پێشەوە. لەم کاتەدا ئازادی و یەکسانی سروشتی پێویستیان بە شوێنگرەوەییەکی گرێبەستی هەبوو. ئەم شوێنگرەوەییە بریتییە لە پێکهێنانی کۆمەڵگایەکی عەقلانی و ئۆرگانیك.

لە کتێبی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ڕۆسۆدا هێشتا چەند پێوەندێك لەگەڵ نەریتی تیۆری گرێبەستدا بەرچاو دەکەوێت بەلاّم لە هەمان کاتدا تیایدا پێشەکییەکانی پەڕینەوە بەرەو تیۆری ویستی گشتی و تیۆری ئۆرگانێکی دەوڵەت فەراهەمکراوە. بەرای ڕۆسۆ گرێبەستی کۆمەڵایەتی گرێبەستێك نییە کە لە ڕێگەیەوە یەکەمین کۆمەڵگای ڕێك و پێك دابمەزرێندرێت (هەرچەندە کە هەندێ کات بەدڵیدا بێت وا تەماشای بکات) بەڵکو گرێبەستێکە کە دەبێت لە ڕێگەیەوە کۆمەڵگای دادپەروەرانە بونیاد بنرێت. ڕۆسۆ نیشانیدا کە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی تاك لە دەرەوەی کۆمەڵگا کارێکی پووچە. هەڵەیە ئەگەر تاك وەکو دوولای یەك دژییەکی لۆژیکی لە بەرامبەر دەوڵەتدا دابنێیت. ڕۆسۆ بۆ چارەسەرکردنی کەم کورتیی تیۆری میکانیستی دەوڵەت گەڕایەوە بۆ بیری ئۆرگانیستی دەوڵەت کە پێشتر لەلایەن ئەفلاتۆن و ئەرەستۆوە خرابووە ڕوو. بەلاّم هەروەك پاشتر باسیدەکەین ئەم گەڕانەوەیە گەڕانەوەیەکی سادە نەبوو.

بەلاّم بەر لە درێژەدان بەو باسەی کە تائێرە هێناومانە، خراپ نییە سەرەتا بەپێی شێوازی رابردوو هێڵە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی ڕۆسۆ دیاری بکەین. دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە هێڵە سەرەکییەکانی فەلسەفەی سیاسی ڕۆسۆ دیاری بکرێت:

١- بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی مرۆڤەکان لە باری سروشتیدا ژیان بەسەردەبەن (هەم بەپێی گریمانە عەقڵییەکان و هەم بەپێی بەڵگەمێژووییەکان).

٢- ئەم مرۆڤانە بەرێکەوت پەی بە سوودی هاوکاری دەبەن.

٣- هاوکات لەگەڵ هاوکاری دابەشکردنی کار و پسپۆڕی و دوابەدوای ئەمە موڵکداری تایبەتی پەیدا دەبێت.





٤- بۆ پارێزگاریکردن لە موڵکداری تایبەتی دەوڵەت دروستدەبێت و مرۆڤ سەربەخۆیی خۆی لە دەستدەدات و بەپێی خۆی بەرەو بەستنەوەی خۆی هەنگاو دەنێت.

٥- لەخۆ نامۆن کە بەم شێوەیە هاوکات لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا دروستدەبێت، دەبێ لە خودی کۆمەڵگادا چارەسەربکرێت و لەناوببرێ.

٦- بە چاکسازکردنی کۆمەڵگا ویستی گشتی زاڵدەبێت کە تیایدا خود ڕێسایی مرۆڤی سروشتی دەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤی کۆمەڵایەتی و هەموو کەسێك بە پەیڕەویکردن لە ویستی گشتی لە ڕاستیدا پەیڕەوی لەخۆی دەکات.

لەڕاستیدا ڕۆسۆ بەم شێوەیە لە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتییەوە دەپەڕێتەوە بۆ تیۆری ویستی گشتی و تێڕوانینی ئۆرگانیستی بۆ دەوڵەت.

## لە گرێبەستی کۆمەڵایەتییەوە بەرەو ویستی گشتی

بەم جۆرە تێپەڕینی ڕۆسۆ لە نەریتی گرێبەستەوە بۆ تیۆری ئۆرگانیستی هاوکاتە لەگەڵ چەند ئالۆزی و ناڕوونییەك (کە هیچ جۆرە تێپەڕینێك بەدوور نییە لێیان). ڕۆسۆ هێشتا لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا پارێزگاری لە پێوەند گەلێك کردووە لەگەڵ تیۆری گرێبەستدا. هەربۆیەش سەبارەت بە عەقلانیەتی دەوڵەت جیاوازیگەلێك لە نێوان گرێبەستی کۆمەڵایەتی و ویستی گشتی بەدیدەکرێت. سەبارەت بەو پرسیارەی کە دەوڵەت چییە و بۆچی دەبێت پەیڕەوی لێبکرێت وەلاّمی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە دەوڵەت بریتییە لە میکانیزمێك کە مرۆڤ بۆ مەبەستی خۆی دروستیدەکات. ئەم ڕوانگەیە کە هەندێ کات ڕۆسۆ لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بەرەولای ئەو هەنگاو دەنێت هاووێنەیە لەگەڵ نەریتی تیۆری گرێبەستی کە بۆ ماوەی دووسەدە زاڵبووە بەسەر بیری سیاسیی نوێدا. بەلاّم ڕۆسۆ لە ویستی گشتیدا بە تەواوی پاشماوەکانی بیری پێشووی گرێبەست واز لێدەهێنێت و دەچێتە ناو سنووری بیری ئۆرگانیستییەوە. بۆیە ڕۆسۆ لە ویستی گشتیدا دەوڵەت بە کەسێتییەکی بە کۆمەڵ ناودەبات کە مرۆڤ لە ڕێگەیەوە بەرەو ئازادی هەنگاو دەنێت.

کێشەکە ئەوەیە کە ناکرێت گرێبەستی کۆمەڵایەتی لەگەڵ چەمکی ویستی گشتیدا بگونجێندرێت، چونکە ئەگەر ویستی گشتی دەسەڵاتی باڵا و دەسەڵاتی لەپێشتر بێت ئیدی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ناپێویست و بێ واتایە. بەلاّم ئەگەر گرێبەستی کۆمەڵایەتی پێویست و گرنگ بێت لەم حاڵەتەدا ویستی گشتی ناتوانێت دەسەڵاتی باڵا و لەپێشتر بێت. هەندێك لە

ناڕونی و هاوسازییەکانی تیۆرەکەی ڕۆسۆ لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. ڕۆسۆ لە کاتێکدا کە پێویستیەکانی دەوڵەتی ئۆرگانیك قبوڵ دەکات، ئامادە نییە کە بە تەواوی گرێبەستی کۆمەڵایەتی وەلاوەبنێت. بەم جۆرە زۆرێك لە ڕاڤەکاران بڕوایان وایە کە ڕۆسۆ لە کۆتاییدا گەیشتوەتە تیۆری ئۆرگانیکی. دەکرێت ئەمە لە باس کردنی ئەو بۆ دەوڵەت وەکو هەیکەلێکی کۆمەڵایەتی بە کۆمەڵ و ئەخلاقی هەست پێبکردرێت. هەروەها لەو دیکترینییەی کە ویستی بەدیهاتوویان کردەیی ڕاستەقینەی[٢٢] تاك بە ناچاری باشترین ویستی ئەو نییە، دەکرێت تاك بەبێ مەیلی خۆی بۆلای ویستی ڕاستەقینەی ئەو پاڵپێوەبنرێت بێ ئەوەی ئازادیەکەی پێشێل کرابێت.

کێشەی سەرەکی ڕۆسۆ لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بریتییە لە سروشتی ڕاستەقینەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان[٢٣]. ڕۆسۆ دەیویست بزانێت چ شتێك مرۆڤەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە، هەروەك باسمان کرد ئەو نە تیۆری سروشتی بوونی کۆمەڵگای قبوولکردونە و وەکو هۆبز کۆمەڵگای بە بەرهەمی دەرچوون لەباری شەڕی هەموان لە دژی هەموان لە قەڵەمدا. وێڕای ئەوەی کە هەستی پاراستنی خودی بە بزوێنەری سەرەکیی مرۆڤ لە باری سروشتیدا دەزانی لەگەڵ ئەمەیشدا شوێنێکی بۆ هەستی هاوخەمیش لەبەرچاو گرتبوو، ئەگەر هەستی پاراستنی خود بۆ خەڵکی بەرفراوان بکەیتەوە دەبینیت کە هەستی هاوخەمی بەدەستدێت.

ڕۆسۆ لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا هەوڵیداوە کە پەیوەندییەك لە نێوان ئازادی مرۆڤ لەباری سروشتیدا و ڕێکی کۆمەڵایەتی خوازراو لە کۆمەڵگا دروستبکات. ئەگەر گرێبەستی کۆمەڵایەتی بە نەخشەی کۆمەڵگای ئایدیالی لە داهاتوودا تەماشا بکەین لەم حاڵەتەدا دەکرێت بڵێین مرۆڤ کە بە سروشتی ئامادەبوونی هەیە بۆ باش بوون لە میانەی ڕەوتێکی کامڵبوون و بە پەنابردن بۆ سیاسەت دەتوانێت بگاتە سروشتە ئەخلاقییەکان بەواتا دروستەکەی. مرۆڤ دەگاتە ئازادی ڕاستەقینە، چونکە گەرچی لەباری سروشتیدا ئازادی هەیە بەلام بە ناسین نەگەیشتووە. ڕاست و ناڕاست نەهاتوونەتە بوون. دەوڵەت ویستە جۆراوجۆرەکان هەماهەنگ دەکات و بەرەویەك مەبەست بەرێیاندەکات. لێرەدا دەکرێت چەند خاڵێکی

22- Actuol.

٢٣- ست کاسیرر، پێشوو، ل ٧٤.



لێکچوون لە نێوان تیۆرەکەی ڕۆسۆ و بیری هیگڵدا بدۆزرێتەوە. بەلام دەبێت ئەو خاڵە لەبەرچاو بگیردرێت کە ڕێکیی جێ مەبەستی ڕۆسۆ بەو جۆرەی کە لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا هاتووە پەیوەستە بە ئایندەوە. ڕێکییەکە کە دەبێت پێی بگەین. وەها ڕێکییەك پەیوەندی پەیدا دەکات لەگەڵ بیری ئۆرگانیستی دەوڵەتدا.

ڕۆسۆ بەدوای وەها سیستەمێکی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە کە تیایدا هەموو تاکێك لەوکاتەی کە لەگەڵ هەمواندا یەکیگرتووە لە یەکبووندایە لەگەڵیان بەردەوام پەیڕەوی لە خۆی بکات و هەروەکو بەر لە پەیوەندیکردن بە کۆمەڵەوە بە ئازادی بمێنێتەوە. هەروەك ئاماژەمان پێکرد گرێبەستی کۆمەڵایەتی بەو جۆرەی کە ڕۆسۆ گوزارشتی لێوە دەکات بنەماکانی وەها کۆمەڵگایەك دیاریدەکات. بەلام چۆن وەها شتێك دێتە دی؟ چۆن تاك لە کۆمەڵگادا تەنها پەیڕەوی لەخۆی دەکات؟ چۆن لە کۆمەڵگایەکدا کە هێشتا تیایدا سوود لە هێزی زاڵبوون وەردەگیرێت ئەو کەسەی کە دەکەوێتە بەر زاڵبوون بەردەوام بە ئازادی دەمێنێتەوە؟ وەلامی ڕۆسۆ ئەوەیە کە کاتێك کەسێك دەسەلاتی خۆی بە ویستی گشتی دەسپێرێت لەبری ئەوەی کە لەگەڵ تاك یاخود چەند تاکێکی دیاریکراو (بەناونیشانی حکوومەت) بوویێتە لایەنی گرێبەستی پێی ناوەتە نێو کۆمەڵێکی ئەخلاقییەوە کە ئەوی کردۆتە بەشێکی جیانەکراوەی خۆی و کۆمەڵگا.

تیۆری ویستی گشتی کە لە کتێبی گوتار لە ئابووری سیاسیدا خراوەتە ڕوو فەلسەفەی سیاسیی بەرەو مەیدانگەلێکی نوێ پەلکێشکردووە. ڕۆسۆ لەم کتێبەدا پاش ئەوەی جیاوازی نێوان دەوڵەت و خێزان دەخاتەڕوو بەم شێوەیە درێژە بە قسەکان دەدات کە دەوڵەت ((بوونێکی ئەخلاقی خاوەن ویستە. بەردەوام ئەم ویستە گشتییە ڕووە و پاراستنی خۆشبەختی کۆمەڵ و یەك بەیەکی تاکەکانە. بۆ ئەندامانی ولات سەرچاوەی یاساکانە. یاساگەلێك کە پێوەری دادپەروەری و نادادپەروەرین. ویستی گشتی گشتیترین ویستی خەڵکییە و بەردەوام ڕووە و باشە و بەرژەوەندی هەموانە. مەشروعییەتی حکوومەت (دەستەی فەرمانڕەوایی) بەستراوەتەوە بە پەیڕەوی لێکردنی ویستی گشتییەوە و دەبێت هەموو شتێك لە ولاتدا پەیڕەوی لە ویستی گشتی بکات. دەبێت ویستە پاژییەکانی تاك و کۆمەڵەکانی ناو ولات پەیڕەوی لە

ویستی گشتی بکەن و فەزیلەت شتێکی دیکەی جیا لە پێکەوە گونجانی ویستە پاژییەکان لەگەڵ ویستی گشتی نییە[٢٤])).

ئەوەی رۆسۆ دەربارەی ویستی گشتی وتوویەتی لە سنووری خاڵە گشتییەکان دەرنەچووە، بۆیە لەم رووەوە لە رونکردنەوەی رای ئەو دەربارەی ئەوەی کە ویستی گشتی بەدروستی چ واتایەك دەگەیێنێت باسگەلێکی زۆر بە ئەنجامگەیشتوون. بۆ ئەوەی بزانین بە بۆچوونی رۆسۆ ویستی گشتی چییە دەبێت سەرەتا لەو خاڵە وردببینەوە کە مەبەستی رۆسۆ لە ویستی گشتی چ شتێك نییە. رۆسۆ دەڵێت رەنگە هەندێك لە بڕیارەکانی دەستەی یاسادانەری نەتوانێت دەربڕی ویستی گشتی بێت. هەروەها ویستی گشتی رووی هاوبەشی ویستە پاژییەکانیش نییە. ئەو شێوەیەی کە رۆسۆ بۆ دەرکەوتنی ویستی گشتی دەیخاتەڕوو لەگەڵ ئەم تێگەیشتنەدا ناگونجێت. لە حکوومەتی جێی مەبەستی رۆسۆدا هەموو هاوڵاتییەك دەتوانێت بڕوا و رای خۆی بەجیا لە خەڵکی دەربڕێت ئەوکات هەر شتێك لە تەواوی ئەم بڕواو ڕایانە هاوبەش بوو وەکو ویستی گشتی رابگەیەندرێت. رۆسۆ دەڵێت ویستی گشتی تەنها لە کۆڕی مرۆڤە یەکسانەکان کە ئازادانە باس لە قازانجە هاوبەشەکان دەکەن دێتە بەرهەم. بەڵام لە درێژەی وتەکانیدا دەڵێت ئەگەر ویستی گشتی بڕیارێك بێت لەسەربنەمای سازش کە لە گفتوگۆکانەوە بەدەست دێت هێشتا ناکرێت بەویستی گشتی دابنرێت. ویستی گشتی کاتێك بەدەستدێت کە هاوڵاتیان هەریەك بەجیا (لە دەرەوەی کۆمەڵەکان و پارتەکان) و بەشێوەی راستەوخۆ و تاکەکەسیی بۆچوونی خۆیان دەربڕن تاوەکو لە کۆی ئەوانەوە ویستی گشتی دروستببێت. رۆسۆ پارت و گرووپەکان و لایەنەکان و کۆمەڵە نێوانکارەکان بەرێگری دیارکەوتنی ویستی گشتی راستەقینە لەقەڵەمدەدات[٢٥].

رۆسۆ لایەنگری دیموکراسی راستەوخۆ بوو و دیموکراسی نوێنەریی بە هاوجۆر نەدەبینی لەگەڵ تیۆرەکەی خۆیدا. هەروەك ئاماژەی پێکرا فەرمانڕەوایی کە پەیوەست بوو بەویستی گشتییەوە بە شیاوی گواستنەوەی دانەدەنا بۆ نوێنەرەکان. فەرمانڕەوایی ویستی گشتی لەخۆ دەگرێت و ناکرێت ویستی گشتی بە نوێنەرایەتی بسپێردرێت.

٢٤- فەدریك کاپلستون، پێشوو، ل ٨٥.

25- J. I. Macadam, op, cit, p III.






هەروەها ویستی گشتی ویستی زۆرینە، هەرچەندە کە هەندێ کات رۆسۆ بە جۆرێك باس لە ویستی گشتی دەکات کە دەکرێت واتای ویستی زۆرینەی لێوە هەڵبهێنجێندرێ. رەنگە ویستی گشتی لە یەك تاکدا واتە یاسادانەر کە بە خەڵکی نیشاندەدات چ شتێك باشە بۆیان بەرجەستە ببێت. هەڵبەتە ئەم کارە بەگشتی لە دەستپێکی ژیانی دەوڵەتدا روودەدات. هەروەها کاری یاسادانەر تەنها لە رێگەی قەناعەت پێ هێنانەوە بەرەو پێش دەچێت و بونی ئەو پێ شێلکردنی بنەڕەتی فەرمانڕەوایی خەڵکی نییە. هەروەها ویستی گشتی جیاوازە لە ویستی هەمووان[٢٦]. لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بە ئاشکرا ئاماژە بەم بابەتە کراوە[٢٧]. بەڵام لەوێدا هێشتا وێنایەکی بۆ ویستی گشتی هەیە کە زۆر لە رای گشتی (هەڵبەتە نەك زۆرینە لە شێوەی حکوومەتی نوێنەرایەتیدا) جیاواز نییە. لەگەڵ ئەمەیشدا هەر لەوێدا ئاماژەی بەو بابەتە کردووە کە ویستی گشتی ویستێکە کە دەڕوانێتە قازانجی هاوبەش. بەڵام ئێستا قازانجی هەمووان کە رووە و قازانجە تایبەتەکان بووە بە ویستی گشتی کۆتایی نایەت. لە کاتێکدا کە لە کۆکردنەوە و لێدەرکردنی ئەو ویستە پاژییانەی کە رووەو قازانجی گشتین قازانجی گشتی بەرهەمدێت.

لە راستیدا ویستی گشتی بەو واتایە گشتییە کە ویستی بکەرێکی گشتی یان بەڵگەیەکی گشتی واتە خەڵکی خاوەن فەرمانڕەواییە. لەگەڵ ئەوەدا جەختکردنەوەی رۆسۆ لەسەر گشتی بوونی بابەتەکە گشتی بوونی بابەتی ناسین (بەرژەوەندی گشتی)یە. هەروەك باسمانکرد ناکرێت بەسادەیی ئەم ویستە گشتییە لەگەڵ بەرهەمی کۆی ویستی پاژییەکان کە وەکو زۆرینەی دەنگەکان یاخود تەنانەت رێکەوتنی دەنگەکان دەخرێتەڕوو بەیەك شت لەقەڵەمبدرێت، چونکە رەنگە ئەنجامی دەنگەکان دیارخەری وێنایەکی نادروستبێت بۆ باشەی هاوبەش. لەبەر ئەمەیە کە دەڵێین سەرنجی رۆسۆ رووەو بابەت و بارکراوە نەك بکەر و بارکەر. ویستی هەموان لە هەڵە بەدوور نییە و تەنها ویستی گشتی هەڵە هەڵنەگرە. هەڵبەتە لە هەمان کاتدا بکەری گشتی (خەڵکی خاوەن فەرمانڕەوایی) کە بەرهەمی گرێبەستی کۆمەڵایەتییە لە گەراندایە بەدوای باشەدا. رەنگە خەڵکی ئاسایی نەتوانن ئەم باشەیە دەستنیشانبکەن و پێویست بە رۆشنگەرانێك هەبێت بۆ گەیشتن بە ویستی گشتی تاوەکو ویستی گشتی بە تەواوی توانایی خۆیەوە بەدیارکەوێت. لەم خاڵەدا بۆچوونی رۆسۆ لەلایەکەوە پەیوەندی هەیە لەگەڵ بیری فەیلەسووفە

26- Will of All.

٢٧- ژان ژاك روسو، قرارداد اجتماعی، ترجمه منوچهر کیا، تهران، انتشارات گنجه، ١٣٥٣، ل ٣٤.

کلاسیکەکانی یۆنان و لەلایەکی ترەوە پەیوەندی هەیە لەگەڵ تیۆری نەوکانتیەکاندا. بەڵام ئەوەی کە بۆچوونی رۆسۆ دەبەستێتەوە بە فەیلەسووفە کلاسیکەکانی یۆنانەوە بریتییە لە بڕوا داربون بە باشە و فەزیلەت وەکو مەبەستی ژیانی سیاسی[٢٨]. هەروەها جیاوازبوونی توانایی مرۆڤەکان لە گەیشتن بە مەعریفە وەکو بناغەی سەرەکیی فەزیلەت. بەم جۆرە نابێت لەیاد بکرێت کە رۆسۆ بڕوای بە توانا و لێهاتوویی سروشتی نییە بۆ توانایی بەدەستهێنانی مەعریفە و فەزیلەت، هەروەها بڕوای بەسەرچاوەی میتاییش نەبوو بۆ عەقڵی دۆزەرەوەی باشە. بۆیە نابێت ئەم بۆچوونەی رۆسۆ بەهاوتا دابنرێت لەگەڵ بانگەشەکانی فەلسەفەی یۆناندا.

بۆچوونەکەی رۆسۆ تا ئەوجێیەی کە ئاماژە بە رۆڵی رۆشنگەرانی دەکات لە رێنماییکردنی خەڵکی (نەك فەرمانڕەوایی کردن بەسەر خەڵکییەوە)دا پەیوەندییەکی هەیە لەگەڵ بیری سیاسی نوێ، بەتایبەت بۆچوونەکەی هابرماس دەربارەی ((سنووری گشتی)) وەکو شوێنی باس و رەخنەی پرسە سیاسییەکان و رێنماییکردنی سیاسەت دانانی گشتی. زیاد لە هەموو شتێکی تر ئەم بۆچوونەی رۆسۆ خاڵێکی دەستپێکە بۆ تیۆرەکەی هیگڵ دەربارەی بەشداریی سیاسی.

## ویستی گشتیی رۆسۆ و بەشداریی گشتی هیگڵ

هەروەك پاشتر بەدوورودرێژی دێینەسەری، هیگڵ بەشداری سیاسی بەشتێکی گشتی و هەمووانی[٢٩] دەناسێت. دەوڵەت بەرهەمی وەها بەشدارییەکە. بەشداری گشتی و هەمووانی واتە ئەوەی کە یەکەمجار هەموانییە و دووەمیش بۆ قازانجی هاوبەشە (نەك تەنها قازانجی کەسی و تایبەتی). جیاوازی رۆسۆ لەگەڵ هیگڵ لەوەدایە کە رۆسۆ عەقڵ و ویست بەتاکەکەسی و یەك هۆشی دەزانێت، لەکاتێکدا کە هیگڵ بە کۆمەڵی و نێوان هۆشەکانی دادەنێت. ئەگەر تۆ پەیوەندی بە کۆمەڵێکەوە بکەیت سروشتییە کە قازانجی کەسی خۆتت لە بەرچاوگرتووە و بۆ ئەو قازانجە بەم کارە هەڵساویت. بەڵام ئەگەر تەنها بەپێی قازانجی خۆپەرستانەی خۆت کاربکەیت و خەڵکیش تەنها بیر لە قازانجە خۆپەرستانەکانی خۆیان بکەنەوە، ئیدی شوێنێك بۆ وەها کۆبوونەوەیەك نامێنێتەوە. کەواتە تۆ ناچاریت بیر لە قازانجی خۆپەرستانەی خۆت

---

٢٨- لئو اشتراوس، فلسفه سیاسی چیست، ترجمه دکتر فرهنگ رجایی، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٣، گفتار دوم.

29- Universal – general.





نەکەیتەوە بەڵکو قازانجی گشتیی کۆمەڵەکەیش لەبەرچاو بگریت. ئەگەر تۆ بەم شێوەیە بیر بکەیتەوە و خەڵکیش هەمان شێوە بیربکەنەوە و کاربکەن ئەو کۆمەڵە دەبوژێتەوە و گەشە دەکات. لەم حاڵەتەدا گیانێکی بە کۆمەڵ یان ویستێکی بە کۆمەڵ دروستدەبێت. کەواتە ویستی گشتی و هەمووانی ویستی ئەو هاوڵاتییانەیە کە قازانجی تایبەتی خۆیانیان ناوێت. بەڵکو خوازیاری قازانجە باش و هاوبەشەکانن بەم جۆرە ویستی گشتی واتە خواستی هەموان بۆ باشەی گشتی[٣٠].

ئەوەی کە رۆسۆ لە درێژەی ئەم باسەدا دێتەسەری دووبارە خاڵێکی دەستپێکە بۆ تیۆری ئۆرگانیستیی هیگڵ دەربارەی دەوڵەت و جێی گرنگییە بۆ تێگەیشتنی تیۆرەکەی هیگڵ و رۆسۆ. رۆسۆ لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێت ئەو ویستەی کە باشترین بەرژەوەندی دەوڵەتی دەوێت باشترین ویستی تاکە و راستەقینەترە لەو ویستەی کە خوازیاری قازانجی تاکەکەسییە. هەموو کردارێك ئەنجامی ویستە بەڵام ئەو ویستەی کە رووە و باشە و بەرژەوەندی گشتییە لەرووی ئەخلاقییەوە لە پێشترە لە ویستەکانی تر. هەندێ کات وادێتە پێش چاو کە رۆسۆ لە ویستی گشتییەوە ((عەقڵی گرووپی)) دەردەهێنێت. عەقڵی گرووپ لێکدراوی باشترین ویستەکانی تەواوی هاوڵاتیانە کە باشترین قازانجی دەوڵەتیان دەوێت. دەکرێت لێرەدا رێگەیەك بەرەو عەقڵی جۆریی ناو سیستەمی فەلسەفەی هیگڵ بدۆزنەوە. بەڵام نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە رۆسۆ هێشتا لە چوارچێوەی عەقڵی تاکەکەسیدا بیردەکاتەوە.

ویستی گشتی فەرمانڕەوایی باڵا و کۆتاییە. لەبەرئەوەی ویستی گشتی ویستی راستەقینەی تاکە بۆیە دەبێت لە دەوڵەتدا فەرمانڕەوا بێت و تاکیش دەبێت پەیڕەوی لێبکات. ئەگەر کەسێك لەرووی خۆپەرستی و تەماحکارییەوە نەیەوێت پەیڕەوی لێبکات ئەوا ویستی گشتی ئەو دەسەڵاتە مەشروعەی هەیە کە ئەو کەسە ناچارە بە پەیڕەوی لێکردن بکات. ویستی گشتی تەنها ویستێکە کە دەتوانێت تاك ناچار بە پەیڕەوی لێکردنی خۆی بکات. ئەم ناچارکردنە پێشێلکردنی بنەڕەتی ئازادی تاك نییە. بیرمەندانی پێش رۆسۆ چ ئەوانەی کە لەسەربنەمای ماف ئازادیان دیاری دەکرد (هۆبز و لۆك) و چ ئەوانەی کە بەپشتبەستن بە قازانج باسیان لێوە دەکرد (بێنتهام و هیوم) رووبەرووی ئەو لوغزەبوون لەبیردا کە چۆن پرسی ئازادی تاك و کۆتی ملکەچیکردن بۆ دەوڵەت پێکەوە بگونجێنن. ئەگەر تاکەکان بۆ ئەوە لە کۆمەڵگادا کۆبوونەتەوە تاوەکو پارێزگاری لە ماڵ و ئازادی خۆیان بکەن ئایا بە

---

30- C. L. Wayper, op. cit, p. 144.

قبوولکردنی کۆت و بەندەکانی کۆمەڵگای ڕێکخراو ئازادی خۆیان لەدەست نەداوە؟ ئایا لەبری ئازادبوون بە پێچەوانەوە ملکەچ نەکراون؟ ئایا ئەوە دژیەك بێژی نییە گەر بڵێین تاکەکان بە ملکەچ بوون و فەرمانبەری ئازاد دەبن؟ تیۆری ویستی گشتی ڕۆسۆ بەم شێوەیە ئەم گرفتە چارەسەر دەکات کە دەڵێت تاکەکان لە کۆمەڵگادا دەبنە پەیڕەوی لێکەری یاسا (نەك شوێنکەوتووی حکوومەت) و یاسا دیاریکەری ویستی گشتییە. ویستی گشتیش ویستی ڕاستەقینەی تاکە. کەواتە هەموو کەسێك بە پەیڕەوی لێکردنی یاسا پەیڕەوی لە عەقڵ و جیاکاری و ویستی ڕاستینەی خۆی کردووە، و پەیڕەویکردن لە عەقڵ و جیاکاری و ویستی خۆی واتە ئازادبوون[٣١].

هەروەك بینیمان ناکرێت بە بنەما و گریمانەکانی سوودگەرایی وەڵامی ئەم گرفتە بدرێتەوە. لە تیۆری سوودگەراییدا هەر کەسە و بەدوای قازانجی خۆیدا دەگەڕێت و قازانجی گشتیش شتێکی دیکەی جیا لە بەرهەمی کۆی قازانجە پاژییەکان نییە. ئەگەر ستوارت میل بە پێچەوانەی پێشینانی ئاماژە بەجۆرێك ویستی بەکۆمەڵ دەکات تەنها بەقیمەتی لادان لە گریمانەکانی سوودگەرایی کۆتایی دێت. بنەماکانی بوونناسی و مەعریفەناسیی نۆمینالیستی کە بناغەی سوودگەرایین ڕێگە بەوەها ڕێرەرەوێك نادەن. بەڵام ڕۆسۆ بڕوای وایە کە دەبێت تاك لە کۆمەڵگادا و کۆمەڵگا لەتاکدا بناسرێت. ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت سیاسەت و ئەخلاق (ئەخلاقی دامەزراو لەسەر دەروونناسی تاك) بەجیا لەیەکتر بخەنە بەرتوێژینەوە هەرگیز نە بە سیاسەت دەگەن و نە بە ئەخلاق. ئەخلاقیات کاتێك دێتەبوون کە مرۆڤ دەست بەناسینی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ هاوجۆرەکانی دەکات.

ویستی گشتی تەنها لە پرسە گشتی و هاوبەشەکان دەکۆڵێتەوە و پەیوەندی بە پرسی کەسی و تایبەتیەکانەوە نییە. بەڵام هەر خودی ویستی گشتی تەنها بڕیاردەرە دەربارەی ئەوەی کە چ شتێك لە قازانجە گشتییەکانە و چ شتێك لە ریزی قازانجە تایبەتییەکان دادەنرێت. هەر لەبەرئەمەیە کە هەندێك ڕۆسۆیان بە توتالیتاریانیزم تاوانبار کردووە. لە تیۆرەکەی ڕۆسۆدا تاك ناتوانێت شکایەت لە دژی ویستی گشتی بکات و بەم شێوەیە هیچ شتێك و لەوانەش مافی خودایی و مافی سروشتی یان سوود و سودمەندی دەسەڵاتی ویستی گشتی سنووردار ناکات. ویستی گشتی دەتوانێت ئاینێکی نوێ بۆ دەوڵەت (کۆمەڵگا) هەڵبژێرێت و لەم حاڵەتەدا تاکەکان دەبێت پەیڕەوی لێبکەن. بەم شێوەیە ڕۆسۆ جەخت دەکاتەوە کە ویستی گشتی دەبێت

31- C. L. Waypaer, op. cit, p. 145.



تەنها گرنگی بە پرسە گشتی و هاوبەشەکان بدات و خۆی لە بوارە تایبەتییەکان بەدوور بگرێت. ڕۆسۆ بەتایبەتی موڵکداری تایبەتی قبووڵدەکات بەڵام بۆئەوەی دەوڵەمەندەکان بە پارە یاسانەکڕن و هەژارانیش لەپێناو ناندا ئازادی نەفرۆشن چەند سنوورێك لە یەکسانی بە پێویست دەزانێت بۆ موڵکداری تایبەتی[٣٢]. بەهەرحاڵ لە میکانیزمی تیۆریی ڕۆسۆ موڵکداری بەرزترن لە یاسا و ویستی گشتی. ئەگەر موڵکداری دەستدرێژی بکاتە سەر چوارچێوەی دەسەڵاتی گشتی و نفووزی سیاسی بەدەستبێنێت، زیان بە مەبەستی کۆتایی یاسا دەگەیەنێت، بۆیە مەشروعیەتی خۆی لەدەستدەدات. بۆیە نابێت هیچ هاوڵاتییەك هێندە دەوڵەمەند بێت کە خەڵکی بکڕێت و نە ئەوەندەیش هەژار بێت کە خۆی بفرۆشێت. ئەگەر ڕێزداری مرۆڤ و دەسەڵاتی یاسا وەکو شتوومەك لە بازاڕدا کڕین و فرۆشتنیان پێوە بکرێت بەتەواوی واتای خۆیان لەدەستدەدەن.

ویستی گشتی هەڵە هەڵنەگرەو هەمیشە ڕەواو ڕووەو قازانجی هەموانە. هەڵبەتە ئەوەی کە هەموو کات ڕەوایە بەو واتاییە نییە کە هەمیشە هەموو شتێك بە باشی دەستنیشان دەکات و تووشی هەڵە نایەت. ئەگەر دەوڵەت وەها هەڵەیەك بکات و بە ناعەقڵانی ڕەفتار بکات خۆی ڕەتکردووەتەوە و چیدی دەوڵەت نییە. هەندێك لە توێژەران حەزدەکەن ویستی گشتی بە هاوشێوەی ئایدیالی نەتەوەیەك لەقەڵەمبدەن کە بە مێژوو و نەریت و دامەزراوەکانیدا بڵاو دەبێتەوە. ئەم ئایدیالە خاوەن فۆرمێکی تایبەتیی هەمیشەیی نییە بەڵکو لە سایەی کامڵبوونی نەتەوەدا لەبەردەم گوزارشت و لێکدانەوەدایە. شوێنی یاسادانەریان تیۆردارێژ و ڕۆشنگەر لە نیشاندانی ویستی گشتیدا لە وێدایە کە دەتوانن بە نەتەوە بڵێن ((لە ڕاستیدا چیان دەوێت)). لەباری ئایدیالیشدا ئەو هاوڵاتییە نوێیەی کە ڕۆسۆ دەیەوێت بە گۆرینی پێکهاتەی کۆمەڵگا دروستیبکات مرۆڤێکی جیاوازە لەوەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بە گەندەڵی دەیبینین. ئەو هاوڵاتیە نوێیەی کە وتمان دەبێت سیاسەت دروستیبکات لە نامۆبوون لەخۆی و لە خەڵکی ڕزگاری بووە. هاوڵاتی دنیایەکە کە تیایدا هیچ کەسێك کەسێکی تر وەکو ئامرازێك بۆ مەبەستەکانی خۆی یان ڕکەبەر لە بەرامبەر خۆی تەماشای

32- F. M. Barnard, "Will and political rationality in Rousseu" in Lively and Reeve op. cit, pp. 129-147.

ناکات. ئەم مرۆڤە لەو گەندەڵییەی کە مێژوو بەسەریدا سەپاندووە رزگاربووە و تەنانەت لە رووی دەروونناسیشەوە گۆڕاوە بۆ مرۆڤێکی نوێ[٣٣].

لە بونیادنانی کۆمەڵگای نوێدا فەلسەفەی سیاسی و فەیلەسووفە سیاسییەکان رۆڵیان هەیە. بۆیە سیاسەت کە لەبیری رۆسۆدا رۆڵی دروستکەری کۆمەڵگای نوێ لەخۆ دەگرێت رۆڵی دەرمانکردنی کەم و کورتی رۆحیی مرۆڤەکانیشی لەخۆیدا هەڵگرتووە. سیستەمی ژیانی سیاسی بەرز کە سیاسەت دەبێت دروستیبکات سەبارەت بە دەروونی تاکەکانیش شوێنی باشبوون و گێڕانەوەی هاوسەنگییە لەدەست چووەکانە. لەوەها سیستەمێکدا نەخۆشیگەلێکی وەکو خۆپەرستی و دووڕوویی و لاوازی و پەرێشانی و تەمبەڵی کە هەموو پەیوەستن بە کەلتووری هەلوەشاوەکەوە تیمار و چارەسەر دەکرێن[٣٤]. رۆسۆ بۆ خۆیشی دەزانێت کە وەها وەرچەرخانێك بە یەك جار روو نادات، بەڵکو شتێکی بەرە بەرەیە. رۆسۆ بیر لە یەکێتی ژیانی تاکەکەسی و کۆمەڵی دەکاتەوە، ئەو شتەی کە لە ژیانی سیاسیی یۆنانی کۆندا هەبوو و پاشتر هیگڵ لەبیری خۆیدا گەڕایەوە بۆی و مارکس لە تیۆرەکەی خۆیدا فراوانی کرد و پەرەی پێدا.

## عەقڵ و ئازادی و ویستی گشتی

هەندێك لە توێژەران کەلێنێك دەبینن لەنێوان هەردوو کتێبی گوتار دەربارەی نایەکسانی و گرێبەستی کۆمەڵایەتی رۆسۆدا و وایدادەنێن کە گوتار دەربارەی نایەکسانی ستایشی باری سروشتی و مرۆڤی سروشتی و بانگەشە بۆ گەڕانەوە بۆ باری سروشتییە و گرێبەستی کۆمەڵایەتیش دەربارەی نەخشەی دەوڵەتێکی ئایدیالییە. بەڵام هەندێکی تری راڤەکاران بەپشتبەستن بە چەمکی ناوەندیی سەربەخۆیی یان ئازادی و خود رێسایی مرۆڤ پەیوەست بوونێکی لۆژیکی لەنێوان ئەم دوو بەرهەمە و تەواوی بیری رۆسۆدا بەدیدەکەن. ئەم کۆمەڵەی راڤەکاران بڕوایان وایە چەمکی خودرێسایی یان ئازادی ناوەند و چەقێکە کە ئەم دوو بەرهەمە و بیری رۆسۆ دەکاتە خاوەن پێوەندێکی ناوەکی[٣٥].

33- James Glass, "political philosophy as therapy: Rousseu and pre-social origih's consciousness" political Theory, vol 4, No. 2, may 1976, pp. 163-183.
34- Marshall Berman, "Liberal and totalitarian therapiesin Rousseau", political Theory, vol 4, No 2, May 1976, pp. 185-194.
35- J. I. Macadam, op. cit.



رۆسۆ خودرێسایی یان ئازادیی بەدوو واتا بەکاربردووە: یەکەم شوێن نەکەوتنی ویستی خەڵکی و دووەم شوێن نەکەوتنی حەزەکان. ئەو کەسەی کە شوێنکەوتووی حەزەکانە هێندەی ئەو کەسەی کە شوێنکەوتووی ویستی خەڵکییە کۆیلە و بەردەیە. بەم شێوەیە ئازادی لە روانگەی رۆسۆوە جیاوازە لەگەڵ ئازادی لە واتا ئاسایی و رەشۆکییەکەی واتە: ئەوەی کە مرۆڤ حەزی لێیەتی ئەنجامیبدات. ئازادی بەو واتایەی کە رۆسۆ مەبەستێتی بە واتای هەڵسوکەوتی بێ بەند و جیا لە خەڵکی نییە، بەڵکو دروست بەپێچەوانەی ئەم واتایەوە واتە جۆرێك بەشداریکردن لە ژیانێکی بەرفراوانتر و هەروەك پاشتر دێبینە سەری واتە بەشداریکردن لە ویستی گشتی.

رۆسۆ لە هەردوو کتێبی گوتار دەربارەی نایەکسانی و گرێبەستی کۆمەڵایەتی مامەڵە لەگەڵ ئەو بابەتەدا دەکات کە مرۆڤ چۆن لە قۆناغەکانی یەکەمی باری سروشتیدا سەربەخۆ و ئازادە، پاشان چۆن لە ئاکامی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەباری سروشتیدا روو دەدەن ئازادی و سەربەخۆیی خۆی لەدەستدەدات (مرۆڤ بە ئازادی دروستکراوە بەڵام لە هەموو شوێنێکدا کۆت کراوە) و لە ئەنجامدا (هەروەك لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا دەیخاتەڕوو) چۆن دەتوانێت و دەبێت بە هاوکاری عەقڵی کۆمەڵایەتی و بەپێکهێنانی سیستەمێکی نوێ (نەك بە گەڕانەوە بۆ باری سروشتی) سەرلەنوێ ئازادی و سەربەخۆیی خۆی بەدەست بێنێتەوە[٣٦]. بۆ روونکردنەوەی زیاتر و بەتایبەتی بۆ دیاریکردنی پێگەی عەقڵ لەم وەرچەرخانەدا دەبێت چاوێك بە بۆچوونی رۆسۆ دەربارەی باری سروشتی و گۆڕانی باری سروشتی بخشێنین. بەپێی بۆچوونی رۆسۆ مرۆڤ لەباری یەکەمدا یاخود لە قۆناغە یەکەمەکانی باری سروشتیدا بە هەردوو واتا ئازاد بووە (نە شوێنکەوتووی ویستی خەڵکی بووە و نەبەردەی حەزەکان). مرۆڤەکان جیابوون لە یەکتر و یەکتربینین و چاوپێکەوتنەکانیان شتێکی بەرێکەوت بوو. کەواتە هیچ کەسێك شوێنکەوتووی ویستی کەسێکی تر نەبووە. تەنانەت ئەگەر کەسێك ئاسکێکی راوبکردایە و کەسێکی تر بەزۆر لەوی بسەندایە ئەم کارە بە نایەکسانییەکی سروشتی لەقەڵەمدەدرا نەك شوێنکەوتنی ویستی کەسێکی تر. لەراستیدا وەکو ئەوە وابوو کە شێرێك نێچیری گورگێك برفێنێت. شکەست خواردنی کەسە لاوازەکان لە بەرامبەر کەسە بەهێزەکان بەکارێکی سروشتی دادەنرا. بەڵام ئەم نا

٣٦- یەکێك لە لێکۆڵەرەکان کە ناوی جین ستار و بینسکییە ئەم دەربڕینە رەت دەکاتەوە. ر. ك:
Jean Starobinski, Jean Jacque Rousseau, Transparency and Obstruction, (Chicago, Gold Hammer, 1988).





یەکسانییە سروشتییە نەگۆڕابوو بۆ نایەکسانی کۆمەلاّیەتی. مرۆڤی سروشتی شکەست خواردووی حەز و خواستە نەفسییەکانیش نەبوو، چونکە خواست و پێداویستییەکانی سنووردار و لەگەڵ یەك گونجاو بوون. تەنها شتگەلێکی دەناسی و دەیویست کە توانای بەخاوەن بونیانی هەبوو.

بەلاّم ئەم ئاژەڵە نەجیبە(٣٧) لە یەك شتی گرنگ بێبەش بوو و ئەویش بریتیبوو لە هەستکردن بە خود یان خود ئاگایی و هۆشیاری(٣٨). بۆیە لەگەڵ ئەوەی کە ئەم ئاژەڵە نەجیبە ئازاد و سەربەخۆیە، بەلاّم بێ ئاگایە لەسەربەخۆیی خۆی و وەکو تاکێك هیچ لەبارەی خۆیەوە نازانێت. بەم پێیە گەرچی سەربەخۆ و ئازادە بەلاّم بێ ئاگایە لە ئازادی خۆی. تەنزی گوتار دەربارەی نایەکسانیش لەم خاڵەدا حەشارماوە. سەربەخۆیی بەرزترین بەهایە بۆ مرۆڤ بەلاّم کاتێك کە مرۆڤ هەیبوو لێی بەئاگا نەبوو، بەواتایەکی تر نەیدەتوانی هەیبێت، بەلاّم نەزانی پاکی مرۆڤی سەرەتایی شیاوی گەڕاندنەوە نییە. بەم پێیە گرێبەستی کۆمەلاّیەتی بەدواداگەڕانی هەلومەرجێکی نوێیە بۆ ئازادی و سەربەخۆییەکی نوێ(٣٩).

ڕۆسۆ دەڵێت لە کۆمەڵگای نوێدا مرۆڤ ئازادی و سەربەخۆیی نییە و لە هەلومەرجی ئێستایشدا ناتوانێت سەربەخۆیی بەدەستبێنێت. کامڵبوونی بەرە بەرەی مرۆڤ ئەوی بەرەو ئەم بارە پاڵ پێوەناوە. مرۆڤی سەرەتایی لەسەرەتادا بەهۆی پێداویستییەکانیەوە بەشێوەی چەند کۆمەڵێکی پێکهاتوو لە خێزانەکان لە دەوری یەکتر کۆبوونەوە. لێرەدا بوو کە جیاوازییە سروشتییەکان و توانا تاکەکەسیەکانی وەکو هۆش و توانا و لێهاتوویی و هتد کە پێشتر بێ بایەخ بوون ڕۆڵ و گرنگیان وەرگرت. لەم کاتەدا بوو کە مرۆڤەکان لە پەیوەندی لەگەڵ یەکتردا ئاگایی و هۆشیاریان لەبارەی خۆیانەوە بەدەستهێنا. هاوکات لەگەڵ ئەم وەرچەرخانانەدا پەیوەستبوون بە یەکترەوە شوێنی سەربەخۆ و جیابوون لە یەکتری گرتەوە. خود ئاگایی کە لە هەلومەرجە نوێیەکەدا لە ئەنجامی بەراوردکردنی خود لەگەڵ خەڵکیدا وەدی هاتبوو یەکەمین هەنگاوبوو لە نایەکسانیدا. تایبەتمەندیگەلێکی وەکو: خۆ بەزلزانی و لووتبەرزی و تەماح و ئیرەیی و چەندانی تری لەم شێوەیە لەوەها هەل و مەرجێکدا سەریان هەڵدا. ئێرە هەمان ئەو خاڵەیە کە باسمانکرد ڕۆسۆ تیایدا لە هۆبز جیادەبێتەوە و ڕەخنەی لێدەگرێت.

37- Noble Savage.
38- Consciousness.
39- Jean Starobinski, op. cit, p. 122.






کەواتە ئەم ئاگا بەخۆ بوونەیە کە جیاوازی بنەڕەتی نێوان باری سەرەتایی و باری کۆمەلاّیەتی و مرۆڤی سەرەتایی و مرۆڤی کۆمەلاّیەتی دیاریدەکات. مرۆڤی سەرەتایی هەمیشە لەناوخۆیدا دەژی، لە کاتێکدا کە مرۆڤی مەدەنی (مرۆڤی کۆمەلاّیەتی) هەمیشە لە دەرەوەی خۆیدا دەژی. مرۆڤی کۆمەلاّیەتی لە ئاوێنەی ڕوانینی خەڵکیدا خۆی دەناسێت. بۆیە تاك گرنگی بە خەڵکی و بەباش زانین و بەخراپ زانینی خەڵکی دەدات و هەوڵدەدات بەو شێوەیەی لێبێت کە خەڵکی دەیانەوێت. لێرەدا تیۆرەکەی ڕۆسۆ یەکێك لە کەم و کورتییەکانی تیۆرەکەی لۆك ڕاستدەکاتەوە کە ئەویش بریتییە لە حەزکردن بە بەدواداگەڕانی بێسنووری موڵکداریی کەسی. لۆك ڕوون ناکاتەوە بۆچی دەبێت مرۆڤ زیاتر لە پێداویستییەکانی خوازیاری موڵکداری بێت. شیکردنەوەی ڕۆسۆ سەبارەت بەو بارەی کە باسکرا ئەم پرسە ڕوون دەکاتەوە. ڕۆسۆ دەڵێت کاتێك کە تاك بەو شتانەوە دەناسرێتەوە کە هەیەتی کەواتە ئەو بریتییە لە هەمان ئەوانەی کە هەیەتی. موڵکداری دەتوانێت کەم و کورتییە سروشتییەکانی ئەو پڕبکاتەوە. ئەو شتەی کە پاشتر مارکس سەبارەت بە پارە خستییەڕوو: تەنانەت پارە دەتوانێت هەمان ئەو هەل و توانایە بۆ پیاوێکی ناشیرین فەراهەمبکات کە جوانترینی پیاوەکان دەتوانن هەیانبێت.

پەیوەستبوونی کەسی و ئەخلاقی کە لە ((باری نوێی سروشت))دا هاتووەتە بوون ڕەهەند و لێکەوتگەلێکی سیاسیشی هەیە و ئەویش ئەوەیە کە دەبێت ڕەگ و ریشەی ئەو کۆمەڵگا سیاسییەی کە هەیە بگەڕێندرێتەوە بۆ نەخشە و ئامادەسازیی کەمینە دەوڵەمەند بۆ سوودوەرگرتن لە هێز و توانای هەموان لەپێناو پارێزگاریکردن لە موڵك و خاوەندارییەکانی خۆیان لە بەرامبەر زۆرینەی خەڵکی. ئێستاکە زاڵبوونی هەندێك بەسەر هەندێکی تردا لە ئارادایە ڕاستیی زاڵبون لای هەندێك وەهمی سەربەخۆیی دروستدەکات. خاوەند بەزاڵبوون بەسەر بەندەکانەوە خۆی بەسەربەخۆ دەزانێت، لەکاتێکدا کە بە نۆرەی خۆی پەیوەستە بە بەندەکانەوە. بەواتایەکی تر واتای سەربەخۆیی تێکدەچێت و دەکەوێتە هەڵەوە. بەندە شوێنکەوتووی ویستی خاوەندە و خاوەند شوێنکەوتووی حەزەکانی خۆیەتی. ئەو ڕستەیەی ڕۆسۆ کە مرۆڤ بە ئازادی دروستکراوە بەلاّم لە هەموو شوێنێکدا کۆتکراوە، لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم پرسەدا ڕوون دەبێتەوە و دەرکی پێدەکرێت(٤٠).

40- Jean Starobinski, op. cit, p. 125.

## ئازادی و ویستی گشتی

ئەگەر قبوولبکەین کە تاك کاتێك سەربەخۆ دەبێت کە شوێنکەوتووی ویستی تاك یان تاکگەلێکی تر نەبێت لەم حاڵەتەدا چەمکی گرێبەستی کۆمەلاَیەتی بریتیدەبێت لەوەی کە دەبێت تاك بگۆڕێت بۆ ((تاکی فەرمانڕەوا لە نێوان یەکسانەکان)) و ((فەرمانڕەوایی ویستی گشتی)) بەر قەرار ببێت. کاتێك ئەم دوو دەربڕینە لە تەنیشت یەك دابنێین واتاکەی بەم شێوەیە دەبێت کە فەرمانڕەوایی ویستی گشتی بەم شێوەیە بەرقەرار دەبێت کە هەموو کەسێکی بەراستی هاولاَتی: واتە فەرمانڕەوا و یاسادانەر و سەرچاوەی دانانی یاساگەلێك کە لەگەڵ تەواوی فەرمانڕەوا یەکسانەکاندا[41] پەیڕەوی لێدەکات. یاسا لەلایەن هەمووان بە شێوەیەکی یەکسان دادەنرێت و لەلایەن هەموانیشەوە بەشێوەیەکی یەکسان جێبەجێ دەکرێت. هێندە بەسە کە یاسادانەرێکی بێ لایەن یاسایەك پێشنیار بکات کە بە قازانجی هەموانە. وەهاکارێك لەلایەن یاسادانەرەوە کارێکی عەقلانییە. ویستی گشتیش بەشی خۆی سوود لە ((عەقڵی دروستکەر)) وەردەگرێت. لەم کاتەدا عەقڵ رێساگەلێك بۆ بنەما نوێیەکان دەچەسپێنێت. عەقڵ کە لە رەوتی وەرچەرخانی باری سروشتیدا سروشت بەسەریدا زاڵببوو ئێستا خۆی ئازاد دەکات و سەردەکەوێت بەسەر سروشتیدا. ویستی گشتی بە پشتبەستن بە عەقڵی مرۆڤ، مرۆڤ ناچار بە ئازاد بوون دەکات. ئەم رستەیەی رۆسۆ کە مرۆڤ دەبێت پەیوەستببێت تاوەکو بەسەربەخۆیی بگات واتاکەی ئەوەیە کە دەبێت تاك شوێن عەقلاَنیەتی ویستی گشتی بکەوێت تاوەکو بە سەربەخۆیی و ئازادی بگات. بە پەیڕەوی لێکردنی یەکسانی ئەو یاسایانەی کە ویستی گشتی دایناوە خودرێسایی تەواوی تاك لە کۆمەڵگادا مسۆگەر دەبێت. رۆسۆ دەیەوێت لە رێگەی چەمکی ویستی گشتییەوە رێکیی کۆمەلاَیەتی لەگەڵ ئازادی تەواوی تاك بگونجێنێت[42]. تاك بە شوێنکەوتنی ویستی گشتی شوێنکەوتووی ویستی کەسانێکی تر نییە بەڵکو شوێنکەوتووی خۆیەتی. لەلایەکی ترەوە ئێستا ئەو لە شوێنکەوتنی حەز و ئارەزووەکانیش ئازادە چونکە شوێنکەوتووی عەقلاَنیەتی ویستی گشتییە. بەم شێوەیە سەربەخۆیی و خودرێسایی ئەو تەواوە. ئەم سەربەخۆییە (لە بەرامبەر سەربەخۆیی لەباری لە ئاژەڵ چووندا) سەربەخۆییەکی پۆزەتیڤ و داهێنەرە. ئەرکی دروستکردنی یاسا بۆ باشەی خەڵکی هاوکاری گەشەی تاك دەکات وەکو بوونەوەرێکی کۆمەلاَیەتی. عەقڵی وەدیهاتووی مرۆڤەکان ئەوان لە مرۆڤی کۆمەلاَیەتییەوە دەگۆڕێت بۆ مرۆڤی ئەخلاقی.

41- Sovereign equals.
42- Lively and Reeve, op. cit, p. 102.



رۆسۆ ئازاد و خودبونیادیی بەواتایەك بەکاردەبرد کە پاشتر کانت لە تیۆرەکەی خۆیدا پەرەی پێدا. لە تیۆرەکەی کانتدا ئازادی شتێکی دیکەی جیا لە خودبونیادی یان خودرێسایی[43] ویست نییە. و خودرێسایی ویست دەتوانێت چ شتێکی لەوە باشتر بێت کە ویستی خۆی یاسای خۆی بێت (وەها هەڵسوکەوت بکە کە بتوانی خوازیاری ئەوە بێت کە کردارەکەت بگۆڕێت بۆ یاسای گشتی). بەم شێوەیە هیچ جیاوازییەك لەنێوان ویستی ئازاد و ویستی شوێنکەوتووی یاسا ئەخلاقییەکان نییە. ئەگەر تاك خۆی بداتە دەست حەز و ئارەزووەکانەوە لەبری ئازادی بە کۆیلەیی دەگات، کۆیلە و بەردەی هەواو هەوەس. کاتێك کە مرۆڤ بە ئاشکرا یاسایەك پەسەند دەکات و کاروکردارەکانی خۆی لەگەڵ ئەودا دەگونجێنێت تەنانەت ئەگەر ئەم کارە سنووردار بوونێکیشی تیادابێت بۆ ئەو دیسانەوە هەر ئازادە، چونکە ئەم یاسایە لە سەرچاوەیەکی دەرەکییەوە بەسەریدانە سەپێندراوە. هەر لەبەر ئەمەیە کە گونجان لەگەڵ خواستەکانی ئەودا خودی ئازادییە[44]. بەم پێیە گونجان لەگەڵ ویستی گشتی بەو واتایەی کە رۆسۆ باسی لێوە دەکات یان ویستی گشتی کردەیی بەو شێوەیەی کە کانت باسی لێوە دەکات بەواتای رەتکردنەوەی ئازادی و سەربەخۆیی نییە.

## پرسی فەرمانڕەوایی

هەروەك لە بەشی پێشوودا بە دیارکەوت ئەو بیرمەندانەی کە عەقلاَنیەتی دەوڵەتیان لەسەربنەمای مافی سروشتی (نوێ) یان لەسەربنەمای قازانجی گشتی ئاراستە و دیاری دەکرد دەستەویەخەی گرفتێکی لۆژیکی بوون. ئەم گرفتە لۆژیکییە بریتی بوو لە پرسی گونجاندنی ئازادی و سەربەخۆیی تاك لەگەڵ پەیڕەویکردن لە یاسا. چۆن تاك دەتوانێت ئازاد بێت لەکاتێکدا کە پەیڕەوی لە دەوڵەت دەکات؟ رۆسۆ بە تیۆری ویستی گشتی و فەرمانڕەوایی یاسا ئەم گرفتە لۆژیکییەی چارەسەرکرد. رۆسۆ لە شوێنێکدا دەپرسێت: ((چۆن دەکرێت مرۆڤ بێ ئەوەی کەسێکی لە سەرووی خۆیەوە هەبێت تاوەکو فەرمانی پێبدات فەرمانبەری بکات، بێ ئەوەی کە گەورەی هەبێت خزمەت بکات و کاتێك کە لەژێر زەبر و زۆرێکی رواڵەتیدا کارێك ئەنجامدەدات ئازادتر

43- Autonomy.

٤٤- و. ت. جونز، پێشوو، ل ٣٤٦.





بێت لە هەموو کاتێکی دی)) و بۆ خۆی وەڵام دەداتەوە کە ((ئەمە سەیر و سەمەرەیی کاری یاسایە))[٤٥].

بەم شێوەیە رۆسۆ بە جیاکردنەوەی چەمکی فەرمانڕەوایی لە حکوومەت پرسی پەیڕەویکردنی کەمینە لە زۆرینەشی کە یەکێك بوو لە ناهاوسازییەکانی بیری لۆك چارەسەرکرد. بە تیۆری ویستی گشتی رۆسۆ فۆرمی حکوومەت بێ بایەخ دەبێت. کۆمەڵگای ئایدیال و عەقڵانیی رۆسۆ بریتییە لە کۆمەڵگای مرۆڤە یەکسانەکان کە بەپێی نەخشە و پلانەکەی مرۆڤ ئامرازی مرۆڤێکی تر یان قوربانیی مرۆڤێکی تر نییە. بۆ ئەوەی بزانین رۆسۆ چۆن پرسی حکوومەت و فەرمانڕەوایی چارەسەر دەکات دەبێت بگەڕێینەوە بۆ خاڵی دەستپێکی ئەو لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی و دیاریکردنی ئەم پرسە لەم گرێبەستەدا.

لە تیۆری کۆنی مافی سروشتیدا باس لە دوو گرێبەست دەکرا: یەکەم ئەو گرێبەستەی مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتردا دەیبەستن و رێکدەکەون کە یەکبگرن و رێکەوتن و رەزامەندی هاوبەش پارێزگاری لە ئاسایشی خۆیان بکەن. گرێبەستەکەی دی یان گرێبەستی دووەم ئەو گرێبەستە بوو کە تیایدا هەمان ئەو تاکانە دەسەڵاتیان بە فەرمانڕەوایەك یان حکوومەتێك دەسپاردە. گرێبەستی یەکەم بە Pactum Societatis (گرێبەستی کۆمەڵایەتی) و گرێبەستی دووەم بە Pactum Subjectionis (گرێبەستی شوێنکەوتن) ناودەبرێت. هۆبز و رۆسۆ هەریەك بە شێوازی تایبەتی خۆیان ئەم دوو گرێبەستەیان وەلاوەنا و بەرەو یەك گرێبەست هەنگاویان نا. شێوەی چارەسەرکردنی ئەم پرسە (گۆڕینی دوو گرێبەست بۆ گرێبەستێك) لەرووی ناوەڕۆکەوە ئەنجامگیرییەکانی هۆبز و رۆسۆی لە یەکتر جیاکردەوە. هۆبز گرێبەستی یەکەمی رەتکردەوە و گواستییەوە بۆ چوارچێوەی گرێبەستی دووەم یان گرێبەستی شوێنکەوتن و پەیڕەوی لێکردن. بەم شێوەیە کاتێك کە لە تیۆرەکەی هۆبز دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی پێکدەهێنرێت ویستی تاکەکان لە ویستی فەرمانڕەوادا دەتوێتەوە و تاکەکان دەگۆڕێن بۆ شوێنکەوتووان. رۆسۆ بە پێچەوانەی هۆبزەوە گرێبەستی دووەمی وەلاوەنا، بەم شێوەیە تەواوی فەرمانڕەوایی گواسترایەوە بۆ خەڵکی و لە ئەنجامدا دامەزراوەی حکوومەت بە تەواوی بچووك بووەوە بۆ کۆمسیۆنێك. لە مافی سروشتیی کلاسیکیدا چەمکی فەرمانڕەوایی بوونی نییە، چونکە بەلای کەمەوە ناوەندی

٤٥- ارنست کاسیرر، رۆسۆ، کانت، گوته، ترجمه حسن شمس اوری، کاظم فیروزمند، تهران، نشر مرکز، ٧٤|٧٥



بڕیاردان بەشێوەیەکی فۆرماڵی و بەشێوەیەکی فەرمی دوو ناوەندە: خەڵك و فەرمانڕەوا. لەراستیدا هۆبز بە قبوولکردنی یەك گرێبەست ڕێگەی بۆ تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆ کردەوە. بەم شێوەیە رۆسۆ بەگەڕانەوە بۆیەك گرێبەست، ئەویش گرێبەستی جۆری یەکەم توانیتی تیۆری ویستی گشتی و فەرمانڕەوایی خەڵکی فۆرمۆلبەندی بکات.

رۆسۆ بە قبوولکردنی تەنها یەك گرێبەست، ئەویش گرێبەستی پێکهێنانی کۆمەڵگا[٤٦] شۆڕشێکی لە فەلسەفەی سیاسی و تیۆری سیاسیدا دروستکرد. بە هەڵبژاردنی ئەم روانگەیە و دەستپێکردن لەم گریمانانەوە ئیدی حکوومەت شوێنی ئەو فەرمانڕەواییە نییە کە خەڵکی بە جۆرێك بۆ ئەویان گواستبێتەوە (هەروەك چۆن لای لۆك وەهایە) بەڵکو فەرمانڕەوایی تەنها بۆ خەڵکی دەمێنێتەوە و حکوومەت شتێکی دیکەی جیا لە دامەزراوەیەکی جێبەجێکاریی یان کۆمسیۆنێك نییە. رۆسۆ جەختدەکاتەوە کە نابێت پلەوپایەی حکوومەت (دەستەی جێبەجیکاریی) لەگەڵ پایەی فەرمانڕەوادا (خەڵکی) تێکەڵبکرێت. رۆسۆ بە خستنەرووی دەسەڵاتی رەها و هەمیشەیی کۆبوونەوەی خەڵکی و پەیوەستبوونی دەسەڵاتەکانی دەسەڵاتی جێبەجێکاریی بەخودی دانیشتن (کۆبوونەوە)کانی خەڵکی، تیۆری شۆڕشی بەردەوامی ئامادەکرد. لەراستیدا نوێنەرانی خەڵکی جیا لە نێردراوگەلانێك نین، چونکە فەرمانڕەوایی لە ویستی گشتیدا حەشار ماوە و ویستی نوێنەری قبوولناکات. فەرمانڕەوایی خەڵکی وەکو شتێکی دابەش هەڵنەگر و دوور لە پارچە پارچەبوون وایە. ئەنجامێکی تری ئەم رێڕەوە لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا بریتییە لە هەڵوەشانەوەی دەوڵەتێك کە نوێنەری قازانجە تایبەتییەکانە و هەروەها هەڵوەشانەوەی حکوومەتێك کە سەرچاوەکەی پەیوەستە بە قازانجە تایبەتییەکانەوە. لەم روەوە رۆسۆ پێشڕەوی تیۆرەکەی مارکسە دەربارەی هەڵوەشانەوەی بەرە بەرەی دەوڵەت[٤٧].

بەڵام هەندێك لە رەخنەگران رەخنەیان گرتووە کە رۆسۆ بە قبوولکردنی رۆڵێك بۆ ((یاسادانەر)) واتە کەسێك کە بەویستی خودی خەڵکی ئەوان بەرەو باشەی گشتی رێنمایی دەکات جۆرێك رۆڵی باوکانەی بۆی لەبەرچاوگرتووە کە ناگونجێت لەگەڵ خودرێسایی ویستدا[٤٨].

46- Association.
47- Lucio Colletti, op. cit, p. 189.
48- Lively and Reeve, op. cit, p. III.





## عەقڵ و کۆمەڵگا

گەرچی حەزی پاراستنی خود لە بناغەی کۆمەڵگای مەدەنیدایە بەڵام لەو مەبەستەی کە دەبێت پاشتر کۆمەڵگای مەدەنی بەرەو ئەو هەنگاوبنێت عەقڵ شوێنێکی گرنگی هەیە. ئەم عەقڵە بە پێچەوانەی عەقڵی ڕێچکەی سوودگەرایی و تیۆرەکەی هۆبز عەقڵی ئامێری نییە. هەروەك باسمانکرد ڕۆسۆ جگە لە حەزی پاراستنی خود هەستی هاوخەمیشی بەخاوەن ڕۆڵ و شوێنی تایبەت بەخۆی دادەنا لەنێوان غەریزەکانی مرۆڤدا. لەهەر شوێنێکدا کە ناکۆکی هەبێت لە نێوان هەستی هاوخەمی و حەزی پاراستنی خود دەبێت هەستێکی تر وەکو ناوبژی بوونی هەبێت. ئەم ناوبژییەییش بریتییە لە ویژدان. بەڵام ویژدان تەنها هەستێکی کوێرە و پێویستی بەڕێنمایی هەیە. و ئەم ڕێنمایەییش بریتییە لە عەقڵ. عەقڵ ڕێگە بە مرۆڤ نیشاندەدات و ویژدانیش مرۆڤ بەرەو ئەو ڕێگەیە دەخاتە هەنگاونان. بەڵام بۆ وەها کارێك پێویستی کۆمەڵگا و کەلتور دێتە ئاراوە. لە کۆمەڵگادا سەربەخۆیی باری سروشتی (بەو شێوەیەی کە باسکرا) دەگۆڕێت بۆ ئازادی ڕاستەقینە. مرۆڤ لە کۆمەڵگادا شتگەلێك بەدەستدێنێت کە سەربەخۆیی ناتوانێت لەباری سروشتیدا بەوی بدات. لە هەموو گرنگتر ئەوەیە کە مرۆڤ لە کۆمەڵگادا مافگەلێك بەدەستدێنێت کە بە هێزێکی زۆر گەورەتر لە هێزی خۆی واتە هێزی کۆمەڵ پارێزگاری لێدەکرێت.

ڕۆسۆ وایدادەنێت کە مرۆڤ دەتوانێت بە بیرکردنەوە و بە سوود وەرگرتن لە هزر دەوڵەتێکی گونجاو لەگەڵ عەقڵی خۆی دروستبکات. ئەم کۆمەڵگایە کۆمەڵگایەکی دادپەروەرانەیە و جیاواز لەو کۆمەڵگایەی کە هەیە. کۆمەڵگایەکە کە تیایدا نایەکسانی مرۆڤەکان گەندەڵ ناکات و درێغی لە هیچ هەوڵێك ناکرێت بۆ فەراهەمکردنی هەلومەرجی کۆمەڵایەتی لەپێناو یەکسانی تیایدا. دەبێت هۆشیارانە و بە نەخشە کۆمەڵگای دادپەروەرانە دروستبکرێت. دەکرێت بە پەروەردە و فێرکردن هاوکاری گەشەکردنی فەزیلەت بکرێت لە مرۆڤدا. دەکرێت مرۆڤ بگۆردرێت بۆ مرۆڤی ئەخلاقی و خودرێسا. لە کتێبی ئەمیلدا باس لە جۆرێك پەروەردە کراوە کە دەکرێت بە هاوکاری ئەو چوارچێوەیەکی لەبار بۆ منداڵ فەراهەم بکرێت تاوەکو لەو گەندەڵیەی کە کۆمەڵگا بەسەریدا دەسەپێنێت پارێزراو بێت و لەرووی عەقڵ و پابەندبوون بە بنەڕەتە ئەخلاقییەکانەوە هێندە بەهێزبێت کە بتوانێت لە بەرامبەر گەندەڵیدا بەرگری بکات. بەم شێوەیە دەکرێت بەپشتبەستن بە هۆشیاری و ئاگایی کۆمەڵگای عەقلانی دروستبکرێت، و بەم [illegible] جیاوازە لە پشتبەستن بەعەقڵ بەو جۆرەی کە لە بیری پێش نوێ لە ئارادا بوو و






ئەفلاتۆن خستبووەروو. ئەفلاتۆن دەیوت مەعریفە فەزیلەتە و ئەوەی کە عەقڵ نەك تەنها دەتوانێت دروست و نادروست لێك جیابکاتەوە بەڵکو لەوێوەی کە دەتوانێت جڵەوی نەفس بگرێتە دەست ئەو کۆنترۆڵدەکات. بەڵام ڕۆسۆ وەکو هۆبز بڕوای وابوو کە عەقڵ بە تەنها خۆی ناتوانێت مرۆڤ بەڕێوەبەرێت. عەقڵ دەتوانێت حەزەکان لەگەڵ یەکتردا بەراورد بکات و هەڵیانبسەنگێنێت. عەقڵ دەتوانێت ئەوە بدۆزێتەوە کە کام یەك لە حەزەکان بەدوورن لە تێرکردن یان لە ناکۆکیدایە لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانی تردا. عەقڵ دەتوانێت دادپەروەری دەستنیشانبکات، بەڵام ناتوانێت بە تەنهایی خوازیاری ئەو بێت. ڕۆسۆ لەو ڕووە گرنگەوە جیاواز بوو لە لایەنگرانی سوودگەرایی کە بڕوایان وابوو حەزەکانی خاوەن عەقڵ بەهۆی خاوەن عەقڵ بوونەوە تایبەتمەندیگەلێکی تایبەتیان هەیە. مرۆڤ بەهۆی هەبوونی عەقڵەوە بوونەوەرێکی خود ئاگایە. هەربۆیە خۆشبەختییەکەی تەنها پەیوەست نییە بەوەی کە زنجیرە حەزگەلێکی یەك لەدوای یەك تێر بکات، بەڵکو هەروەها پەیوەستە بە هەستکردنی دەربارەی خۆی و خەڵکیش. مرۆڤ پێویستی بەوەیە کە هەست بکات لە دنیایەکدا ژیان بەسەردەبات کە خۆی ڕێکی خستووە. لێرەدا ئەو لە هیۆم دووردەکەوێتەوە، لە کاتێکدا کە دووری خۆی لەگەڵ ئەفلاتۆن کە خوازیاری کۆمەڵگایەك بوو تیایدا خاوەن عەقڵەکان بەسەر هەموو تاکەکانەوە حکوومەت بکەن پاراستبوو چونکە بەپێچەوانەی ئەفلاتۆنەوە زۆر بەتوندی بڕوای بە یەکسانی و ئازادی هەبوو. حکوومەتی جێ مەبەستی ئەو ئەگەر چی (وەکو دەوڵەتی جێ مەبەستی ئەفلاتۆن) پەروەردەکار بوو بەڵام ئەم پەروەردەکارە وەکو پەروەردەکارەکەی ئەمیل بوو کە لە هەنگاوی یەکەمدا چاوی لەخۆ پێگەیاندنی قوتابی بوو.

## ویستی گشتی و حکوومەتی نوێنەری

ئایا هیچ نەگونجانێك هەیە لە نێوان حکوومەتی ویستی گشتی و حکوومەتی نوێنەری؟ هەروەك باسکرا ڕۆسۆ لە نێوان ئەم دوەدا نەگونجان بەدیدەکات. دژواری دامەزراندنی دیموکراسی ڕاستەوخۆ بەو جۆرەی کە ڕۆسۆ دەیویست لە کارایی تیۆرەکەی ئەو بۆ کۆمەڵگای هاوچەرخ کەمدەکاتەوە. بەڵام هەندێك لە ڕەخنەگرە وردبینەکان نیشانیانداوە کە هیچ نەگونجانێکی لۆژیکی لەنێوان حکوومەتی ویستی گشتی و حکوومەتی نوێنەریدا نییە[٤٩]. ئەو وتەی ڕۆسۆ

49- John Plamentz, Ibid.

کە دەڵێت ناکرێت ویست بە نوێنەر بسپێردرێت وتەیەکی روون و دروستە، بەڵام ئەو ئەنجامانەی کە رۆسۆ لێیەوە بەدەستی دێنێ جێی مشتومڕە. ناکرێت لەو وتەییەوە کە دەڵێت هیچ کەسێك ناتوانێت لەبری کەسێکی تر ویستی هەبێت بەو ئەنجامە بگەین کە هیچ کەسێك ناتوانێت ئەو دەسەڵاتە بە کەسێکی تر بدات کە لەلایەن ئەوەوە بەشداری لە بڕیارداندا بکات. کاتێك کە کەسێك دەسەڵات بە یەکێکی تر دەدات کە بەشداری لە ئەنجوومەنی نوێنەران بکات و لەلایەن ئەوەوە بڕیاربدات ئەمە بەو واتایە نییە کە ویستی خۆی بە کەسێکی دی سپاردووە، بەڵکو بەو واتایەیە کە کەسێکی تری بە نوێنەری خۆی هەڵبژاردووە بۆ بڕیاردان دەربارەی کارێکی تایبەت. مەگەر ئەوەی کە وتەکەی رۆسۆ بەو واتایە لێکبدەینەوە کە هیچ کەسێك مافی ئەوەی نییە کە کەسێکی تر لەلایەن خۆیەوە بۆ بڕیاردان دیارییبکات، کە ئەم کارە بە ئاشکرا نادروستە.

دەکرێت ئەم بۆچوونەی رۆسۆ بە جۆرێکی تریش لێکبدرێتەوە. بۆ نموونە دەوترێت تاکاتێك تاك ئەو ئیمتیازانەی کە بە کۆمەڵگای داوە وەرینەگرتبێتەوە ناتوانێت سەربەخۆ بێت لە خەڵکی. بەڵام ناکرێت لەرووی لۆژیکییەوە ئەم دەربڕینە قبوولبکەین. چونکە رۆسۆ نایەوێت ئەو شتەی کە تاك بە کۆمەڵگای داوە وەریبگرێتەوە. ئەو بڕوای وایە مرۆڤ تەنها لە کۆمەڵگادا دەتوانێت ببێتە بوونەوەرێکی ئەخلاقی و عەقلانی و توانایی و لێهاتوییەکانی خۆی ببوژێنێتەوە و بەشێوەیەکی هەماهەنگ گەشە بکات. لەو جێیەوەی کە سەربەخۆیی تەواوی تاك لە کۆمەڵگا شتێکی لواو و خوازراونییە، باشتروایە لەرووی پەیوەستبوون بە کۆمەڵگاوە یەکسانی لە نێوانیاندا هەبێت. لە کۆمەڵگای ئازاد و یەکساندا هیچ کەسێك زیاتر لە یەکێکی تر پەیوەست نییە بە خەڵکییەوە.

## هەندێك لە ناهاوسازییەکانی تیۆرەکەی رۆسۆ

بۆچوونی رۆسۆ دەربارەی ئازادی هەندێك ناهاوسازی و کەم و کورتیی تیادایە. ئێمە لێرەدا ئاماژە بە هەندێك لەو ناهاوسازی و کەم و کورتیانە دەکەین کە پاشتر لەبیری کانت و هیگڵدا وەڵامێکی گونجاویان بۆ دراوەتەوە.

هەروەك رۆسۆش دانیپیادادەنێت لە هەموو کۆمەڵگایەکدا مرۆڤەکان حەزگەل و ئارەزووگەلێکی جیا لە دادپەروەری و باشەی گشتیشیان هەیە. ویستێکی تریشیان هەیە کە ویستێکی پایەدار و ئەخلاقی نییە. ئەوان حەز بە کردارگەلێکی جیا لەوەی کە رەنگە لەرووی ئەخلاقییە بەباش دابنرێت دەکا[illegible] مرۆڤ تەنها تا ئەو سنوورە و بەو ئاستە ئازاد نییە کە بەپێی ویستی پایەدار یان ویستی





ئەخلاقی ژیان بەسەر نەبات. هەروەها بەو ئاستەش ئازادە کە بتوانێت بەپێی ئەوەی کە بۆخۆی بە باشەی دەزانێت بڕیار بدات، رەنگە ئەوەی کە ئەو بۆخۆی بە باشەی دەزانێت رووەو شتگەلێك بێت کە لە دەرەوەی بنەڕەتە ئەخلاقییەکانن. مرۆڤ خواستگەلێکی جۆراوجۆری هەیە، رۆسۆ ئەم خواستانە رەت ناکاتەوە بەڵام لە دیکترینی ئازادی خۆیدا بایەخیان پێنادات(٥٠).

ئەو مانایەی کە ئازادی بریتییە لە پەیڕەویکردن لە یاسایەك کە ئێمە بۆخۆمان داناوە دەتوانێت چ واتایەك بەدەستەوە بدات. ئەگەر ئەو یاسایەی کە ئێمە لە هۆشماندا هەیە یاسایەکی ئەخلاقییە لەم حاڵەتەدا ناتوانین بڵێین یاسایەکە کە ئێمە بۆ خۆمان لەبەرچاومان گرتووە، چونکە یاسای ئەخلاقی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. دەکرێت لەگەڵ رۆسۆدا هاو رابین کە مرۆڤ تەنها وەکو بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ و شوێنکەوتووی عەقلانیەت دەتوانێت خۆدیسپلین بێت(٥١) و دەتوانێت تێگەیشتنێکی هەبێت بۆ ئازادی و بەهای پێ ببەخشێت، بەڵام پرسەکە لەوەدایە کە مرۆڤ تەنها بەناوی بنەڕەتی ئەخلاقییەوە خۆدیسپلینی ناکات.

پرسێکی تری نێو دیکترینی ئازادیی رۆسۆ بریتییە لە چەمکی ((ناچارکردن بە ئازادی)). بە بۆچوونی رۆسۆش ئەم لایەنە یەکێك بووە لەو لایەنانەی کە بۆ ئایدیالیزمی ئەڵمانی و لەوانەش بیری کانت سەرچاوەی ئیلهام و داهێنانگەلێکی نوێ بووە لە فەلسەفەدا. وتمان کە رۆسۆ کێشەی لەگەڵ یەك گونجانی ئازادی تاکەکەسی و ملکەچیکردن لە یاسا فەرزکراوەکان کە لە سیستەمە هزرییەکانی مافگەرایی و سوودگەرایی بووە چارەسەر کرد. پرسیارەکە لەوەدایە کە ئایا بۆخۆی رووبەرووی پارادۆکسێکی نوێ نەبووەتەوە؟ رۆسۆ دەڵێت هەرکەسێك پەیڕەوی لە ویستی گشتی نەکات دەستەی کۆبوونەوە ناچاری دەکەن بە پەیڕەوی لێکردن و ئەم ناچارکردنە بەو واتایەیە کە ئەو کەسە ناچارکراوە بە ئازادبوون و ئازادییەکەی لەکەدار نەبووە. لێرەدا ئەم پرسیارە دروستدەبێت کە چۆن دەکرێت کەسێك ناچار بە ئازادبوون بکرێت؟ هەروەك رۆسۆ خۆی قبوولێدەکات هیچ هۆکارێکی نییە کە ئەو شتەی پێشتر ویستوومانە ئێستاش بمانەوێت، یان هێشتا هاوڕابین لەگەڵیدا. کەواتە کاتێك کە بەزۆرەملێ خۆ بەدەستەوە دەدەین بەرامبەر بەم هاوڕابوونە ئیدی چۆن دەکرێت بڵێین ناچارکراوین بە ئازادی.

دەبێت لە تیۆری ویستی گشتیدا وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزینەوە. رۆسۆ دەڵێت ئازادی پەیڕەوی کردنە لەو یاسایەی کە ئێمە بۆ خۆمانمان داناوە. کەواتە پرسیارەکەی سەرەوە بەم شێوەیە

50- Lively and Reeve, op. cit, p. 417.
51- Self- discpline.

لێکدەدرێتەوە کە ویستی گشتی چۆن رەنگدانەوە دەبەخشێتە ئەو یاسایەی کە من بۆخۆمم دانـاوە؟ کاتێك کە تۆ لە دژی بەرنامە و پلانێکی یاسایی دەنگ دەدەیت، لە کاتی پەسەندکردنی و گۆڕینی بۆ یاسا وەکو یاسایەك کە رەفتار و کرداری تۆ رێنمایی بکات هەڵتبژاردووە. بـەڵام بـەپێی تیـۆری ویستی گشتی تۆ ئازادانە بەشداریت لە دەنگدان کردبێت و ئەگەر گرووپە تایبەتـەکان (پاژییـەکان) ویستی خۆیان بەسەر تۆدا نەسەپاند بێت، هەروەها مافی ئەوەت هەبێت کە هـەر کاتێـك بتـەوێت بتوانێت جارێکی تر هەمان بابەت بەشێوەیەکی گونجاو بخەیتەڕوو و بەدوایدا بچیت، لەم حاڵەتەدا تۆ ویستووتە کە یاسا جێبەجێ بکرێت تەنانـەت ئەگـەر دەنگـت لـە دژیـشی دابێـت. تـۆ ویـستوتە دادپەروەری جێبەجێ بکرێت و لە دادپەروەری و عەقڵی کۆمـەڵگادا ئاسایـشێکی زیـاترت هەیـە. کەواتە دەبێت وایدابنێیت کە هەر کاتێك بۆچوونی تۆ لە بۆچوونی تەواوی کۆمەڵگا جیاواز بوو ئەوا تۆیت کە لە هەڵەدایت. رەنگە هەندێ کات راڕابییت کە یاسایەکی دیاریکراو پێشێل بکەیت بـەڵام بەشێوەیەکی گشتی یاسا بە کارێکی حەتمی لەقەڵەمدەدەیت. لە راستیدا کاتێکیش کە بەدروسـتی کار ناکەیت ئەوە بەباشتر دەزانیت کە دروست کاربیت، کەواتە کە ناچار دەکرێیت بـە پـەیڕەویکردن لە یاسا لەراستیدا ناچارکراویت بە ئازاد بوون. لـە حاڵەتێکـدا ئازادنیـت کـە ناچـار بکرێیـت بـە پەیڕەویکردن لە یاسایەك کە کەسانێکی تر بۆ تۆیان دیاریکردووە.

ئەم تێگەیشتنە بۆ ئازادی بەتەواوی جیاوازە لەتێگەیشتنەکانی دامەزراو لەسەر مافگـەرایی و سـوودگەرایی. تێگەیـشتنی ئـەم رێبازانـە بـۆ ئـازادی وەکـو ئـازادی نیگـەتیڤ بـواری زاڵبـوون بەسەرگرفتی ناولێنراو بە لۆژیکی (دژیەکبوونی ئازادی لەلایەك و پەیڕەویکردن لە یاسا لە لایـەکی ترەوە) نارەخسێنێت. لە تێگەیشتنی ئەوان بۆ یاسا تەنها بەناچارکردن تاکەکان بۆ دوورکەوتنەوە لە کێشە دروستکردن بۆ یەکدی پارێزگاری لە ئازادی هاوڵاتیان دەکرێت.

لەو کاتەوەی کە یاسا، لەبیری سیاسیدا وەکو دروستکراوی مرۆڤ نەك وەکو رەنگدانەوەی ویستی هێزێکی دەرەکی (وەکو خودا یان عەقڵی سروشتی) تەماشاکرا ئەم پرسیارە لە ئارادا بوو کە بۆچـی دەبێت مرۆڤ پابەندبێت بە ملکەچی لێکردنی ویستی مرۆڤگـەلێکی تـرەوە. ئـەم پرسـە بۆچـوونی هەموو تیۆرداڕێژانی بەلای خۆیدا راکێشابوو. بەڵام رۆسۆ توانیی بەجۆرێك بیخاتەروو کـە بتوانێـت چارەسەری بکات: یاسا بریتییە لە ویستی گشتیی نێوکاری هاوبەش. یاسـا رەنگدانـەوەی ئـازادیی ئێمەیە، کەواتە کاتێك کە پەیڕەوی لێدەکەین پەیڕەویمان لە ئـازادیی خۆمـانکردووە. شـوێنکەوتنی وەها یاسایەك نەك هەر پێشێلکردنی ئازادی نییە بەڵکو خودی ئازادییە. هێندە بەسە کە یاسادانان بەشێوەیەکی دروست ئەنجامدرابێت تاوەکو تەنانەت نـەیارانی ئـەو یاسـایەش لـە کـاتی پـەیڕەوی






لێکردنی بەپێچەوانەی ئازادی خۆیانەوە هەڵسوکەوتیان نەکردبێت. بە پەیڕەوی لێکردنی یەکسان لەو یاسایانەی کە لەلایەن هەمووانـەوە دانـراون خودرێـسای تـەواوی تـاك لـە کۆمـەڵگادا دەسـتەبەر دەبێت[٥٢].

ئایزایا بەرلین رەخنە لەم دیکترینەی رۆسۆ دەربارەی ئازادی دەگرێـت و دەڵێـت ئەگـەر ئـازادی پێویستی بە سنووردارکردنی دەسـەڵاتی تاکـەکان هـەبێت ئـەوا ئـەم سـنووردارکردنە لـەژێر هـەر ناونیشانێکدا سەپێندرا بێت لەگەڵ ئازادیدا ناگونجێت. ئەو دەڵێت دەبێـت رێـسا و یاسـاگەلێك لـە دەرەوەی ویستی گشتی هەبێت بۆ پارێزگاریکردن لە سنوورەکانی ئازادی جا ئەم یاسایانە لەژێر هەر ناونیشانێکی وەکو مافی سروشتی و یاسای سروشتی و پەیڤی خودایی یـان قازانجـە چەسـپاوەکانی مرۆڤ بێت[٥٣]. بە بۆچوونی ئێمە ناکرێت رەخنەکەی ئایزایابەرلین قبووڵبکـەین هەرچـەندە کـە ئـەو خواستەی کە تیایدا بەرچاو دەکەوێت بۆ پارێزگاریکردن لە ئازادی خواستێکی عەقڵ پەسـەندانەیە. پرسەکە لەوەدایە کە ئەگەر هەر سنوورداریەتێك لە دەرەوەی خودی ویستی گشتی بۆ ویستی گشتی پەسەند بکەین لە راستیدا پانتایی ویستی دەستەی کۆمەڵمان سنووردار کردووە.

بەڵام ئەو رەخنە گرنگەی کە ئاراستەی رۆسۆ دەکرێت پەیوەست دەبێـت بـە بـەراوردکردنی دوو تیۆری جیاوازی ئەو، واتە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی لەگەڵ تیۆری ویستی گشتی. ئەگەر رۆسۆ بە پابەند دابنێین بەرامبەر بە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی لەم حاڵەتەدا ئەو دژیەکە لەخۆ دەگرێت کە چۆن تاك لەگەڵ کۆمەڵێکدا کە هێشتا بوونی نییە گرێبەست دەبەستێت. و ئەگەر قبووڵبکـەین گرێبەستیکۆمەڵایەتی سەرچاوەو مەرجی هەموو مافێکە و ئەو بنەڕەتە گرنگە لەبەرچاو بگرین کە هەموو گرێبەستێك دوولایەنی هەیە، لەم حاڵەتەدا رەخنەکەی سەرەوە شتێکی بەجێیە. لە کاتێکدا کە گرێبەستی کۆمەڵایەتی سەرچاوەو مەرجەعی هەموو مافێکە و ئەو بنەڕەتـە گرنگـە لەبەرچـاو بگرین کە هەموو گرێبەستێك کۆمەڵایەتی هۆبز بەدووره لەم ناهاوسازییە. پرسێکی تر بریتییە لـە نامۆبوون و گرێبەست. ئەگەر هەروەك رۆسۆ دەڵێت هـەموو کەسـێك هەرچییەکی هەیـە بیخاتـە بەشدارییەوە لە ویستی گشتی واتە هەموو توانا و سامان و ئازادی خۆیان بخەنە ئەو بەشـدارییەوە، لەم حاڵەتەدا هەموو شتێکیان سپاردووە و گەیشتوونەتە لە خۆنامۆبوونی تەواو.

52- Lively and Reeve, op. cit, p. 109.

٥٣- ایزایا برلین، ((دو مفهوم ازادی)) در مایکل ساندل، لیبرالیسم و منتقدان ان، ترجمـه احمدتـدین، تهـران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٤، ص ٤٤-٤٥.

## بەکورتی

وێڕای ئەوەی کە ڕۆسۆ لە چەند ڕوویەکی گرنگی فەلسەفەی بیری خۆیدا درێژەپێدەری ڕێگەی هۆبز بوو بەڵام لە هەمان کاتدا دامەزرێنەری شێواز و تێڕوانینێکی نوێ بوو بۆ وردبوونەوە لە ناوەرۆکی دەوڵەت. ئەو دوو ڕەوتە سەرەکییەی فەلسەفەی سیاسی کە تا بەئێرە لە قاڵبی دوو بەشداوە بەر لێکۆڵینەوەمان خستووە لە بنەڕەتدا دەوڵەت وەکو میکانیزم و ئامێرێك تەماشادەکەن کە مرۆڤەکان بۆ ئامانجێکی دیاری کراو دروستیان کردووە. ڕەنگە ئەم ئامانجە دابینکردنی ئاسایش بێت یان ڕێکخستنی کاری سوودی گشتی، بەڵام بە هەموو شێوەیەك دەوڵەت (کە زۆرتر لەم ڕوانگەیەدا بەیەك شت لەگەڵ حکوومەتدا تەماشا دەکرێت) ئامێرێکە بۆ مەبەستێکی تایبەت. تیۆرەکەی ڕۆسۆ سەرەتای تێڕوانینێکی نوێیە بۆ دەوڵەت کە بە تێڕوانینی ئۆرگانیستی بۆ دەوڵەت ناوبراوە. ئەم تێڕوانینە ڕوویەکی هاوبەشی هەیە لەگەڵ تێڕوانینی کلاسیکی و بیری سەرچاوە گرتوو لە یۆنانی کۆن، بەڵام لە هەمان کاتدا جیاوازی ناوەرۆکییشی هەیە لەگەڵیدا.

بەهەرحاڵ دەوڵەت لە تێڕوانینی ئۆرگانیستیدا وەکو ئۆرگانیزمێك لەبەرچاوگیراوە کە لەڕەوتی کاملبوونی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی مرۆڤدا سەریهەڵداوە و کاملبووە. لە ڕوانگەی ئۆرگانیستیدا دەوڵەت ڕێکخراوێکی جیا لە کۆمەڵگای مرۆڤ نییە. ڕۆسۆ بۆچوونی بیرمەندانی پێش خۆی کە تاك و دەوڵەتیان لە بەرامبەر یەکتر دادەنا و ئەم دووەیان لە دژ یەکێکی لۆژیکیدا دەبینییەوە ڕەت دەکاتەوە. ڕۆسۆ لە ((ویستی گشتی))دا دەوڵەت بە کەسێتییەکی بە کۆمەڵ پێناسە دەکات کە مرۆڤ لەڕێگەیەوە بەرەو ئازادی هەنگاو دەنێت.

ڕۆسۆ لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا لە هەمان بنەماکانی هۆبزەوە دەستپێدەکات، بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز لە ئەو باری سروشتی ڕووندەکاتەوە. بە بۆچوونی ڕۆسۆ لەباری سروشتیدا مرۆڤەکان تاك تاك و دوور لە یەکن و لووتبەرزی و تەماح کە هۆبز باسیان لێوەدەکات لە باری کۆمەڵایەتیدا هاتوونەتە بوون نەك ئەوەی کە لەباری سروشتیدا هەبوو بێت. مرۆڤەکان لەباری سروشتیدا باش و خراپیان نییە و لە باری کۆمەڵایەتیدا باشی و خراپی دروستبووە.

مرۆڤە تاککەوتووەکانی باری سروشتی بەرێکەوت مامەڵە لەگەڵ یەکدا دەکەن و بەهۆی ئەم ڕێکەوتنەوە پەی بەسوودمەندی هاوکاری دەبەن. لەگەڵ دەستپێکردنی هاوکاری پسپۆڕی و دابەشبوونی کار دروستدەبێت و لەگەڵ ئەویشدا مولکداری تایبەتی. بەفراوانبوونی ئۆرگانی مولکداری تایبەتی زاڵبوونی هەندێك بەسەرهەندێکی تر دەستپێدەکات و دەوڵەت بەرهەمی ئەم پرۆسەیە. بەم جۆرەیە کە مرۆڤ کە بە ئازادی لە دایك بووە بەسەر بەرەو زنجیرەکانی خۆی دەچێت.





بەم شێوەیە مرۆڤی ئازاد و سەربەخۆ دەگۆڕێت بۆ مرۆڤێکی پاشکۆ، بەڵام مرۆڤ نابێت و ناتوانێت بۆ بەدەستهێنانەوەی ئازادی و سەربەخۆییە لەدەستچووەکەی بگەڕێتەوە بۆ باری سروشتی بەڵکو دەبێت کۆمەڵگایەك دروستبکات کە جارێکی تر مرۆڤ تیایدا ئازادی و سەربەخۆیی خۆی لە بارێکی خوازراوتردا بەدەستبێنێتەوە. لێرەدایە کە ڕۆڵی سیاسەت لە تیۆرەکەی ڕۆسۆدا پێگەیەکی تایبەت وەردەگرێت. ئێستا کە مرۆڤ لە باری سروشتی دووركەوتووەتەوە لە ئەستۆی سیاسەتدایە کە کۆمەڵگایەکی عەقلانی دروستبکات. بەم شێویە دەوڵەتی عەقلانی دروستدەبێت.

چەمکی ((ویستی گشتی)) چەقی تیۆری سیاسیی ڕۆسۆیە. چەمکی ویستی گشتی لەبیری ڕۆسۆدا بوەتە بابەتی باس و لێکدانەوەگەلێکی زۆر. لەڕواڵەتدا ویستی گشتی بریتییە لە ویستی بە کۆمەڵی خەڵکی خاوەن موڵك کە ڕووەو باشە و بەرژەوەندی گشتییە نەك قازانجی تاکەکەسی. لەڕوویەکەوە دەکرێت ویستی گشتی بە ((عەقڵی کۆمەڵ))یان عەقڵی گرووپیی هاوڵاتیگەلێك کە خوازیاری باشترین بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتن لەقەڵەمبدرێت. بەهەرحاڵ موڵکداری لە دەوڵەتدا لەگەڵ ویستی گشتیدایە. لە تیۆرەکەی ڕۆسۆدا ناکرێت فەرمانڕەوایی بە نوێنەرایەتی بسپێردرێت. کەوابوو دەستەی فەرمانڕەوایی تەنها دەستەیەکی جێبەجێکارییە و فەرمانڕەوایی لە ویستی گشتی جیانابێتەوە.

ڕۆسۆ توانیتی بە تیۆری ویستی گشتی گرفتێکی گەورەی فەلسەفەی سیاسی نوێ چارەسەر بکات. ئەم گرفتەش بەم شێوەیە بوو کە چۆن دەکرێت پرسی ئازادی و سەربەخۆیی تاك لەگەڵ کۆتی ملکەچیکردن لە دەوڵەت کۆبکرێنەوە. لە تیۆری ویستی گشتیدا هەموو کەسێك بە ملکەچیکردن لە ویستی گشتی لە ڕاستیدا ملکەچی لە ویستی خۆی کردووە نەك لە ویستی هێزێکی دەرەکی. لە دوو جۆری بیری سیاسیدا ئەو سیستەمانەی کە لەسەر بنەمای ماف دامەزراون و ئەو سیستەمانەی کە لەسەربنەمای قازانج دامەزراون، لەو شوێنەوەی کە دەوڵەت دەوڵەتێکی دەرەکی بوو و بە ئامێرێکی جیا لە خەڵکی تەماشا دەکرا چارەسەرکردنی ئەم گرفتە لواو نەبوو. سەرئەنجام لەو سیستەمانەدا ئازادی تاك و ڕێکی کۆمەڵایەتی دەکەوتنە ڕووبەڕووی یەکدی. بەڵام بە تیۆری ویستی گشتی ڕێکی کۆمەڵایەتی و ئازادی لەگەڵ یەکدا دەگونجێن. لەم تیۆرەدا جیاوازی و لە بەرامبەر یەك بوون لە نێوان ویستی ئازاد و ویستی شوێنکەوتووی یاساکاندا نییە. بەم تیۆرە گرفتی تیۆرەکەی لۆك دەربارەی شوێنکەوتنی کەمینە بۆ زۆرینە چارەسەر دەبێت. هەروەها پێویست بەوە ناکات کە گرێبەستی گشتی بگۆڕدرێت بۆ گرێبەستی سپاردنی ویستی هەمووان بە ویستی فەرمانڕەوا. بەم شێوەیە ڕۆسۆ وێڕای ئەوەی کە جارێکی تر وەکو هۆبز گرێبەستی کۆمەڵایەتی گۆڕی

بۆ یەك گرێبەست خودی خەڵكیشی كە دەلایەنی گرێبەستەكە نەك فەرمانڕەوایەكی دەرەوەی گرێبەست.

ڕۆسۆ وای دادەنێت كە مرۆڤ بە بیركردنەوە و سوود وەرگرتن لە عەقڵ دەتوانێت دەوڵەتێكی عەقڵانی دروستبكات، دەوڵەتێك دامەزراو لەسەربنەمای عەقڵ و ئازادی. دەوڵەتێك كە تیایدا مرۆڤ هەروەكو باری سروشتی خاوەن سەربەخۆیی و خودڕێساییە. بەڵام كێشەی تیۆرەكەی ڕۆسۆ لەوەدایە كە هێشتا لە تیۆرەكەی ئەودا عەقڵانیەت لەنێوان عەقڵانیەتی تاكەكەسی و عەقڵانیەتی نێوان هۆشەكان بە هەڵواسراوی ماوەتەوە، هەروەك چۆن تیۆری دەوڵەتەكەیشی لەنێوان باری ئامێری ((گرێبەستی كۆمەڵایەتی)) و ئۆرگانێك ((ویستی گشتی))دا سەرگەردانە. بەم پێیە كاملبوونی تیۆری دەوڵەتی ئۆرگانیك و فەرمانڕەوایی ویستی گشتی و عەقڵانیەتی نێوان هۆشەكان و دەوڵەتی عەقڵانی دەكەوێتە ئەستۆی بیرمەندانی پاشتر و لە هەموویان گرنگتر هیگڵ. ڕۆسۆ بە هێنانە پێشی ڕەگەزی مێژوو لە پاڵ شیكردنەوەی عەقڵانیدا ڕێگەی بۆ هیگڵ خۆشكرد.



**پاژی هەشتەم:**

## عەقڵانیەتی ویستی ئەخلاقی
## لێك پچڕانی پشت بەستنی عەقڵانیەت بە سروشت

هێشتا تیۆری ویستی عەقڵانیی ڕۆسۆ پاشماوەیەكی تێڕوانینی مرۆڤناسیی كلاسیكی لە خۆیدا هەڵگرتبوو: ئەو وێنا كۆنەی كە مرۆڤ بوونەوەرێكی دوو لایەنەی پێكهاتوو لە عەقڵ و هاندانە[1]. هەندێ كات ڕۆسۆ لە بەرامبەر عەقڵدا هاندان بە كارێكی دەرەكی لەقەڵەمدەدات و دەڵێت كاتێك ڕاڕادەبین كە بەپێی هاندانی دەرەكی هەڵسوكەوت بكەین بەڵام بەسەر لاوازی خۆماندا زاڵدەبین تەنها گوێمان لە داوای ویستگرتووە. كاتێك كە بەرامبەر بە ((خود عەقڵانی)) بێ بایەخی نیشانبدەین لە ڕاستیدا ئازادی خۆمانمان لە دەستداوە. ڕۆسۆ هەرسێ چەمكی ویست و ئازادی و ئەخلاق لە پەیوەندی لەگەڵ یەكدا دەخاتە بەر لێكۆڵینەوە. بەڵام خود ڕێسایی[2] یان خود بونیادیی جێ مەبەستی ئەو بە خستنەرووی یاسای گشتی بۆ خود بەدەستنایەت، بەڵكو بەخستنەرووی یاسای پێكەوەیی دەرەكی بۆ ویست بەدەستدێت. بەگوێگرتن لەم ویستە (ویستی گشتی) و گوێگرتن لە بانگ و داوای ((عەقڵ)) و ((ویژدان)) یان گوێگرتن لە ویستی ناوەوە و كار پێكردنی تاك لە ئازادی ((ڕاستەقینە)) بە ئاگا دەبێتەوە. كاركردن بەپێی ویستی ناوەوە چەمكی ئازادی بۆ تاك وەكو كەسێتی ئەخلاق یان خود ئەخلاق[3] ئاشكرا دەكات[4].

ڕۆسۆ چەمكەكانی ویست و ئەخلاق و ئازادی بەو شێوەیەی كە دەبێت هەبن پێناسە كردبوو نەك بەو شێوەیەی كە هەن، واتە بۆخۆی لەم پرسە بەئاگابوو. دەیزانی كە ڕەنگە مرۆڤ بەرێگەی

---

1- inputs.
2- Autonomy.
3- Moral- Self.
4- F. M. Barnard "Will and political Rationality" In Lively and Reeve op. cit, p. 136.





هەڵەدا بڕوات و ڕەنگە خەڵکی یاساگەلێکی ناڕاست دروستبکەن. لێرەدا جۆرێکی تری ئازادی بەدیار دەکەوێت: ئازادی هەڵبژاردنی ((ناڕاست)) و ئەمەیش واتە لەدەستدانی خودرێسایی و سەربەخۆیی چونکە هەروەك باسکرا خۆ بەدەستەوەدان بۆ حەز و هەوای نەفس خۆ بە کۆتی یەکێکی دی سپاردنە نەك ئازادی. ئەم ناهاوسازییەی نێو بنەماکانی مرۆڤناسی ڕۆسۆی بەرەو تیۆری ناچارکردن بە ئازادی (واتە ڕێگەچارەی سیاسی) پەلکێشکرد. دەکرێت خەڵکی ناچار بە ئازادی بکرێن. هەروەها لێرەدایە کە باسی ((یاسادانەر)) دێتە پێشەوە. ئەم یاسادانەرە پایەیەکی دەرەکییە. کانت ئەم یاسادانەرەی گۆڕی بۆ خود یاسادانەر[٥] و ناهاوسازییەکانی نێو تیۆرەکەی ڕۆسۆی لەناوبرد. ڕۆسۆ ئەخلاقیەتی ئازادیی بەستەوە بە عەقلانیەتی یاسا بەڵام ئەخلاقیەتی لە عەقلانیەتەوە (عەقڵ) هەڵنەهێنجا. ئەم کارە گرنگە لەلایەن کانتەوە بەئەنجامگەیشت. لە ((فەرمانی ڕەها))دا[٦] ئەخلاقیەت لە عەقلانیەتەوە دەردەهێنرێت. لە کاتێکدا کە ناکرێت ویستی ڕۆسۆ بکرێتە بنەڕەتی گشتیی کردار و لە هەلومەرجی کاتی و شوێنی و نەتەوەیی جیابکرێتەوە، فەرمانی ڕەهای کانت وەکو بنەڕەتی گشتیی کردار بەدوورە لە هەلومەرجی نەتەوەیی. کانت گشتی بوونی ئەخلاقیی گۆڕی بۆ ڕەها و بێ مەرج.

ڕۆسۆ دەربارەی پرسی بە یەککردنی سەرچاوەی مەشروعیەتی سیاسی لەگەڵ ویستی خەڵکی ڕووبەڕووی دژواری بووەوە. پرسی سەرەکیی بواری فەلسەفەی سیاسی ئەوەیە کە ئەگەر ویستی خەڵکی فەرمانڕەوایی باڵای هەیە ئیدی شتێکی سەرووتر لەو بوونی نییە و ناکرێت سەرچاوەیەکی مەشروعیەتی تر بخرێنە ناو دەوڵەتەوە. لەکاتێکدا کە ڕۆسۆ دەڵێت یاسا دروستبوون فەرمانڕەواییەکی باڵا و کۆتایی هەیە و بەرزترە لە هاوڵاتیان. بەڵام ئەگەر قبووڵبکەین کە یاسا بەرهەمی ویستی بە کۆمەڵە کەواتە کاری سیاسی خەڵکی دەسەڵاتی باڵایە نەك یاسا. لە حاڵەتی پەسەندکردنی وەها بنەڕەتێك ئیدی شوێنێك بۆ دەسەڵات لە جۆری دەسەڵاتی باوکسالارانەی یاسادانەر نامێنێتەوە[٧]. لێرەدا کەلێن دەکەوێتە نێوان خودرێسایی ویستی تاك و ویستی گشتی و نێوان کاری هەڵبژاردنی کەس[٨] و کاری دروست،[٩] دوو لایەنی بوونێك لە نێوان ویستی سیاسی و عەقلانیەتی سیاسی بەرچاو دەکەوێت. کانت ویستی لە

5- Self- legislation.
6- cafegorical imperativ.

٧- فردريك كاپلستون، تاريخ فلسفه سياسى، جلد ششم، پێشوو، ل ١١١.

8- Self- choosing.
9- Right- acting.





هەلومەرجی سیاسی و هەلومەرجی دەرەکی جیاکردەوە و لە هەموو ڕوویەکەوە بێ مەرجی کرد، لەکاتێکدا کە ویستی عەقلانیی نێو تیۆرەکەی ڕۆسۆ هێشتا پێویستی بە بزوێنەرێك هەبوو لە ناو قووڵایی سروشتی مرۆڤدا، یاخود یاسایەکە کە ((بە پیتگەلێکی نەسڕاوە لەناو دڵی مرۆڤەکاندا هەڵکەندراوە)).[١٠] ویستی عەقلانیی کانت بە شێوەیەکی پەتی عەقلانییە و پەیوەستە بە عەقڵی کردەیی (وەکو بنەڕەتێکی پێشینە)ەوە. لە ئەنجامدا دوولایەنی بوون لەنێوان ویستی سیاسی و عەقلانیەتی سیاسیدا بەرچاوناکەوێت و هیچ کەلێنێك لەنێوان کاری هەڵبژاردن و کاری دروستدا بوونی نابێت. بەم جۆرە ڕێسایی ویست و ویستی گشتی یەکسان دەبن.

## ویستی سیاسی و ویستی عەقڵانی

لە پاژی یەکەمدا باسمان لەو بابەتە کرد کە چۆن هۆبز لەگەڵ ئەوەی کە ویستە جیابووەکانی مرۆڤی کردە بنەڕەت لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسیدا بەڵام بە گواستنەوەی ئەم ویستە بۆ فەرمانڕەوای ڕەها نەك تەنها بنەڕەتی ڕەزامەندی کە بناغەی پێکهێنانی دەوڵەت بوو لە بیری نوێدا کاڵکردەوە بەڵکو پێگەی ویستیشی لە کاری یاسادانانداندا لاواز کرد. کاری بیرمەندانی پاش ئەو لە ڕوویەکەوە گەڕاندنەوەی ویست بوو بۆ خاوەنەکانیان واتە خەڵکی. کانت بەدوای ئەو ناهاوسازیگەلەی کە ببوونە هۆی کەم و کورتییەکانی سەرەوە لە تیۆرەکەی ڕۆسۆدا هەوڵیدا لە تیۆری عەقڵی کردەییدا ماوەی نێوان عەقلانیەت و ویست لابەرێت و دوالیزمی ((ویستی ڕاستەقینە)) و ((ویستی حەقیقی)) کە بەشێك بوو لە تیۆرەکەی ڕۆسۆ وەلابنێت. کانت بەم کارە بەتەواوی دەوڵەتی بەرەو مەیدانی عەقڵی پەتی برد. عەقڵی پەتی لەسەربنەمای بیری پێشینە[١١] خوازیاری ئەوەیە کە خەڵکی وەکو بونەوەرگەلێکی خاوەن عەقڵ ببنە شوێنکەوتوانی سیستەمی یاساکان.

کانت هەروەها گرێبەستی کۆمەڵایەتیش لە هەمان چوارچێوەدا دەخاتەڕوو. بەپێی بۆچوونی کانت کاتێك تاکەکان لە کۆمەڵگادا ژیان بەسەردەبەن وەکو ئەوە وایە کە بەرامبەر بە گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی ڕەزامەندییان نیشاندابێت، چونکە وەها شتێك لە ئاکامی پێویستیی مرۆڤ بوونی ئەوانە[١٢]. چوونە ڕیزی گرێبەستی کۆمەڵایەتی و پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی

10- F. M. Barnard, op. cit, p. 137.
11- apriori.
12- Heiner Bielfeldett "Autonomy and Republicanism, Immanuel Kant Philosophy of Freedom" , political Theory, August 1997, p. 524-555.

هاوڕایە لەگەڵ عەقڵی پەتیدا، بەڵام تەنها ڕێکخستنی تاکەکان لە کۆمەڵگایەکی مەدەنیدا بەو واتایە نییە کە تاکەکان کۆبوونەتەوە و عەقڵی خۆیان بەکاربردووە لە کارەکاندا و پێویست بوون و مەشروعیەتی حکوومەتیان پشت ڕاست کردووەتەوە. حکوومەت لەو ڕووەوە مەشروعەکە عەقڵ بەشێوەیەکی پێشینەیی مەشروعیەتی ئەوی ئاشکرا کردووە. بیرۆکەی گرێبەست بیرۆکەیەکی پێشینەیی پەیوەست بە عەقڵی پەتییە.

بەم شێوەیە کانت لە تیۆری ئامێربوونی دەوڵەت کە لە پێویستییەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتییە بەواتا هۆبزییەکەی دووردەکەوێتەوە و وەك بڵێی ئەم کارە ئەو لە کەمپی لیبرالیزم جیاناکاتەوە. ئەرکی سیاسی لە بۆچوونە لیبرالییەکاندا بەزۆری وەکو ئامێر تەماشا دەکرا، چونکە ئامانجە سیاسییەکانی دەوڵەتی لیبرال کەم تازۆر تەنها بە پاراستنی مافەکانی بەر لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسی یان بەواتاییەکی تر پێش سیاسی[13] لەقەڵەمدەدرا. دەبێت دیکترینی خۆیاسادانەری کانت بەسەرچاوەی ڕێسای تەواوی مافە سیاسییەکان ببێتە هەژمار. ناکرێت لە تیۆرەکەی کانتدا دەوڵەت بۆ ئامێری پارێزگاریکردن لە مافە دیاریکراوەکان تاکەکان بچووك بکرێتەوە، چونکە کاری سەرەکی ئەو بریتییە لە خێراکردنەوە و بەهێزکردنی سیستەمێکی دادپەروەری کە لە ڕێگەی ئەوەوە بنەڕەتی ئازادی یەکسان، باری کردەیی وەردەگرێت. کەواتە دەوڵەت نەك تەنها لایەنی ئامێری بەڵکو لایەنی ڕێساییشی هەیە. هەر لەم ڕووەی دەوڵەتدایە کە نەو کانتییە سۆسیالیستەکان وێڕای ئاماژەکردن بە بۆچوونی کانت لەمەڕ مافی خودی سەبارەت بە ئازادی وەها ئەنجامگیری دەکەن کە دەبێت دەوڵەت بۆ بەهرەمەندبوونی هەمووان لەبەژداری و ئازادی هەلومەرجی ئابووری- کۆمەڵایەتیی پێویست وەکو پێش هەلومەرج فەراهەمبکات[14].

کانت لە یادداشتەکانیدا بۆ ((چەند سەرنجدانێکی هەستی جوانی و کاری هاوسەنگ)) لە ئاماژەکردن بە گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆبز دەنوسێت: ((لەخۆ سپاردن و بەدەستەوداندا نەك تەنها شتێکی مەترسیدارە بەڵکو ناپەسەندی و دژ یەکێك بوونی هەیە کە لە هەمان کاتدا دیارخەری نامەشروعیەتی ئەوە. گیانداربوونەوەرێکی تەواو نییە، چونکە بە ئاگا نییە لە بوونی خۆی.... و هیچ لە بوونی خۆی نازانێت. بەڵام ئەگەر مرۆڤیش پێویستی بەگیان و خۆویستی

13- Pre Political.

14- Heiner Bielfeldett "Autonomy and Republicanism: Immanuel Kant Philosophy of Freedom", political Tneory, August 1997, p. 524-555.





نەبێت و گیانێکی تر ئەندامەکانی بجاتە جوولە شتێکی پووچ و هەڵەیە. وەها مرۆڤێك بەتەواوی ئالەتی دەستی کەسێکی ترە... ئەو مرۆڤەی کە پەیوەستە بە کەسێکی ترەوە ئیدی مرۆڤ نییە و پلە و پایەی خۆی لەدەستداوە. شتێك نییە جیا لە موڵکی مرۆڤێکی تر))[15].

## لە ویستی گشتییەوە بۆ ویستی عەقڵانی

کانت چەمکی ((ویستی گشتی))ی وەکو ویستی ڕووەو باشە و هەروەها پەیوەندی نێوان ڕووی گشتی و ڕووی ئەخلاقیی یاسای لە ڕۆسۆوە وەرگرت و کردییە بناغەی تیۆری ((خودرێسایی ویست))ی خۆی. هەروەك ئاماژەی پێکرا ڕۆسۆ کۆمەڵگای بە بوونەوەرێکی ئەخلاقی و بەهرەمەند لە ویست هەژماردەکرد و بڕوای وابوو کە ئەم ویستە گشتییە هەموو دەم خوازیاری مانەوە و خۆشبەختی گشت و بەشەکانیەتی و وەکو پێوەری دەست نیشانکردنی ڕەواو ناڕەوایە بۆ هەموو تاکەکان[16]. بیری گشتی بوونی یاسا بووە یەکێك لە سەرچاوەکانی ئیلهامی کانت و سەرەداوی تیۆری فەرمانی ڕەهای ئەو. کانت بە تیۆری فەرمانی ڕەها و هۆشی باڵا یەکێك لە کەم و کورتییەکان و ناهاوسازیەکانی تیۆرەکەی ڕۆسۆ دەربارەی ویستی گشتی چارەسەرکرد. ئەم کەم و کورتییەیش بەم شێوەیە بوو: ڕەنگە لە تیۆری ویستی گشتی ڕۆسۆدا ئەو میکانیزمەی کە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا نوێنەری ویستی گشتییە بەدروستی کارنەکات و ویستەکەی ڕووەو باشە نەبێت هەر لەبەر ئەم تێبینییە بوو کە ڕۆسۆ جیاوازی دانابوو لە نێوان ویستی گشتی و ویستی هەمووان. ویستی هەمووان گەرچی ویستی هەموو خەڵکی و ویستی هاوبەشە بەڵام ڕووەو باشەی گشتی نییە. بەڵام ویستی گشتی وێڕای ئەوەی کە ویستی هەموو خەڵکییە و هاوبەشە لە هەمانکاتدا ڕووەو باشەیشە. هەروەها پێگەی یاسادانەریش لە پەیوەندی لەگەڵ ئەم پرسەدا خرابووەڕوو. بەڵام ڕۆسۆ هیچ پێوەرێکی سەربەخۆی بەدەستەوە نەدابوو کە بزانین کامیەك میکانیزمی نوێنەری ویستی گشتییە و کامیەك نوێنەری ویستی هەمووانە. بۆیە هیچ پێوەرێك بۆ دەستنیشانکردنی چۆنیەتی ئەخلاقی کارەکان و ڕووەو باشە بوونیان دیارینەکرابوو.

١٥- ارنست کاسیرر، رۆسۆ، کانت، گۆتە، پێشوو، ل ٦٤.

16- Politique, Bibliotheque de la Pleade, Voll III, p. 244.

لەم بارەیەوە کانت درێژەی بەکارەی رۆسۆ دا و تەواویکرد. لە تیۆرەکەی کانتدا چۆنیەتی خۆیاسادانەریی ویست یەکێکە لە لایەنەکانی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە. کانت ویستی عەقلانی دەکاتە شوێنکەوتووی یاساگەلێك کە خۆی دایدەنێت. یەکێك لە دەستکەوتە گەورەکانی کانت هەر لەم بوارەدا بەدیارکەوت. ئەم دەستکەوتە گرنگە بریتیبوو لە دوورخستنەوەی تەواوی ئەخلاق لە کۆتی ئەو وێنایانەی کە پەیوەندییان بە میتافیزیك و ئیلاهیاتەوە هەبوو. بەم جۆرە کانت تایبەتمەندی پێویست و گشتیی ئەخلاقیاتی کە بەردەوام جێی رەخنەی گومانگەراکان بوو سەلماند و لە بەرامبەر هێرشە گومانییەکاندا پێگەیەکی نوێی بۆ تیۆری رەهابوونی ئەخلاق دروستکرد.

کانت ئەخلاقیاتی خستە سەربنەمای ویستی ئازاد، بەم جۆرە شۆڕشێکی لەناو ئەخلاقیاتدا دروستکرد کە بە شۆڕشی کۆپەرنیکی چوێندراوە. بە بۆچوونی کانت یاسای ئەخلاق بریتی نییە لە دۆزینەوەی عەقڵی کردەیی بەڵکو بریتییە لە فەرمانی عەقڵی کردەیی واتە بەرهەمی ویستی پەتی. فۆرمی ویستی پەتی کە دراوی عەقڵە، بناغەی چەمکە کردەییەکانە. لێرەدایە کە مەرجەعیەتی ویست لە جیهانێکدا سەرگەرمی کاری یاسادانەرییە کە هێشتا بەتاڵ و بێ ناوەڕۆکە. هیچ شتێکی لە پێشتر لە ویست بوونی نییە. کانتیش وەکو رۆسۆ مرۆڤی خاوەن عەقڵ بەخود مەبەست دادەنێت کە هەرگیز نابێت وەکو ئامراز بۆ خزمەتی مەبەستگەلێکی تر بەکاربرێت. ئەم خاڵە بەو واتایەیە کە ((ویستی هەر بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ یاسایەکی گشتی دروستدەکات)). بە بۆچوونی کانت ئێمە وەکو ((خود گەلێك))ی سەربەخۆ ئازادین لە هەڵبژاردنی ئامانج و مەبەستەکانی خۆماندا[17].

بۆ گەیشتن بە خود رێسایی دەبێت هەموو کارە مەرجدار و پەیوەستەکانی حەزو ئارەزووە نەفسانییەکان یان بەرژەوەندییەکان بەکارگەلێکی مەرجی یان مەرجدار و پەیوەست تەماشا بکەین و بەدوای فەرمانی رەها یاخود کاری بێ مەرجدا بگەڕێین. تەنها شتێك کە بەبێ هەموو تێبینی و مەرجێك باشە بریتییە لە ویستی باش. هەموو شتێکی تر بۆ مەبەستێك بەباش لەقەڵەمدەدرێت بەڵام ویستی باش تەنها شتێکە کە بەبێ لەبەرچاوگرتنی هەموو مەبەستێکی تر بەباش دادەنرێت. بەهرەگەلێکی وەکو زیرەکی و ئازایی و هۆشیاری و خۆشبەختی و سامان و پلەوپایە و چێژەکان هیچ کامیان شێوازی بەکارهێنانی خۆیان دیاریناکەن، تەنها وەکو

١٧- مایکل ساندل، ((عدالت و خیر)) درمایکل سانل، ویراستار، لیبرالیسم و منتقدان ان، پێشوو، ل ٢٧٧.





ئامرازێکن کە ویست بەهەر جۆرێك بیەوێت بەکاریان دەبات. بەڵام ویستی باش بۆخۆی باشە، نەك لەبەر مەبەستەکانی. ویستی باش کارکردنە بە ئەرك، واتە کارکردن بۆ ئەرك نەك بۆ هیچ بەهاو بایەخێکی تر[18].

فەرمانی رەها کە خودرێسایی ویستی لەخۆیدا هەڵگرتووە بەم بنەڕەتە یان ئەم رێساییە[19] دەخرێتەڕوو: وەها هەڵسوکەوت بکە کە بەردەوام رێسای ویستی تۆ وەکو بنەڕەتی دانانی یاسا بێت. بەم جۆرە خودرێسایی ویست وەکو بنەڕەتی باڵای ئەخلاق و تەنها بنەڕەتی هەموو رێسا ئەخلاقییەکان و ئەرکی رەها لەگەڵ ئەودا دەردەچێت. ئەگەر ئازادی ویست واز لێبێنین و بیکەینە شوێنکەوتووی تێبینییەکانی تر لەم حاڵەتەدا ویست شوێنکەوتووی ئەخلاق یان شوێنکەوتووی خودیاسادانەریی ویستی عەقلانی نییە. کانت لە کتێبی رەخنەی عەقڵی کردەییدا ئاماژە بە تیۆرگەلێك دەکات کە بنەڕەتە ئەخلاقییەکانیان لەسەربنەمایەکی جیا لە ویستی عەقلانی داناوە و لێرەوە رەخنەیان لێدەگرێت. لێرەدا دەڵێت مۆنتنی بنەڕەتە ئەخلاقییەکانی لەسەربنەمای پەروەردە داناوە، مندڤیل لەسەربنەمای سیستەمی یاسایی و ئیپیکۆر لەسەر چێژ و هاچسن لەسەر هەستکردنی ئەخلاقی، بەڵام هەموو ئەمانە هۆشەکی و دەرەوەی خودین. تیۆر گەلێکیش هەن کە ئەخلاقیان لەسەربنەمای عەقڵگەرایی دامەزراندووە و یاسای ئەخلاقی لە عەقڵەوە دەردەهێنن. وەکو هەیوانییەکان، بەڵام ئەوان رێسا ئەخلاقییەکان و ئەرکی ئەخلاقیان بە پرسی کاملکردنی خود و کاملبوونی ناوەوە بەستووەتەوە[20]. کانت ئەمانە رەت دەکاتەوە و لە رەتکردنەوەی ئەخلاقدا وەکو ئەرکی ملکەچیکردن لە خودا دەڵێت: دەکرێت لەم کۆمەڵە بپرسین بۆچی دەبێت ملکەچی لە ویستی خودایی بکرێت؟ کاتێك لە وەڵامدا بوترێت: بۆ راپەڕاندنی ئەرك، کانت بەڵگە دێنێتەوە کە ئەم وەڵامە نیشانی دەدات بەر لە ملکەچیکردن لە خودا بە ئاگاین لەبوونی خۆمان وەکو بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ. لەم حاڵەتەدا دیسانەوە بەو ئەنجامە دەگەین کە خودبوونیادی یان خودرێسایی ویست بنەڕەتی باڵای ئەخلاقیاتە.

١٨- یوسف کرم، فسلفه کانت، ترجمه محمد محمد رضایی، قم. انتشارات تبلیغات اسلامی، ١٣٧٥، ل ٨٩.
19- axium.
٢٠- فردریك کاپلستون، پێشوو، ل ٣٣٧.

هەڵبەتە ئەمانە کاتێك واتادار دەبن کە جیاوازی دابنێین لەنێوان مرۆڤ وەکو بوونەوەری خاوەن عەقڵ و مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی شوێنکەوتووی حەز و ئارەزووەکان، چونکە حەز و ئارەزووەکان لەگەڵ فەرمانەکانی عەقڵدا یەکناگرێتەوە. کانت وایدادەنێت کە عەقڵی کردەیی یان ویست وەکو عەقڵ خەریکی دانانی یاسا دەبێت و مرۆڤ وەکو بوونەوەرێك کە لە هەمان کاتدا خاوەن حەز و ئارەزو و بزوێنەرگەلێکە دەبێت پەیڕەوی لەم یاساییەی عەقڵی کردەیی بکات. لێرەدا دەگەینە روویەکی تری زنجیرەی پەیوەندی نێوان بیری کانت و رۆسۆ. رۆسۆ هەمیشە ویستی گشتی بەسەرچاوەی یاسا ئەخلاقییە راستییەکان دەزانێت و جیاوازی دادەنێت لەنێوان ویستی گشتی وەکو ویستی راست و دروست لەگەڵ ویستە پاژی و تەنانەت ویستی هەمووان (کە راست و دروستیش نییە). کانت ئەم بیرەی رۆسۆی بەرەو دەقی فەلسەفەی خۆی و تیۆری ویستی عەقلانیی خۆی برد و ئەو پلەوپایەی کە رۆسۆ بۆ ویستی گشتی لەبەرچاوی گرتبوو بەویستی باشی بەخشی: ویستی باش وەکو ویستی بێ مەرج واتە ویستێك بەدوور لە هەموو بەند یان مەبەستێکی دەرەوەی خۆی.

کانت بەم پێشەکییانە ویستی عەقلانیی وەکو توانای رێساسازی غەریزەیی مرۆڤ دەناسێنێت. بەم جۆرە پێگەیەکی بەرزتر بۆ چەمکی ویست وەکو بەردی بناغەی کۆمەڵگای سیاسی لەبیری نوێدا دیاری دەکات. لە تیۆرەکەی کانتدا ویست زیاد لەوەی کە توانایی هەڵبژاردن بێت توانای ئەرکدارکردنی تاکە بە بنەڕەتە خودسازەکان[21]. شتێکی بەڵگەنەویستە کە ویستی بەبێ هەبوونی هەل و بواری هەڵبژاردن واتە بڕیاردان بەشێوەیەکی سەربەخۆ ئازاد نابێت. بەڵام ئازادیی راستی لە هەڵبژاردنی پەتی کە مەرجی پێویست و دەرەوەی ویستی ئازادە زیاتر هەنگاو دەنێت. تاك دەزانێت کە دەبێت فلانە کار ئەنجامبدات لە هەمان کاتیشدا دەزانێت کە ئەنجامدانی ئەم کارە شتێکی زۆرەملێ نییە بەڵکو لە بڕوای ئەرکسازی خۆیەوە سەرچاوە دەگرێت.

بۆ باشتر تێگەیشتنی تیۆری دەوڵەتی کانت خستنەڕووی وێنەیەکی گشتێتی بۆچوونی ئەو دەتوانێت هاوکارێکی بەسوودبێت لەم بارەییەوە:

١- کۆمەڵگای سیاسی یان دەوڵەت بۆ وەدیهێنانی مافی زاتیی ئازادی دەرەکی دروستبووە.

21- Self- given.





٢- مافی زاتیی ئازادی دەرەکی واتە سەربەخۆ بوون لە ویستی خەڵکی (خودرێسایی) پێویستی بەوەیە کە خەڵکی ویستەکانیان لە یەکتردا یەکبخەن. شوێنکەوتنی ویستی هاوبەش وەکو شوێنکەوتنی ویستی خودە.

٣- مرۆڤەکان وەکو بوونە خاوەن عەقڵەکان بەپێی فەرمانی عەقڵی کردەیی بە یەکخستنی ویستەکانی خۆیان و دانانی یاسا هاوبەشەکان فەرمی بوونی ئازادی و موڵکداری و مەرجەکانی دادپەروەری و نادادپەروەری (کە لە باری سروشتیدا شتێکی بێ واتایە) جێگیردەکەن.

٤- یاسا هاوبەشەکان بەرهەمی خۆیاسادانەریی هەموو ئەندامێکی خاوەن بیری دامەزراو لەسەر فەرمانی عەقڵی کردەیی گونجاو لەگەڵ ئەم بنەڕەتە دایە: تەنها بەپێی رێسایەك کار بکە کە بخوازێت ئەو رێسایە بگۆڕێت بۆ یاساییەکی گشتی.

پرسیاری سەرەکی کانت لە کتێبەکانی ((بنەما میتافیزیکییەکانی ئەخلاق)) و ((رەخنەی عەقڵی کردەیی)) بریتییە لە چۆنیەتی خودڕێسایی و خۆیاسادانەریی ویست. کانت دوابەدوای رۆسۆ سەرنجی ئەو بنەڕەتە دەدات تا ئەوکاتەی نەتوانین لە تێگەیشتنی هەموو تاکێکدا بەدوای بنەڕەتی ئەخلاقییەت[22] بگەڕێین، ئەخلاق دەبێتە شتێکی مەحاڵ. دەبێت خاڵی دەستپێکی تێڕامانی ئەخلاقی لەسەربنەمای تێگەیشتنی ئەخلاقیی دامەزرابێت ئەوە تێڕوانینێکی کۆنە کە دەڵێت دەبێت کاری ئەخلاقی شتێکی زیاتر لە قبووڵکردنی کاردانەوەییانەی پێوەرگەلێك لە کردارەوە بێت. بۆ ئەوەی کردارێك لەڕووی ئەخلاقییەوە خاوەن بەهابێت، دەبێت لەسەربنەمای ویستی ئازادی ناوەوەی بکەر دامەزرابێت. لە نەریتی بیری ئەخلاقیدا بەردەوام گرنگی ویستی ناوەوەی بکەر بەمەرجی پێویستی ئەخلاقی بوونی کردار لەقەڵەمدەدرا. تۆماس ئاکویناس تا ئەو جێیە بەرەو پێشەوە دەچێت کە دەڵێت دەبێت لە کاتی ناکۆك بوونی نێوان ویژدان و رێسایەکی ئەخلاقی دەرەوە بەپێی خواستی ویژدان کاربکەین تەنانەت ئەگەر رێسا ئەخلاقییەکەی دەرەوە دروست و ویژدان لە هەڵەش دابێت، کانت رەخنە لە وتەکەی ئاکویناس دەگرێت و دەڵێت ئەو پەیڤەی کە رەنگە ویژدان لە هەڵەدا بێت وتەیەکی زمانەوانی بێت چونکە هەموو رێسایەکی دەرەوەی ویستی ئەخلاقی بە دوورە لە بەهاوپێگەی ئەخلاقی[23]. هەروەها هەموو جۆرە بینبەخشینێك بەرێسای ئەخلاقی بۆ نموونە سیستەمی بەها میتافیزیکییەکان کە سەربەخۆ و لەپێشتر بێت لە ویستی لە ئاکامدا بەرێژەیی بوونی ئەخلاقی کۆتایی دێت.

22- mordlity.

23- Heiner Bielefeldt, op. cit, p. 526.

هەروەك ئاماژەی پێكرا كانت دەڵێت ((ناكرێت هیچ شتێك لە جیهان و تەنانەت لە دەرەوەی جیهانیش بەبیرماندا بێت كە بەبێ بەست و مەرج بە باش دابنرێت جگە لە خواستی باش (ویستی باش)[٢٤])).

بەم جۆرە كانت ئەخلاقی لە فەلسەفە و بە تەواوی لە میتافیزیك جیاكردەوە. لەم كارەیشدا شێوازەكەی رۆسۆ و بەو واتاییەی كە ئێمە خستمانەروو شێوازەكەی هۆبزی درێژە پێداو بەرەو كامڵبوونی برد. بەڵام لە كاتێكدا كە رۆسۆ پێویست بوونی فەلسەفەی ئەخلاق بەدی ناكات كانت هەوڵدەدات بۆ ئەوەی بنەڕەتی ئەخلاقیەت لە بەرامبەر راڕایی وازلێهێنانی ئەركدا بەهێز بكات لەسەربنەمایەكی نوێ فەلسەفەی ئەخلاق دادەمەزرێنێتەوە. كانت سەرچاوەی ناوەوەی ئەخلاق لە بەرامبەر سەرچاوە بینراوەكانی دەرەوە دادەنێت و بڕوای وایە كە ناكرێت سەرچاوەی ناوەوەی ئەخلاق لەسەر بینراوەكانی دەرەوە دابمەزرێندرێت. بۆ نموونە كاتێك كە بنەڕەتە ئەخلاقییەكان لەسەر حەزە سروشتییەكان دابمەزرێنین بە تەواوی گۆڕیومانە بۆ ئامێر، واتە ئامرازێك بۆ خۆشی تاكەكەسی (بەهەمان شێوەی سوودگەرایی)، و كاتێك لەسەر فەرمانی خودایی دایبمەزرێنین كرداری ئەخلاقیمان بۆ پەیڕەوی لێكردنی كوێر كوێرانە بچووك كردۆتەوە. هەر كاتێك كە پەروەردەی ئەخلاقی ببەستینەوە بەفێركردنە كەلتووری و هزرییەكان دەگەینە خۆ بەزلزانی، واتە شتێكی دژ بە سروشتی ئەخلاقی. بەم پێیە بێ مەرج بوونی ((دەبێت))ی ئەخلاقی هەموو جۆرە بینبەخشیەك رەتدەكاتەوە.

## پێویستی ئەخلاقی و عەقڵانیی كۆمەڵگای سیاسی

یەكێك لەو پرسانەی تر كە كانت لە درێژەی تیۆرەكەی رۆسۆ سەبارەت بە ویستی گشتی وەڵامی دەداتەوە بریتییە لە بابەتی گونجانی لۆژیكی لە تێكەڵكردنی ئازادی لەلایەك و زەبر و زۆرەملێ لەلایەكی ترەوە. چۆن دەكرێت لە كۆمەڵگای سیاسیدا ئازادی و زۆر و ناچاركردن تێكەڵ بە یەك بكرێن بێ ئەوەی لەگەڵ ئازادی گشتیدا ناكۆك بێت[٢٥]. هەروەك باسكرا ئەم پرسە یەكێكە لە بابەتە سەرەكییەكانی فەلسەفەی سیاسیی رۆسۆ. دەكرێت بەم جۆرە ئەم پرسە

---

٢٤- ایمانوئل كانت، بنیاد ما بعد الطبیعة اخلاق، ترجمة حمید عنایت و علی قیصری، تهران، انتشارات خوارزمی، ١٣٦٩، ل ١٢.

25- universal freedom.





بخرێتەڕوو: چۆن فۆرمێكی كۆبوونەوە (كۆمەڵ) بدۆزینەوە كە تیایدا بەهێزی هەمووان بەرگری لە باشەی تاك و هەموو ئەندامان بكرێت لەكاتێكدا كە تاك لەگەڵ خەڵكیدا یەكی گرتووە جیا لەخۆی پەیڕەوی لە كەسی تر نەكات و وەكو بەر لە پەیوەندیكردن بەم كۆمەڵەوە بەردەوام بە ئازادی بمێنێتەوە؟ ئەم پرسە لە فەلسەفەی سیاسیی كانتدا بەشێوەی گونجاندنی خودرێسایی ئەخلاقی تاك لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیی دەوڵەت دەخرێتەڕوو. بەبڕوای كانت دەسەڵاتی سیاسی بریتییە لە مافی راگەیاندنی یاساكان و جێبەجێ كردنیان بەسوود وەرگرتن لە مافی تایبەتیی سوود وەرگرتن لەو زەبر و زۆرەملێیەی كە خەڵكی بە فەرمی ناسیویانە. بەم پێیە لە بنەڕەتدا یاسا فەرمانی فەرزكراوی فەرمانڕەوایە بۆ ئەو هاوڵاتییانەی كە ئەركدارن بە ملكەچی لێكردن[٢٦]. بەڵام هەروەك باسمانكرد بەبڕوای كانت تایبەتمەندی سەرەكیی بكەرێتی ئەخلاقی[٢٧] بریتییە لە خودرێسایی واتە خۆیاسادانەری یان بەواتایەكی تر توانایی ویست لە دانانی یاساكان بۆ خود، چونكە پابەندبوون بە یاسای كەسانێكی ترەوە واتە ناخودڕێسایی[٢٨]. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی كە دەسەڵاتی سیاسی لەخۆگری ناخود رێساییە، ئایا لێرەدا ناكۆكی و دژیەك بوونێك لە تیۆرەكەی كانتدا بەرچاوناكەوێت؟ چۆن تاك كە لێرەدا خاوەن باری شوێنكەوتنە، لەژێر فەرمانی دەسەڵاتی سیاسیدا پەیڕەوی لە عەقڵی خۆی دەكات؟ لەباری سروشتیدا تاكەكان لەژێر فەرمانڕەوایی هیچ دەسەڵاتێكدا نین. بەڵام لەكاتی چوونە ناو كۆمەڵگای سیاسی یان كۆمەڵگای مەدەنی ئەم ئازادییە لەدەستدەدەن. هۆبز ئەم كارە بە گونجاو لەگەڵ هۆشیاری و دووربینی دەبینێت. رۆسۆ دەڵێت كاتێك كە لە كۆمەڵگای سیاسیدا هەمووان پەیڕەوی لە ویستی گشتی دەكەن لە راستیدا پەیڕەوی لە خۆیان دەكەن و جیا لە خۆیان پەیڕەوی لە كەسی تر ناكەن. كانت چۆن ئەم پرسە واتە ئازادی و ناچاركردن بەیەكەوە دەگونجێنێت؟ لە كاتێكدا كە بەروالەت دەبێت دووركەوتنەوە لەباری سروشتی و قبووڵكردنی كۆمەڵگای سیاسی بەواتای دووركەوتنەوە لە خودرێسایی و قبووڵكردنی ناخودرێسایی بێت.

---

26- Immanuel Kant, The Metaphy sical Elements of Justice, Trans John Iadd, Indianapolis, Bobbs- Merill, 1965, p. 26.

27- Moral Agency.

28- Heteronomy.

کانت دەڵێت تاك ئەرکدارە بە چوونە ناو کۆمەڵگای سیاسی، لە کاتێکدا کە بەرواڵەت بۆ پاراستنی خودرێسایی نابێت وەها کارێك بکات[٢٩].

کانت بەم جۆرە ئەم پرسە چارەسەر دەکات: پیشانیدەدات کە خودرێسایی ویستی تاك و دەسەڵاتی حکوومەت نەك تەنها هەر ناکەونە بەرامبەر یەك بەڵکو تەنانەت دوو چەمکی پەیوەست بە یەك، یاخود لەراستیدا دوو ڕووی یەك دراون. کانت لە تیۆری مافی خۆیدا یەکسانیی ئەم دوو چەمکە دەسەلمێنێت. کانت لەم تێڕوانینەی ڕۆسۆوە دەستپێدەکات کە کۆمەڵگای سیاسی ئاڵوگۆڕی ئەخلاقی لە سروشتی تاکدا دروستدەکات. باری تاك لە کۆمەڵگای سیاسیدا وەکو بکەرێکی ئەخلاقی بەشێوەیەکی چۆنی جیاوازە لە باری ئەو لە حاڵەی سروشتیدا کە بەدوورە لە ئەخلاق. لە کۆمەڵگای سیاسیدا تاك دەتوانێت دادپەروەر یان نادادپەروەر بێت لە کاتێکدا کە ئەمە سەبارەت بە باری سروشتی ڕاست دەرناچێت[٣٠]، تاك بە چوونە نێو کۆمەڵگای مەدەنی ئازادیی بێ یاسای پێشوو بەجێدەهێڵێت و دەچێتە ناو باری یاساییەوە. لێرەدا دیسانەوە ئەو ئازادە چونکە دەتوانێت خەریکی خۆیاسادانان بێت، بەم جۆرەش خودرێسا بێت. بۆ ئەوەی توانای خۆیاسادانەریی تاك بە تەواوی بێتەدی دەبێت لە ڕێگەی گرێبەستێکی کۆمەڵایەتییەوە بەشداری لە کۆبوونەوەیەکی مەدەنی بکات. خود یاسادانەریی تاك لە کارێکی بە کۆمەڵ و هاوبەشدا دێتەدی[٣١].

بۆ تێگەیشتنی ڕێگەچارەکەی کانت لە پێکەوە گونجانی خودرێسایی و دەسەڵاتی سیاسی یان ئازادی و ناچارکردن دەبێت سەرنجی تێڕوانینی ناوبراو بدەین دەربارەی گرێبەستی کۆمەڵایەتی. تێڕوانینی کانت بۆ گرێبەستی کۆمەڵایەتی جیاوازە لە تێڕوانینی هۆبز و لۆك. کانت لە چوارچێوەی تیۆری عەقڵی کردەییدا دەڕوانێتە گرێبەستی کۆمەڵایەتی. مەبەستی عەقڵی کردەیی بریتییە لە کردار هەروەك چۆن مەبەستی عەقڵی تیۆری بریتییە لە ناسینی جیهانی دیاردە. عەقڵی کردەیی مامەڵە لەگەڵ بڕیاری ویست، لێرەیشەوە لەگەڵ هزرەکاندا دەکات. ئێمە بە هەڵبژاردنی بیرێك وەکو بابەتی ویستی خۆمان ئەو بیرە دێنینەدی. وەدیهاتنی ویست پەیوەستە بە توانایی ویست لەو بارەیەوە کە بتوانێت ببێتە هۆکاری کارەکان. دەتوانین لە بیرۆکەی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی خۆزراو یان ئامانجدا وەکو نموونەیەك دامەزراوەیەکی

29- Kevin Dodson "Autonomy and Authority in Kant's Rechtslehve", Political Theory, Vol 25 No I, February 1997, p. 93- III.
30- Ibid.
31- Kevin Dodson, op. cit.





مەدەنی دروستبکەین و هەوڵبدەین لە واقعیەتی دەرەوەدا بەرە بەرە لەو نموونەیە نزیك ببینەوە. ئەم دامەزراوە خوازراوە دامەزراوەیەکە کە بە گونجان لەگەڵ ئازادی خەڵکیدا زۆرترین ئازادیی گونجاو فەراهەمدەکات. لە هەموو قۆناغێکی مێژوویدا کۆمەڵگای مەدەنی لە هەڵسەنگاندنی بەپێی ئاستی ئایدیال چەند کەم و کورتیگەلێك لەخۆ دەگرێت و دەبێت ئێمە بەردەوام هەوڵ بۆ باشترکردنی بدەین. لە ڕاستیدا ئەمە بەشێکە لە سروشتی ئایدیا کە واقعیەت هەرگیز بە تەواوی لەگەڵیدا یەکناگرێتەوە.

خاڵێکی تر ئەوەیە کە بەپێی بنەڕەتی خودرێسایی ویست و گونجاو لەگەڵ فۆرمولی کاری ڕەهای کانت دەبێت ئێمە ویستی خۆمان نەك تەنها بکەینە شوێنکەوتووی یاسا بەڵکو بیکەینە شوێنکەوتووی فۆرمێك کە دەبێت بەپێی ئەو یاسا بۆ خۆمان دابنێین و خود یاسادانەر بین. بەواتاییەکی تر ئێمە تەنها شوێنکەوتووی یاسا نیین بەڵکو شوێنکەوتووی فۆرمێکین کە تیایدا بەتەواوی خود یاسادانەری ئێمە لە بەرچاوگیراوە. بەپێی بۆچوونی کانت کار بەڕێوەبەرە خاوەن عەقڵەکان یان زاتە خاوەن عەقڵەکان بەهۆی یاسا هاوبەشەکانەوە سنوورێك لە مەبەستەکان دروستدەکەن کە کۆمەڵگای مەدەنی یەکێکە لە ڕەهەندەکانی یان لایەنە گرنگەکانی، واتە لایەنی دادگایی و یاسایی ئەو سنوورە. لە وڵاتی مەبەستەکاندا هەموو بکەرە عەقڵانییەکان لەگەڵ یەکتردا یەکیان گرتووە. ئەم پێکەوە پەیوەستبوونە لە جۆرێك گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا ڕەنگی داوەتەوە کە کۆمەڵگای مەدەنی دروستدەکات. ئەم پەیوەندی کردنە بە یەکێتی بوونەوەرە خاوەن عەقڵەکان لەسەربنەمای پەیوەندی بەرامبەری نێوان ئێمە دامەزراوە. خودرێسایی ناوەڕۆکی سەرەکیی گرێبەستی کۆمەڵایەتییە و یاسا هاوبەشەکانیش بەرهەمی خودیاسادانەریی بینراوی هەموو ئەندامێکی گرێبەستەکە یاخود ئەندامانی یەکێتییەکەیە. هەموو ئەندامێك بەشدارە لە دانانی یاسا گشتییەکاندا و لە کاتێکدا کە پەیڕەوی لەم یاسا گشتییانە دەکات شوێنکەوتووی ویستی کەسێکی تر نییە، چونکە ئەم یاسایانە لە ویستی ئەوەوە سەرچاوەیان گرتووە. بەشداریکردنی لەم یاسادانانە ڕەگەزی سەرەکی و بناغەی ئەندامبوونە لە وڵاتی مەبەستەکاندا. لە کاتی نەبوونی وەها بەشدارییەك خودرێسایی ویست بچووك دەبێتەوە بۆ ناخودرێسایی.

کانت بەم شێوازە پرسی ویستی گشتیی ڕۆسۆ چارەسەر دەکات کە دەڵێت ویستی هەموو ئەندامێك بەشدارە لە دانانی یاسا گشتییەکاندا، بۆیە لە کاتی پەیڕەوی لێکردنی یاساکانی کۆمەڵگای مەدەنی شوێن ویستی کەسێکی دیکەی جیا لە ویستی خۆی نەکەوتووە. یاسا

ویستی هەموو تاکێکە (چونکە ویستی هەموو تاکێك بەشدارە لە دروستکردنی یاسای گشتیدا)، لەراستیدا هەموو کەسێك بە پەیڕەویکردن لە یاسا پەیڕەوی لە ویستی خۆی دەکات. لە فۆرمولی ویستی گشتی رۆسۆدا لەبەرئەوەی هەموو تاکێك شوێن هەمووان دەکەوێت بۆیە کەس شوێن کەس نەکەوتووە، بەلاّم لە فۆرمۆلەکەی کانتدا لەبەرئەوەی ویستی تاك یاسای گشتی دادەنێت بۆیە هەموو تاکێك بە پەیڕەوی لێکردنی ویستی گشتی لەراستیدا پەیڕەوی لە ویستی خۆی کردووە. بەم جۆرە کانت وەلاّمی ئەم رەخنەیە دەداتەوە کە لە کاتی هاورانەبوونی بۆچوونی تاك لەگەڵ بڕیاری ویستی گشتیدا لەم حاڵەتەدا تاك لە بازنەی خودرێسایی دەرچووە و بەرەو ناخودرێسایی چووە.

تاکەکان لە کاروبارە کەسییەکاندا ئازادن کە لە چوارچێوەی یاسا هاوبەشەکاندا بەدوای ئامانجەکانی خۆیاندا بگەڕێن. هەربۆیەش میتافیزیکی ئەخلاق هەم تیۆری ماف و هەم تیۆری فەزیلەت. تیۆری ماف مامەڵە لەگەڵ پەیوەندی دەرەکیی بکەرە ئەخلاقییەکان یان زاتە ئەخلاقییەکان کە پەیڕەوی خودیاسادانەریی بە کۆمەڵن دەکات، لە کاتێکدا لە تیۆری فەزیلەت جەخت لەسەر ئەو مەبەستانە دەکاتەوە کە یەك بەیەکی زاتە ئەخلاقییەکان قبووڵیانکردوە[٣٢]. ئێمە لێرەدا مامەڵە لەگەڵ سیستەمێکی ئەخلاقی تاکەکەسی بکەرانێك دەکەین کە لە بارودۆخی کۆمەڵگایەکی داینەمیکدا پەیوەندن بە یەکترەوە. لەوەها کۆمەڵگایەکدا پەیڕەوی لێکردنی کەسێك لە یەکێکی تریان شوێنکەوتنی کەسێك لە یەکێکی تر لە ئارادانییە. هەموو ئەندامەکان لە کردارێکی بەرامبەردا لەگەڵ یەکدا یەکیان گرتووە. هەروەك چۆن کە یاسای گشتیی دادپەروەری پێویستی بە سنووردارکردنی ئازادیی منە، ئەو رێگەیەش بەمن دەدات کە ئازادی خەڵکی سنووردار بکەم.

## مولّکداری وەکو بنەمای دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی

بەپێی بۆچوونی کانت مولّکداری بریتییە لە پانتایی هاوکرداری ئێمە لەگەڵ زاتە ئەخلاقییەکانی تر[٣٣]. ئێمە دەبێت لە بەدواداگەڕانی مەبەستە تایبەتییەکانی خۆماندا شتگەلێکی دەرەکی بۆ ئەو مەبەستانە بەدەستبهێنین. بۆیە لەکاتی سوود لێ وەرگرتنی ئەو

32- Kevin Dodsom, op. cit.
33- Patrick Riley, "On susam Shell's Kamk's Theory of Property", Political Theory, Vol. 6 No. 1 February 1978, pp. 91-99.






شتگەلە رووبەرووی کۆمەڵە تاکێکی تر دەبینەوە کە هەمان ئەو شتانەیان پێویستە بۆ مەبەستە تایبەتییەکانی خۆیان. دەبێت ئەم رووبەڕوو بوونەوە بەشێوەیەك چارەسەر بکرێت کە رێزداریی خودرێسایی زاتە ئەخلاقییە جیاوازەکان بە پارێزراوی بمێنێتەوە. ئەم رێگەچارەیە تەنها بەدامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی دێتەدی. کانت دەڵێت کاتێك شتێك بە مولّکی ئێمە دادەنرێت کە بەبێ مۆڵەتی خۆمان سوود لێ وەرگرتنی ئەو شتە لەلایەن خەڵکییەوە بە سووکایەتی کردن دابنرێت بۆ سەر کەسێتی ئێمە[٣٤]. بۆ ئەم کارە نەك تەنها دەبێت ئەو شتە لەنێو دەستی خۆماندا بێت بەڵکو دەبێت مافی یاسایی و دەسەلاّتی سوود لێ وەرگرتنیشیمان هەبێت. ئەمە پێویستی بە یاسای مولّکدارییە کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بەدەستدێت[٣٥]. هەربۆیە لە تیۆرەکەی کانتدا ئەو ئەرکەمان لە ئەستۆیە یاخود بەواتایەکی تر ئەرکدارین کە بچینە ناو کۆمەڵگای مەدەنییەوە. بەڵگەهێنانەوەی ئەو بۆ ئەم کارە زۆر سادەیە. ئەگەر جیا لەمە بێت بابەتی دەرەکیی ویستی خود (یان ئەو شتەی کە ویستی خود لە دەرەوە پەیوەست دەبێت پێیەوە) ناتوانێت ببێتە مولّکی مەشروعی هیچ کەسێك. تەنها لە کۆمەڵگای مەدەنیدا مولّکداری دەبێتە کارێکی لواو. بۆیە ئێمە ئەرکدارین لەگەڵ یەك و گشتمان پێکەوە بچینە نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە.

لە رواڵەتدا و لە پەیوەندی لەگەڵ بابەتی مولّکداری و کۆمەڵگای مەدەنی دوو روانگەی جیاواز لە کتێبەکەی[٣٦] کانتدا بەرچاو دەکەوێت[٣٧]. لە روانگەی یەکەمدا مولّکداری لە باری سروشتیدا هەیە بەلاّم کاتییە. تاکەکان بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی مولّکداری دەچنە نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە. ئەم روانگەیە لە تێڕوانینەکەی لۆکەوە نزیکە. جیاوازی نێوانیان تەنها لەوەدایە کە لۆك بڕوای وایە مولّکداری لە باری سروشتیدا زیاترە لە شتێکی کاتی. بەپێی ئەم تێڕوانینە مافی مولّکداری لەسەربنەمای خاوەنداری هاوبەش و سروشتیی زەوی دامەزراوە و ویستی گشتی بە گونجان لەگەڵ ئەم مولّکدارییە هاوبەشە خاوەندارێتی تایبەتی بەشتێکی رێگەپێدراو لەقەڵەمدەدات. تاك وەکو مولّك شتێك دەخاتە بەرخاوەندارێتی خۆی و بەو پێیە ئەو کارە ئەنجامدەدات کە یەکەم کەسە بەکردەوە دەستی بەسەر ئەوشتە داگرتووە. ئەم کارە

34- Immanuel Kant, Metaphysical element of Justice, op. cit, p. 51.
٣٥- لێرەدا کانت لە تیۆرەکەی لۆك دوورکەوتۆتەوە و بەرەو تیۆرەکەی گرسیۆس هەنگاوی ناوە.
36- Rechtslehre.
37- Kevin Dodson, op. cit.

لەباری سروشتیدا دێتەدی. لەو جێیەوەی کە ویستی گشتی موڵکداری تایبەتی بە کارێکی ڕێگەپێدراو دادەنێت گەرچی دەستبەسەراگرتن کاری ویستی تایبەتییە بەڵام بە داگیرکردنی موڵکی خەڵکی لەقەڵەمنادرێت.

گەرچی دەکرێت لە باری سروشتیشدا موڵکداری هەبێت بەڵام لەبەرئەوەی کە تاك دەبێت بە تەنها خۆی پارێزگاری و بەرگری لێبکات بۆیە زۆر لەبەردەم زیان بەرکەوتندایییە. لێرەدا کە تاك ناتوانێت بەتەنهایی و بەشێوەیەکی شیاو ئاسایشی موڵکداری خۆی لە بەرامبەر هەڕەشەی خەڵکی دەستەبەر بکات، دەبێت هەرکەسە و ویستی خۆی لەگەڵ ویستی تایبەتیی هەموو تاکەکانی تر یەك بخات. لە ئاکامدا تاك بەچوونە ناوباری مەدەنی ئەوەی کە لەباری سروشتیدا هەیبووە دەیپارێزێت بەو جیاوازییەی کە ئێستا بەهێزی زاڵبوونی گشتی بەرگری لێدەکات[٣٨].

ئەمە تەنها تێڕوانینی کانت بۆ موڵکداری و کۆمەڵگای مەدەنی نییە. ئەگەر وابوایە دەمانتوانی بڵێین کە کانت لەم ڕووەوە زۆرتر لە لۆك بەرەو پێشەوە هەنگاوی نەناوە. لە کاتێکدا کە ئێمە تێڕوانینەکەی کانت بەهاوجۆر لەگەڵ تیۆرەکەی ڕۆسۆ و بەئاراستەی کامڵبوونی تیۆری ویستی گشتی هەڵدەسەنگێنین، کانت ئەو ڕوانگەیەی سەرەوە دەخاتەروو تاوەکو بە قازانجی ڕوانگەییەکی تر لێکی بداتەوە[٣٩]. کانت لە ڕوانگەی دووەمدا دەڵێت تەنها یەك مافی زاتی هەیە و ئەویش بریتییە لە ئازادی. مافی موڵکداری پەیوەستە بە مافی موڵکداری هاوبەش لە زەوی و ڕێگەپێدانی ویستی گشتی بە خاوەنداریێتی تایبەتی. بەدەستهێنانی شتێکی دەرەکی کاتێك ڕەوایە کە گونجاو بێت لەگەڵ ویستی گشتیدا. بەڵام ویستی گشتی لەباری سروشتیدا بوونی نییە. ئەم ویستە گشتییە بە یەکبوون و یەکگرتنی ویستە تایبەتەکان لە کاتی چوونە ناو کۆمەڵگای مەدەنی دادەمەزرێت. لەباری سروشتیدا ئێمە بەپێی ویستی تایبەتی خۆمان کاردەکەین. لەکاتی هەنگاونان بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی ویستە تایبەتییەکان خۆیان دەگوازنەوە بۆ ویستی گشتی و پەیوەست دەبن پێیەوە. لەباری سروشتیدا موڵکدارییی کردەیی پێشوو دەگۆڕێت بۆ شتێکی یاسایی[٤٠].

بەپێی بنەڕەتی خودیاسادانەریی کانت کاتێك کە تۆ دەڵێیت شتێك هی تۆیە هەم خەڵکیشت ئەرکدار کردووە کە ڕێز لە موڵکدارییەکەی تۆ بگرن و هەم خۆیشت ئەرکدار کردووە

38- Ibid, p. 65.
39- Mary Gregor, The Laws of Freedom, Oxford, Oxford University Press, 1963, p. 50-63.
40- de Jure.





کە ڕێز لە موڵکداری خەڵکی بگریت. واتە یاسات بۆ هەموو زاتە ئەخلاقییەکان داناوە. بەڵام یاسادانانی یەك کەس ناتوانێت گشتی بێت، چونکە خودرێسایی خەڵکی تر پێشێلدەکات. کەواتە دەبێت لە ویستێکی گشتیی بە کۆمەڵدا بەشدارییکات کە هەموو زاتە ئەخلاقییەکان لەخۆ بگرێت. کاتێك کە هەموو زاتە ئەخلاقییەکان بەشداری لە ویستی گشتیدا بکەن تەنها پەیڕەوی لەو یاسایانە دەکەن کە خۆیان داینناوە. هەمووزاتێکی خاوەن عەقڵ لەڕووی عاقڵ بوونیەوە هاوڕادەبێت لەگەڵ وەها یاساگەلێکدا. لە تیۆرەکەی کانتدا چەمکی گرێبەستی کۆمەڵایەتی چەمکێکی پێشینەیە، چونکە لە گوتارە خاوەن تێگەیشتنەکانە کە بەشێوەی مەرجی پێشینەیین. تەنها بەمەرجێك چەمکی گرێبەستی کۆمەڵایەتی ڕاست دەردەچێت کە تاکەکان ناچاربن لەگەڵ یەکتردا بکەونە پەیوەندی و کرداری بەرامبەرەوە. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە ئێمە لەگەڵ کەسەکانی تردا لە هاوکردارییدا دەژین، گرێبەستی کۆمەڵایەتی ئەو یاسایانەی کە دەبێت حاکم بن بەسەرمانەوە دیاریدەکات. هەرچەندە کە ڕاستبوونی ئەمە پەیوەستە بەڕاستییە بەرچاوەکانەوە بەڵام بەهاکەی وەکو بیرۆکەیەك پەیوەستە بەزاتە خاوەن عەقڵەکانەوە. ئەم تێڕوانینە ئەو ڕێگەیە بە کانت دەدات کە گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە لایەنی ئامێری دووربخاتەوە. بەپێچەوانەی پێشترەکان، گرێبەستی کۆمەڵایەتی لە تیۆرەکەی کانتدا لایەنی ئامێریی نییە[٤١].

## ویستی گشتی و حکومەتی نوێنەری

لە تیۆرەکەی کانتیشدا وەکو تیۆرەکەی ڕۆسۆ ویستی گشتی بنەما و سەرچاوەی یاسادانانی سیاسییە. خەڵکی لەسەربنەمای یەکسانیی ئازادی ڕێسا یاساییەکان دروستدەکەن[٤٢]. مافی گشتیی ئازادی لە ڕێگەی یاسادانانەوە لە کۆمەڵگایەکی دیاری کراودا فۆرمێکی پەیوەستە وەردەگرێت. بەڵام کانت بەپێچەوانەی ڕۆسۆوە بڕوای وابوو کە دەبێت کاری یاسادانان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ئەنجامبدرێت و ناکرێت ویست بە نوێنەرایەتی بسپێردرێت، لەسەر ئەم بڕوایە بوو کە بەپێچەوانەی خودیاسادانانی ئەخلاقییەوە کە لەلایەن ویستی ئەخلاقییەوە بەشێوەیەکی بێ نێوانکار ئەنجامدەدرێت ناکرێت ئەو چاوەڕوانییەمان هەبێت کە سەبارەت بە یاسادانانی سیاسی کاری یاسادانان بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەلایەن خودی خەڵکییەوە

41- Dodson, op. cit.
42- Riley, op. cit.

ئەنجامبدرێت. نوێنەرایەتی ویستی گشتی دەتوانێت لەسەربنەمای ویستی یەکگرتووی هەموو خەڵکی کاری یاسادانان بۆ کۆمەڵگای سیاسی ئەنجامبدات.

تیۆری ئەخلاقی و سیاسی کانتیش وەکو تیۆرەکەی رۆسۆ لەسەربنەمای تێگەیشتنێك بۆ سروشتی مرۆڤ دامەزراوە. کانت لەو رووەوە ستایشی رۆسۆی دەکرد کە باشیی سروشتیی مرۆڤی خستبووە روو و کارەکەی ئەوی بەهاو ئاستی کارەکەی نیوتۆن دادەنا[٤٣]. کانت دەیوت کە رۆسۆ رونتر لە هەموو بیرمەندێکی تر جیاوازی دانابوو لە نێوان رووی راستەقینەی مرۆڤ و ئەو رووشاندن و لەکەیەی کە کۆمەڵگا لەسەر ئەم رووە بەجێی هێشتووە. کانتیش بڕوای وابوو کە شارستانیەت کۆمەڵێکی زۆری ((باشە)) رواڵەتییەکانی بەسەر مرۆڤدا سەپاندووە کە لەگەڵ سروشتی ((حەقیقی))ی ئەودا ناگونجێت. هەروەها تێگەیشتنی کانت بۆ سروشتی مرۆڤیش وەکو تێگەیشتنی رۆسۆ لایەنی مەبەست ناسیی هەیە. واتە مەبەستی ئەو لە سروشتی مرۆڤ ئەو سروشتەیە کە مرۆڤ دەتوانێت بەدەستی بێنێت و ئەو شتەی کە دەتوانێت هۆشەکیانە پێیبگات و ببێتە ئەو شتە. بە واتاییەکی تر ئەویش وەکو رۆسۆ لەم رووەوە تێڕوانینێکی ئەرەستۆیی هەیە. خەڵکی هەموو شتێك تا ئەو ئاستە دەرکدەکەن و لێیتێدەگەن کە بەپێی مەبەست و مەرامی [شتەکە] لەبەرچاوی بگرن، مەبەستی ناوەوەی سروشت بریتییە لە کەلتووری مرۆڤ. مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی مەعقوڵ و شوێنکەوتووی یاسای ئەخلاقی مەبەستی کۆتایی سروشتە. بەلاّم بە ئاستێك کە مرۆڤ بەپێی وەلاّمی خواستە نەفسییەکان کاردەکات نەك لەسەربنەمای یاسای ئەخلاقی، سروشتیش بە هەمان ئاست دەکەوێتە سەر ئاراستەی مەبەستێکی دەرەوەی خۆی. مەبەستی کۆتایی سروشت بە ئاستێك کە مرۆڤایەتی بە ئاراستەی کەماڵی ئەخلاقی گەشە دەکات، وەدیدێت. مەبەستی کۆتایی سروشت لە کۆمەڵگا و دەوڵەتدا دێتەدی. بۆیە تا ئەو کاتەی کە مرۆڤ لە باری سروشتیدا بمێنێتەوە مەبەستی کۆتایی سروشت وەدینایەت، چونکە تا ئەو کاتەی کە خەڵکی لەم هەلومەرجەدابن ئەخلاق ناکاراییە. لەنێوان ئەو خەڵکانەی کە هێشتا دەوڵەتیان پێکنەهێناوە تاوەکو ئەرکەکانیان لەبەرامبەر یەکتردایە جێبەجێ بکات وەك بلێی هەموو شتێك رێگەپێدراوە. لەنێوان ئەواندا دادپەروەری و نادادپەروەری بوونی نییە بۆیە دەوڵەت مەرجی پێویستی کامڵبوونی ئەخلاقە.

---

٤٣- ...ست کاسیرر، پێشوو، ل ٦٦.





## دەوڵەت، مەرجی مافی زاتیی ئازادیی دەرەکی

دیاریکردنی شوێنی تیۆری دەوڵەتی کانت لە ناو ئەو دەستەیەی بیری سیاسی کە تائێرە باسمان لێوە کردو دەکرێت بە تیۆری ئامێریی دەوڵەت و تیۆری ئۆرگانیستیی دەوڵەت ناویان لێبنێین کارێکی تاڕادەیەك دژوارە. هەندێك لە بەشەکانی تیۆرەکەی کانت لە تێڕوانینی ئامێریی دەوڵەتەوە نزیکە. کانت لە چەند روویەکەوە دەوڵەت بەدامەزراوەیەك دادەنێت کە بە بەکارهێنانی دەسەلاّتی زۆرەملێ و ناچارکردن هەلومەرجی پێویست فەراهەمدەکات تاوەکو تاکەکان بتوانن بەبێ کێشە بۆیەکتر دروستکردن بەدوای ئامانج و مەبەستەکانی خۆیاندا بچن. وەها تێگەیشتنێك پەیوەندی هەیە لەگەڵ رۆڵی ئامێریی دەوڵەتدا. بەلاّم ئەگەر بە تەواوی سەرنجی خۆمان بخەینە سەر ئەم لایەنەی تیۆرەکەی کانت و بەشەکانی دیکەی لەبەرچاو نەگرین لە تێگەیشتنی فەلسەفەی سیاسی کانت دوور دەکەوینەوە. بەڵگەهێنانەوەی کانت بۆ روونکردنەوەی پێویستبوونی دەوڵەت روویەکی سەرەکیی تریشی هەیە. هەروەك باسکرا کانت هەوڵدەدات پێویستبوونی دەوڵەت ببەستێتەوە بەدیاریبوونی فەرمانی رەهاوە[٤٤]. بەپێی بۆچوونی کانت مرۆڤ رۆڵێکی بۆخۆی دیاریکردووە لە جیهاندا کە تەنها بەدامەزراندنی دەوڵەت بۆ مەبەستی پارێزگاریکردن لە ئازادی شیاوی جێبەجێکردنە.

کانت یاسادانان بۆ دووبەش دابەشدەکات: یاسادانانی ئەخلاقی و یاسادانانی یاسایی. رەنگە ئەخلاق و یاسا بۆچوونی یەکسانیان هەبێت سەبارەت بە دادپەروەری و نادادپەروەری، بەلاّم بزوێنەر و هاندەریان بۆ جێبەجێکردنی رێساکان جیاوازە. لە ئەخلاقدا خود وەزیفە و ئەرکی بزوێنەر و کارکردنە بەرێسای ئەخلاقی، بەلاّم لە یاسادا بزوێنەری دەرەکیش لەبەرچاو گیراوە.

لە هەمان کاتدا تیۆری دەوڵەتی کانت پەیوەستە بە روانگەی مەبەستناسانەی ناوبراوەوە. کانت بڕوای وایە کە هەموو شتێك تەنها بە لەبەرچاوگرتنی مەبەست و ئامانجی ئەوشتە دەکرێت دەرك بکرێت. مەبەستی هەموو شتێك یان دەرەکییە یان ناوەکی. مەبەستی ناوەکی سروشت ئەوەیە کە مرۆڤەکان بتوانن وەکو بوونەوەرگەلێکی خاوەن هەست مەبەستەکانی خۆیان فورمۆلبەندی بکەن و بەدوایاندا بگەڕێن. وەها کارێك لەباری سروشتیدا شتێکی مەحاڵە[٤٥].

---

44- Catagorical imperative.

٤٥- راجر اسکروتن، پێشوو، ل ١٧٦.

لەباری سروشتیدا باش و خراپ و دادپەروەری و نادادپەروەری واتایان نییە. تەنها بە دامەزراندنی دەوڵەتە کە راپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی تاکەکان لە بەرامبەر یەکتر ریکوپێکیەك لەخۆدەگرێت. بەم شێوەیە دەوڵەت مەرجی گەشەکردنی ئەخلاقە. هەروەك باسکرا کانت دەوڵەتی لە مافی زاتیی ئازادیی دەرەکییەوە هەڵێنجا، مافی زاتیی ئازادیی دەرەکی واتە سەربەخۆبوون لە ویستی کەسانی تر و پێویستی بەوەیە کە خەڵکی بکەونە هەلومەرجێکەوە کە ویستەکانیان لەگەڵ یەکدا یەك بگرێت. ئەم مەرجە مەرجی دادپەروەرییە. نادادپەروەری بریتییە لە بارێك کە تیایدا ویستی تاك ناتوانێت بەپێی یاسایەکی گشتیی ئازادی لەگەڵ ویستی کەسەکانی تردا یەکبگرێت. دەکرێ ئەم نادادپەروەرییە تەنها لە رێگەی کردارێکی هاوشێوەوە واتە زەبر و زۆر لەناوببرێت[٤٦]. سوود وەرگرتن لە زۆر و زۆرەملێ لە دژی ئەو کەسەی کە نادادپەروەرانە هەڵسوکەوت دەکات کارێکی دادپەروەرانەیە. دابینکردنی ئەم هەلومەرجە بۆ کامڵبوونی مرۆڤ (وەکو مەبەستی کۆتایی سروشت) واتە کامڵبوونی ئەخلاقی و عەقلانی پێویستە.

بەم جۆرە کانت وێنەیەك بۆ دەوڵەت دەخاتە پێش چاو کە لەلایەکەوە لەبیری لیبرالی نزیکە چونکە وەها دەوڵەتێك بۆ پاراستنی ئازادیی زاتی پێویستە، لەلایەکی ترەوە دەوڵەت بە مەرجی کامڵبوونی مرۆڤ بەرەو کەماڵی ئەخلاقی لەقەڵەمدەدات. وێنای یەکەم بۆ دەوڵەت کە پشت بە رۆڵی وەستاندنی دەوڵەت دەبەستێت دەوڵەت بە هەڵقولاوی خراپەکانی سروشتی مرۆڤ دادەنێت، بەڵام تێڕوانینی دووەم کە جەخت لەسەر رۆڵی دەوڵەت لە کامڵکردنی ئەخلاق دەکاتەوە دەوڵەت بە هەڵقولاوی فەزیلەتی مرۆڤ لەقەڵەمدەدات. دەکرێت بوترێت کانت بە پێشەکی و گریمانەکانی تیۆرەکەی خۆی وێنای دووەم و بەو ئەنجامانەی کە لە بەڵگەهێنانەوەکانی خۆیەوە بەدەستی دێنێت وێنای یەکەمی گەورە کردۆتەوە. کانت وێڕای ئەوەی کە بەڵگەیەکی پێشینیی بۆ دەوڵەت دێنێتەوە و بەم جۆرە بە تەواوی جەخت دەخاتە سەر عەقلانیەت، لە ئەنجامگیریدا (لەبەر ئەو هۆکارانەی کە پاشتر دێینە سەری) بەرەو تێڕوانینی سوودگەرایی (هاو وێنەی تێگەیشتنەکانی سوودگەرایی) دەچێت و دەوڵەت بۆ عەقلانیەتی ئامێری بچووك دەکاتەوە.



٤٦- چاوەی پێشوو، ل١٨٢.



ناچاربوون بە ئازادی کە لە تیۆرەکەی رۆسۆدا ئاماژەی پێکرا لە تیۆرەکەی کانتیشدا بوونی هەیە. کانت دەڵێت ئەو کەسەی کە لە هەلومەرجی باری سروشتیدا دەژی هەڕەشە لە ئازادی دەرەکی کەسانی تر دەکات، بۆیە ئەو کەسانەی لە دەوڵەتدان دەتوانن ناچاری بکەن کە پەیوەندی بە کۆمەڵگای مەدەنییەوە بکات، بەم جۆرە ناچاری بکەن بە ئازاد بوون. بەگشتی دەبێت بوترێت بڕوای کانت وایە کە پابەندکردنی ئەخلاقی بەس نییە بۆ دەستەبەرکردنی مافە کەسییەکانی خەڵکی و تەنها بە دامەزراندنی دەوڵەت مافە کەسی و تایبەتییەکانی خەڵکی دەستەبەر دەبێت. تەنها رێگەی وەدیهێنانی مافی زاتیی ئازادی دەرەکی ئەوەیە کە خەڵکی ویستەکانی خۆیان لەسەر ئەو بڕیارە یەك بخەن کە ئەو مافانەی کە لەلایەن ویستی گشتییەوە ناسراون پێشێلی نەکەن. لە راستیدا دەوڵەت وێنەی ئەم زامنکردنە بەرامبەرەیەیە.

کانت گرێبەستی کۆمەڵایەتی بە جیاواز لە هەموو گرێبەستەکانی تر دەزانێت و جیاوازییەکەشیی ئەوەیە کە هاوڕابوون لەگەڵیدا بەناچاری و زۆرەملێیە و دەکرێت بۆ دابینکردنی ئەم مەبەستە سوود لە زەبر و زۆر وەربگیردرێت. لە هەموو گرێبەستێکدا یەکگرتنی چەند تاکێکی جیاواز بەرچاودەکەوێت، بەڵام لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا یەکگرتن و پێکەوە پەیوەستبوونی تاکەکان بۆ خۆی مەبەستە و دەبێت هەموو بەشداری تیادا بکەن. ئەم گرێبەستە ئەرکێکی رەها و سەرەتاییە لە هەموو پەیوەندییەکی دەرەکیی نێوان مرۆڤەکاندا. وەها یەکگرتنێك تەنها لەو کۆمەڵانەدا بەرچاودەکەوێت کە دەوڵەتێکی مەدەنییان دامەزراندووە[٤٦].

## خودرێسایی ویست و دنیای بینراو

کانت بە دانانی ویست لەسەربنەمای عەقڵی پەتی ویستی لە ناوەڕۆکە بینراو و دەرەکییەکەی داماڵی. هەر بۆیە تیۆری خودرێسایی ویستی کانت بە تیۆری خودرێسایی رادیکال ناوبراوە. بنەمای روانگەکەی کانت بریتییە لەوەی کە ((ویژدانێکی ئەخلاقی)) لە ئارادا هەیە کە بەردەوام خوازیاری پەیڕەوی کردنە لە ئەرکی پەتی. ئەم ئەرکە پەتی و ئەبستراکتە لەگەڵ جیهانی پاشکۆدا رووبەرووی یەك رادەوەستن. دنیای بینراو پەیڕەوی لە بنەڕەت و یاساگەلێك دەکات کە هاوجۆر نییە لەگەڵ ویژدانی ئەخلاقیدا.

46- Immanuel Kant "On the common Saying". In kant's Political Writinged. Hans Reiss Trans. H. B. Nisbet, Combridge, Cambridge University Perss 1970, P. 73.

بەلاّم پرسەکە لەوەدایە کە ئەگەر نەتوانین سەرچاوەی ناوەوەی ئەخلاقیەت بکەینە بینراو ئەوا ناتوانین وەلاّمی ئەو پرسیارە بدەینەوە کە خودرێسایی ویست چۆن دێتەدی. ئەنجامەکەی ئەوەیە کە دەگەین بە دووربونی پرسی پابەندکردنی ئەخلاقی لە تێگەیشتنەوە، بەواتایەکی تر دەتوانین بڵێین کە کانت لەم رووەشەوە جارێکی تر سنوورداربوونی عەقڵی مرۆڤی نیشانداوە هەروەك چۆن لە عەقڵی تیۆریی پەتیشدا ئەم کارەی کردووە.

هەروەك ئاماژەی پێکرا فەیلەسووفەکانی پێش کانت بەدوای جۆرێك رێسای فەلسەفیدا دەگەڕان بۆ تێڕوانینی ئەخلاقی. کانت ئەخلاقی لەسەربنەمای عەقڵ و ویست دامەزراند و وەها بەڵگەدێنێتەوە کە ئەوە راستییەکی نکۆڵی هەڵنەگری ئەزموونییە کە زۆربەی ئێمە بیر و باوەڕگەلێکی ئەخلاقیمان هەیە. ئێستا ئەگەر بڕیار وابێت ئەم بیروباوەڕە ئەخلاقییانە بەهایەکیان هەبێت ئەوا دەبێت تاڕادەیەك ئازادبین لە بڕیارەکانی خۆماندا.

ئەگەر جیا لەمە بێت هەموو بەها دانانێك بێواتا دەردەچێت. کەواتە ئەگەر بڕیار وایە کە چەمکە ئەخلاقییەکان واتایەکیان هەبێت و دەلالەت لە شتێك بکەن ئەوا دەبێت بەلای کەمەوە بەشێك لە بوونی ئێمە سەربەخۆ بێت لە جیهانی ماددە، چونکە ماددە شوێنکەوتووی یاسا زانستییەکانە. کەوابوو ئێمە خاوەن خودێکین بەلای کەمەوە لەرووی چەند بەشێکەوە ئازادە، بەلاّم شوێنی دەسەلاّت و ویست لەناوبوونی ئێمەدا دەکەوێتە کوێوە؟ کانت بەم جۆرە وەلاّمی ئەم پرسیارە دەداتەوە کە ئەخلاق لە عەقڵەوە سەرچاوە دەگرێت. بەم جۆرە کانت بەدیاریکردنی شوێنی ویست و ئەخلاق لە ناو عەقڵ و جیهانی نەناسراوەکان تیۆرەکەی خۆی رووبەرووی کێشەیەکی گەورە دەکاتەوە. ئەو کێشەیەش ئەوەیە کە چۆن ویستی ئەخلاقی دەست لە دنیای ئەو راستییانەوە دەدات کە ئەزموونی ئێمە پەیوەستە بە ئەوەوە؟

بەم شێوەیە کانت (ویست)ی لە جیهانی بینراو جیاکردەوە، گەرچی بەم کارە شوێنێکی بۆ ویست دۆزییەوە بەلاّم لە بەرامبەردا ئەو ئەگەرەی رەتکردەوە کە بیری ئەخلاقی دەتوانێت گۆڕان لەو شتەدا دروستبکات کە بەراستی روودەدات. کانت ئەخلاقی لە چەمکی دامالڕاوی عەقلانیەتەوە هەلێنجا. دەلێت خواستە سەرەکییەکانی ئەخلاق لەناو خودی چەمکی عەقلانیەتدا حەشارماوە و دەبێت هەموو بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ بەشێوەیەکی پێشینی و سەربەخۆ لە ئەزموون ئیلزامی بوونی ئەم خواستانە یاخود ئەم مەرجانە بەراست و دروست بزانێت. بە شێوەیەکی رێسایی دەبێت هەموو بکەرێکی ئەخلاقی بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ بێت وەکو بتوانێت بیر لە هاوڕابوون و ناهاوڕابوونی لەگەڵ کارێك بکاتەوە و بڕیاری لە بارەوە





بدات[٤٧]. کانت دەیویست لە سیستەمی هزریی خۆیدا بە تەواوی پشت بەستن بە سروشت و جیهانی دەرەوە وەلاوە بنێت و تەنها لە ویستەوە ناوەرۆکی پەیمانەکان و ئەرکەکان وەربگرێت و ئەم کارە بە دانانی پێوەرێکی تەواو فۆرمالی بۆ کار ئەنجامدا و بەڵگەی هێنایەوە کە عەقلانیەت لە خۆگری بیرە بەشێوەیەکی گشتی و بەدواداچوو. بەم پێیە دەبێت بنەڕەتی دانراوی هەموو کارێك وەها بێت کە بتوانین بەبێ دژیەك بوون بیکەینە شتێکی گشتی. ئەگەر نەتوانین وابکەین لەم حاڵەتەدا ناتوانین وەکو ویستی عەقلانی بەشێوەیەکی ئاگایانە ئەم کارە ئەنجامبدەین. تەنها ئەو ویستەی کە وەها تایبەتمەندییەکی هەیە ئازادە لە هەموو پەیوەست بوونێك لە سروشتدا و لە ئەنجامدا بەراستی ئازادە. بەم شێوەیە بکەری ئەخلاقی بەپێی واتای رادیکاڵی خودرێسایە و تەنها ملکەچی لە فەرمانی ویستی خۆی دەکات. لێرەدا عەقڵ وەکو ویستی عەقلانی پێوەری کاروبارەکانە[٤٨]. فەرمانی رەهای کانت لێرەوە بەدەستدێت.

فەرمانی رەهای کانت کە بنەڕەتی فۆرمالیی ئەخلاقی لە قالبی خۆیدا هەڵگرتووە بەو شێوەیەی خوارەوە پۆلیندەکرێت: ((تەنها بەپێی ئەو رێسایە رەفتار بکە کە لە هەمان کاتدا بخوازیت ئەو رێسایە ببێتە یاساییەکی گشتی))[٤٩]. لەلایەکی ترەوە لەبەرئەوەی هەموو شوێنەوار و هۆکردەکان بەهۆی یاساکانی سروشتەوە دێنەبوون بۆیە دەکرێت بەم شێوەیەی خوارەوەش فەرمانی رەها بخرێتەروو: ((وەها رەفتار بکە کە وەك بڵێی بڕیار وایە کە رێسای رەفتارەکەی تۆ لەسەر خواستی تۆ ببێتە یەکێك لە یاسا گشتییەکانی سروشت))[٥٠]. کانت بڕوای وایە بە هەمان ئەو شێوەیەی کە بنەڕەتی فۆرمالیی بەڵگەهێنانەوەی قیاسیی هەموو قیاسەکان لە رووی دروستییەوە دابەشدەکات بۆ دوو کۆمەڵی ئەنجامدار و بێ ئەنجام بنەڕەتی فۆرمالیی ئەخلاقیش هەموو کارەکان دابەشدەکات بۆ دوو کۆمەڵی ئەخلاقی و نائەخلاقی. مرۆڤ بوونەوەرێکی پاك و بێ گوناهنییە و رەنگە لە کاتی لە دژیەك راوەستانی ئەرك و حەز و ئارەزووە نەفسییەکان حەز بە کارگەلێکی خراپ و نادروست بکات. بۆ ئەوەی بزانێت کە

---

٤٧- ژان هیپولیت، پدیدارشناسی روح برحسب نظر هگل، ترجمه کریم مجتهدی، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧١، ص ١٩٤.

48- Charles Taylor, Hegel, London- New York. Cambridge University Press, 1975, p. 386.

٤٩- ایمانوئل کانت، بنیاد ما بعد الطبیعة اخلاق، پێشوو، ل٦٠.

٥٠- سەرچاوەی پێشوو، ل ٦٥.

کارەکەی ئەخلاقییە یان نا، دەبێت بەپێی بنەڕەتێکی فۆرمالی کە ئەخلاقی بوونی کارەکەی ئەو دیاریدەکات، کاربکات. واتە دەبێت بزانێ دەتوانێت خوازیاری ئەوە بێت کە ئەو بنەڕەتەی بەپێی ئەو کار دەکات بگۆڕێت بۆ یاسای گشتیی سروشت یان نا. هەڵسەنگاندنی بەپێی ئەم پێوەرە دیاریدەکات کە ئایا بنەڕەتێك یاخود ڕێسایەك دژیەك بوونی تیادایە یان نا. ئەگەر دژیەك بوونی تیادابێت لەگەڵ فەرمانی ڕەهادا یەك ناگرێتەوە.

بەڵام کانت بەردەوام پابەند نییە بەم شێوازی تاقیکردنەوەیە. زۆربەی کاتەکان لەبری ئەوەی بزانێت ئایا ئەو ڕێسا یان بنەڕەتەی کە دەبێت ببێتە گشتی لەناو خۆیدا دژ یەکبونێکی تیادایە یان نا ئەو بنەڕەتەی لە کرداردا لەگەڵ هاوکێشە دروستەکانی تری سەبارەت بە جیهان هەڵدەسەنگاند تاوەکو ئەگەرە لۆژیکییەکەی دیاریبکات. بەم جۆرە دەبێت هاوکێشەگەلێك سەبارەت بە جیهان لەبەرچاوبگیرێت و هەندێك لەم هاوکێشانە لە جۆری هاوکێشە ئەزموونییەکانن کە دروست و نادروست بوونیان جێی گومانە. یەکێك لەو بنەڕەتانەی کە کانت بەنائەخلاقی لەقەڵەمیداوە: ((نابێت لە کاتی سەختییەکاندا هاوکاری هیچ کەسێك بکەیت، هەروەها نابێت هاوکاری لە هیچ کەس وەربگرێت)) بنەڕەتێکی فۆرمالیی پەتی نییە بەڵکو پەیوەستە بە پێشگریمانەیەکەوە دەربارەی پێکهاتەی دەروونیی مرۆڤ.

بەڵام ئەگەر بێت و بنەڕەتە ئەخلاقییەکانی کانت بە تەواوی بە فۆرمالی دابنێین و لە هەموو ناوەڕۆکێکی ئەزموونی دایبماڵین ئەو کات خودی ئەو ئەخلاقەش بە تەواوی پووچدەبێتەوە. هیگڵ لە ڕەخنەی تیۆری ئەخلاقی کانتدا دەڵێت فەرمانی ڕەها تەنها یاسایەکی داماڵراو و فۆرمالیمان[٥١] دەداتێ. ئەم فەرمانی ڕەهاییە یان یاسا ئەخلاقییە ویستی ئێمە بە بەندکراو دەزانێت بەڵام لە بەرامبەر ڕاستییە دەرەکییەکاندا بێ توانایە. کاتێك کە ((خود))ی ئەخلاقی لە هەموو پێوە بەند بوونە ڕاستبەخشەکان رووت بووەوە، زیاتر لەوەی کە ئازاد و سەربەخۆ بێت لە هێز و توانا بەتاڵ دەبێتەوە. ئەم ((خود))ە سەربەخۆییە لە بنەڕەتدا لە توانا دادەماڵرێت و لاوازترە لەوەی کە بتوانێت بکەوێتە وەدیهێنانی ڕاستی لە واتا ئاساییەکەیدا[٥٢]. ناکرێت لەسەربنەمای بنەڕەتی ئەخلاقیی کانت سەبارەت بە زۆرێك لە پرسە کۆمەڵایەتییەکان بڕیار بدرێت.

---

51- Formal.

٥٢- [illegible] ساندا ((عدالت و خیر)) درمایکل ساندل، ویراستار، لیبرالیسم و منتقدان، پێشوو، ل ٢٨٥.



هیگڵ دەڵێت ویژدان لە تیۆرەکەی کانتدا ئەرك یان وەزیفە دەکاتە بنەما بەڵام لە هەمان ئەو ساتەدا ڕاستیی دەرەکیی لە بەرامبەر خۆیدا دەبینێتەوە کە سەربەخۆیە لە ویستی ئەو. سروشت هیچ نیگەرانی ئەوە نییە کە ڕەزامەندی بنوێنێت بەرامبەر بە یەکێتی ئەرك و ڕاستی [واقعییەت]. ئەم گرفتەی نێو تیۆرەکەی کانت یەکێکە لەسەرچاوەکانی تیۆری ئەخلاقی هیگڵ. هیگڵ دەڵێت ئێمە ناتوانین ڕێکی ئەخلاقی و جەوهەری ئەخلاقیەت تەنها لەناو بنەڕەتی فۆرمالی و یاسای فۆرمالیدا بدۆزینەوە. جەوهەری ئەخلاقی لە ڕاستیی پێکەوەیی و لە کردەییبوون و لە ژیانی دەوڵەتدا بە دیاردەکەوێت. دەوڵەت هۆشی ڕەهایە و هیچ ڕێساییەکی داماڵراو و ئەبستراکت بۆ باش و خراپ و بەرز و نزم لەبەرچاو ناگرێت. ئەخلاقی بوون سەبارەت بە ویستی تاك ڕاست دەردەچێت نەك دەربارەی ویستی گشتی. هیگڵ بە ناچاری جارێکی تر و بەزیاد کراو گەلێکی نوێ دەگەڕێتەوە بۆ تیۆری ویستی گشتیی ڕۆسۆ[٥٣].

ئەوەی کە کانت ناتوانێت لە تیۆرەکەی خۆیدا بیخاتە پێش چاو ئەو ڕاستییەیە کە ڕێسا ئەخلاقییەکان تەنها بنەرەتگەلێکی هۆشەکی نین بەڵکو بنەڕەتگەلێکی مێژوویین و پەیوەستن بە هەلومەرجی هەمیشە لە گۆڕانی کۆمەڵایەتییەوە نەك ئەزموونی کەسیی تاك. بە واتایەکی تر بنەڕەتە ئەخلاقییەکان بە ناچاری پەیوەستن بە کات و شوێن و ئەزموونە دەروونییەکانی تاك، هەروەها هەموو چوارچێوەی کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەوە. بەم پێیە ڕێساییەکی ئەخلاقی ناتوانێت بۆ هەمیشە ڕەنگدانەوەی یاسای ئەخلاقی بێت. ((دەبێت))ی بێ مەرجی فەرمانی ڕەها تەنها بە شێوەی مەرجدار و لە ڕێگەی ئەو ڕێسایانەی کە خۆیان ڕووبەڕووی گۆڕان و کامڵبوونن دروستدەبێت. بۆیە دەبێت فەرمانی ڕەها پەیوەستبکرێت بە قەزاوەتی کۆمەڵگاوە. بەپێی وتەی یەکێك لە ڕەخنەگران یاسای ئەخلاقی بۆ مرۆڤ دروستکراوە نەك بە پێچەوانەوە مرۆڤ بۆ یاسای ئەخلاقی دروستکرابێت. پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و عەقڵ و بیری هاوبەش[٥٤] و گۆڕینەوەی بیروڕاش بەشدارن لە کامڵبوونی ڕێسا ئەخلاقییەکاندا[٥٥].

---

53- Ernst Cassirer, The Myth of the State, New Haven, Yale University Press. 1946, p. 264.

54- Commom reflection.

٥٥- ژان هیپولیت، پێشوو، ل ١٩٧.





## ناكۆكیی نێو تیۆری ماف و دادپەوەریی كانت

كانت لە ((بونیادی میتافیزیكی ئەخلاقی))دا ڕێزداری مرۆڤ وەكو مەبەستێك لەنێوخۆی پێناسە دەكات[٥٦]. ڕێزداری بەرزترە لە هەموو بەهایەك. هەموو شتێك بەهایەكی هەیە و دەكرێت لەگەڵ شتگەلێكی تردا هەڵبسەنگێندرێت، بەڵام ناكرێت بەهایەك بۆ ڕێزداری مرۆڤ دیاری بكرێت و هیچ شتێك نییە كە بكرێت لەگەڵیدا بگۆڕدرێتەوە. ڕێزگرتن لە ڕێزداری مرۆڤ هاوئاستی ڕێزگرتنە لە خودی یاسای ئەخلاقی و وەكو خودی فەرمانی ڕەها وایە. دەكرێت بەم شێوەیە بنەڕەتی سەبارەت بە ڕێزداری مرۆڤ ئاستبەندی بكرێت: ((وەها ڕەفتار بكە كە بەردەوام لە كەسی خۆت یان لە خەڵكانی تردا مرۆڤبوون وەكو مەبەست لەبەرچاو بگریت نەك هەرگیز وەكو ئامرازێك[٥٧])). چونكە ڕێزداری مرۆڤ بە نۆرەی خۆی پەیوەستە بە مرۆڤەوە وەكو بكەرێكی ئەخلاقیی خودرێسا، و پەیوەست نییە بەتایبەتمەندییە تایبەتەكان ئەم و ئەوەوە. ئەم تێڕوانینە نوێیە لە بەرامبەر ڕوانگەی پێش نوێ ڕادەوەستێت كە تیایدا بە زۆری چەمكی ڕێزداری مرۆڤ لەگەڵ چەمكی نەژاد و ڕەچەڵەك و چاكی و پاكی تێكەڵ دەكرا و دەدرایە پاڵ پلە و پاییەوە. ئەمە یەكێك بوو لە بانگەشەكانی بیری نوێ كە مرۆڤەكان لەگەڵ یەكدا بە یەكسان تەماشا بكرێن.

چەمكی ڕێزگرتن لە ڕێزداری مرۆڤ ڕۆڵێكی سەرەكیی هەیە لە تێڕوانینی كانت دەربارەی ماف و دادپەروەری. وای دابنێ لە ئەنجامی كاری هێزێكی دەرەوەی كۆنترۆڵی یاسا مافی بەهرەمەندبوونی كەسێك لە ئازادی پێشێلدەكرێت. لەوەها هەلومەرجێكدا خەڵكی ئەركدارن سیستەمێك جێگیر بكەن كە مافی یەكسانی بەهرەمەندبوون لە ئازادی دەستەبەر بكات. كانت دەڵێت لە هەموو ئەو شوێنانەی كە مرۆڤەكان بەیەكەوە دەژین وەها سیستەمێكی ماف پێویستە، چونكە لەو شوێنەی كە مرۆڤەكان بەیەكەوە ژیان بەسەردەبەن كارەكانیان بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ كاردەكەنە سەریەكدی. بەسەرنجدانی ئەو حاڵەی كە بەهۆی هەلومەرجی ژیانی مرۆڤەكان بەردەوام مەترسی پەیوەندییە جیاكارییەكان و پەیوەستبوونی كەسێك بە یەكێكی ترەوە لە ئارادایە دەبێت ئەو خەڵكانەی كە لە خاكێكدا ژیان بەسەردەبەن میكانیزمێكی یاسایی كارا دروستبكەن. بەم پێیە دەكرێت بڵێین فەلسەفەی مافی كانت پایەیەكی دوو لایەنەی هەیە: یەكەم ڕێسایی و دووەم ڕاستینە[٥٨]. لە پایەی ڕێساییدا

٥٦- ایمانوئل كانت، بنیاد ما بعد الطبیعة اخلاق، پێشوو، بەشی یەكەم.

٥٧- سەرچاوەی پێشوو، ل ٧٤.

58- Factual.





دەڵێت مرۆڤەكان لە ڕێزداریدا یەكسانن و لە پایەی ڕاستینەیشدا دەڵێت هەلومەرجی ئەزموونیی مرۆڤ ئەگەری پێشێلكردنی یەكسانی دێنێتە ئاراوە، بۆیە جێگیركردنی سیستەمی یاسایی گونجاو دەكاتە كارێكی پێویست.

كانت خودرێسایی دەخاتە دەرەوەی چوارچێوەی چاودێری یاساییەوە. دەبێت یاسا لە ((سنووری دەرەكیی كردار))دا سنووردار بێت. نابێت زاڵبوونی یاسایی بۆ یاسادانەریی ناوەوەی ویست فراوان بكرێتەوە. بەم جۆرە كانت پەیوەندی نێوان یاسادانانی ئەخلاقی (یاسای ناوەوە) و یاسادانانی دەرەكی (قەزایی) لێكدەپچڕێت و لەلایەكەوە وەها پەیوەندییەك بەهاو ئاستی نكۆڵی لێكردنی ڕێزگرتن لە ڕێزداری مرۆڤ لەقەڵەمدەدات و لەلایەكی ترەوە بە هۆكاری تێكچوونی نێو سیستەمی سیاسیی دادەنێت. بە ئاشكرا هۆشداری دەدات كە: ((وای بۆ یاسادانەرێك كە بیەوێت بە سوود وەرگرتن لە زەبر و زۆر كۆمەڵگایەكی سیاسی جێگیر بكات كە بەرەو مەبەستی ئەخلاقی ئاراستەی وەرگرتووە، چونكە بەرهەمی كارەكەی نەك تەنها تێكدانی كۆمەڵگایەكی سیاسیی ئەخلاقییە بەڵكو دەبێتەهۆی زیانپێگەیاندن و لەكەداركردنی دەوڵەت و ئاسایشیش))[٥٩].

بەم شێوەیە كانت ئەو ئەگەرە ڕەت دەكاتەوە كە بۆ برەوپێدانی ئەخلاقی تاكەكەسی دەكرێت سوود لە زاڵبوونی یاسایی وەربگیرێت. بەم كارە پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەو نەریتەی كە لە سەردەمی ئەفلاتونەوە لە بیری ڕۆژئاوادا باوبووە و بەپێی ئەو كاری دەوڵەت بە برەوپێدانی فەزیلەت لەنێوان مرۆڤەكان لەقەڵەمدەدرا، دەپچڕێنێت. جیا لە ڕەشبینی كانت بەرامبەر بە بەرهەمی وەها كارێك كە لەو گێڕانەوەیەی سەرەوەدا ڕەنگی داوەتەوە، تێڕوانینی كانت دەربارەی خودرێسایی ئەخلاقی خاڵی سەرەكیی ئەم لێك جیابوونەوەیەیە. بەڵام لە لایەكەوە ئەم ڕوانگەیەی كانت بەهۆی سنووورداركردنی سنووری دەسەڵاتی قەزایی چەمكی مافە دانراوەكان و مافە چەسپاوەكان لەكەدار دەكات، چونكە لەم حاڵەتەدا سیستەمی یاسایی تەنها بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ خودرێسایی ئەخلاقیی بە فەرمی ناسیوە، بەم جۆرە بەشێوەیەكی هێمایی یەكسانی ڕێزداری مرۆڤ دانی پیادانراوە لە كاتێكدا كە خودرێسایی ئەخلاقی و دەستەبەركردنی یاسایی یەكسانی یەك گشتبوون لە بواری ڕەنگدانەوەی ویستی گشتیدا دروستدەكات. بەم پێیە بابەتی یەكسانی ڕێزداری مرۆڤیش لە تیۆرەكەی كانتدا لایەنی فۆرمالی وەردەگرێت (وەكو تەواوی بەشەكانی تری تیۆرەكەی).

59- Immanuel Kant, Religion Wtithin the Limits of Reason Alone. Theodor Gleen and Hoyt Hudson, New York. Harper and Row, 1960, p. 53.

هەروەها کانت خۆی بەدوور دەگرێت لە هەندێك پابەندییەکانی تیۆری مەشروعیەتی حکومەت و مافی بەرگریی خۆی. بەپێی پابەندییەکانی تیۆرەکەی کانت دەبێت یاسادانان کاتێك مەشروعیەتی هەبێت کە خەڵکی بتوانن هاوڕابن بەرامبەری. هەڵبەتە ئەم هاوڕابوون و ڕەزامەندییە پەیوەستە بەگشتیبوونی یاساوە نەك بەش بەشی بڕگە یاساییەکان. بە لەبەرچاوگرتنی ئەم بنەما و گریمانانە دەبێت کانت بڵێت بەرگریکردن لە بەرامبەر یاسادانانی نامەشروعدا کارێکی ڕێگەپێدراوە. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە کانت بەردەوام و بە جەخت لەسەرکردنەوە هەموو جۆرە بەرگریکردنێك لە بەرامبەر ئەو حکومەتانەی کە یاساگەلێکی ستەمکارانە دەخەنە جێبەجێکردنەوە بە ناپەسەند و ڕێگەپێنەدراو لەقەڵەمدەدات. ئەم بۆچوونە لەگەڵ خواستەکانی تیۆری ئەخلاقی کانتدا ناگونجێت. کانت لەلایەکەوە بەپێی ئەو ڕۆڵەی کە دەوڵەت هەیەتی لە کامڵبوونی ئەخلاقدا پاساو بۆ دەوڵەت دەهێنێتەوە، ئەو کات بەرپاکردنی شۆڕش لە دژی ئەو حکومەتەی کە ئەخلاق و خودرێسایی ئەخلاقیی تاك لەکەدار دەکات بە نامەشروع لەقەڵەمدەدات. کانت لەلایەکەوە ئاماژە بە مافە جیانەکراوەکانی خەڵکی دەکات و لەلایەکی ترەوە دەڵێت کە نابێت خەڵکی بەهێزی زاڵبوون ڕووبەڕووی سەرپێچییەکان ببنەوە.

لە بەرامبەردا کانت بەڕوونی دەڵێت ئەوە ئەرکی خەڵکییە کە تەنانەت خۆڕاگر بن لە بەرامبەر قبووڵنەکراوترین بەدکارییەکانی فەرمانڕەوا[٦٠]. بە بۆچوونی کانت بەرگریکردن لە بەرامبەر یاسادانانی دەوڵەتدا بنەڕەتی کۆمەڵگا بەرەو لەناوچوون دەبات. تەنانەت دەبێت پەیڕەوی لە حکومەتی ستەمکارانەش بکرێت، چونکە بەرگریکردن لە بەرامبەر هەر دەوڵەتێك ئاسایشی هەموو دەوڵەتەکان تێك دەشێوێنێت. لەبەرئەوەی ئەم بەرگریکردنە لەلایەن یاساییەکەوە ڕێگەی پێدراوە کە ئەگەر گشتیی وەربگرێت تەواوی دامەزراوەی مەدەنی لەناو دەبات و کۆتایی بەو تەنها حاڵەتە دەهێنێت کە تیایدا خەڵکی دەتوانن مافیان هەبێت. بەبێ بوونی دەوڵەت مافی زاتیی خەڵکی سەبارەت بە ئازادی و پێشکەوتن بەرەو کامڵبوونی سروشتی لەرزۆك دەبێت[٦١].

٦٠- راجر اسکروتن، پێشوو، ل ١٨٩.

٦١- راجر اسکروتن، سەرچاوەی پێشوو.





## بە کورتی

کانت داهێنانە گەورەکەی ڕۆسۆ لە تیۆری ((ویستی گشتی))ی بەرەو مەیدانێکی نوێ برد و لێیەوە گەیشتە عەقڵی کردەیی پەتی. ویستی گشتی ڕۆسۆ ویستی ڕووە و باشەی تەواوی کۆمەڵگای سیاسییە. ویستی گشتی هەردوو ڕووی ئەخلاقی و عەقڵانی لەخۆیدا هەڵگرتووە. لەڕاستیدا تاك بە پەیڕەویکردن لە ویستی گشتی پەیڕەویی لە ویستی خۆی کردووە. هەموو کەسێك بە گوێڕایەڵی کردن لەو یاسایەی کە ویستی گشتی دایدەنێت گوێڕایەڵی لە عەقڵ و خواستەکانی ئازادی کردووە. بەڵام ڕۆسۆ دەیزانی کە ڕەنگە مرۆڤ بە ڕێگەی هەڵەدا بچێت و یاساگەلێکی خراپ دروستبکات کە لەم حاڵەتەدا لەبری خودرێسایی (ئۆتۆنۆمی) بەرەو ناخود ڕێسایی هەنگاوی ناوە، بۆیە لەبری ئازادی بەرەو شوێنکەوتن چووە. بەم شێوەیەیە کە ڕۆسۆ لە تیۆرەکەی خۆیدا چەمکگەلێکی وەکو ((ناچارکردن بە ئازادی)) و ((ویستی ڕاستەقینە)) و ((ویستی حەقیقی)) خستۆتەڕوو و باسی یاسادانەری هێناوەتە پێشەوە. عەقڵی کردەیی و فەرمانی ڕەهای کانت بەرهەمی ئەم وەرچەرخانەی نێو ویستی گشتی بوون.

فەرمانی ڕەهای کانت بەخستنەڕووی یاسای گشتی بۆ ویست بەدەستدێت: ((وەها ویستت هەبێت کە بخوازی ڕێسای ویستی تۆ بگۆڕێت بۆ یاسای گشتی)) فەرمانی ڕەهای کانت بە پێچەوانەی ویستی گشتی ڕۆسۆ بە تەواوی ناوەکی و بێ مەرجە. کانت بە خستنەڕووی ئەم تیۆرە بە تەواوی دەوڵەتی بەرەو سنووری عەقڵی پەتی برد. عەقڵی پەتی خوازیاری ئەوەیە کە خەڵکی وەکو بوونەوەرگەلێکی خاوەن عەقڵ ببنە پەیڕەوی سیستەمی یاساکان. مرۆڤەکان وەکو بکەرانی خاوەن عەقڵ بە یەکترگرتن و بەهۆی یاسا هاوبەشەکانەوە سنوورێك لە مەبەستەکان دروستدەکەن کە کۆمەڵگای مەدەنی یەکێکە لە ڕەهەندەکانی واتە لایەنی یاسایی ئەو. یاسا هاوبەشەکان بەرهەمی خۆ یاسادانانی هەموو ئەندامێکن. ڕەنگە لە ویستی گشتی ڕۆسۆدا هەموو تاکێك خوازیاری یاسای تەواو و گشتی نەبێت چ بگات بەوەی کە ویستی هەندێك لەگەڵ ویستی گشتیدا یەکنەگرێتەوە. لەم حاڵەتەدا ڕەنگە ئەو لە پەیڕەویکردنی یاسای ویستی گشتی لەبری خود ڕێسایی بە ناخود ڕێسایی ناچار بووبێت. ڕۆسۆ ئەم ناچارکردنە بە ناکۆك نابینێتەوە لەگەڵ ئازادیدا و بڕوای وایە کە لێرەدا تاك ((ناچار بە ئازادبوون)) کراوە. بەڵام لە ویستی ئەخلاقی و عەقڵانی کانتدا هەموو تاکێك خوازیاری یاسای گشتییە بۆیە بەردەوام لە چوارچێوەی خودرێسایی خۆ یاسادانان بەرەو پێشەوە دەچێت.

بەم شێوەیە کانت توانیتی لە نەریتی گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا خۆی لە تیۆری ئامێری بوونی دەوڵەت رزگار بکات. ئامێری بوونی دەوڵەت و ئەرکی سیاسی لە پێویستییەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتین، چونکە دەوڵەت بەپێی گرێبەست بۆ مەبەستێکی تایبەت دروستکراوە.

بەڵام لە تیۆرەکەی کانتدا بیرۆکەی دەوڵەت و بیرۆکەی گرێبەستی کۆمەڵایەتی بیرۆکەیەکی پێشینەیین و دەوڵەتی دەرەوە رەنگدانەوەی ئەو دەوڵەتەی ناوەوەیە. بۆیە دەوڵەت لە هەنگاوی یەکەمدا حاڵەتی رێسایی هەیە نەك ئامێری. خەڵکی لەسەربنەمای یەکسانی لە ئازادی رێسا یاساییەکان دروستدەکەن. مافی گشتی ئازادی لە رێگەی یاسادانان لە کۆمەڵگای دیاریکراودا فۆرمی پێکەوەیی لەخۆ دەگرێت.

کانت بەشێوەیەکی جیاواز لە رۆسۆ بەڵام بە ئیلهام وەرگرتن لە تیۆرەکەی ئەو ویستی گشتیی بە بنەما و سەرچاوەی یاسادانانی سیاسی راگەیاند. بەڵام بەپێچەوانەی رۆسۆوە بڕوای وابوو کە دەکرێت ویستی گشتی بە نوێنەرایەتی بسپردرێت. نوێنەرایەتی ویستی گشتی دەتوانێت لەسەربنەمای ویستی یەکگرتووی هەموو خەڵکی کاری یاسادانان بۆ کۆمەڵگای سیاسی ئەنجامبدات.

بۆچوونەکەی کانت بە چارەسەرکردنی کەم و کورتییەکانی تیۆری ویستی گشتی بۆ خۆی رووبەڕووی گرفتێکی نوێ بووەوە. ئەم گرفتە نوێیە بریتی بوو لە پووچبوون و فۆرمالی بوونی رێسا ئەخلاقییەکانی سەرچاوە گرتوو لە عەقڵی کردەیی. بۆ چارەسەرکردنی ئەم کەم و کورتییە هیگڵ بە نۆبەی خۆی پێی نایە نێو مەیدانەکەوە و عەقڵی فۆرمالیی کانتی بەرەو مەیدانێکی نوێ برد.





## پاژی نۆیەم:

## عەقڵانیەتی ویستی عەقڵانی

**مرۆڤ کاتێك بە دروستی پەرۆشی خۆیەتی کە بە هەمان ئاست پەرۆشی خەڵکیش بێت.**

### عەقڵی خودرێسای سیستەمی بوونەوەرەکان

بیری سیاسی ئەو جێ گوزەرە سەختەی کە بۆ رەتکردنەوەی وێنا کۆنەکان لە دەوڵەت بڕیبووی بە فەلسەفەی کانت تێپەڕاند و روانگەیەکی نوێی لە بەرامبەر خۆیدا بینییەوە. کانت دەیویست هەموو جۆرە پشت بەستنێکی عەقڵانیەت بە سروشت (بە شێوەیەکی گشتی) و میتافیزیك لێکبچڕێنێت و هەموو شتێك بۆ ویستی مرۆڤ و عەقڵی پەتیی تاکی مرۆڤ بگەڕێنێتەوە. ئێستا وادەی هیگڵ بوو تاوەکو عەقڵی پەتی تاکەکەسی بگۆڕێت بۆ هۆشی بە کۆمەڵ و عەقڵی جۆری و فەلسەفەی سیاسی بەرەو پایەیەکی نوێی گەشەکردن پاڵ پێوە بنێت.

هەروەك ئاماژەی پێکرا لە فەلسەفەی سیاسی رۆژئاوادا سێ تێگەیشتنی جیاواز بۆ عەقڵ و عەقڵانیەت لە ئارادا هەبوو. تێگەیشتنی یەکەم لە فەلسەفەی ئەفلاتۆنەوە سەرچاوەی گرتبوو و چەندین سەدە کاریگەری هەبوو بەسەر بیری بیرمەندانەوە. ئەفلاتۆن عەقڵی مرۆڤی بە توانایی تێگەیشتنی پێکهاتەی عەقڵانی جیهان بۆ گونجاندنی لەگەڵ ئەودا پێناسە کردبوو. بەعەقڵانیکردن واتە کارکردن بەپێی سیستەمی سروشت یان عەقڵانیەتی گەورەتر. بیری نوێ و لەوانەش تێڕوانینی دیکارت و سیستەمی فەلسەفەی هۆبز شۆڕشێك بوو لە دژی ئەم تێگەیشتنە بۆ عەقڵانیەت. لەسەردەمی نوێدا مرۆڤ خۆی وەکو زاتێك پێناسە کرد کە دەتوانێت بیرکردنەوە و بڕیاری عەقڵانیی هەبێت جگە لەمە بابەتی زنجیرەیەك حەز و ئارەزووی سروشتییە. پاش هۆبز زنجیرەیەك لە بیرە فەلسەفی و سیاسییەکان پێگە و پشکێکی گرنگیان بۆ

ئەم حەز و ئارەزوانە لەناو رەفتار و ئەخلاقی مرۆڤدا دیاریکردووە. دامەزرێنەرانی فەلسەفەی سوودگەرایی بە پشتبەستن بە بەشێك لە میراتی هۆبز حەزەکان و ئارەزووەکانی مرۆڤیان کردە بنەمای ئەخلاق و رەفتار و عەقڵیان بەرەو پێگەیی وردبینی پەتی خستە دواوە. ئەوان لەسەر ئەو بنەمایە بەڵگەیان هێنایەوە کە عەقڵ ناتوانێت پێوەرێك بۆ بریارە ئەخلاقییەکان فەراهەمبکات و لەبری ئەمە ئەخلاقیان بەستەوە بە دەروونناسی مرۆڤەوە. ئەم بیرمەندانە سیستەمی سروشتی (بە واتا ئەفلاتۆنییەکە)یشیان لە پێوەری ئەخلاقییەت و عەقلانییەت روونکردەوە. رایانگەیاند کە هیچ سیستەمێك لە رێساکان بوونی نییە کە مرۆڤ پەیڕەوی ئەو بێت. بەبۆچوونی ئەم بیرمەندانە کۆمەڵگای سیاسی یەکەم بە ئامانجی گەورە و دووەم بۆ دەستەبەرکردنی مەبەستە سەرەتاییەکانی مرۆڤ واتە تێرکردنی حەزەکان تەماشا دەکرا. عەقڵی وردبینی مرۆڤ ئەو رێنماییدەکات کە هۆشیارانە وەها ژینگەی خۆی رێکبخات کە ئەو بە شادی و خۆشی بگەیێنێت. سەرئەنجام لە بەرامبەر ئەم دوو روانگەیەدا روانگەی سێیەم سەبارەت بە عەقلانییەت پەیدابوو کە هەردووکیانی بۆ رکەبەرایەتی کردنی یەکتر بانگهێشت کرد. ئەم روانگەیە بریتی بوو لە خودرێسایی ویستی ئەخلاقی کانت کە هەروەك وتمان بۆخۆی لە درێژەی کامڵبوونی ویستی گشتی رۆسۆ یان لە راستیدا لە چارەسەرکردنی کێشەکانی ئەو تا بەئێرە گەیشتبوو. خودرێسایی ئەخلاقی کانت نەك تەنها ئەخلاقی لە هەموو پێوەندێك لەگەڵ بیری کۆن رزگار کرد و واتاییەکی نوێی بۆ عەقڵ بەدەستەوەدا کە جیاواز بوو لەگەڵ روانگەی کلاسیکیدا، جگە لەمە بە توندی کەوتە بەرهەڵستیکردنی بناغەی مەعریفەناسی سوودگەراییش واتە ئەزموونگەریی. کانت بەپشتبەستن بەلایەنێکی تری نەریتی هۆبز کە پشت ئەستوور بوو بە ویستی هەولێدا کە پەیمان و ئەرکەکانی مرۆڤ لە ویستەوە دەربهێنێت، بەلاّم بە تێگەیشتنی رادیکاڵی ئاستی هۆبز. هۆبز ئەرکی لە بریاردان بە خۆسپاردن بە فەرمانڕەوایەك، بە مەبەستی دوورکەوتنەوە لە مەرگی ناسروشتی هەڵێنجا بوو و رۆڵێکی سەرەکی بۆ حەزەکان و هەندێك لە راستییە سروشتییەکان لەبەرچاوگرتبوو، هەرچەندە رۆڵی عەقڵی وەکو هێزی رێکخەر فەرامۆش نەکردبوو.

بەلاّم کانت ویستی ئەرکەکانی مرۆڤ تەنها لە ویستەوە دەربهێنێت و خۆی لە هەموو جۆرە پشت بەستنێك بە یاسای سروشت هەرچەندە کە جەوهەرەکەی تەنها بریتی بێت لە هۆشیاری و ئاگا لەخۆبوون بە دووربگرێت. پێوەرێکی فۆرمالی و بەدوور لە هەموو پەیوەندییەك لەگەڵ سروشتی دەرەوەی بۆ کاری ئەخلاقی دۆزییەوە و وتی کە عەقلانییەت لە خۆگری بیرکردنەوەیە






بە شێوەیەکی گشتی و هاوساز (بەدوور لە دژیەك بوون). بەم پێیە دەبێت بنەڕەتی دانراوی هەموو کارێك وەهابێت کە ئێمە بتوانین بەبێ دژیەك بوون بیخەینە شێوەی بنەڕەتی گشتییەوە. ئەگەر نەتوانین وەها بکەین لەم حاڵەتەدا ناتوانین وەکو ویستی عەقڵانی لەسەربنەمای هۆشیاریی و هەستکردنی دروست هەڵسوکەوت بکەین[1].

بەلاّم ئەو ویستەی کە لەسەربنەمای وەها بنەڕەتێك هەڵسوکەوت دەکات دوورە لە هەموو پەیوەست بوونێك لە سروشتی دەرەوەدا و لە ئەنجامدا بە واتای راستەقینە ئازادە. بەم شێوەیە کانت بە بنەڕەتیترین شێوە بکەری ئەخلاقی یان زاتی ئەخلاقیی بە خودرێسا راگەیاند. لێرەدا تاك تەنها پەیڕەوی لە ویستی خۆی دەکات و دوورە لە هەموو ویستێکی تر. لە راستیدا عەقڵ شتێك نییە جیا لە ویستی عەقلانی (وەها رەفتار بکە کە بخوازی ویستی تۆ بگۆڕێت بۆ یاسای سروشتی). ئەو میراتە کانتییە بەدوور لەو کێشە و گرفتانەی کە رووبەڕووی بوون و بەدوور لەو رەخنەیەی کە ئەوانی تر و هیگڵ ئاراستەیان کرد بووە سەرچاوەی بیر و سیستەمی فەلسەفەی تازە دامەزراوی هیگڵیی. یەکێك لە راڤەکاران بەناوی کارل فێردریك رۆزەنکرانتس پەیوەندییەکی هەمەلایەنە لەنێوان فەلسەفەی کانت و فەلسەفەی هیگڵدا بەدیدەکات[2]. هیگڵ عەقڵی خودرێسای کانتی بۆ هەموو سیستەمی بونەوەرەکان فراوان کردەوە. خودرێسایی عەقڵ یان گیان[3] واتە ئەوەی کە عەقڵ یان گیان تەواوی ناوەڕۆکەکەی لە ناوخۆی وەدەردەنێت. ویست کاتێك ئازادە کە تەنها خۆی بوێت نەك شتێکی دەرەوەی خۆی. چەمکی ویستی پێکبەستراوە لەگەڵ چەمکی ئازادیدا. عەقڵ و بیر بنەمای ویست و جەوهەری ویستە و ویست بەبێ هزر و بیرکردنەوە بوونی نییە. عەقلانیەتی ویست پێوەری کۆتایی دروستیی شتەکانە. دەوڵەتی تەواو وەدی هاتووی رۆسۆ لەسەر ئەم بنەڕەتە دامەزراوە. یەکێکی تر لە توێژەران دەڵێت تیۆرەکەی کانت دەربارەی یەکێتی باڵایی هەمان خود ئاگایی بناغەی دیکترینی گیان یان عەقڵی هیگڵە[4].

هەروەك بینیمان کێشەی عەقلانیەتی کانت بریتی بوو لە فۆرمالی بوون و پووچبوونی ئەو. کانت خودرێسایی رادیکاڵی ویستی بە نرخی پووچبوون و فۆرمالیبوونی ئەو بەدەستهێنابووە

---

1- Charles Taylor, London, New York. Cambridge University Press 1975, p. 368.

٢- جان، پلامناتز، فلسفه اجتماعی هیگل، ترجمه حسین بشیریه، نشرنی ١٣٦٧، ل ١٩.

3- Geist.

٤- اشتفان کورنر، فلسفه کانت، ترجمه عزت الله فولادوند، تهران، انتشارات خوارزمی، ١٣٦٨، ل ٦٥.

کانت بە پێچەوانەی حەزی خۆی و پێچەوانەی پلانی سەرەکی خۆی لە جۆرێك پێوەری ئەفلاتۆنی بۆ عەقڵ نزیك ببوویەوە. پێوەری دروستی بنەڕەتێك ئەوەیە کە تا ئاستی کۆتایی خۆی فۆرمالی بێت. کانت وایدەزانی کە هەبوونی پێوەرێکی گشتی و تەواو فۆرمالی رێگەمان پێدەدات کە پێوەرێکی بینراومان هەبێت بۆ رەتکردنەوە و پەسەندکردنی کارەکان و دەبێت و نا بێتەکان. بەلاّم پێوەرێکی وەها فۆرمالی وەها تەمومژێکی لەخۆیدا هەڵگرتووە کە بەکارهێنانی لە کرداردا سەخت و تەنانەت مەحاڵ دەکات. هیگڵ رەخنە لە کانت دەگرێت کە پێوەرەکەی ئەو بە تەواوی پووچ و فۆرمالییە. تێڕوانینی ئەخلاقی کانت لەسەربنەمای ئەو گریمانەیە دامەزراوە کە ویژدانێکی ئەخلاقی هەیە کە بەردەوام خوازیاری پەیڕەوی کردنە لە ئەرکی پەتی. بەلاّم وەها ویژدانێك هەمیشە دەکەوێتەڕوو بەڕووی سروشتی پاشکۆ و دەرەوە. راستی ناوەوە پەیڕەوی لە یاساگەلێك دەکات و ویژدانی ئەخلاقی لە یاساگەلێکی تر و ئەم دووە لەگەڵ یەکدا هاوجۆرنین.

هەروەك هیگڵ دەڵێت بەپێی بانگەشەکەی کانت دەکرێت بە قبوولکردنی ئازادی و دەسەلاّت بۆ بکەری ئەخلاقی یان زاتی ئەخلاقی کاری لە ناوخۆی ویستی لەگەڵ راستی دەرەوەدا بگونجێندرێت، لە کاتێکدا کە ئاگای لەو پرسە نییە کە ویژدانی ئەخلاقی کاتێك دەچێتە ناو وەها کارێکەوە بتەوێت و نەتەوێت خۆی وەکو کارێك لەناوخۆیدا رەتکردۆتەوە، چونکە تاك لەو پایەی کە وەها کارێك ئەنجامدەدات پاژی و تایبەتە بۆیە کردارەکەی وەکو پاژی و تایبەت ناتوانێت هەڵگری زەرووەت بێت. ئێستا ئەگەر کێشەکە بەو جۆرە بخەینەڕوو کە ئێمە وەکو زاتی پاژی دەبێت وەکو کارێك لەناو خۆیدا تەماشای ئەخلاقییەت[٥] بکەین کە ئێمە بەرەو کامڵبوون بانگهێشت دەکات لەم حاڵەتەدا دەبێت ویستی ئێمە لەگەڵ یاسا پەتیەکاندا بگونجێت. بەلاّم ئەم جارەیان کامڵبوون لایەنی پەتی بوونی هەیە کە لەم جیهانە هەستییەدا هیچ بوونەوەرێك ناتوانێت پێیبگات[٦].

هیگڵ تێڕوانینی ئەخلاقی کانتی وەکو تەواوی میکانیزمی فەلسەفەی ئەو بە رووبەڕووی جۆرێك دژیەکی ناوەکی چارە هەڵنەگر دەبینی. لە فەلسەفەی کانتدا ویستی بەردەوام وەها

5- Morality.

٦- ژان هیپولیت، پدیدا شناسی روح برهسب نظر هگل، ترجمه کریم مجتهدی، تهران، انتشارات علمی – فرهنگی، ١٣٧١، ل ١٩٤.





خۆی لە رووبەڕووی سروشتی دەرەوەدا دەبینێت کە هەموو ئەگەرێکی وەدیهاتنی لێدەسێنرێتەوە. بۆیە هیگڵ هەوڵدەدات عەقڵ لەو چوارچێوەیەی کە کانت بۆی دیاریکردووە زیاتر بەرەو پێشەوە ببات تاوەکو تووشی دژیەکبوونەکانی سیستەمی کانتی نەبێتەوە. بەم شێوەیە بوو کە هیگڵ عەقڵ یان رۆحی وەکو بکەری ئەخلاقیی سەرتاسەری جیهان و مێژوو خستەڕوو. بۆیە ئەم بکەرە داهێنەرە (عەقڵ) لەبری ئەوەی کارێکی گشتی لەو دیوی خۆی وەکو کارێکی ئەبستراکت بەرجەستە بکات بەرەو ناوخۆی رادەکێشێت. ئێستا بەم پێگەیە ئیدی عەقڵ زاتی ئەخلاقییەتە کە لەباری بوون و بەکردەیی بوونە.

بە واتاییەکی تر لەبری ئەوەی بەپێی تێگەیشتنی کانت کارێکی گشتی کارێکی لەناوخۆ و ئەبستراکت و دەرەوەی سنووری دەستپێگەیشتن بێت دەگۆڕێت بۆ کارێکی پاشکۆ و مرۆیی و لە سەرورەی مێژوودا جێگیر دەبێت، لە ئەنجامدا مێژوو سەبارەت بە حەقیقەت و بەهای کاری تاك دەکەوێتە دادوەری کردن. هیگڵ پاش کانت چارەنوسی فەلسەفەی بە بەستراوە لەگەڵ کاری کۆکردنەوەی نێوان بیر و کردار دەبینی. مێژووی مرۆڤ وەکو چوارچێوەیەك بینییەوە کە دەکرێت تیایدا بیر و کردار کۆبکرێتەوە. هیگڵ هەستی بەوە کرد ناکرێت لە تاك یان بە واتاییەکی تر لە سنووری پاژیدا بەدوای بنەمای ئازادی و ئەخلاقدا بگەڕێین، بەڵکو دەبێت لە جۆرێك یەکێتی نێوان پاژ و گشتی یان ویستی تاکەکەسی و ویستی بە کۆمەڵدا ئەم بەدواگەڕانە ئەنجامبدەین. ناتوانین تاك بناسین مەگەر ئەوەی لە پەیوەندی تایبەتی ئەو لەگەڵ تەواوی ئەو کۆمەڵگایەی کە ئەو ئەندامە تیایدا تێبگەین.

لەم رووەوە هیگڵ لایەنێکی تری میراتی کانت کاملکرد. کانت رایگەیاند بوو کە تێگەیشتنی مرۆڤ نەك تەنها یاساکانی خۆی لە یاساکانی سروشتی و ئەزموونەوە وەرناگرێت، بەڵکو یاساکانی خۆی بەسەر ئەودا دەسەپێنێت و دەیخاتە نێو ئەوەوە (عەقڵی پەتی و مەعقولییەتی کانت)، سەبارەت بە یاسا ئەخلاقییەکانیش بە هەمان شێوە. تەنانەت لێرەشدا مرۆڤ بەسادەیی قبووڵکەری یاساگەلێك نییە کە بەهۆی ویستی خودا یان هەر سەرچاوەیەکی ترەوە بەسەر ئەودا سەپێنرابێت. ویستی هەر بوونەوەرێکی عاقڵ ویستی یاسادانەرە بە شێوەیەکی گشتی. بوونەوەری عاقڵ پەیڕەوی لە هیچ یاساییەك ناکات جیالەوەی کە خۆی

دایدەنێت[٧]. هیگڵیش بە هەمان شێوە مرۆڤی خاوەن عەقڵ بە چالاك و مێژووساز تەماشا دەكات، بەڵام ئەم عەقڵە، عەقڵی تاكەكەسی نییە بەڵكو هۆش یان عەقڵی بە كۆمەڵە.

هیگڵ و شوێنكەوتوانی پاشتری ئەو لەوانەش ماركس بەشێوەیەكی نوێ و چاكساز كراو مەعریفەناسیی كانتیان خستەبەر سوود لێوەرگرتن. لە مەعریفەناسی هیگڵ و شوێنكەوتوانیدا بەهای زانست و تێگەیشتن پەیوەستە بە بكەری ناسەری خاوەن عەقڵەوە. بەڵام بكەری ناسەری هیگڵ و ماركس لەلایەكەوە كۆمەڵایەتی و لەلایەكی ترەوە داینەمیكییە. بەم تێڕوانینە ناسین بەشێوەیەكی كۆمەڵایەتی هەماهەنگ دەبێت و هەم لە هەموو ساتێكدا مەرجدارە بە ئەزموونی مێژوویی ئێمەوە و هەم بەهۆی ئەوەوە دەبێتە خاوەن سەربەخۆیی[٨]. ڕەخنەی هیگڵ لە كانت ئەوەیە كە ئایدیالیزمی ئەو ئایدیالیزمێكی هۆشەكییە.

هیگڵ دەڵێت بە هەمان شێوە وێنای كانت بۆ ئازادیش وێنایەكی فۆرمالییە و هەر بۆیە ئەو نەیتوانیوە لە بیرۆكەی ئازادییەوە بگاتە بیرۆكەی كۆمەڵگای سیاسی[٩]. لە ئاكامدا كانت سەرئەنجام ناچاربووە لە تیۆری سیاسی خۆیدا سوود لە بۆچوونەكانی سوودگەرایی وەربگرێت. كانت گەیشتووەتە ڕوانگەیەكی سوودگەرایانە بۆ كۆمەڵگا كە تیایدا كۆمەڵگا وەكو مەیدانێكی لێكدراو لەو تاكانە تەماشا كراوە كە هەریەك بەشێوەیەكی تاكەكەسی و بەشێوەیەكی تایبەت بەخۆی بەدوای خۆشی خۆیەتی. لەم حاڵەتەدا پرسی سیاسەت بریتی دەبێت لە دۆزینەوەی ڕێگەیەك بۆ پاراستنی چوارچێوەی ئازادی نێگەتیڤ كە تیایدا تاك بتوانێت لەگەڵ تاكەكانی تردا لە سایەی یەك سیستەمی گشتی یاسادا ژیان بەسەربەرێت. هیگڵ بانگەشەی ئەوە دەكات كە كانت لەبەرئەوەی سەبارەت بە ئازادی تێڕوانینێكی تەواو فۆرمالی و لەبەر ئەمەش پووچی هەیە بۆیە ناتوانێت تێگەیشتنێكی جەوهەری نوێ بۆ كۆمەڵگای سیاسی بخاتە ڕوو. كانت ناتوانێت بەو تێگەیشتنە بگات كە كۆمەڵگای سیاسی لەسەر ئەو ئامانجانە دامەزراوە كە بە شێوەیەكی زاتی لە جەوهەری گیان یان عەقڵەوە سەرچاوەی گرتووە و بەهاییەكی جەوهەری و بێ مەرجی هەیە بۆ مرۆڤ نەك ئەوەی كە ئامراز و ئامێرێك بێت بۆ مەبەستێك.

7- Immanual Kant, Fundamental Principla of Metaphsics of Morals, Eng. Trans. T. Abbott, London, Longman, 1927, P. 50.

8- Michael Pusey, Jurgen Habermas, London, New York, Tavistock Publication 1987, p. 23.

9- Polity.





كانت لەبەرئەوەی لە مرۆڤەكانەوە وەكو تاكگەلێك كە بەدوای ئامانجگەلێكی تایبەتیدا دەچن دەستپێدەكات، عەقلانییەت و ئەخلاقییەت لە ڕوخساری دەوڵەتدا وەكو سنوورداریگەلێك كە بەسەر تاكدا سەپێنراوە لێكدەداتەوە. بەم شێوەیە گەرچی كانت ڕێڕەوەكەی خۆی بە تێگەیشتنێكی نوێ بۆ ئەخلاقییەت دەستپێدەكات لە كۆتاییدا تیۆرە سیاسییەكەی بەرەو كوێرە ڕێی سوودگەرایی دەچێت كە تیایدا ڕۆڵی دەوڵەت بۆ هەماهەنگ كردنی ویستە پاژییەكانی تاكەكان بچووك بووەتەوە[١٠]. هەندێك لە ڕەخنەگران ئەم هەڵسەنگاندنەی هیگڵ بۆ تیۆرەكەی كانت تاڕادەیەك بەبێ ویژدانانە دادەنێن دەرهەق بە كانت، بەڵام هەرچی هەبێت هیگڵ كاری سەرەكی خۆی بە چارەسەركردنی كەم و كورتییە باسكراوەكانی سەرەوە داناوە لەم مەیدانەدا.

هیگڵ هەمان ڕەخنەی ئاراستەی ڕۆسۆش كردووە و بەو بانگەشەیەی كە هێشتا ویستی گشتی ئەو ویستی تاكە ڕەخنەی لێدەگرێت. هەڵبەتە ئەم تێگەیشتنە جێی ڕەخنەیە چونكە هەروەك بینیمان ڕۆسۆ لەویستدا چاوی بڕیوەتە ڕەگەزی عەقلانی. بەڕواڵەت مەبەستی هیگڵ لەو ڕەخنەیەی كە ئاراستەی تیۆرەكەی ڕۆسۆ و كانتی كردووە ئاماژەكردنە بە پرسێكی تر. هیگڵ پێی وابوو مرۆڤ كاتێك پەی بە شووناسی بنەڕەتیی خۆی دەبات كە خۆی وەكو بكەری گیان یان عەقڵ لەبەرچاو بگرێت. ئەگەر جەوهەری ویستی بریتیبێت لەبیر یان عەقڵ و ئەگەر ویستی كاتێك ئازاد بێت كە جیا لە عەقڵی خۆی پەیڕەوی لە هیچ شتێكی تر نەكات ئەو كات بیر یان عەقڵ تەنها پەیوەست نابێت بە مرۆڤەوە بەڵكو پەیوەست دەبێت بە گیانی جیهانییەوە كە سەرتاسەری بوونەوەرەكانی پڕ كردۆتەوە. هیگڵ بەوەها تێڕوانینێك بۆ عەقڵ بە تەواوی پرسەكەی گۆڕی. بەپێی ئەم تێڕوانینە بۆ عەقڵ ئەو كێشە و كەم و كورتییەی كە خودڕێسایی ڕادیكاڵ بە ئەو كۆتایی پێدەهات چارەسەر دەبێت.

ئەگەر بەپێی تێڕوانینی هیگڵ ئازادی ڕەتكەرەوەی هەموو جۆرە دیاركەوتنێكی ویست بێت بەهۆی حەزە تایبەتییەكانەوە، لەم حاڵەتەدا بە هەموو جۆرێك لەگەڵ هەموو كارێكی عەقلانیدا نەگونجاو دەردەچێت چونكە چۆن دەكرێت لەویستدا شوێنێك بۆ كردارێك بهێنێتەوە كە لە هەموو ڕوویەكەوە بەتاڵ بێت. بەڵام ویستی ئازاد و عەقلانیی هیگڵ بە دوورە لەم دژیەك بوون و بەكێشە كۆتایی پێهاتنە. بە پێچەوانەی ویستی ئازاد و عەقلانیی كانت ویستی ئازاد و

10- Charles Taylor, op. cit, p. 372.

عەقلانیی هیگڵ تەنها بەگشتی و تەواوی نامێنێتەوە بەڵکو ناوەڕۆکێکی تایبەت و دیار لە خۆی دەخاتەڕوو. بەلاّم لەو رووەوە بوەتە خاوەن وەها ئیمتیازێك کە تەنها پەیوەست نییە بە مرۆڤەوە بەڵکو پەیوەستە بە هەموو جیهانەوە، ئەو نموونەیە رەهایە کە جیهانی پەرت و زۆرکراو دەخاتە نێو مەیدانەوە. ویستی عەقلانی مرۆڤ بە دۆزینەوەی پەیوەندی خۆی لەگەڵ عەقلی جیهانیدا ناوەڕۆك بەدەستدەهێنێت نەك بە تاراندنی خود لە تەواوی دەرکەوتە تایبەتەکان بە مەبەستی گەیشتن بە ئازادی و بەدەستهێنانی گشتیبوون. هیگڵ لە میکانیزمی فەلسەفیی خۆیدا سیستەمێکی بەرفراوانتر پەروەردە دەکات کە مرۆڤ بەشێکە لەو. بەلاّم ئەم سیستەمە بە تەواوی جیاوازە لە سیستەمی جیهانیی نێو بیری کۆن (پێش نوێ). لە هەردوو بیری سیستەمی جیهانیی کۆن و بیری نوێ کە بە ماکیاڤیللی و هۆبز دەستپێکرد سەنتێزێکی دروستکرد کە گیانی ئەو هاوکۆکە لەگەڵ گیانی سەردەمی نوێدا نەك لەگەڵ تێڕوانینی جیهانناسیی[١١] کۆن. تێگەیشتنی کۆن بۆ رێکیی ئەوە بوو کە لە کۆتاییدا خودا بەخشیویەتی. زنجیرە پلەی بوون بە کۆتاییەك دادەنرا کە جێی دەربڕین و دیاریکردن نەبوو مرۆڤ تەنها دەبوو شوێنی خۆی لەو زنجیرە پلەیەدا بەدەستبێنێت. بەلاّم وێنای هیگڵی بۆ گیان یان عەقڵ وەکو ئازادی شتەکانی تەنها وەکو شتگەلێکی دراو لەبەرچاو نەدەگرت. گیان هەموو ناوەڕۆکێکی خۆی لە خۆیەوە وەردەگرێت و ویست تەنها بەخۆی دیار دەکەوێت. هیگڵ لە رەتکردنەوەی ئەو شتەی کە بە فۆرمۆلبەندی بەتاڵی فەلسەفەی کانت ناوی دەبرد جەخت دەکاتەوە کە گیان رووت و داماڵراو نییە، بەڵکو گشتیی کۆنکریتییە[١٢] کە لە پرۆسەی بوون واتە لە مێژووی جیهان (کە مێژووی مرۆڤیشە) و لە فۆرمە تایبەتەکاندا بەرجەستە دەبێت[١٣].

## دەوڵەت وەکو پرۆسەی پێویستی وەدیهاتنی ئازادی

داواکانی گیان یان عەقڵ ئەوەیە کە مرۆڤ لە دەوڵەتێکدا ژیان بەسەرببات کە بەپێی دەوڵەتی عەقڵ پەسەند دروستکرابێت و مرۆڤەکان وەکو بەشداربوانی ژیانێکی گەورەتر پەیوەست بن بە یەکترەوە نەك وەکو تاکگەلێك کە قازانجەکانیان بە دروستکردنی ئامێرێکی

11- Cosmology.
12- Concrete universality.
13- Robert Wokler "Contextualizing Hegel's Phenomendogy of the French Revolution and the Terror", Political Theory Vol 26, No. 1, February 1998, p. [illegible]55.






گەورەتری بە کۆمەڵ دەستەبەر دەبێت. ئەم ژیانە گەورەترە پێویستی بە ئەوپەڕی وەفاداری[١٤] و پەیماندانی ئەوانە. لێرەدا هیگڵ چەمکی پەیوەندییەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگا دەخاتە هاو ئاستی ئەو چەمکە لە قۆناغی پێش نوێ. بە واتاییەکی تر ئەو جارێکی تر لە کۆمەڵەی فەلسەفیی خۆیدا سیستەمی چادری زیندوو دەکاتەوە، بەلاّم بە ناوەڕۆکێکی تەواو جیاواز لە وێناو تێڕوانینی کلاسیکی. سیستەمەکەی هیگڵ سیستەمێکی ئەودیوی مرۆیی یان سەرووی مرۆیی نییە، سیستەمێکە کە لە خودی مرۆڤەوە سەرچاوە دەگرێت. بەردەوام مرۆڤ بەپێی ئەو نەریتەی کە هۆبز بونیادی ناپەیڕەوی لەویستی خۆی و یاسای خۆی دەکات، پەیڕەویکردن لە یاسایەك کە لە خودی مرۆڤە و لەوەوە سەرچاوەی گرتووە[١٥].

لە روانگەی مەبەستناسانەی هیگڵدا مێژوو پرۆسەیەکی کاملبوونییە کە تیایدا ئەو بوونەوەرەی کە بەشێوەیەکی لەناوخۆ ئازادە واتە رەنگدانەوەی گیانە لە بەرزترین رێڕەوی کاملبوونی خۆیدا، بەخود ئاگایی ئازادی دەگات. ئەم خود ئاگایی ئازادییە لە قۆناغە پێشووەکانی کاملبوونی گیان یان عەقڵ و بۆ نموونە لە قۆناغە یەکەمەکانی کاملبوونی کۆمەڵگای مرۆیی وەکو سەردەمی کۆیلەداری و فیودالی بوونی نییە. لە کۆمەڵگای کۆیلەداری و فیودالیدا هێشتا هەموو مرۆڤەکان هۆگری ئازادی نین و هێشتا ویستەکانیان نەگۆڕاوە بۆ ویستی ئازاد. تەنها لە کۆمەڵگای نوێدا ژیانی ئەخلاقیی دەوڵەت دەچێتە شێوەی کۆمەڵەیەکی لەگەڵ یەکدا گونجاوەوە[١٦]. ئازادی لە کۆمەڵگای نوێ و لە قالبی دامەزراوە عەقلانییەکانی وەکو موڵکداری و گرێبەستەکان و پەیمانەکانی هاوسەرێتی کە رەنگدانەوەی وەدیارکەوتنی ویستەکان و بە فەرمی ناسینە بەرامبەرەکانی تاکەکانە، دێتەدی[١٧].

هیگڵ بە ئەنجامگیری کردنی ناوەڕۆکی ئەرك لە بیرۆکەی ئازادییەوە گرفتی تیۆری خودرێسایی رادیکاڵ بەو جۆرەی کە کانت خستبوویە روو چارەسەر کرد. بەلاّم ئەم کارە لەو رووەوە شیاوی رووانە کە هیگڵ تەنها باس لە ئازادی مرۆڤ ناکات، بەڵکو باس لە نموونە دەکات. بەم جۆرەیە کە دەتوانێت جۆری کۆمەڵگای خوازراو لە فۆرمی عەقڵ پەسەندەوە کە ناوەڕۆکێکی کۆنکرێتیی هەیە دەربهێنێت. بەم شێوەیە عەقلانیەت لە سیاسەت و ئەخلاقیەتدا

14- Allegiance.
15- Michael Oakeshott "Thomas Hobbes" Politica, No 2, 1936-7, p. 364-379.
16- Mark Tunick "Hegl on the justified Disobedience" Political Theory, Vol 26, No 4, August 1998, p. 519-535.
17- Mutual Recognition.

دەگۆڕێت بۆ پێوەری جەوهەری. هەروەك بینیمان خودڕێسایی ویستی كانت لەسەر ئەو بنەمایەیە كە نابێت ویست جگە لە خۆی پەیڕەوی لە شتێكی تر بكات. هیگڵ لە فەلسەفەی خۆیدا سیستەمێكی گەورەتری دروستكرد كە مرۆڤ بەشێكە لەو وبیری سیستەمی جیهانی و سیستەمی چادریی كلاسیكیی لەگەڵ تیۆری خودڕێسایی كانتدا تێكەڵ بە یەك كرد و وتی كە دەبێت دەوڵەت یان كۆمەڵگای سیاسی وەدیهاتن و ڕەنگدانەوەی نموونە بێت. بەپێی ئەم پێوەرە ئەخلاق دەتوانێت لە كۆمەڵگادا ناوەڕۆكێكی دیار و كۆنكریتی بەدەستبهێنێت. هیگڵ ئەمەی بە ژیانی ئەخلاقی[۱۸] یان ئەخلاقی بینراو ناودەبرد و جیای دەكردەوە لە ئەخلاق Moralitat بە واتای ئەركەكانی تاك. هیگڵ دەڵێت كانت لە سنووری ئەخلاقی تاكەكەسیدا (Moralitat) مایەوە و نەیتوانی بەرەو ژیانی ئەخلاقی یان ئەخلاقی بینراو بچێت. لەو جێیەوەی كە كانت ئەخلاقی لە كۆمەڵگای كردەییەوە كە تاك پەیوەستە بە ئەوەوە وەرنەگرتووە بۆیە ئەوەی كە سەبارەت بە ئەخلاق باسی لێوەكردووە لە سنووری ئەخلاقی تاكەكەسیدا ماوەتەوە. هیگڵ دەڵێت عەقڵ و گیان كارێكی داماڵراو نین بەڵكو گشتی و كۆنكرێتین[۱۹] كە لە پرۆسەی بوون واتە لە مێژووی جیهان كە مێژووی مرۆڤیشە لە قاڵبی فۆرمە تایبەتەكاندا بەرجەستە دەبێت. كانت لەبەرئەوەی ژیانێكی گەورەتری كە تاك بەشێكە لەو (ژیانی ئەخلاقی) لە وێنای خۆیدا هەیە بۆیە بەردەوام ماف لەگەڵ واقعیەتدا بەرامبەر بە یەك دانا. هیگڵ بە جیاكردنەوەی ویست و ئازادی لە كۆتی واقعیەت كارەكەی كانتی درێژە پێدا بەڵام ئەم كارەی بەستەوە بە گۆڕینی واقعیەت (كە لەسەرەتادا فۆرمێكی ناتەواوی هەیە) بۆ خواستی داواكانی عەقڵ. دیكترینی ژیانی ئەخلاقی پێی وایە كە ئەخلاق لە كۆمەڵگادا بە كامڵبوونی خۆی دەگات[۲۰].

## بەرەو هۆشیاری

ئەو خاڵەی كە دەڵێت ناسین كردارە نەك كاردانەوە ڕۆڵێكی گرنگی لە پێشكەوتنی بیری نوێدا هەبووە. شوێنكەوتووانی ئەزموونگەرایی ناسینیان بە كاردانەوە دادەنا، جگە لە وەرگرتنی كار هیچ ڕۆڵێكی تریان بۆ هۆش لە بەرچاو نەدەگرت. لەم ڕووەوە كانت ڕێگەیەكی نوێی كردەوە كە یەكێكی ترە لە دەستكەوتەكانی ناوبراو لە مێژووی فەلسەفەدا. بە ڕەخنەی

18- Sittlichkeit.
19- Concrete niversality.
20- Robert Worker "Contextualizing Hegel's Phenomenology of the French Revolution and the Terror "Political Theory vol 26, No 1, February, 1998, p. 3[illegible]5.



عەقڵی پەتی نیشانیدا كە هۆش ڕۆڵێكی چالاكی هەیە لە پرۆسەی ناسیندا. بەڵگەی هێنایەوە كە بیرەكان و چەمكەكان تەنها لەو ئەزموونە جیا نابنەوە بەڵكو بەشێكن لەو. چەمكەكان و بیرەكان لە ونیای شتەكان و بینراوەكان وەرناگیرێن بەڵكو گوتار و فۆرمگەلێكن كە بكەری ناسەرباری دەكات لە كاری تێگەیشتن. مەعریفە بەرهەمی كاركردنی بكەری ناسەری لەلایەك و شتی بابەتی ناسین لەلایەكی ترەوەیە. هەر ئەم تیۆرەی كانت دەربارەی یەكێتی بالآیی خودئاگایی بنەڕەتی دیكترینی گیان یان عەقڵی هیگڵە. هیگڵیش وەكو كانت بكەری ناسەری بەیەك گشت ناوبرد كە كۆمەڵی بێ فۆرمی دراوە هەستییەكان ڕێكدەخات و یەكێتی دەبەخشێتە بیر. هیگڵ بە ڕاگەیاندنی ئەوەی كە ئەم هۆشە هۆشی تاكەكەسی نییە بەڵكو هۆشی بە كۆمەڵە سیستەمێكی نوێی بیری دامەزراند. هیگڵ بۆچوونەكەی كانتی قبووڵكرد كە بەرهەمی مەعریفە بریتییە لە كار نەك كارلێكردن بەڵام بە پێچەوانەی كانتەوە وتی كە ناسین یان مەعریفە بەرهەمی فرەیی هۆشەكانە. ئەو بیرانەی كە لە ڕێگەیانەوە سەبارەت بە جیهان وێنەیەكی گونجاو بەدەستدێنین بەشێوەیەكی جیاجیاو لە هۆشە تاكەكانەوە دروستنابێت، بەڵكو بەزۆری ناوەڕۆكێكی هەموانیی هەیە و بەرهەمی میراتی بە كۆمەڵە. ئەم سیستەمە بەدرێژایی مێژوو لە سەردەمێكەوە بۆ سەردەمێكی تر دەگوازرێتەوە. كانت پێكەوە بوون و تێكەڵییە مرۆییەكانی نێو مێژووی لەبەرچاو نەگرت، بەڵام هیگڵ پشتی بە پێكەوەبوون و تێكەڵییە مرۆییەكان و مێژوو بەست و وتی كە ناسینی خود و ناسینی خەڵكی تر بەیەكەوە گەشەدەكەن و ئەوەی كە تاك چ ڕایەكی هەیە سەبارەت بە خەڵكی تارادەیەكی زۆر پەیوەستە بەو ڕایەی كە خەڵكی هەیانە سەبارەت بە ئەو[۲۱]. مكینتایر لەم بارەیەوە دەڵێت كە لە ڕاستیدا خودی هەركەسێك چیرۆكی ژیانی ئەو كەسەیە و چیرۆكی ژیانی هەر كەسێكیش بەشێكە لە چیرۆكی ژیانی ئەو كۆمەڵگایەی كە تاك تیایدا ژیان بەسەردەبات و شوناسی پێدەبەخشێت. مكینتایر وەكو هیگڵ قبووڵناكات كە تاك هەمان ئەو شتەیە كە خۆی هەڵیدەبژێرێت. دەرچوون لە پەیوەندییە مێژوویی و كۆمەڵایەتییەكان و هەنگاونان بەرەو

٢١- جان پلامناتز، ایدئولوژی، ترجمه عزت الله فولادوند، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٣، ل٣.

سنووری بنەڕەتە جیهانگرەوەکانی پەیوەست بە مرۆڤ (مرۆڤی بێخەوش بەواتای مرۆڤ بوون، بەو واتایەی کە کانت باسی لێوە دەکات) تەنها وەهمێکە و هیچی تر[٢٢].

گیان یان عەقڵ بەو واتایەی کە هیگڵ باسی لێوە دەکات بەجیا لە ڕێڕەوی ئەو ڕووداو و چالاکییانەی کە ناوەرۆکی ئەو ئاشکرا دەکەن بوونی نییە. لەو جێیەوەی کە گیان لە ئاستی هۆشیاری و عەقڵ و لە خواست و هەوڵەکانی مرۆڤدا بەدیار دەکەوێت و ئاشکرا دەبێت بەو ئەنجامە دەگەین کە مرۆڤیش لە پێشڕەوی کردن بەرەو تێگەیشتنی کاملتری جیهان و تێگەیشتنی پێگەی خۆی تیایدا بەرەو پێشەوە دەچێت. بەم پێیە بکەری ناسەری هیگڵ هەم کۆمەڵایەتی و هەم مێژووییە یان بەواتایەکی تر داینەمیکییە. لێرەدا هیگڵ بە تەواوی لە کانت، هەروەها تەواوی فەلسەفەی کلاسیك کە مەعریفەناسی بەو شێوەیە لێکدەداتەوە کە تاك لەلایەکە و لوغزی جیهان لەلایەکی تر، جیادەبێتەوە. هیگڵ بناغەی ئەو تیۆرە دادەمەزرێنێت کە مەعریفە بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی هەماهەنگ دەبێت و لە هەموو ساتێکدا مەرجدارە بە ئەزموونی مێژووییەوە، بەلاّم نابێت بەشی ڕۆسۆیش لەم تێڕوانینەدا فەرامۆش بکرێت.

هەروەها هیگڵ بەڵگە دەهێنێتەوە کە توانا هۆشەکییەکانی مرۆڤ پەیوەندێکی ئۆرگانیکیان هەیە لەگەڵ چەند فۆرمێکی تایبەتی ڕێکی کۆمەڵایەتی و ئەم فۆرم و سیستەمە کۆمەڵایەتییانە بۆ خۆیان کاریگەریان هەیە لەسەر گەشەکردنی ئەو توانایانە. بە واتایەکی تر عەقڵانیەت لەرووی ناوەرۆکەوە کارێکی نێوان هۆشی و کۆمەڵایەتییە[٢٣]. مارکس ئەم میراتەی هیگڵی نوێژەن کردەوە و بەرفراوانی کرد. هەروەها هیگڵ ئەو بابەتەی خستەروو کە بکەری ناسەر هەوڵدەدات لە هەموو ئەزموونێك جیاوازی لە نێوان هێز و حەقیقەتدا دابنێت، بەو جۆرەی کە لەو وەهمانەی کە هێز لە ڕێگەیانەوە حەقیقەت پەردەپۆش دەکات کێشە دروستبکات و کاری تێبکات. بەم شێوەیە مرۆڤ بەردەوام حەز بە بەدواداچوونی حەقیقەت و دادپەروەری دەکات[٢٤].

٢٢- السدر مکینتایر، فضایل، وحدت زندگی انسان و مفهوم یك سنت، در لیبرالیسم و منتقدان ان، پێشوو، ل ٢٣٥.

٢٣- اندرو وینسنت، نظریه های دولت، ترجمه دکتر حسین بشیریه، تهران، نشر نی، ١٣٧١، ل١٩٦.

24- Michael Pasey, op. cit, p. 24.



## یەکێتی بکەری ناسەر و بابەتی ناسین

عەقڵ یان گیانی نێو سیستەمی فەلسەفیی هیگڵ لە چەند ڕوویەکەوە لەگەڵ ڕەخنەی بۆچوونی کانت دەربارەی شت لە خۆیدا و دوابەدوای ئەو لەگەڵ خستنەرووی بابەتی یەکێتی بکەری ناسەر و بابەتی ناسین (یان زانەر و زانراو) دروستبوو. کانت بڕوای وابوو کە هۆشەکانمان جۆری تێگەیشتنمان بۆ واقیعیەت پێکدەهێنێت. ئێمە بەبێ ئەو چەمکانەی کە هۆشمان لە هەموو شتێك باری دەکات بێ توانایین لە ئاست تێگەیشتنی شتەکان. هۆشی ئێمە بە جۆرێك دروستکراوە کە دەبێت وەرگیراوە هەستییەکان بەرەو نێو قاڵبگەلێکی وەکو کات و شوێن و هۆکارێتی و هاوشێوەی ئەمانە بدرێت تاوەکو بۆمانی وەدیار بخات. ئێمە لە ڕێگەی ئەم قاڵب یان فۆرمانەوە ڕاستییەکان وەردەگرین، بەلاّم ئەوەی کە ئەم ڕاستییانە لەناوخۆیاندا چ شتێکن بۆ ئێمە ئاشکرا نییە و ئێمە ناتوانین شتێك لە ناوخۆیدا دەرك پێ بکەین. ئەنجامەکەی حەقیقەت یان بوونناسییە و ئێمە تەنها دیارکەوتەکان دەناسین. ئەو شتەی کە نە لە کات یا شوێندا هەیە و یان نەچەندێتی و چۆنیەتی و پەیوەندییەکی هەیە بۆ ئێمە دوورە لە تێگەیشتن. بۆیە مەعریفە و ناسینی ئێمە تەنها سنووردار دەبێت بە دیوی دەرەوە و ڕواڵەتی کاروبارەکان. ئەو شتەی کە حەقیقەتی هەیە بۆ ئێمە هەمان جیهانی ڕواڵەتەکە هەڵبەتە بێ بناغەیش نییە.

کەواتە دەبێت فەلسەفە دەست لە هەموو هەوڵدانێك هەڵبگرێت بۆ ناسینی حەقیقەت و تێپەڕین بەرەو ئەو دیوی دەرکەوتەکان. کانت بە خستنەرووی ئەم تیۆرە فەلسەفەی بەرەو بن بەست پاڵ پێوەنا. پێشکەوتنی فەلسەفە و دامەزراندنی سیستەمی فەلسەفیی نوێ پەیوەست بوو بە تێکشکاندنی ئەم بنبەستەوە. هیگڵ بە سوود وەرگرتن لە هەمان ئەو ئامادەسازییانەی کە فەلسەفەی کانت خستبوویە بەردەستی بەرەو تێکشکاندنی ئەم بنبەستە هەنگاوی نا، یەکێتی بکەری ناسەر و بابەتی ناسین (زانەر و زانراو) لەم کارەوە واتە لە زەرووڕەتی تێکشکاندنی بنبەستی مەعریفەناسی کانتەوە سەری هەڵدا[٢٥]. هیگڵ وەها بەڵگەی هێنایەوە کە چەمکی شت لەناوخۆیدا دژیەکبوونێکی تیادایە. کانت بەو هۆیەوە شت لەناو خۆیدای هێنابووە پێشەوە کە وایدەزانی دەبێت هەستکردنەکانی ئێمە هۆکارێکی دەرەکیان هەبێت. بەلاّم شت لەناوخۆیدا ناتوانێت هۆکار بێت، چونکە بەپێی سیستەمەکەی کانت هۆکار گوتارێکی هۆشەکییە و گوتارە هۆشەکییەکان ناتوانن لەگەڵ شت لەناوخۆیدا بگونجێن.

٢٥- و. ت. سیتس. فلسفه هگل، جلد اول، ترجمه حمید عنایت، تهران، شرکت انتشارات جیبی، ١٣٧٠، ل٥٧.





بەهەمان شێوە هیگڵ کاری بەدوور لە ناسینیشی ڕەتکردەوە و وتی ئێمە ناتوانین سنوورێك بۆ ناسین دابنێین. چونکە مەعریفە بە هەر سنوورێك پێویستی بە ناسینی شتێکی دەرەوەی ئەو سنوورەیە. ناتوانین کۆتایی هێڵێك وێنە بکێشین بیٚ ئەوەی فەزای بەتاڵی ئەوبەری کۆتایی هێڵەکە لەلای خۆمان وێنابکەین. ئێمە تەنها ئەوکاتە سنوور دەناسین کە ئەودیوی ئەو سنوورەیش بناسین. لە ڕاستیدا بەم جۆرە ئێمە لە سنوور تێپەڕیوین و گەیشتوونەتە ئەودیوی. هیگڵ بەرەتکردنەوەی شت لەناوخۆیدا گەیشتە یەکێتی زانەر و زانراو[٢٦]. واتای یەکێتی زانەر و زانراو ئەوەیە کە هۆش و بینراو دووڕووی یەك حەقیقەتن. چونکە ئەگەر بینراو یان بابەتی زانیاری بەتەواوی جیاواز بێت لەوەی کە لە بیری ئێمەدا دروستدەبێت پێویستە هۆش و بینراو یان ناسین و بوون دوو حەقیقەتی لێك جیاواز و لەبەرامبەر یەك بن و کەلێنێکی پڕنەکراوە لە نێوانیاندا هەبێت. لەم حاڵەتەدا شت دوور لە ناسین دەبێت. تا ئەوکاتەی کە شت لەناوخۆیدا لە دەرەوەی توانای عەقڵ بێت بە بنەمایەکی هۆشەکی و بیٚ توانا لە ئاست دەستتێوەردان و کارپێکردنی پێکهاتەی بینراوی ڕاستی دەمێنێتەوە.

ڕەتکردنەوەی شت لە ناوخۆی و دوور لە ناسین بوون بە سەلماندنی بنەڕەتی یەکێتی زانەر و زانراو یان ناسین و بوون کۆتاییهات. بوون واتە بوون بۆ زانیاری. بوونەوەرەکان شتێك نین جیا لە ناوەرۆکی زانیاری. ئەگەر ئەمە ڕەت بکەینەوە تووشی داوی دژییەکەکانی پەیوەست بەشتی دوور لە ناسین دەبین، بەلاّم ئەگەر ئەمە قبووڵبکەین بەناچاری دەبێت بینراوبوونی چەمکەکان یان گشتەکانیش پشت ڕاست بکەین، چونکە لەم کاتەدا هەموو شتێك بە تەواوی و بەتایبەتی هەمان ئەو شتەیە کە ئێمە دەیناسین وەکو کۆمەڵێك لە گشتەکان تەماشای دەکەین. هیگڵ بیری جیاوازی نێوان هۆش و بینراوی کە لەسەردەمی دیکارتەوە سەرچاوەی گرتبوو و زاڵببوو بەسەر فەلسەفەی پاش دیکارت و لە فەلسەفەی کانتدا بە کامڵبوون گەیشتبوو بە تەواوی ڕەتکردەوە و یەکێتی هۆش و بینراوی وەکو گرنگترین ڕەگەزی سیستەمی فەلسەفی خۆی خستەڕوو. بەم جۆرە سیستەمی هیگڵی هاوکات لەگەڵ ڕەخنە و لە هەمان کاتدا لەگەڵ فراوانکردنەوەی گرنگترین ڕەگەزی فەلسەفەی کانتدا دروستبووە. هەر لەبەر ئەمەیە کە بەرتراند ڕاسل دەڵێت سەرەڕای ڕەخنەگرتنی هیگڵ لەکانت ئەگەر فەلسەفەی کانت نەبوایە کۆمەڵەی فەلسەفەی هیگڵیی دورستنەدەبوو[٢٧].

٢٦- سەرچاوەی پێشوو، ل٦٣.

٢٧- [illegible]ت الله فولادوند، در استفان کورنر، پێشوو، ل ٦٥.





## کۆمەڵگای عەقڵانی و دەوڵەتی عەقڵ

بە بۆچوونی هیگڵ هەبوونی دەوڵەت شتێکی بەرێکەوت نییە، بەڵکو لوتکەی پرۆسەیەکی دوور و درێژە کە لەگەڵ سەرەتای شارستانیەتی مرۆڤەوە دەستیپێکردوە و بەردەوام بەرەو بالاّچوون بەرەو پێشەوە دەچێت تاوەکو سەرئەنجام عەقڵی مرۆڤ دەوڵەتێکی تەواو عەقڵانی دروستبکات. مرۆڤەکان بەپێی سروشت و چارەنووسی خۆیان لەناو دەوڵەتدا گەشەدەکەن، نەك لەبەرئەوەی کە دەوڵەت دەسەلاّتێکی خۆسەپێنەر و هەڵهاتن هەڵنەگرە بەڵکو لەبەرئەوەی کە دەوڵەت لەناو ناخ و سروشتی مرۆڤەکان وەکو بوونەوەرگەلێکی عەقلاّنی هەڵدەقوڵێت. بەم پێیە دەوڵەت نەك تەنها خاوەن واتایەکی دەرەکییە بەڵکو خاوەن واتایەکی ناوەکیشە. ڕەوتی کۆتایی جیهان بەرەو ئەو ئامانجانەیە کە گیان خود ئاگابێتەوە بەرامبەر بە ئازادی یان بە خودئاگایی ئازادی بگات و بەم جۆرە ئازادی بێتەدی. وەدیهاتنی گیان لەخۆگری کامڵبوونی کۆمەڵگایەکە کە ڕەنگدانەوە و درەوشانەوەی تەواوی عەقڵ بێت[٢٨]. لەبەرئەوەی کە گیان یان عەقڵ لە دنیای کات و شوێندا جێگیرە بۆیە دەکرێت مێژوو بە وەدیهاتنی گیان یان عەقڵ لەقەڵەمبدرێت. ئامانجی گیان لە ڕێڕەوی مێژوودا ئەوەیە کە بگاتە ناسینی خود و بۆ ئەم کارەیش دەبێت کۆمەڵگایەکی عەقلاّنی دروستبکرێت.

ئازادی مرۆڤ لە پەیڕەوی لێکردنی جەوهەری خود واتە عەقڵەوەیە و پەیڕەویکردن لە عەقڵ بە واتای بەشداریکردنە لە ژیانی فراوانتری دەوڵەت. تەنها لە دەوڵەتدا مرۆڤ بوونی عەقلاّنی بەدەستدەهێنێت. هەموو پێشکەوتنێکی تاك تەنها لە پەیوەندییەکانی ئەو لەگەڵ کۆمەڵدا بەرهەمدێت[٢٩]. ئەو مرۆڤانەی کە لە خێڵە بیابان نشینەکان و دەرەوەی دەوڵەت ژیان بەسەردەبەن دەکەونە پەراوێزی مێژووەوە. لە میانەی مێژوودا مرۆڤ لە کۆمەڵگا ناکامڵ و سەرەتاییەکانەوە بەرەو کۆمەڵگا گەلێکی کامڵ هەنگاو دەنێت. نموونە لە مێژوودا وەدی دێت بەلاّم بەشێوەیەکی بەرە بەرە و لەمیانەی قۆناغەکاندا. ئەم قۆناغانە شارستانییە یەك لەدوای یەکەکانی مێژوون. درامای مێژوو بەتێك ڕووخانی ژیانی ئەخلاقیی دنیای یۆنان و لەدایکبوونی تاك دەستیپێکرد. ئەوکات خولێکی کامڵبوونی ماوە درێژ دەستیپێکرد کە لە کۆتایی ئەودا تاك

28- Charles Taylor op. cit, p. 389.
29- Jason Caro, "Looking over your shoulder: The onlookers of Hegel's Phenomenology", Political Studies, 1977 XLV, 914-927.

و دامەزراوە سیاسییەکان کە لە ژیانی ئەخلاقیدا[٣٠] بەرجەستە بووە لە ئاستێکی بەرزتردا بە یەکبوون دەگەن. ئەمە دیالێکتیکی گیانی نێو دیاردەناسیی گیانی هیگڵە.

لەو دەوڵەتەی کە لە بەرزترین رووی کامڵبوونی خۆی دروستدەبێت مرۆڤ بە ئازادی رەها دەگات. لەوەها دەوڵەتێکدا هەموو شتێك بەرهەمی ویست و بڕیاری مرۆڤە. بڕیارەکان بە بەشداری راستەقینەی هەمووان وەردەگیرێن. هیگڵ ئەم بەشدارییە بە بەشداری گشتی و هەمووانی ناودەبات. مەبەست لە بەشداری گشتی و هەمووانی ئەوەیە کە یەکەم هەمووان بەشدارن لە بڕیارداندا و دووەم بەشداربووان هۆشیارانە بەکاری گشتی و هەمووانی بۆچوونی و کارپێکردنی دەنگی خۆیان دەردەبڕن. وەها دەوڵەتێك جیاوازە لە دەوڵەتی کلاسیکی و دەوڵەتی ئابووری ئازادیش. ئەم پێکهاتەیە لەگەڵ پێکهاتەیەکی وەکو پێکهاتەی کۆمەڵگای کلاسیکیی ئابووری ئازاد کە تیایدا وردە کۆمەڵێك کارگەلێك و وردە کۆمەڵێکی تر کارگەلێکی تر ئەنجامدەدەن بە تەواوی جیاوازە. لە کۆمەڵگای کلاسیکیدا وەك بڵێی هەندێك بەپێی ویستی خودا یان سروشتی کاروبارەکان بەشداری لە بڕیاردانە سەرەکییەکاندا دەکەن و هەندێکی تر بێ بەشن لێی. کۆمەڵگای کلاسیکی پێکهاتەیەکی هەیە خاوەن چەند رۆڵێکی لێك جودا، ئەم پێکهاتەیە دیاریدەکات کە چ بابەتگەلێك لە سنووری بڕیاردانی مرۆڤدایە و چ کەسانێك لەو سنووردا بڕیاردەدەن. لەم پێکهاتەیەدا تاکەکان بە چەند شێوەیەکی جیاواز پەیوەستن بەو بڕیارانەی کە دەبێت وەربگیرێن[٣١].

سروشتی سەردەمی نوێ و بزووتنەوەی رۆشنگەری بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ وەها پێکهاتەیەکدا (پێکهاتەی کلاسیکی) نەدەگونجا. رۆشنگەری بڕوای وابوو کە دەبێت هەموو شتێك بە عەقڵی مرۆڤ هەڵبەسەنگێندرێ و بڕیاری لەسەر بدرێت. دیکترینی ویستی گشتیش بەهەمان شێوە هیچ جۆرە دامەزراوە و پێکهاتەیەك قبووڵناکات کە پێشتر هەبووبێت و نەکرێت بڕیاری لەسەر بدرێت. دەوڵەتی دامەزراو لەسەر ویستی گشتی خاوەن هیچ پێکهاتەیەکی پێشتر دیاریکراو نییە کە نەتوانرێت بخرێتە بەردەم بڕیاردانی هەمووانەوە، جگە لەوەی کە بۆ پرۆسەی کاری بڕیاردان پێویستە وەکو ئەنجوومەن و باسە ئازادەکان و هاوشێوەی ئەمانە. جیا لەمانە هەموو شتێك و لەوانەش فۆرمی حکوومەت و مافی موڵکداریش لەبەردەم بڕیاردانی ویستی

30- Sittichkeit.
31- Charles Taylor, op. cit, p. 404.



گشتیدان، تەنانەت مافە بێ چۆن و بۆیە تاکەکەسییەکان کە لە دەرەوەی چوارچێوەی دەوڵەت شوێنیان بۆ لەبەرچاوگیرا بێت بونیان نییە[٣٢].

هەروەها ئەو کۆمەڵگا ئازادەی کە رەنگدانەوەی ویستی گشتییە جیاوازە لە کۆمەڵگای دامەزراو لەسەر بازاڕ. راستەکە لە کۆمەڵگای دامەزراو لەسەر بازاڕیش هیچ دامەزراوەیەکی پێشوەخت دیاریکراو نییە، جگە لە موڵکداری تایبەتی و ئەوەی پەیوەستە بە ئەوەوە وەکو گۆڕینەوە و گرێبەست و....هتد بوونیان نییە، راستییەکە ئەم کۆمەڵگایەش پێکهاتەی دامەزراو لەسەر نەریت و سیستەمی خودایی قبووڵناکات و هەموو شتێك دەبەستێتەوە بە ویستی عەقڵانیی مرۆڤەوە بەڵام واتای ویستی عەقڵانیی نێو کۆمەڵگای دامەزراو لەسەر بازاڕ جیاوازە لە واتای ویستی عەقڵانیی نێو دەوڵەتی خاوەن ئازادی رەها (دەوڵەتەکەی هیگڵ). لە کۆمەڵگای دامەزراو لەسەر بازاڕ هەر کەسە و بۆخۆی بڕیار دەدات و ئەنجامی بڕیارەکەشی بۆ خۆیەتی. تاك دەربارەی کاری گشتی و هەمووانی بڕیار نادات و بڕیاری تاکەکەسی ئەو کاریگەرییەکی تاڕادەیەك کەمی هەیە لەسەر گشت. ئەو لە دەرەوەی ئەو کارەی کە پەیوەست دەبێت بە بڕیاری ئەوەوە رووبەرووی هەلومەرجێکە کە کاری ئەو نییە و بەرهەمی هەزاران ویستی ترە کە هەموو ئەوانیش رووبەرووی هەمان ئەو بارە پەشێوەن. شێوەی پێکەوە بەستنەوەی ئەم ویستانە کاری یاساکانی ولاتە نەك ویست[٣٣]. ئەگەر ئازادی ئەوەیە کە ئەو شتەی کە ژیانی تۆ دروستدەکات دەبێت لەلایەن خودی تۆوە دیاریکرابێت و پەیوەست بێت بە بڕیاری تۆوە لەم حاڵەتەدا هەرچەندە تۆ لە هەلومەرجێکدا بیت کە تەنها بەشێکی بچووکی بەرهەمی بڕیاری تۆ بێت بە ناچاری بەهەمان رادە ئازادنیت. ئازادی ئەوەیە کە تەواوی ئەنجام و هەلومەرجەکان پەیوەندی هەبێت بە بڕیاری تۆوە. هەڵبەتە لەو شوێنەی کە ئەنجامی گشتی کارێکی کۆمەڵایەتییە بۆیە ناکرێت تەنها لەلایەن تۆوە دیاریبکرێت. ئەگەر وەها بێت ئەو کات خەڵکانی تر ئازاد نابن. کەوابوو ئەگەر بڕیار وابێت هەموو ئازاد بن دەبێت سەرەتا هەموو بەشداری لە بڕیارداندا بکەن و پاشان هەموو بکەونە بڕیاردان دەربارەی کاری گشتی. وەها بەشداری کردنێك بەشداری گشتی و هەمووانەیە.

بەم جۆرە تاکەکان لە کۆمەڵگای مەدەنیدا (کۆمەڵگای مەدەنی بەواتا هیگڵییەکەی نەك بە واتای کۆمەڵگای سیاسی بەشێوەیەکی گشتی) وەکو بوونەوەرگەلێکی سەربەخۆ و هەڵگری

32- Ibid, p. 405.
33- Charles Taylor, op. cit.





ماف و پێداویستی دەکەونە پەیوەندییەوە لەگەڵ یەکتردا و رێگـە بـە دیارکـەوتنی تـاکبوون و تایبەتی بوون دەدەن، لە کاتێکدا کە لەسەرووی کۆمەڵگای مەدەنییەوە سیستەمی یاسـاکان و سیستەمی سیاسی هەیە کە پەیوەندییەکانیان رێکدەخات[٣٤].

هەروەك بینیمان تیۆری بەشداری گشتی و هەمووانی لە گرێبەستی کۆمەڵایـەتیی رۆسـۆدا خرابووەروو. رۆسۆ دەیویست فۆرمێکی کۆمەڵگای سیاسی بدۆزێتەوە کە تیایدا هەموو کەسێك لە هەمان کاتی پەیڕەوی لێکردنی یاساکان بەردەوام پەیڕەوی لە خۆی بکـات و وەکـو بـەر لـە پەیوەندیکردن بە کۆمەڵگای سیاسییەوە بە ئازادی بمێنێتەوە. تاك تـەنها کاتێـك پـەیڕەوی لـە خۆی دەکات کە ئەو یاسایانەی پـەیڕەوی لێـدەکات لـە خۆیـەوە ئـەنجامگیری کرابێـت. وەهـا بەشدارییەك (گشتی و هەمووانی) لە چوارچێوەی ویستی گشتیدا دێتەدی. لەوێدا کە باسمان لە تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆ کرد روونمانکردەوە کە چۆن بەشداری گشتی و هەمووانی بە واتـای رەنگدانی ئەرێ بە تەواوی یاساکان نییە. کاتێك بەشداری گشتی و هـەمووانی بێـت تەنانـەت ئەگەر تاك لە چـەند حاڵەتێکـدا دەنگـی نـەرێیی بـە یاسـایەکی دیـار و تایبـەتیش دابێـت، پەیڕەویکردن لە یاساکانی کۆمەڵگای سیاسی لەگەڵ ئـازادی و ویـستی ئـازادی ئـەودا نـاکۆك نابێت. بەلاّم وەها دەوڵەتێك ناتوانێت لە جۆری دەوڵەتە گەورەکانی ئێـستا بێـت کـە تیایانـدا بەشداریکردن رووبەرووی دژواریگەلێکی زۆرە.

بەلاّم هیگڵ لەم بارەیەوە لە خاڵێکی گرنگدا رەخنە لە رۆسۆ دەگرێت و لەو جیا دەبێتـەوە. هیگڵ لەو رووەوەی کە رۆسۆ ویستی وەکو بنـەڕەتی ناوەنـدی کۆمـەڵگای سیاسـی و دەوڵـەت داناوە دەستخۆشانەی لێدەکات بـەلاّم لـەو شـوێنەی کـە بـەبڕاوی هیگـڵ رۆسـۆ ویـستی بـە دەنگەکانی تاکە لێك جیاکان داناوە رەخنەی لێدەگرێت[٣٥]، هیگڵ دەڵێت گەرچی رۆسۆ پایە و بناغەی دەوڵەتی دەستنیشانیکردووە و ناساندووە بەلاّم لەسـەربنەمای ویـستە لێـك جیـاواز و نایەکگرتووەکانی تاکە لێك جیاوازەکان دایمەزراندووە.

34- James Schmidt "cabbage Heads and Gulps of water" Hegel on terror" political Theory vol 26, No. 1, February 1998, p. 4-32.

35- Robert Workler "Contextualizing Hegel Phenomenology of The French Revolution and the ferror" Political theory vol 26. No.1, 1998, p. 33-55.






## دەوڵەت و کۆمەڵگای مەدەنی

دەوڵەتەکەی هیگڵ دەوڵەتی نوێیە بە تەواوی واتا دەوڵەتێکە کە تەواوی لایەنەکانی ژیـانی مرۆیی تیادا لەبەرچاو گیراوە. کاتێك کە باس لە دەوڵەتی عەقلانیی هیگڵ دەکەین نابێت وابیر بکەینەوە کە ئەو بایەخی بە لایەنەکانی تری سروشتی مرۆڤ و رۆڵی ئەو لە کۆمەڵگادا نـەداوەو لە بیری کـردووە. هیگـڵ بـە لەبەرچـاوگرتنی هـەموو لایەنـەکانی ژیـانی مـرۆڤ و لەوانـەیش قازانجەکان و حەزو ئارەزووەکان و رۆڵیان لە کۆمەڵگادا باسی لە دەوڵەت کردووە. هیگڵ بوونی حەز و قازانجەکان لەیادناکات: هیچ شتێك بەبێ مەرام و قازانجی کارگوزارانی یان بکـەرانی بـە ئەنجام ناگات. و ئەگەر قازانجەکان بە حەزو ئارەزو ناوبەرین دەبێت بەبێ دوو دڵـی ئـەوە پـشت راسـت بکەینـەوە کـە هـیچ کـارێکی گـەورە لـە جیهانـدا بـەبێ حـەز و ئارەزووەکـان بەئەنجامناگات[٣٦]. حەز و ئارەزووەکانی تاك و عەقڵی جۆری هەریەك وەکو تان و پۆ یەکن کـە مێژوو لەوانەوە دروستدەبێت.

روویەکی دەوڵەتی هیگڵ ئەوەیە کە سەنتێزیکە لـە خێـزان و کۆمـەڵگای مـەدەنی. مـرۆڤ بوونەوەرێکی پێکهاتوو لە تاکگەلێکی گۆشەگیر و جیا لە یەك نییـە. هـەموو تاکێـك لەگـەڵ چەند تاکێکی تردا دەژی و پەیوەستە بەوانەوە، بەهەمان ئەو جۆرەی کە خەڵکیش پەیوەستن بە ئەوەوە. بۆیە نابێت بەجیا لە کۆی ئەو دامەزراوانەی کـە خزمـەت بـە پێداویـستییەکانی ئـەو دەکەن و خودی بەرجەستە کردنی گیان یان عـەقڵن لـە جیهانـدا هەڵـسەنگاندنی بـۆ بکرێـت. یەکەمین دامەزراوە کە لە پێکەوەڵکانی تاکەکان دروستدەبێت بریتییە لە دامـەزراوەی خێـزان. خێزان خزمەت بە پێداویستییە هەستییەکانی مرۆڤ دەکات و یەکەمین پێگەیـە کـە ئـارامی و ئاسایش بۆ ئەو دابیندەکات. گەرچی ژن و مێردایـەتی لەسـەربناغەی هەسـتکردن دروسـتبووە بەلاّم ئەم هەستکردنە هەستکردنێکە کە عەقڵ لە نـاخی ئـەودا حەشـارماوە، بەواتایـەکی تـر لێرەدا و لـەژێر بـاڵی هەسـتکردندا بەدیاردەکـەوێت. ژن و مێـردی وەکـو هـەموو دامـەزراوە ئەخلاقییەکانی تر لەبنەڕەتی خۆیدا لەسەربنەمای عەقڵ دامەزراوە[٣٧].

36- C. L. Wayper op. cit, p. 161.

٣٧- و. ت. ستیس، فلسفه هگل، جلد دوم، ترجمه حمید عنایت، تهـران، شـرکت سـهامی کتابهـای جیبـی، ١٣٧٧، ل ٥٧١.

بەلاّم خێزان بچووکترە لەوەی کە وەلاّمی هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤ بداتەوە. جگە لەمە کاتێك منداڵانی خێزان گەورە دەبن بۆ هەنگاونان بەرەو دنیایەکی گەورەتر خێزان بەجێ دەهێڵن. ئەم دنیایە بریتییە لە کۆمەڵگای مەدەنی یان بە واتایەکی تر کۆمەڵگای بوارژوازی. کۆمەڵگای مەدەنی باری بەرامبەری خێزانە. تاکەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەچنە نێو کۆمەڵگای مەدەنییەوە و پاڵنەری قازانجە کەسییەکان دەیانخاتە نێو پەیوەندییەوە و بەیەکیانەوە دەبەستێت. لە کاتێکدا کە کاری سەرەکی خێزان بریتییە لە ئەوین و خۆشەویستی بەرامبەر، کاری سەرەکی کۆمەڵگای مەدەنی بریتییە لە رکەبەرایەتی گشتی و سەرتاسەری.

بازرگانی و پیشەسازیی دنیای بۆرژوازی یان کۆمەڵگای مەدەنی بوار و رێکخستنێکی نوێیە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی مرۆڤ، بۆیە خاوەن عەقلانێیەتێکی تایبەت بەخۆیەتی. ئەم دنیایە بەشێوەی تایبەتیی خۆی دنیایەکی عەقلانییە. لە دووباری بەرامبەریەکی خێزان و کۆمەڵگای مەدەنییەوە سەنتێزێك دروستدەبێت کە باشترین تایبەتمەندییەکانی هەردووکیانی لەخۆیدا هەڵگرتووە. ئەم سەنتێزە بریتییە لە دەوڵەت. دەوڵەت باشترین تایبەتمەندییەکانی هەردووکیان وەردەگرێت و بێ ئەوەی هەردووکیان لەخۆیدا بتوێنێتەوە لە گشتێکی بەرزتردا دەیان گەیەنێتە یەکێتی و یەکبوون. بنەمای دەوڵەتی نوێ ئەوەیە کە تیایدا گشت و تایبەت یان بەش و هەموو بەجۆرێك بە یەکەوە بەستراوە کە تایبەت و بەشەکان ئازادی تەواویان هەیە. لە دەوڵەتی عەقلانیدا گشتبوونی ئامانجی دەوڵەت و ئازادی ویستەکان هەماهەنگن لەگەڵ یەکتردا.

هەندێك وایان وێناکردووە کە جیاکردنەوەی دەوڵەت لە خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی لەلایەن هیگڵەوە بەو واتایەیە کە چالاکییە بازرگانی و قازانجخوازەکانی نێو کۆمەڵگای مەدەنی دەبێتە هۆی بەریەککەوتن و گرژیگەلێك کە دەوڵەت وەکو دادوەرێکی بێ لایەن بۆ جێبەجێکردنی دادپەروەری دێتە پێشەوە[٣٨]. بە بۆچوونی ئێمە وەها تێگەیشتنێك لە بۆچوونی هیگڵ دەربارەی دەوڵەت بەد حالیبوونێکی گەورەیە سەبارەت بە تەواوی فەلسەفە و مەعریفەناسی و دیالێکتیکی هیگڵ. ئەگەر دەوڵەت تەنها دادوەرێکی بێ لایەن بێت لەم حاڵەتەدا تیۆری دەوڵەتی هیگڵ زۆر لە تیۆرەکەی لۆك پێشنەکەوتووە. یان ئەگەر کاری دەوڵەت بریتی بێت لە دابینکردنی ئاشتی و

٣٨- ر. ج. بەهرمیداس باوند، ((گفتوگۆ درباره جامعه مدنی))، اطلاعات سیاسی- اقتصادی، شماره ١١٨- ١١٧ خرداد- تیر ١٣٧٦) ل ٤-٥٥.






ئارامی لە نێوان تاکەکانی نێو کۆمەڵگای مەدەنی یان گونجێنەری خێزان لەلایەك و کۆمەڵگای مەدەنی لەلایەکی ترەوە بێت، شتێکی بەرزتر لە دەوڵەت لە روانگەی سوودگەراییەوە نییە. وەها تێگەیشتنێك بۆ دەوڵەت لەگەڵ تێڕوانینی میکانیستی دەربارەی دەوڵەت لە پەیوەندیدایە نەك لەگەڵ تێڕوانینی ئۆرگانیستیی هیگڵ. هیگڵ جیاوازی دادەنێت لە نێوان سیستەمی پێداویستییەکان کە مامەڵە لەگەڵ بەرهەمهێناوەی ژیان ماددی دەکات و سیستەمی دادپەروەری و بنەرەتەکان کە تاکە لێك جوداکان بە مەبەستگەلێکی هاوبەشەوە بەیەکەوە دەبەستێتەوە[٣٩]. بە بۆچوونی هیگڵ تێکرووخانی وێنای رۆشنگەری بۆ سوودمەندی دەگەڕێتەوە بۆ دژواری ئەم سیستەمە هزرییە لە گونجاندنی قازانجی تاکەکان لەگەڵ ویستی گشتی[٤٠]. هیگڵ خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی هەریەك بە خولەکێك لە چەمکی دەوڵەت دادەنێت کە دەبێت لە چوارچێوەی سیستەمی دیالێکتیکیی هیگڵدا لە پەیوەندییەکەیان تێبگەین.

جیاوازی سەرەکی هیگڵ و بێنتهام لەوەدایە کە بێنتهام ئامانجە گشتییەکان وەکو ئامرازێك بۆ گەیشتن بە مەبەستی تایبەتیی خوازراو لەقەڵەمدەدات نەك لەبەر خۆیان. هەروەك بینیمان بێنتهام باشەی گشتیی بەکۆی ژمارەیی باشەی تایبەتی تاکەکان و ئامرازێك لە رێگەی باشەی تایبەتی هەڵدەسەنگاند. بەلاّم هیگڵ رەسەنی دەبەخشێتە مەبەستە گشتییەکان و لەوانەش شتگەلێکی وەکو دادپەروەری یان فۆرمێکی رێکیی کۆمەڵایەتی یاخود شوناس و شکۆمەندی نەتەوەیی. مرۆڤەکان خاوەن مەبەستگەلێکی گشتین و هەوڵ بۆ چاکسازکردنی دامەزراوە و بەهاکان دەدەن، چونکە بەبێ لەبەرچاوگرتنی پاڵنەری قازانجی تایبەتی لەناوخۆیاندا بە خوازراو یان نەخوازراو لەقەڵەمیاندەدەن. لە هەموو کۆمەڵگاکاندا هەم مەبەستە تایبەتییەکان و هەم مەبەستە گشتییەکان بوونیان هەیە کە هەریەکەیان لەپێناو خۆیانی کاریان بۆ دەکرێت. بڕوای هیگڵ وایە کە لە کۆمەڵگایەکی سیاسیی عەقلانیدا ئەم مەبەستە تایبەتی و گشتیانە تووشی ناکۆکی و نەگونجان نایەن لەگەڵ یەکتردا. لە کۆمەڵگای پێکهاتوو لە مرۆڤە خاوەن عەقڵ و ئازادەکان واتە لە دەوڵەتی عەقلانیدا هەماهەنگی لەنێوان مەبەستە تایبەتی و گشتییەکاندا هەیە. لەم حاڵەتەدایە کە ناوەڕۆکی زاتیی دەوڵەت دەچێتە باری کردەییەوە[٤١].

39- Hegel, System Ethical Life trans. T. M. Knox, Albany, State University of New York press 1979, 147-156.
40- James Schmidt, op. cit.
٤١- جان پلامناتز، پێشوو، ل٢١٩.

لە کۆمەڵگای جێ مەبەستی سوودگەرایی ڕەنگە تاکەکان لەگەڵ یەکتر ڕکەبەری و یاخود بەپێچەوانەوە هاوکاری لە نێوانیاندا هەبێت، بەڵام لە هەموو کاتێکدا ئەم کارە بۆ قازانجی خۆیان ئەنجامدەدەن. بە بۆچوونی بیرمەندانی سوودگەرایی ئەو شتەی کە باشە تایبەتییە. هیگڵ وێڕای ئەوەی کە ڕکەبەری و هاوکاریی نێو کۆمەڵگای مەدەنی قبوڵدەکات بەڵام بڕوای وایە کە مرۆڤەکان بە ژیانیان لەناو کۆمەڵگای مەدەنی لە هەمانکاتدا بەهاکانی دەوڵەتیش دەرك پێدەکەن. هاوکاری لە بەرەو پێشبردنی قازانجی تایبەتی و گەڕان بەدوای قازانجی تایبەتی لە هەمان کاتدا بەهای هاوکاری لەبەرخودی هاوکاریمان پێ فێر دەکات. ئەو پێداویستییانەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا بۆ ئێمە دروستدەبن زیاتر لە پێداویستییە سروشتییەکان ئێمە لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ کۆمەڵگادا بەیەکەوە دەبەستێتەوە. لێرەدا پێوەرگەلێك دەربارەی فەزیلەت بەدەستدەهێنین کە لە ناوەرۆکی ویستی گشتییەوە نزیکترە. هەروەها هیگڵ بە پێچەوانەی کانتەوە فەزیلەت لە بەرامبەر ڕێساکان و ئەرکە بینراوەکان دانانێت. بەپێچەوانەی ئەم وێناییەوە بڕوای وایە کە لە فەزیلەت بەواتای ڕاستەقینەی فەزیلەتەکان کەسێتییەکی هۆشەکی لەگەڵ ڕێساکاندا هەماهەنگ دەبێت[42]. بەهەمان شێوە هیگڵ بە پێچەوانەی ڕۆسۆ ژیانی سادە بە ژیانی سروشتی دانانێت بەڵکو بڕوای وایە کە سروشتی مرۆڤ لەوەدایە بەردەوام تواناکانی خۆی گەشەپێبدا و بیگەیەنێتە بەرزترین پلە.

بەپێی ئەوەی تائێرە باسکرا و ئەو ڕوونکردنەوانەی کە بەدوای ئەم باسەدا دێن تاڕادەیەك دەکرێت تیۆری دەوڵەتی هیگڵ بەم شێوەیە کورت بکرێتەوە:

١- مێژوو پرۆسەیەکی کامڵبوونییە کە تیایدا مرۆڤ لە ئازادی شاراوەوە دەگاتە ئازادی کردەیی و خودئاگایی ئازادی.

٢- دەوڵەت بەرزترین دەرکەوتنی گیان (عەقڵ)ە لە مێژوودا و لوتکەی پرۆسەیەکی دوورودرێژە کە لە سەرەتای شارستانیەتی مرۆڤەوە دەستیپێکردووە و بەردەوام هەتا دروستکردنی دەوڵەتێکی عەقڵانی بەرەو پێشەوە هەنگاو دەنێت.

٣- مەبەستی عەقڵ (گیان) لە ڕێڕەوی مێژوودا ئەوەیە کە بە ناسینی خۆی بگات و دەبێت بۆ ئەم کارەیش کۆمەڵگایەکی عەقڵانی دروستببێت.

42- Andrew Buchwalter, "Hegel's Concept of Virtue" Political Theory, vol. 20, No 4, Novmeber 1992, p. 548-583.






٤- دەوڵەتی دەرەکی سەنتێزێکە لە ڕوویەکی بەرزی خێزان و کۆمەڵگای مەدەنییە کە بۆخۆی لە پێداویستییە ناوەکی و دەرەکییەکانی مرۆڤەوە هەڵقوڵاوە.

٥- لە دەوڵەتی نوێدا کە سەرئەنجام مرۆڤ لەدوای بڕینی قۆناغگەلێکی یەك لەدوای یەك دەوڵەتێکی عەقڵانی لەسەربنەمای بەشداری گشتی و هەمووانی دروستدەکات لە ئەنجامدا مرۆڤ بە ئازادی ڕەها و هۆشیاری ئازادی دەگات.

بەم شێوەیە ئازادی ڕەهای مرۆڤ کە لە تیۆرەکەی هۆبزدا لە باری سروشتی و بەر لە پێکهێنانی دەوڵەت بوونی هەیە، لە تیۆرەکەی هیگڵدا دەکەوێتە کۆتایی پێشکەوتنی کامڵبوون و عەقڵانیی مرۆڤەوە.

## دەوڵەتی ئەخلاقی و دەوڵەتی عەقڵانی

هیگڵ بە سێ واتا وشەی دەوڵەت بەکاردەبات کە لە ڕاستیدا سێ ڕوویەك ڕاستین. ئەم سێ واتایە بریتین لە: ١- دەوڵەتی دەرەکی ٢- دەوڵەتی سیاسی ٣- دەوڵەتی ئەخلاقی. چەمکی دەوڵەتی ئەخلاقی کامڵترین واتای دەوڵەت و لەخۆگری دووروەکەی ترە. مەبەست لە دەوڵەتی دەرەکی کۆمەڵێکە لە ڕێکیی و یاساکان کە بەراست سەری کۆمەڵگای مەدەنی واتە شوێنی بەدواداگەڕانی قازانجی کەسی و ڕکەبەری و بازرگانییەوەیە، بەڵام لەڕاستیدا دەوڵەتی سیاسی تێڕوانینی بۆ دەوڵەت لە ڕوانگەی دامەزراوە تایبەتە حکومییەکان و سیستەمی دەسەڵاتەوەیە. سەرئەنجام دەوڵەتی ئەخلاقی دەوڵەتە لەوکاتەی کە هاوڵاتیان واتای ئەخلاقیی دامەزراوە پێکهاتەی دەوڵەت دەستنیشاندەکەن و لێی تێدەگەن. لە دەوڵەت بەواتا ئەخلاقییەکەی مرۆڤ دەگاتە لوتکەی کامڵبوونی مێژوویی. بەبڕوای هیگڵ دەوڵەت بریتی نییە لە کۆمەڵێك لە یاساکان و ڕێسا سەربەخۆ و جیا لە حەز و خواستە کردەییەکانی هاوڵاتییان. هەروەها دەوڵەت نوێنەری کۆن قازانجی ناو کۆمەڵگا (بەو جۆرەی کە سوودگەرایی مەبەستێتی) نییە. دەوڵەت دامەزراوەیەکی ئەخلاقییە کە لە چوارچێوەی یاساکان و دامەزراوە سیاسییەکاندا حەز و خواستی تاکەکانیشی لەخۆگرتووە. دەوڵەت تەنها لە واتا ئەخلاقییەکەیدا لەخۆگری ویستی عەقڵانی و لە ئاست سروشتی مرۆییدایە. ڕەنگە تاك و دەوڵەت سەرگەرم و

سەرقاڵی کاروباری ئەم جیهانیانە بن بەڵام لە هەمان کاتدا گواستەرەوەی عەقڵێکی جیهانی و گیانی ڕەهان[٤٣].

ئەوەی بیرمەندانی سوودگەرایی دەربارەی دەوڵەت باسی لێوەدەکەن شتێکی هاوسنوور و هاوئاستی کۆمەڵگای مەدەنیی نێو تیۆرەکەی هیگڵە. لە تیۆرەکەی هیگڵدا کۆمەڵگای مەدەنی جۆرێك دەوڵەت نییە بەڵکو خولەکێکە لە چەمکی دەوڵەت. هیگڵ دەڵێت مرۆڤەکان بەبێ ئەوەی خودئاگا بن لە مەرام و حەزە تایبەتییەکانی خۆیاندا سنووردار نابن بەڵکو لە عەقڵانیەتی دنیای ڕاستەقینەدا نوقم دەبن و لە کردار و بیرکردنەوە و بارودۆخەکانی خۆیاندا دەیخەنەوەڕوو. هیگڵ جەختدەکاتەوە کە نابێت دەوڵەت لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنی یان بەواتایەکی تر لەگەڵ ئابووری ئازاددا تێکەڵ بە یەك بکرێن. ((ئەگەر دەوڵەت لەگەڵ کۆمەڵگای مەدەنیدا تێکەڵ بە یەك بکرێن و ئەگەر مەبەستی تایبەتیی ئەو بە ئاسایشی موڵکداری تایبەتی و ئازادی کەسی لەقەڵەمبدرێت، لەو حاڵەتەدا قازانج و حەز و خواستی تاکەکان بۆخۆیان وەکو مەبەستی کۆتایی کۆبوونەوەیان لەقەڵەمدەدرێن))[٤٤].

ئێمە بەداب و نەریت و یاسا و دامەزراوگەلێك پەروەردە دەبین کە پێماندەڵێت ئەرکەکانی ئێمە چییە. کارکردن بەپێی خواستەکانی ئەم نەریت و ڕێسایانە دەگۆڕێت بۆ سروشتی دووەمی ئێمە. لەڕاستیدا دەگۆڕێن بۆ شتێك کە بەڕاستی ئێمە خوازیاری ئەوین[٤٥]. بەم شێوەیە لەلایەکەوە ئەمانە ڕەنگدانەوەی بنەڕەتە ئەخلاقییەکانن و لەلایەکی ترەوە ئاوێتە بوونە لەگەڵ هەستکردنەکانی ئێمەدا.

## کۆمەڵگا بەرزترین پێگەی دیارکەوتنی ئەخلاق

بەپێی بۆچوونی هیگڵ بەرزترین و کاملترین ژیانی ئەخلاقی تەنها ژیانێکە کە وەکو ئەندامی کۆمەڵگا دەتوانین بەدەستی بهێنین. ئەم تێڕوانینەی هیگڵ لە تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتیی دامەزراو لەسەرمافی سروشتی (هۆبز و لۆك) و ڕوانگەی سوودگەرایی سەبارەت بە کۆمەڵگا وەکو ((ئامراز))ی گەیشتن بە خۆشی گشتی زیاتر بەرەو پێشەوەمان دەبات. چونکە ئەو دەوڵەتەی کە لەسەربنەمای ئەم دوو کۆمەڵەی بیرە (دەوڵەتی دامەزراو لەسەر ماف

43- W. F. Hegel, Philosophy of Right, op. cit. 222, sect 359.

٤٤- اندرو وینسنت، پێشوو، ل٢٠٩.

45- Mark Tunick "Art there Natural Right?: Hegel's Break With kant" in Hegel on Modern World, ed, Ardis Collins, Albany, State University of New York 1994






و دەوڵەتی دامەزراو لەسەر قازانج)، ناتوانێت پێگەی پەیماندانە سەربەخۆکان بێت، ئەم دوو جۆرەی دەوڵەت پەیوەستن بە پەیماندانە ئەخلاقییە پێشینەکان یان پێشوەخت ئامادەکان واتە مەرجی پابەندبوون بە پەیمان هەتا دەستەبەربوونی زۆرترین خۆشبەختی بۆ زۆرترین ژمارە. تیۆرەکەی هیگڵ کە ژیانی ئەخلاقی لەسەر لوتکەی ژیان دادەنێت لەخۆگری وێنەیەکی کۆمەڵگایە وەکو ژیانێکی کۆمەڵایەتی بەرفراوانتر کە تاك وەکو ئەندامێك بەشداری تیادا دەکات. کۆمەڵگا یەکێکە لە دیارکەوتن و بەرجەستەبوونەکانی گیان. تیایدا گیان بەشێوەیەکی کاملتر و جەوهەری تر بەرجەستەبووە.

ئەو بیرەی کە ژیانی بینراو بە لە پێشتر دادەنێت لە تاك بووەتە سەرچاوەی بەدحاڵیبوونێکی زۆر دەربارەی فەلسەفەی هیگڵ و ڕەخنەگەلێکی زۆر سەبارەت بەو. بۆ نموونە یەکێك لەو بەدحاڵیبوونانە بریتییە لە تۆمەتبارکردنی هیگڵ بە فاشیزم و دەوڵەتگەرایی. ئەم تۆمەتانە لە تێگەیشتنگەلێکی نادروست بۆ تیۆر و تێڕوانینی هیگڵ سەرچاوەی گرتووە. هیگڵ کۆمەڵگا و دەوڵەت بە جەوهەری تاکەکان دادەنێت و مەبەستیشی ئەوەیە کە تاکەکان تەنها لە پێوەندبوون لەگەڵ کۆمەڵگادا گۆڕاون بۆ ئەوەی کە ئێستا هەن، لە هەڵسەنگاندنی سوودگەراییدا ئەو وێنایە لە بناغەوە بە نادروست دەزانێت کە دەوڵەت بە ئامراز و هاوڵاتیان بە ئامانج لەقەڵەمدەدات و دەڵێت کە لێرەدا خستنەڕووی بابەتی ئامانج و ئامراز کارێکی بێ واتایە. دەوڵەت و هاوڵاتیان پێکەوە ژیانێکی ئۆرگانیکی پێکدەهێنن و کۆمەڵگا نەك تەنها بونەوەرێکی ئۆرگانیکی بەڵکو بوونەوەرێکیە خودئاگایشە. هەڵبەتە ئەم خودئاگایە وەکو خودئاگایی تاك نییە بەڵکو دەبێت وەکو چەمکێکی فەلسەفی لێی تێبگەین[٤٦].

هیگڵ دەڵێت تاك بەشێکە لە گیانێکی گەورەتر، مەبەست لە گیانێکی گەورەتر چییە؟ ئێمە کاتێك کە باس لە مرۆڤ دەکەین مەبەستمان تەنها ئاماژەکردن نییە بە بوونەوەرێکی زیندوو وەکو ئۆرگانیزمێك، بەڵکو ئاماژە بە مرۆڤێك دەکەین کە دەتوانێت هەستبکات و بیربکاتەوە و بڕیار بدات و پەیوەندی دروستبکات لەگەڵ کەسانی تردا. هەموو ئەمانە پێویستی بە میدیایەکی وەکو زمان هەیە. زمان ئامرازێکە بۆ تاقیکردنەوەی جیهان و ڕوونکردنەوەی هەستکردنی خود و تێگەیشتنی پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی و دروستکردنی پەیوەندی لەگەڵ ڕابردوو. زمان ئامرازێکە کە بە ئەو خۆمان دەخەینە ناو دنیای کەلتورییەوە و

46- Charles Taylor, op. cit, p. 380.

شوناسی خۆمان دیاریدەکەین، بەڵام زمان شتێکە کە تەنها لە کۆمەڵگادا دەتوانێت دروستبێت و تەنها کۆمەڵگا دەتوانێت خاوەن زمان بێت. لە تیۆرەکانی رۆسۆشدا ئەمەمان بەرچاوکەوت. هیگڵ دەڵێت ئێمە تەنها کاتێك وەکو بوونەوەری مرۆیی دەناسرێین کە لە کۆمەڵگایەکی کەلتووریدا بژیین. کەوابوو زمان و ژیانی کەلتووری پەیوەستە بە ناوەندێکی گەورەتر لە تاك. زمان لە کۆمەڵگادا دروستدەبێت. تاك لەگەڵ کەلتووری کۆمەڵگادا پەیوەندی دروستدەکات بەم جۆرە دەبێتە خاوەنی شوناس. هەموو پێشکەوتنێکی تاك تەنها لە پەیوەندی لەگەڵ کۆمەڵدا بەرهەمدێت. گیانی تاکەکەسی گیانێکی ناتەواوە.

کاتێك کە دەڵێین زمان تەنها دەتوانێت هی کۆمەڵگا بێت مەبەستمان ئاماژەکردن نییە بەو راستییەی کە زمان میدیاییەکی[٤٧] پەیوەندییە بە واتایەی کە ئەزموونەکانی ئێمە بە تەواوی تایبەتین و ئێمە تەنها پێویستمان بە میدیایەکی گشتی هەیە تاوەکو لەگەڵ یەکتردا پەیوەندی دروستبکەین و ئەزموونەکانی خۆمان لەگەڵ یەکتردا بگۆڕینەوە. راستییەکەی ئەوەیە کە لە روویەکەوە ئەزموونەکانی ئێمە لە لێکدانەوەی ئێمە بۆ رووداوەکان دروستدەبن و ئەمە تاڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بەو زەمینە و شوێنگەیەی کە لە کەلتووری ئێمەدا هەیە. زۆرێك لە ئەزموونەکانی ئێمە لە دەرەوەی کۆمەڵگا بە تەواوی مەحاڵە، چونکە لە بنەڕەتدا پەیوەستە بە چوارچێوەگەلێك کە بە تەواوی کۆمەڵایەتین وەکو بەشداریکردن لە مەراسیمەکان و بەشداریکردن لە ژیانی سیاسی و لایەنگیری کردن لەسەرکەوتنی هەڵبژاردەی نیشتمانی و لەم جۆرە[٤٨]. ئێمە دەتوانین نەریت و دامەزراوەکانی ناو کۆمەڵگا وەکو زمانێك تەماشابکەین کە لە رێگەیانەوە بیرگەلێکی بنەڕەتی دەردەبڕین. ئەم بیرانە ناتوانن تەنها لە هۆشی تاکەکاندا هەبن، بەڵکو میراتی هاوبەشی کۆمەڵگایە. بەواتایەك دەتوانین بڵێین گیانی کۆمەڵگا لەمانەدا هاتوەتە دیارکەوتن. هیگڵ ئەمانە بە ((گیانی دیارکەوتوو)) ناودەبات. ئەمانە ژیانی گشتیی کۆمەڵگایەك دروستدەکەن. تاکیش بەرجەستەبوونی گیانە، بەڵام بەم شێوەیەکی گشتی بەرجەستەبوونێکی لاوازتری گیانە. بەگشتی بەرجەستەبوونی گیان لە دەوڵەتدا (نەك بەشێوەیەکی رەها) کامڵترە، کاتێك کە بەرجەستەبوونی گیان لە تاکدا لاوازە رەنگە تاك پەیڕەوی لە غەریزە خاو و ئاژەڵییەکان بکات. ئەگەر گیان لە تاکدا لەباری نوستوودا مابێتەوە لەم حاڵەتەدا تاك لە ئازادییەوە دوورە و کۆیلەی ئارەزووەکانە، گیانی تاك تەنها کاتێك کە

47- Medium.
48- Charles Taylor, op. cit, p. 381.






هەوڵدەدات خۆی لەگەڵ گیان یان عەقڵی گشتیدا هاوجۆر بکات پەیڕەوی لە ویستی راستەقینەی خۆی کردووە. کەواتە کاتێك کە توانیتی کار بە ویستی راستەقینەی خۆی بکات و لە مەبەستەکانی گیان تێبگات و هاورێبوون لەگەڵ ئەو بکاتە مەبەستی خۆی ئەوکات ئازادە. بەم پێیە ئازادی بە واتای خۆویستبوون نییە لە هەڵبژاردنی نائاگایانەدا. ئازادی واتە ویستنی ئەو شتەی کە عەقلانییە.

بەڵام مرۆڤ چۆن ویستی راستەقینەی خۆی بناسێت؟ چۆن خۆی لە داوی قازانجە خۆپەرستانەکان کە بەرەو هەڵدێری دەبەن رزگار بکات؟ هیگڵ فێرماندەکات کە گیانی راستەقینەی تاکەکان لە یاساکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان و دەوڵەتدا رەنگی داوەتەوە. بۆیە لەو کاتەی کە تاك پەیڕەوی لە یاساکانی کۆمەڵگای سیاسی دەکات دەکرێت بوترێ پەیڕەوی لە گیانی راستەقینەی خۆی کردووە.

## ملکەچی کردن و ملکەچی نەکردن

هەندێك لە راڤەکاران وەها ئەنجامگیریان لەو وتەیەی سەرەوە کردووە کە فەلسەفەی سیاسیی هیگڵ لە خۆگری ملکەچی کردنێکی سیاسیی بێبەند و مەرج و بێ چۆن و بۆیە. ئەم راڤەکارانە وتویانە هیگڵ هیچ یاساییەکی بە شێوەیەکی رەهای متمانەپێکراوی قبووڵنییە کە بکرێت بە پەنابردن بۆی مافی ملکەچی نەکردن بە هاوڵاتی بدرێت و وەها مافێك وەکو مافێکی ئەبستراکت لێکدەداتەوە و رەتی دەکاتەوە[٤٩]. بۆ نموونە یەکێك لە راڤەکاران دەڵێت کە فۆرمالیزمی هەستکردن و خودئاگایی نێو تیۆرەکەی هیگڵ لە خۆگری قبووڵکردنی ناوەڕۆکی هەموو ئەو شتانەیە کە داب و نەریتەکان لەسەردەمێکی دیاریکراودا لە خۆیانی دەگرێت[٥٠].

بەڵام زۆرێك لەو راڤەکارانەی کە بە وردییەوە لە فەلسەفەی هیگڵیان کۆڵیوەتەوە ئەم تێگەیشتنانە قبووڵناکەن. ئەم کۆمەڵەی لێکۆڵەران دەڵێن راستە کە هیگڵ جەخت لەسەر ئەو داب و نەریتانە دەکاتەوە کە هەن و بڕوای وایە کە دەبێت ئەمانە وەکو دیاردەگەلێکی پایەدار تەماشا بکرێن کە ئێمە لە رێگەی ئەوانە بە کۆمەڵایەتی دەبین، بەڵام هیگڵ خوازیاری

49- Carol Pateman, The Problem of Political Obligation, Berkeley, University of California press, 1985, 104-105.
50- Patrick Riley, Will and Political legitimacy, Cambridge, Harvard University Press, 1982, p. 187.

قبوولکردنی بێ بیر لێکردنەوە و تێڕامانی یاسا نییە. ئێمە دەبێت عەقلانیەتی یاسامان پێ قبوولبێت و بڕوامان بەرەوابوونی هەبێت. هیگڵ بایەخێکی زۆر بە سەرچاوەبوونی داب و نەریتەکان و دەسەلاتی دەوڵەت دەدات. بەلام لە بەرامبەر دەوڵەتێکی نادادپەروەردا تاك بەدەست بەستراوە لە ئاست هەموو مافێکی بەرگریکردن بەجێ ناهێڵێت. لە تیۆرەکەی هیگڵدا ئێمە ئەرکدارین کە ملکەچی لە یاساکانی دەوڵەت بکەین، بەلام بەو مەرجەی کە یاساکانی دەوڵەت جەوهەری ئەخلاقیی ئێمە بێت. هیگڵ ملکەچی نەکردنی پاسا و بۆ هێنراوە قبوولناکات و دەڵێت کە ئەو نایەکسانییەی کۆمەڵگای مەدەنی کە هەیە بەهای ئەرکی چینێکی بەرفراوانی خەڵکی هەژار دەخاتەژێر پرسیارەوە. نابێت جەختکردنەوەی هیگڵ لەسەر گرنگی تێگەیشتن و داب و نەریتەکان لەگەڵ کۆنسێر ڤاتیڤی ناعەقلانی تێکەڵ بەیەك بکرێن[51].

هەروەها دیار نییە کە دەوڵەتی کردەیی هەمیشە لە ئاستێکی ئایدیالیدا بێت. هەرچی زۆرتر یاسا لەگەڵ بەرژەوەندی یاخود باشەی راستەقینەی تەواوی کۆمەڵگا نەگونجاو بێت. لەم حاڵەتەدا ملکەچی نەکردنی مەدەنی بەناوی باشەی هەمووان نەك باشەی کەسیی شتێکی پاساو هەڵگرە. لەم حاڵەتەدا دەبێت سەرپێچی لە یاساکان بکرێت. هەڵبەتە دەبێت بەردەوام ئەو خاڵە لەبەرچاو بگیرێت کە نەبادا سەرپێچیکردن لە یاسایەکی نادروست بەخراپەیەکی خراپتری وەکو پاشاگەردانی کۆتایی بێت، بناغەی ئەخلاقیی ئەرکی سیاسی وەها واتایەکی نییە کە ملکەچی نەکردن بەهیچ شێوەیەك پاساو هەڵناگرێت[52]. پەیوەندی نێوان تاك و دەوڵەت پەیوەندییەکی دیالێکتیکییە. دەوڵەت هاوکاری مرۆڤ دەکات تاوەکو خۆی بێنێتەدی، بەلام لەولایشەوە کاملبوونی دەوڵەتیش پەیوەستە بەوەدیهاتنی تاکەوە. دەوڵەت بۆ ئازادیی مرۆڤ پێویستە، بە هەمان ئەو شێوەیەی کە مرۆڤی ئازاد بۆ کاملکردنی دەوڵەت پێویستە.

هەڵبەتە وەها پەیوەندییەکی بەناچاری لەگەڵ کۆمەڵگا و کەلتووری کۆمەڵگا ئەگەری دیارکەوتنی نامۆبوون لەبار نابات. نامۆبوون کاتێك دێتە پێش کە ئەزموونە کۆمەلایەتییەکانی کۆمەڵگا بێ واتابن لای ئێمە. کاتێك کە ئامانجەکان و رێساکان یان ئەو مەبەستانەی کە دامەزراوە و کردارەکان دەناسێنن وردە وردە بەنابەجێ و دێو ئاسا بێنەبەرچاو

---

51- Jacques D. Hondi, Hegel in His Time Trans. John Burbrige et al, Peterborough, Ontario, Broad viw, 1988.

٥٢- فردریك کاپلستون، تاریخ فلسفه، جلد هشتم: از بنتام تاراسل، ترجمه. بهاءالدین خرمشاهی، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی و سروش، ١٣٧٦، ل١٩٧.





نامۆ بۆ سەرهەڵدەدات. ئەو شتەی کە لەم گردبوونەوەیەوە سەرهەڵدەدات ئەوەیە کە ئیدی تاك بەشێوەیەکی بنەڕەتی شوناسی خۆی بە ئەزموونە کۆمەڵیەکانی کۆمەڵگا پێناسە ناکات. لەم حاڵەتەدا ئەو ئەزموونەی کە بۆ ئەو بە سەرەکی تر و واتادارتر دێتە پێش چاو بۆ چوارچێوەی تایبەتی پاشەکشە دەکات و ئەزموونە گشتییەکان لای ئەو پایەیەکی پلە دوو یان بێ بایەخ وەردەگرن کە تەنها لەگەڵ بەشێکی بچووکی حەز و ئارەزووەکانی ئەو لە پەیوەندیدا دەبێت. دەکرێت سەرەتای ئەم پرۆسەیە وەکو نموونەیەك بگەڕێندرێتەوە بۆ رووداوی داروخانی دەوڵەتشارەکانی یۆنان. لە دەوڵەتشارەکانی یۆناندا مرۆڤ خۆی لەگەڵ ژیانی گشتیدا لە وەك یەکبوون و یەکێتی تەواودا دەبینی. تاك شوناسی خۆی دەبەستەوە بە دەوڵەتشارەوە. بەها بناغەییەکانی هاولاتیان بەهاگەلێك بوون کە لە ژیانی گشتیدا رەنگیاندەدایەوە. لەگەڵ ئەمەشدا هیگڵ ئەم پەیوەندەیەی بە ئایدیالی و کۆتایی دانەدەنا. یەکبوونی ناو دەوڵەتشارە کۆنەکان یەکبوونێك نییە کە لە پێوەندی هۆشیارانەی لایەنی گشتی و لایەنی تایبەتییەوە بەرهەمهاتبێت. بۆ ئەوەی یەکبوونی هۆشیارانە بەرهەمبێت دەبێت گیان سەرەتا قۆناغی لەخۆ نامۆبوون تێبپەرێنێت. لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمدا کە قۆناغی نامۆبوونی لە بەشێکی پرۆسەی مێژوودا یەکبوونی گشت و تایبەت لە جیهانی راستەقینەوە بۆ جیهانی بالای ئاسمان گواسترایەوە. لەم قۆناغەدا هەستکردنێك بلاوەیکرد کە هیگڵ بەهەستکردنی ناخۆشبەخت ناوی دەبات. مەسیحیەت لەودیوی کۆمەڵگای سیاسییەوە بەدوای ئایدیالەکانی خۆیدا دەگەڕا. لە مەسیحییەتدا کەماڵی ئەخلاقی دەکەوتە دەرەوەی سنووری ژیانی سیاسییەوە. بەم شێوەیە هیگڵ پێی وایە مەسیحییەت هاندەری مەزهەبی تایبەتی و پەیوەندی کەسییە لەگەڵ خوادا و باوەڕی تاکەکەسیی بە لەپێشتر داناوە.

لە روانگەی هیگڵەوە خودا نەك مەزن و بالا بەڵکو لە فۆرمە مێژوویی و سیاسییەکاندا تواوەتەوە و دامەزراوە سیاسییەکان بە دەرکەوتنی جۆراوجۆری خودا لەقەڵەمدەدرێن. لە راستیدا کاتێك کە تاکەکان بەشداری لەم دامەزراوانەدا دەکەن وەك بڵێی بەشداریان لە وەدیهێنانی خوادا کردووە. لە دیالێکتیکی هیگڵدا ژیانی کۆمەلایەتی یۆنان گشتبوونەوە مەسیحیەت پاژبوون و دەوڵەتی ئەخلاقیش یەکبوونی هەردووکیانە و لەخۆگری گشتی و پاژیی هەردووکیانە. هەستی ناخۆشبەختیی مەسیحیەت لەسەردەمی رێنیسانس و سەردەمی نوێدا بۆ قۆناغی عەقڵ گەشەی پێدەدرێت و لەگەڵ رێنیسانس و سەردەمی نوێدا سەردەمی عەقڵ دەستپێدەکات. و ئێستا ئیدی هەستکردن نایەوێت تاك لە دنیای راستەقینە جیابکاتەوە. ئیدی

مرۆڤ کاری بەدەستپێك و گەڕانەوە نییە و دەیەوێت لەم جیهانەدا خۆی بدۆزێتەوە و حەز بە ناسینی ئەم جیهانە دەکات و دەیەوێت بیخاتەژێر دەسەلأت و زاڵبوونی خۆیەوە[٥٣].

## ئازادی و سەردەمی عەقڵانیەت

لەسەردەمی نوێدا هەستکردنی مرۆڤ سەبارەت بەخۆی بە ئاستێکی گەشەکردن گەیشتووە کە دەبێت چارەنووسی خۆی بگرێتە دەست و ببێتە بڕیاردەری ژیانی خۆی. بەپێی تیۆرەکەی هیگڵ دەوڵەت ئامرازێکە بۆ پەرەپێدانی ئازادی و مرۆڤ تەنها لە دەوڵەتدا دەتوانێت بە ئازادی بگات. بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان بەبیری ئوتۆمیزمی و هەموو جۆرە تیۆرە لیبراڵییەکانەوە گرتووە وەها حوکمێك زۆر سەیر دێتە پێش چاو، چونکە بەوەها تێگەیشتنێك ئەگەر نەیشڵێین دەوڵەت بەشێك لە ئازادییەکانمان سنووردار دەکات بەلای کەمەوە ناتوانین بە بەرجەستەبوونی هەمەلایەنەی ئازادی لەقەڵەمیبدەین. بۆ تێگەیشتنی تیۆرەکەی هیگڵ پێویستە دیکترینی ئازادیی ناوبراو بەوردبوونەوەرێکی زیاترەوە بخەینە بەر خوێندنەوە.

هەروەك بینیمان هیگڵ کامڵبوونی مێژووی مرۆڤی وەکو کامڵبوونی گیان یان عەقڵ لەقەڵەمدەدا و بڕوای وایە کە گیان دیارکەوتنی تەواوی خۆی لە دەوڵەتی تەواودا بەدەستدەهێنێت. دەوڵەتی تەواو هەمان دەوڵەتی نوێیە کە بەپێی ئەوەی باسمانکرد لەرووی پلەی کامڵبوونەوە لە دەوڵەتەکانی پێشووتر جیاوازە. دەوڵەتی تەواو، دەوڵەتێکی بەراستی ئازادە و ئەو هاوڵاتییانەی کە پەیڕەوی لە یاساکانی دەوڵەتی تەواودەکەن ئازادی تەواویان هەیە. مرۆڤ وەکو بوونەوەرێکی خاوەن عەقڵ و خودئاگا وایە کە دەتوانێت هۆشیارانە بڕیار بدات. مرۆڤ لەم پایەیەدا ئازادی بە باڵاترین بەها دەبینێتەوە و ئەمەیش تەنها لە دەوڵەتدا دەکرێت بەدەستبهێنرێت. هیگڵ لەرووی ((ویستی بینراو))ەوە دەوڵەت پێناسە دەکات و ئازادی بە ویستێك لێکدەداتەوە کە خوازیاری خۆیەتی. ئەو ئازادییە یان ویستەی کە خوازیاری خۆیەتی لە دەوڵەتدا دێتەدی، هەرچەندە کە پێویستە جارێکی تر بە جیاواز لەم تێگەیشتنە لەگەڵ تێگەیشتنە لیبراڵی و سوودگەراییەکان بڕوانین.

مەبەست لە پێناسەکردنی دەوڵەت بەپێی ویستی بینراو ئەوەیە کە مرۆڤەکان هۆشیارانە بۆ بەدەستهێنان و پارێزگاریکردن لە ئازادی دەوڵەت دروستدەکەن. بەپێی ئەوەی کە هیگڵ باسی

٥٣- ژ. هیپولیت، پێشوو، ل ٩٢.





لێوە دەکات مرۆڤەکان لە قۆناغێکی دیاریکراوی کامڵبوونی گیان وەکو ئەندامانی کۆمەڵ و پەیوەست بە سیستەمێکی سیاسی و ئەخلاقیی دیاریکراو وێنایەك بۆ ئازادی بەدەستدەهێنن و خوازیاری دەبن. راستە کە گیان تەنها لە هۆشە کۆتاییدارەکانی تاکەکاندا بوونی هەیە بەلأم واتای ئەم وتەیە ئەوە نییە کە مرۆڤ بەردەوام لە هەموو قۆناغەکانی مێژووی جیهاندا بەشێوەیەکی ئاگایانە خۆی دروستدەکات. مرۆڤەکان بە کارەکانیان ژینگەی کۆمەلأیەتی دروستدەکەن و لە میانەی ئەم پرۆسەیەدا خۆشیان دەگۆڕن و دەگۆڕێن بۆ بوونەوەرگەلێکی خاوەن عەقڵ.

پەیوەندییەکی لۆژیکی هەیە لە نێوان خودئاگایی و عەقلأنیەتی مرۆڤ. مرۆڤ وەکو بوونەوەرێك کە بە توانایە لە ئاست بەراوردکردن و ئەبستراکت و چەمك سازیدا دەتوانێت جیاوازی لە نێوان خۆی و ئەو شتەی کە سەبارەت بەو دەرەکییە دابنێت. مرۆڤ وەکو بوونەوەرێك کە خاوەن حەزگەلێکە بە ئاگایە لە خۆی و بەهەمان شێوە ئاگایە لەوەی کەسانێکی تریش هەن کە هەمان جۆر حەز و ئارەزووگەلیان هەیە و خوازیاری تێرکردنیانن. ئەم کارە بە پێچەوانەی وێنای بیرمەندانی سوودگەرایی شتێکی زیاترە لە چاوپۆشیکردن لەو شتانەی کە ناتوانێت بەدەستی بێنێت یان قبووڵکردنی ڕێساگەلێکە کە لەبەر خەڵکانی تر ئەو سنووردار دەکەن. بە بۆچوونی هیگڵ ئەم کارە پێویستی بە قبووڵکردنی ڕێساگەلێك بە ویستی ناخ و خواستی بەرژەوەندی گشتی و بنەڕەتگەلێکی ئەخلاق هەیە لە پێناو خودی ئەو بنەڕەت و بەرژەوەندییانە (نەك بەپێی تێڕوانینی سوودگەرایی وەکو ئامرازێك بۆ مەبەستگەلێکی تر).

ئەو کەسەی کە لە پێناو قازانجی خۆی ڕێز لە یاسا دەگرێت ڕەنگە بەم واتایە عەقلأنی هەڵسوکەوت بکات، بەلأم لە راستیدا خۆشبەخت نییە چونکە ئەو ئەندازەیەی کە دەتوانێت بەبێ مەترسی بەدەستبهێنێت وەدەستدەهێنێت نەك تەواوی ئەو شتانەی کە خوازیارێتی. بەلأم ئەو کەسەی کە بەشێوەیەکی ناوەکی ڕێساکان قبووڵدەکات و بەپێی دروستیی دادپەروەری کاردەکات دەتوانێت بە تەواوی خۆشبەخت بێت. ئەم کەسە لەبەرتێرکردنی حەزەکانی خۆی بە عەقلأنی هەڵسوکەوت ناکات بەڵکو بەدوای جۆرێك لە ژیانەوەیە کە خۆشبەختی تەواوی پێببەخشێت. تاك لەناو کۆمەڵی مرۆڤە خۆپەرستەکاندا هەرچەندیش بە عەقلأنی هەڵسوکەوت بکات دیسانەوە خۆشبەخت نییە.

هیگڵ وێنای هەیوانییەکانیش بۆ ئازادی بە ئەبستراکت ناودەبات و بڕوای وایە کە ئازادی راستەقینە ئازادیی کۆنکرێتییە. ئازادی لەناو ژیاندا بەدەستدێت نەك بە هەڵهاتن لە ژیان

یاخود دورکەوتنەوە لە جیهان و بەسووك تەماشاکردنی. مرۆڤەکان بەدروستکردنی جیهانێکی کۆمەلاْیەتی کە لە وێنای ئەواندا عەقلاْنییە بە خۆشبەختی و ئازادی دەگەن[٥٤].

لەم روەوە لۆژیکەکەی هیگڵ لەگەڵ لۆژیکی رۆسۆ کە پێشتر باسمانکرد گونجان لە نێوانیاندا هەیە. مرۆڤ ناتوانێت لە کۆمەڵگادا ئازاد بێت مەگەر ئەوەی کە بە حەزی خۆی بخوازێت دادپەروەر بێت و پەیڕەوی لە دادپەروەرییەکی هەماهەنگ لەگەڵ رێکی کۆمەڵگا بکات. مرۆڤ دەبێت هەم لە سنووری مەبەستە تایبەتییەکان و هەم لە سنووری مەبەستە گشتییەکاندا خوازیاری دادپەروەری بێت. ویستنی ئازادی لە دەرەوەی چوارچێوەی کۆمەڵگا کارێکی مەحاڵە چونکە لەناو کۆمەڵگادایە کە مرۆڤ بەشێوەیەکی عەقلاْنی بەدوای حەزگەلێکدا دەچێت. ئازادی بە بەدواداچوونی حەزەکان بەرهەمنایەت، چونکە حەزەکانی ئێمە هەریەکەیان رێگری ئەوی ترەو تێرکردنی یەکێك بەنرخی قوربانیکردنی یەکێکی تر وەدەستدێت. لەلایەکی تریشەوە مرۆڤ ناتوانێت لەرووی لەپێشتربوون و لە پاشتربوونەوە حەزەکانی خۆی رێکبخات. مرۆڤ تەنها کاتێك دەتوانێت لەرووی لە پێشتربوون و لە پاشتربوونەوە رێکییەك لە نێوان حەزەکانی خۆیدا دروستبکات کە وەکو بوونەوەرێکی ئەخلاقی ببێتە خاوەن بەهاگەلێك. بە پێچەوانەی بۆچوونی بێنتهام ئەگەر بە ئەوپەرگەیاندنی چێژەکان و هەرچی کەمترکردنەوەی ئازارەکان بریتی بێت لە مەبەستی ئێمە ئەوا هیچ بەڵگەیەکی عەقلاْنی لەبەردەست نابێت بۆ لە پێشتر دانای حەزێك بەسەر حەزێکی تردا. لەبنەڕەتدا وەها هەژمارکردنێك مەحاڵە. مرۆڤ تەنها بە قبوولکردنی رێسا تایبەت و دیارەکان دەتوانێت زنجیرە پلەیەکی عەقلاْنی لەنێوان حەزەکانی خۆیدا دروستبکات و هەروەك ئاشکرایە وەها رێساگەلێك لە بەراوردکردنی خۆشبەختیی بەرهەم هاتوو لە تێرکردنی حەزەکانەوە بەدەستنایەت. لایەنگرانی سوودگەرایی کێشەکە هەڵدەگێڕنەوە و دەڵێت لەبەرئەوەی مرۆڤ خاوەن زنجیرە پلەیەکی عەقلاْنییە لە حەزەکان بۆیە خاوەن بنەڕەتگەلێکی ئەخلاقییە.

مرۆڤ بۆ ئەوەی بە ئازادی تەواو بگات دەبێت خاوەن ویستی عەقلاْنی بێت، ئەگینا هەم حەزەکانی خۆی و هەم حەز و کرداری کەسەکانی تر رێگرگەلێکی جۆراوجۆر دەخەنە سەرە رێی و نائومێدی دەکەن. ئەگەر مرۆڤ بەها گەل و رێساگەلێکی نەبێت کە بەپێی ئەوان هەندێك لە حەزەکان بە لەپێشتر دابنێت لە هەندێکی تر ئەوا ناتوانێت خواستگەلێك و ویستگەلێکی

٥٤- جان پلامنتاتز، پێشوو، ل ٧٧.





پایەداری هەبێت و ئەگەر وەها بەهاگەلێك بوونیان نەبووایە حەزکردن بە ئازادی دروستنەدەبوو. بەلاْم ئەو کەسانەی کە خوازیاری ئازادین دەبێت خواستەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتردا رێکبخەن و لەگەڵ ویستی گشتیدا بیانگونجێنن. هەڵبەتە هیگڵ بڕوای وانییە کە یاسا و پەیمانەکانی کۆمەڵگا بەردەوام هەماهەنگ بن، بەلاْم بڕوای وایە کە بۆ ئەوەی ویستی تاك عەقلاْنی بێت دەبێ سیستەمێکی ئەخلاقی و یاسایی هەماهەنگ لە ئارادا هەبێت. بەپێی بۆچوونی هیگڵ مێژووی مرۆڤ لە پێشکەوتنی بەردەوامدایە بەرەو دروستکردنی هەماهەنگی لە نێوان ویستی عەقلاْنی و ویستی گشتیدا. بەم جۆرە بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کە ویستی گشتیی دەوڵەتی نوێ لە بەرامبەر ویستی گشتیی دەوڵەتشارەکانی یۆناندا خاوەن عەقلاْنیەتێکی زۆرترە، ویستی هاولاْتیانی دەوڵەتی نوێیش لە ویستی هاولاْتیانی دەوڵەتشارەکانی یۆنان عەقلاْنی ترە[٥٥].

بەپێی تیۆری هیگڵ دەربارەی دەوڵەت و ئازادی مرۆڤی ئازاد ئەو مرۆڤەیە کە وەکو ئەندامی کۆمەڵگای سیاسی بتوانێت یاسا و پەیمانەکانی کۆمەڵگا قبوولبکات و بەشداری لە دانانیاندا بکات و هەموو ئەمانە لە رووی ویژدانی ئەخلاقییەوە ئەنجامبدات. لە کۆمەڵگای پێش نوێدا لەو کۆمەڵگایەی کە یاسا و پەیمانەکان لەرووی نەریتەوە قبووڵدەکران هێشتا ئازادی وەدی نەهاتووە[٥٦].

بۆ قبووڵکردنی رێسا و یاساکان لەرووی ویژدانی ئەخلاقییەوە دەبێت مرۆڤەکان بۆ قۆناغگەلێکی کامڵبوونی هزری گەشەیان کردبێت. کەوابوو ئازادی بەشێوەیەکی تەواو لە دەوڵەتێکدا کە خاوەن بەرزترین تایبەتمەندییەکانی خۆ هەڵسەنگاندن بێت وەبەرهەمدێت. ئازادی و بواری وەدیهاتنی بەرهەمی هزر و بیری ئێمەیە وەکو ئەفرێندراوگەلێکی عەقلاْنیی نێو رێکیی کۆمەلاْیەتی. ئەم رێکییە کاردەکاتە سەر ئێمە، بەلاْم ئێمەش بە نۆرەی خۆمان کاردەکەینە سەر ئەو. ئازادی واتە ژیان بەپێی بنەڕەتگەلێك کە رەخنەگرانە لێیان کۆڵڕاوەتەوە و هۆشیارانە پەسەندکراون. هەرچەندە هەماهەنگی و گونجانی نێوان مەبەستە گشتی و تایبەتییەکان زیاتر بێت ئازادیش زۆرتر دەبێت. بۆ ئازادی دەبێت لەگەڵ یەکتردا بگەینە گونجان و لەگەڵ بەدواداگەڕانی قازانجەکانی خۆمان ئارەزووەکانمان هەمواربکەین و بەردەوام ئامانج و

٥٥- هابرماس ئەم بەشەی بۆچوونی هیگڵ لەبەر رۆشنایی ئەزموونە مێژووییەکانی پاش ئەو هەڵدەسەنگێنێت و عەقلاْنیەتی بۆرژوازی بە تێکدەری دامەزراوە کشتییەکان ناودەبات: ن. ك:

Jurgen Habermas, The Philosophcal Discourse of Modernity, Cambridge, Mass, 1987, p. 39.

٥٦- جان پلامنتاتز، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٨٠.

مەبەستەکانمان ریفۆرم و چاکساز بکەین. بەوەها کاریگەری سیاسی و کۆمەڵایەتی و دامەزراوگەلێکی وەکو دەوڵەت ئازادی دێتەدی[٥٧].

دەوڵەتەکەی هیگڵ تەواوی رەهەندەکانی دەوڵەتێکی نوێیی لە خۆیدا هەڵگرتووە. تەنانەت هیگڵ هاوسەنگیی نێوان کۆمەڵە بچووکترەکان و ئازادییەکانی کۆمەڵە بچووکترەکان لەگەڵ دەوڵەت لەبیر ناکات[٥٨]. ئەو کەسانەی کە هیگڵیان بە دەوڵەتگەرایی تۆمەتبار کردووە سەرنجی ئەم لایەنەی تیۆری دەوڵەتی هیگڵیان نەداوە. تەنانەت هیگڵ رەخنەگرتنی نابەرپرسیارانە و نەگونجاویشی دەربارەی کاروبارە گشتییەکان رەت نەکردۆتەوە، جگە لەمە بە پێویستیشی زانیون. هیگڵ دەڵێت ئازادی رادەربڕین و رەخنەگرتن رۆڵێکی گەورە و گرنگی هەیە لە کۆمەڵگادا. باسکردن و گفتوگۆکردنی رێکوپێك دەربارەی کاروبارە گشتییەکان هاوکار دەبێت لە پەروەردەکردنی رەخنەگرتنی هۆشیارانە و بەرپرسانە. هەروەها هەبوونی رەخنەگرتنی ناجۆر و نابەرپرسانە زیانێك بە باری کۆمەڵگا ناگەیەنێت، چونکە بەبێ رەخنەگرتنی نابەرپرسیارانە رەخنەگرتنی بەرپرسیارانە و شیاویش دروستنابێت. دەبێت رێگە بە تاکە نەزان و توندڕەوەکانیش بدرێت کە قسەی خۆیان بکەن. لە کۆمەڵگایەکدا کە ئازادی رادەبڕین هەبێت ئەم تاکانە ناتوانن زیانێکی گەورە بە کۆمەڵگا بگەیەنن. هەروەها هیگڵ دەڵێت دەوڵەت ئەرکی دیاریکردنی بیروباوەڕە ئاینییەکانی هاولاتیان و بەشێوەیەکی گشتی بیروباوەڕەکانی ئەوانی لە ئەستۆدانییە، هەڵبەتە ئەمە بەو واتایە نییە کە نابێت رێگە لە بەرەو پەیداکردنی رێباز و بیروبۆچوونە عەقڵگەراکان بگرێت.

هەندێك هیگڵیان بەلایەنگری دەوڵەتی تۆتالیتار تۆمەتبار کردووە[٥٩]. بەڵام تێبینییەکانی سەرەوە نیشانیدەدات کە ئەم تۆمەتانە بێ بناغەن. هیگڵ تەنها دەیوت دەوڵەت بەرزترین دەرکەوتنی ژیانی ئەخلاقییە و کاتێك کە لە بەرزترین قۆناغەکانی کامڵبووندایە دەبێت تاکیش پەیڕەوی لێبکات[٦٠]. هەروەك باسمانکرد وەها دەوڵەتێك بەشێوەیەکی تەواو هەموو ئازادییە تایبەتی و سیاسییەکانی تاکەکان لەبەرچاو دەگرێت. هەڵبەتە هەندێك دەستەواژە بەرەو

57- C. L. Wayper, op. cit, p. 170.

58- Darrel Moellendorf "Racism and Rationality in Hegel's Philosophy of subjective spirit" History of political Thought, Vol. XIII No. 2, summer 1992, pp. 245-255.

59- C. F. Hugh and A. Reyburn, The Ethical Theory of Hegel, astudy of The Philosophy of Right, Oxford, Clarendon Press, 1921, p. 63.

60- Kenneth Hierans "The concept of Ethical life" in Hegels Philosophy of Right History of Political Thought, Vol. XIII, No. 3, Autumn 1992, pp. 417-433.





زانییەکانی هیگڵ پرسگەلێك لەخۆ دەگرێت کە جێی رەخنەیە و سەرچاوەی چەند بەدحاڵی بوونێکی گەورەیە. بەڵام پێکهاتەی تیۆری دەوڵەتی هیگڵ شوێنێك بۆ رەخنەگەلێکی لەجۆری تۆمەتبارکردن بە دەوڵەتگەرایی و تۆتالیتاریانیزم ناهێڵێتەوە. پرسەکە لەوەدایە کە هیگڵیش وەکو کانت و رۆسۆ بڕوای وایە تاك کاتێك ئازادە کە بتوانێت لەرووی ویژدانی ئەخلاقییەوە نەك تەنها لەرووی نەریت یاخود پاڵنەری قازانجە تاکەکەسییەکان یاسا و رێساکانی کۆمەڵگاکەی خۆی قبوڵبکات. بەڵام تاك کاتێك دەتوانێت لەرووی ئەخلاقەوە یاسا و رێساکانی کۆمەڵگاکەی خۆی قبوڵبکات کە بەشدار بووبێت لە دانانیاندا. هیگڵ چەند رەخنەیەك لە دیموکراسی دەگرێت، بەڵام ئەم رەخنانە ئەو ناکەنە تۆتالیتار. بەبۆچوونی هیگڵ رەخنەی یەکەمی لە دیموکراسی ئەوەیە کە ئەو دەترسا بە حکوومەتی پارتی کۆتایی پێبێت. ئەگەر وەهای لێببێت (کە ئەزموونی پاشتر نیشانیدا تاڕادەیەك نیگەرانییەکەی ئەو لە جێی خۆیەتی) لەم حاڵەتەدا لەبری ویستی گشتی و ویستی هەمووان ویستگەلێکی پاژی بەسەر کۆمەڵگادا زاڵدەبن. هیگڵیش وەکو رۆسۆ پێی وابوو کە ویستی گشتی و ویستی هەمووان کە لە یاساکاندا رەنگدەدەنەوە دەبێت لە گۆڕینەوەی هەمەلایەنەی هزروراو بیری هێزە جۆراوجۆرەکانەوە بەرهەمهاتبێت. بەهەمان شێوە هیگڵ رێزێکی زۆرتر لە رۆڵی تاکە خوێندەوار و بە ئەزموون و سروشت پاکەکانی کۆمەڵگا دەگرێت لە پێکهێنانی ویستی گشتیدا. ئەمە تایبەتمەندییەکانی دەوڵەتی عەقڵانیی هیگڵە.

## بە کورتی

هەروەك باسمانکرد کانت هەموو جۆرە پشتبەستنێکی عەقڵانیەتی بە سروشتەوە لێکپچڕاند و هەموو شتێکی گەڕاندەوە بۆ ویستی مرۆڤ و عەقڵی پەتیی تاکی مرۆڤ.

بەڵام ئەو عەقڵەی کە کانت پێی گەیشتبوو عەقڵێکی فۆرماڵی بوو بۆیە بەتاڵبوو لە هەموو ناوەڕۆکێك. هیگڵ بۆ چارەسەرکردنی ئەم کەموکورتییە واتە دەرهێنانی عەقڵ لە فۆرماڵیبوون و بەتاڵبوون هەوڵیدا کە عەقڵ بگۆڕێت بۆ عەقڵی هەموو بوونەوەرەکان و تەواوی بوونەوەرەکان لەناو ئەم عەقڵە و ناوەڕۆکەکەی جێ بکاتەوە. بەم جۆرە هیگڵ عەقڵی خودرێسای کانتی بۆ سەرتاسەری سیستەمی بوون و عەقڵی جۆریی مرۆڤ فراوان کردەوە. خودرێسایی عەقڵ یان گیان ئەوەیە کە هەموو ناوەڕۆکەکەی لە خۆیەوە دەربهێنێت. ویست کاتێك ئازادە کە خوازیاری خۆی بێت نەك شتێکی دەرەوەی خۆی. بەم جۆرە یەکبوونی باڵای

خودئاگایی بووە بناغەی تیۆری گیان یان عەقڵ لە سیستەمی هیگڵدا. هیگڵ گیان یان عەقڵ دەگۆڕێت بۆ بکەری سەرتاسەری بوونەوەرەکان و تەواوی بوونەوەرەکان لەناو ئەم عەقڵە و ناوەرۆکەکەی جێ دەکاتەوە، بەم شێوەیە لە بەتاڵبوون و فۆرماڵی بوون دەریدەهێنێت. بەم جۆرە هیگڵ عەقڵی خودرێسای کانتی بۆ سەرتاسەری سیستەمی بوون و عەقڵی جۆریی مرۆڤ فراوان کردەوە. لە ئاکامدا ئەم بکەرە ئەفرێنەرە واتە عەقڵی هیگڵی بەپێچەوانەی عەقڵی کانتیەوە سروشتی لە بەرامبەر خۆیدا نەبینییەوە، بەڵکو هەموو سروشتی بەرەو ناوخۆی راکێشا. عەقڵی ئێستا زاتی ئەخلاقیەتە کە لەباری هاتنەبوون و بەکردەیی بووندایە. بەم شێوەیە کاری گشتی لەبری ئەوەی بەپێی تێگەیشتنی کانت کارێکی لەخۆیدا و ئەبستراکت و دوورە دەست بێت دەگۆڕێت بۆ کارێکی کۆنکرێتی و مرۆیی و لەسەیرورەی مێژوودا جێی خۆی دەکاتەوە.

هیگڵ هەستی بەوەکرد کە ناکرێت لەناو تاك و سنووری پاژیدا بەدوای بنەمای ئازادی و ئەخلاق و عەقلانیەتدا بگەڕێین بەڵکو دەبێت لە جۆرێك یەکبوونی پاژ و گشت و لە دیالێکتیکی ویستی تاکەکەسی و ویستی بە کۆمەڵدا بەدوایاندا بگەڕێین. هەروەك هیگڵ دەڵێت لەبەرئەوەی کانت مرۆڤ وەکو پاژیی تەماشا دەکات بۆیە عەقلانیەت لە دەوڵەتدا وەکو سنووردارێگەلێك بۆ ئازادی تاکەکەسی دادەنێت. لە ئاکامدا دەوڵەتی جێ مەبەستی ئەو وەکو دەوڵەتی سوودگەرایی بۆ ئامێری هەماهەنگکەری ویستە پاژییەکان بچووك دەبێتەوە. لە تیۆرەکەی هیگڵدا دەوڵەت بەشێکە لە سیستەمێکی گەورەتری عەقلانی و لە چوارچێوەی ئەم سیستەمە گەورە عەقلانییەدا روویەکی پەیوەندییەکانی مرۆڤەکان دەخاتەوەروو. دەوڵەت دەکەوێتە ناودڵی پرۆسەیەکی مێژووییەوە کە تیایدا ئازادیی شاراوەی مرۆڤ پاش تێپەڕاندنی چەند قۆناغێك سەرئەنجام لە دەوڵەتی نوێدا دەگۆڕێت بۆ ئازادی کردەیی و خودئاگا. ئازادی لە چوارچێوەی دامەزراوە عەقلانییەکانی وەکو گرێبەستەکان و پەیمانەکان و موڵکداری واتە لە رەنگدانەوەی دیارکەوتنی ویستی عەقلانی و بە فەرمی ناسینە بەرامبەرەکان دێتەدی. کەواتە دەبێت لە چوارچێوەی ئەخلاقی بینراودا نەك ئەخلاقی تاکەکەسی دەوڵەت بخرێتە بەر لێکۆڵینەوە.

دەوڵەت بەرهەمی پرۆسەیەکی نێو مێژووی مرۆڤە کە لەگەڵ مێژوودا دەستیپێکردوە و بەردەوام بەرەو کامڵبوون هەنگاوی ناوە و ئێستا بە ئاستێك گەیشتووە کە مرۆڤ دەتوانێت بە تەواوی پەیوەندییەکانی خۆی بە عەقلانی بکات و دەوڵەتێکی تەواو عەقلانی دابمەزرێنێت. کامڵبوونی دەوڵەت هاوئاراستەیە لەگەڵ رەوتی گیان لە ئازادی شاراوەوە بەرەو ئازادی



خودئاگا. گیان لە ماوەی ئەم رەوتە درێژە مێژووییەدا سەرئەنجام بە دروستکردنی کۆمەڵگایەکی عەقلانی بەناسینی تەواوی خۆی دەگات. هەروەها تێڕوانینی هیگڵ بۆ دەوڵەت پەیوەندییەکی لێك نەپچڕاوی هەیە لەگەڵ روانگەی مەعریفەناسەی ناوبراودا. هیگڵ ناسین و مەعریفە بە بەرهەمی فرەیی هۆشەکان لەقەڵەمدەدات و بڕوای وایە ئەو بیرانەی کە لەرێگەیانەوە سەبارەت بە جیهان وێنەیەکی گونجاو بەدەستدەهێنین بەشێوەیەکی جیاجیا و لە هۆشە تاکەکاندا دروستنابێت بەڵکو بەزۆری میراتێکی بە کۆمەڵە. بە هەمان ئەو جۆرەی کە مەعریفەناسیی کانت بە دابڕانێك لە مەعریفەناسیی دیکارت و سەرتاسەری مێژووی پێش خۆی لەقەڵەمدەدرێت، مەعریفەناسیی هیگڵیش بە نۆرەی خۆی بە دابڕانێك لە مەعریفەناسیی کانت و سەرتاسەری مێژووی پێش خۆی لەقەڵەمدەدرێت. هیگڵ پەیوەندی خۆی لەگەڵ تەواوی مەعریفەناسیی پێش خۆی کە لەسەردەمی دیکارتەوە دەستیپێکردبوو و تیایدا تاك لەلایەك و لوغزی جیهان لەلایەکی ترەوە لە رووبەڕوویدا بوو پچڕاند و ئەو بۆچوونەی هێنایە پێشەوە کە مەعریفە و ناسین کارێکی کۆمەڵایەتی و نێو هۆشەکییە. لە هەڵسەنگاندنەکەی هیگڵدا مرۆڤەکان جیا لە مەبەستە تایبەتییەکان مەبەستگەلێکی گشتیشیان هەیە و تەنها بۆ چاکسازکردنی باری خۆیان هەوڵ نادەن بەڵکو هەوڵ بۆ چاکسازکردنی دامەزراو و بەهاکانیش دەدەن. ژیان لە کۆمەڵگای مەدەنی و بواری تایبەتی لە هەمانکاتدا مرۆڤ فێری بەهای هاوکاریش دەکات. هەر ئەم گیانە کۆمەڵایەتییەی مرۆڤەکانە کە لە دامەزراوە جیاوازەکاندا رەنگیداتەوە.

لە دەوڵەتی عەقلانیدا هەماهەنگی نێوان حەزە تایبەتی و حەزە گشتییەکان بە هۆشیاری و کاراییەکی باشترەوە بەئەنجامدەگات. دەوڵەتی عەقلانی بواری بەشداری گشتی و هەموانە. گشت لەو رووەوە کە هەموو بەشداردەبن لە ژیانی دەوڵەت و بەڕێوەبردنیدا و هەموان لەو رووەوە کە خەڵکی نەك تەنها بۆ کاری تایبەتی و پاژی بەڵکو بۆ رێکخستنی کاروبارە هاوبەش و گشتییەکان یان بە واتایەکی تر بۆ باشەی گشتیش بەشداریدەکەن. بەم جۆرەیە کە دەوڵەت سەنتێزێکی تایبەتمەندییەکانی خێزان لەلایەك و کۆمەڵگای مەدەنی لەلایەکی ترەوەی لە خۆیدا هەڵگرتووە. بە کورتی عەقلانیەتی دەوڵەتی هیگڵ لە بەشداری گشت و هەموان و وەدیهاتنی ئازادی و ئازادی هۆشیارانە و دیالێکتیکی گشت و پاژی بە دیاردەکەوێت.

**پاژی کۆتایی:**

## کورتە و چڕکردنەوە
## ویستی رووە و مافی سروشتی

بیری سیاسیی نوێ بەدوو پێی بەهێزەوە یەکەم عەقڵ و دووەم ویستی مرۆیی لەبری عەقڵ و ویستی میتایی رێگەی دوورودرێژی خۆی دەستپێکرد. لەو رێگە دوورودرێژە و پڕ لە پێچاوپێچیەی کە بیری سیاسی لە هۆبزەوە هەتا هیگڵ پێوای هەردوو چەمکی عەقڵ و ویستی مرۆیی وەکو دوو چەرخی سووڕێنەربوون کە بە خێرایی بیری سیاسیان بەرەو پێشەوە دەبرد. پەیامی بیری سیاسی لە میانەی ئەم قۆناغە درەوشاوییەدا ئەوەبووە کە قۆناغ لە دوای قۆناغ رۆڵی دیاریکەری عەقڵ و ویستی مرۆیی لە دروستکردن و بایەخدان بە کۆمەڵگای سیاسی و چارەنووسی مرۆڤ بخەنە بەرچاو. لە میانەی ئەم رێگە دوورودرێژەدا وێڕای ئەوەی کە بیری سیاسی پرۆژە نوێیەکەی خۆی بەرەو پێشەوە برد وردە وردە هەموو ئەو شتانەی بیری کۆن کە بە کۆڵیەوە بوون وەلاوەنا.

هۆبز لە فەلسەفەی سیاسی خۆیدا بۆ یەکەمین جار بناغەی کۆمەڵگای مرۆیی لەسەر ویستی مرۆڤ کە هاوکاری لە عەقڵەوە وەردەگرێت دانا. ئەوکات هەردوو چەمکی عەقڵ و ویستی مرۆیی لە ناوەندی تیۆرە سیاسییە هاوهەنگاوەکاندا تادوا ویستگەی تیۆری ((ویستی عەقلانی)) وەکو جەوهەری دەوڵەتی عەقلانی بەرەو پێشەوە چوون و لەوێدا بە یەکبوونی تەواو گەیشتن. بیری هۆبز درێژەی بزووتنەوەیەکی گەورەی سەدەی حەڤدەیەم بوو کە بۆ تاقیکردنەوەی هەموو شتێك لەسەر بناغەی عەقڵ و دامەزراندنی هەموو شتێك لەسەربنەمای عەقڵ و ویستی مرۆڤ هاتبووە نێو گۆڕەپانەکەوە. لە سەدەی هەڤدەیەمدا کە تێڕوانینی ئامێری زاڵبوو بەسەر بیری مرۆڤدا هۆبز هەوڵیدا کە دەوڵەت وەکو ئامێرێکی





دروستکراوی ویست و عەقڵی مرۆیی تویکاری بکات و نووژەنی بکاتەوە. هۆبز لەگەڵ شیکردنەوەی هەمەلایەنەدا روونیکردەوە کە چۆن حەزەکان بەهاوکاریی عەقڵ و مرۆڤ بەرەو گرێبەستی کۆمەڵایەتی و پێکهێنانی کۆمەڵگای مەدەنی و دەوڵەت پاڵ پێوە دەنێت. تاکەکان بەوەها گرێبەستێك کە لە خۆگری دەستنیشانکردنی فەرمانڕەوایە تیایدا بەیەکبوون دەگەن و کۆمەڵگای سیاسی دادەمەزرێنن. وەها دامەزراندنێك بۆ دەربازبوون لە باری سروشتی کە بارێکی پڕ لە نائارامییە زۆر پێویستە.

هۆبز بەم جۆرە بنەڕەتی ویست و سیماکانی واتە رەزامەندی و رێکەوتن لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسیی خستەروو کە لە ماوەی قۆناغەکانی پاشترداو لە بیری لۆك و بێنتهام و رۆسۆ و کانت و هیگڵدا بە فۆرمگەلێکی نوێوە وەدیارکەوت و درێژەی پێدرا. هۆبز لە بەرامبەر بیری عەقڵی — سروشتیی کلاسیکی کە باسەکەی خۆی لە یاساوە دەستپێدەکرد بناغەی باسکردنی خستە سەر ویست و دروستکردن. هۆبز روونیکردەوە کە مرۆڤ چۆن دەسەڵاتی مەدەنی دروستدەکات و شوێنی دەکەوێت. بەر لە دامەزراندنی دەسەڵاتی مەدەنی ویستی مرۆڤ ویستێکی رەهایە، رەها بەو واتایەی کە بە هیچ رێساو ئەرکێك سنووردار نابێت. بێ ئەرك بوون واتە مافی سروشتی. مافی سروشتی مافی رەهایە لەبەرئەوەی کە لە سروشتی ویستەوە سەرچاوە دەگرێت نەك لە یاسایەکی سەرووتر. کۆمەڵگای مەدەنی دروستکردنی ئازادی ویستە رەهاکانە. تاکەکان بە گواستنەوەی ویستەکانی خۆیان بۆ ویستی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایی لە میانەی گرێبەستێکی کۆمەڵایەتیدا کۆمەڵگای سیاسی دادەمەزرێنن. هەروەها بیری هۆبز سوودی لە نەریتی نۆمینالیزم وەردەگرت کە ویستی بە لە پێشتر دادەنا لە عەقڵ. نۆمینالیستەکان مرۆڤیان وەکو بوونەوەرێکی خاوەن ویست و بیرکردنەوە و خاوەن یەکبوونی ناوەوە تەماشا دەکرد کە پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسەکانی دەوروبەریدا تەنها پەیوەندییەکی دەرەکییە. بەپێی تێڕوانینی نۆمینالیستی کۆمەڵگا بەکاری تاکەکەسیی ویست دروستدەبێت. جەوهەری گرێبەستی کۆمەڵایەتی ویستی هاوبەش نییە بەڵکو بابەتی هاوبەشی ویستە لێکجیاکانە. دەبوو بیری سیاسی رێگەیەکی دوور بڕێت تاوەکو بگاتە شوێنی بابەتی هاوبەشی ویستەکان وەکو جەوهەری گرێبەستی کۆمەڵایەتی [یان بە بۆچوونی رۆسۆ بە (ویستی گشتی) بگات]. هەڵبەتە هۆبز دەستپێکی ئەم رێگە دوورەی دیاری کردبوو. هەروەکو هیگڵ پاشتر باسی لێوەدەکات هۆبز بە دروستی سەرچاوەی

ناوەکی دەوڵەتی دیاریکرد لە کاتێکدا کە پێش ئەو بەردەوام دەوڵەت بە کارێکی دەرەکی کە لە بەرامبەر مرۆڤدا بوو تەماشا دەکرا.

بەڵام هۆبز هەموو ئەو شتانەی کە لەبیری سیاسیدا لە خودای ئاسمانییەوە وەریگرت بەخشییە خودای سەرزەوی. لڤیاتان کە بەرهەمی ویستی تاکە پێکهێنەرەکانی کۆمەڵگای سیاسییە بۆ خۆی دەگۆڕێت بۆ ویستێکی جیا. لە روخساردا وادیارە کە هۆبز ئەمە لە بنەما و لۆژێکی تایبەتی خۆیەوە دەرهێنابێت.

لەباری سروشتیدا ویستی مرۆڤ ویستێکی رەهایە. رەها لەورووەوە کە پەیڕەوی هیچ رێسایەك نییە و هێشتا هیچ ئەرکێکی لە ئەستۆدا نییە. ئەم بێ ئەرکییە وەکو مافی سروشتی وایە. تەنانەت لەباری سروشتیشدا مافی سروشتی هەیە، چونکە هەموو کەسێك دەزانێت کە خەڵکانی تریش وەکو ئەو مافیان هەیە لە بەرامبەر دەستدرێژیکردن بەرگری لە گیانی خۆیان بکەن. ئەم مافە هەمان مافی پاراستنی خودە. مافی پاراستنی خود لە خۆگری بەرگریکردنە لە بەرامبەر دەستدرێژیدا بەڵام لەبەرئەوەی دادوەرێکی بێلایەن لە ئارادا نییە سەبارەت بە قەزاوەتکردن دەربارەی چۆنیەتی سوود وەرگرتن لەم مافە و هەرکەسە و دادوەری خۆیەتی بۆیە لە باری سروشتیدا ناسەقامگیری و پاشاگەردانی زاڵە بەسەر کۆمەڵگادا. دیاریکردنی ئەوەی کە چ کاتێك کەسێك دەبێتە مەترسی بۆ سەر تۆ لە ئەستۆی خۆتدایە. وەها هەلومەرجێك بارێکی شڵەژاو و مەترسیدار دروستدەکات کە بۆخۆی تێکدەری حەزی پاراستنی خودە. بیرکردنەوە لە چارەسەرکردنی ئەم بارە بە دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی و گواستنەوە بۆ باری مەدەنی کۆتایی دێت. هەمووان لەمیانەی گرێبەستێکدا مافی سروشتی و بەرگری لە خۆکردن بە کەس (یان چەند کەس)ی سێیەم دەسپێرن. هەموو ویستەکان دەگواسترێتەوە بۆ ویستی بوونێکی دروستکراو. بەڵام ئەوەی کە بەرهەمدێت ویستی هاوبەش و ویستی گشتی نییە، بەڵکو تاکە ویستی ئەم کەسێتییە دروستکراوەیە. ئەم کەسێتییە دروستکراوە فەرمانڕەوایە و دەسەڵاتی ئەم فەرمانڕەوایە تایبەتی و هەمیشەییە. ئەم فەرمانڕەوایە سەرچاوەی هەموو ماف و ئەرکێکە. سەبارەت بەم خاڵەی دوایی ویستی فەرمانڕەوای هۆبز تاڕادەیەك لە ویستی گشتیی رۆسۆ دەچێت.

لەبەرئەوەی گرێبەستی کۆمەڵایەتیی هۆبز فەرمانڕەوایەکی هەمیشەیی دروستدەکات کە هیچ ئەرکێکی لە ئەستۆدا نییە لە بەرامبەر هاوڵاتیاندا و لە بنەڕەتدا لایەنی گرێبەستەکەی





ئەوان نییە لەراستیدا بۆ گرێبەستی خۆ بەدەستەوەدان بچووك دەبێتەوە. بەم جۆرە تەنها یەك جار رەزامەندی هاوڵاتیان بۆ دانانی فەرمانڕەوا بەدیاردەکەوێت. ئەم گرێبەستییە خۆبەدەستەوەدانە ئەو ناکۆکییەی لەناوخۆیدا هەڵگرتووە کە پاش جێگیرکردنی فەرمانڕەوا هاوڵاتیان سەربەخۆیی خۆیان لەدەستدەدەن. رۆسۆ رەخنە لە گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆبز دەگرێت و بڕوای وایە بە گرێبەستێکی دامەزراو لەسەر ئازادی نەبێت یەکبوون و یەکێتی بەدەستنایەت. رۆسۆ دەڵێت حکوومەت کاتێك بەهای ئەخلاقیی هەیە کە لە هیچ روویەکەوە بەسەرتاکدا نەسەپێندرابێت. بەم شێوەیە رۆسۆ عەقڵانیەتی دەوڵەتی جێ مەبەستی هۆبز دەخاتە بەر پرسیارەوە.

لۆك و هارینگتۆن بنەما و خاڵە گشتییەکانی تێڕوانینی هۆبز بۆ دەوڵەتیان قبووڵکرد و بناغەیەکی نوێیان لەسەربنەماکانی تێڕوانینی هۆبز دامەزراند. لۆك و هارینگتۆنیش بەپێی ئەو بنەمایە هەنگاویان نا کە دەبێت لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەسەڵاتێکی فەرمانڕەوایی هەبێت تاوەکو هەموو تاکەکان لە سنووری بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا ماف و دەسەڵاتەکانی خۆیانی پێ بسپێرن. بەڵام ئەوان ئەو کارەیان بەنا پێویست و نەگونجاو لەگەڵ گریمانەکانی تیۆرەکەی هۆبز دادەنا کە تاکەکان کۆببنەوە و بۆ هەمیشە و بە شێوەیەکی بێ وەرگرتنەوە دەسەڵات بە کەسێك یان دەستەیەك بدەن کە دەسەڵاتی دیاریکردنی شوێنگرەوەی خۆیشی هەبێت. لۆك و هارینگتۆن دژی جێگیرکردنی فەرمانڕەوایەتی هەمیشەیی نەبوون بەڵام دژی فەرمانڕەوایی هەمیشەیی بوون.

لە تیۆرەکەی لۆکیشدا وەکو تیۆرەکەی هۆبزماف و ئەرکی تاك لە سروشت و مافی سروشتی مرۆڤەوە دەرهێنراو. ئەویش کاری ئەنجامگیری خۆی لە تاکەوە دەستپێکردووە و لەوێوە بەرەو کۆمەڵگای مەدەنی هەنگاوی ناوە. بە بۆچوونی ئەویش تاکەکان بەپێی سروشت خاوەن ویستن و سەربەخۆن لە یەکتر، و لە ژێر سەرپەرشتی هیچ کەسێکدا نین. مرۆڤ بەپێی جەوهەری خۆی ئازادە لە هەموو پەیوەندییەك جیا لەوەی کە خۆی بەپێی قازانج و ویستی خۆی دەچێتە ناوییەوە. کۆمەڵگا بەرهەمی زنجیرەیەك پەیوەندی نێوان ئەو تاکانەیە کە خاوەن گیان و موڵکی خۆیانن. بەڵام لۆك پێناسەیەك بۆ باری سروشتی دەخاتەروو کە لە کۆتاییدا بە بوونی عەقڵانیەتێکی دوولایەنە لە کۆمەڵگادا کۆتایی دێت، یەکێك عەقڵانیەتی موڵکداران و ئەوی تر عەقڵانیەتی کرێکارە نەدارەکان. لە تیۆرەکەی لۆکدا چینی کرێکار بە

ئەندامی تەواوی کۆمەڵگای سیاسی دانانرێت. لۆك بەپێی بیروبڕوای باو کۆمەڵی کرێکاران و وێڵگەردەکان بە خاوەنی ژیانی ئەخلاقی تەواو دانانێت. کرێکاران بابەتی سیاسەتن نەك ئەندامی هەیکەلی سیاسی. ئەوان ئامادەی پەیڕەوی لێکردنی ئەخلاقی عەقلانی نین و تەنها پێویستیان بە باوەڕ هەیە. تەنها بە باوەڕ و ئومێد و ترسان لە پاداشت و سزای ڕۆژی دوایی، دەکرێت هانبدرێن بۆ پەیڕەوی لێکردن.

لە تیۆرەکەی لۆکدا لە ئاکامدا دەوڵەت هاوشێوە دەبێت لەگەڵ جۆرێك کۆمپانیای پشکدا. لەم کۆمپانیای پشکەدا خاوەن موڵکە تایبەتییەکان خاوەن پشکن و بەپێی بنەڕەتی فەرمانڕەوایی زۆرینە لەگەڵ یەکتردا یەکیان گرتووە. ئەو بڕیارانەی کە ئەم خاوەن موڵکە تایبەتیانە وەریدەگرن لەسەر کرێکارەکانیان پێویستە ملکەچی لێبکرێت. لۆك لەگەڵ ئەوەی لەلایەکەوە دەڵێت هەموو مرۆڤەکان خاوەن عەقڵ و خاوەن ویستن بەڵام لە ئاکامدا بەو ئەنجامە دەگات کە دوو ئاستی جیاوازی عەقلانیەت لە ئارادا هەیە: عەقلانیەتی خاوەن داراییە تایبەتەکان و عەقلانیەتی ئەو کەسانەی کە بێ بەشن لێی. هەروەها لۆك لە کاتێکدا کە هەمووان لە مافی سروشتیدا بە یەکسان دەزانێت، بەڵام سەبارەت بە بەهرەمەندبوون لە مافی سروشتی دوو سیستەمی جیاواز لەبەرچاو دەگرێت. بەم جۆرە تیۆرەکەی لۆك بەرەو مافی دوو لایەنە و عەقلانیەتێکی دوولایەنە پەلکێش بووە: چینێکی خاوەن عەقلانیەتی تەواو و مافی تەواو (خاوەن موڵکەکان) و چینێکی تر کە خاوەن عەقلانیەت و مافی ناتەواون (چینی کرێکارە نەدارەکان). ئەمە لە کاتێکدایە کە لۆك لە یەکسانیی بەهرەمەندبوون لە عەقڵ و مافی سروشتییەوە دەستیپێکردووە.

تیۆری فەرمانڕەوایی زۆرینەی لۆك جیا لەوەی کە لەسەرەوە باسکرا لەڕوویەکی تریشەوە جێی ڕەخنەیە: بۆچی دەبێت دەسەڵاتی زۆرینە یەکسان بێت لەگەڵ دەسەڵاتی تەواوی کۆمەڵگای سیاسیدا؟ بۆچی دەبێت هەمووان پەیڕەوی لە بڕیاری زۆرینە بکەن؟ لە ڕواڵەتدا بۆچوونی لۆك وایە کە زۆرینە خاوەن دەسەڵاتی زۆرترین و پەیڕەوی لێکردنیان بە سوودە بۆ سەقامگیری و بەرژەوەندی کۆمەڵگا، بەڵام ئەم لۆژیکە بۆنی بۆچوونی سوودگەرایانەی لێوەدێت. دەکرێت لە تێڕوانینی لۆکەوە بگەڕێینەوە سەر سوودگەرایی: ئەگەر بڕیار وایە کە لە نێوان دوو باڵی جیاواز واتە دیاریکردنی چارەنووسی خەڵکی لەلایەن زۆرینە یان لەلایەن کەمەوە یەکیان هەڵبژێرین ئایا باشتر نییە کە باڵی یەکەم هەڵبژێرین؟ ئەگەر قبووڵبکەین






کە خەڵکی لەسەربنەمای قازانجی کەسی دەنگدەدەن لەم حاڵەتەدا دەتوانین بەو ئەنجامە بگەین کە پەنابردن بۆ زۆرینە بەلای کەمەوە لە فۆرمە خاوەکەیدا زۆرترین خۆشبەختی بۆ زۆرترین ژمارە دەستەبەر دەکات. هەڵبەتە خودی لۆك هاوڕانەبوو لەگەڵ وەها تێگەیشتنێکدا. لۆك زۆرتر حەزی دەکرد پەنا بۆ چەمکی ماف و عەقڵ بەرێت بۆ پاساوکردنی مەشروعیەتی حکوومەت و فەرمانڕەوایی زۆرینە. بۆ نموونە هەر بە هەمان هۆوە لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگادا بەشێکی زۆرتری بۆ خاوەن داراییەکان کە بواری بیرکردنەوەیان هەبوو لە بەرچاو دەگرت لەچاو ئەو کرێکارانەی کە بە ((نانەسکی)) کاریان دەکرد. بەم جۆرە بیرمەندانی پاشتر بە جۆرێکی تر سوودیان لە بیرەکانی وەرگرت. تیۆرەکەی لۆك لە ڕوویەکی گرنگی دیکەیشەوە تووشی ناکۆکی هاتبوو. لۆك و هەموو ڕوشنگەرەکان (کە بە جۆرێك لەژێرکاریگەری بیری ئەودا بوون) دەیانوت دەکرێت لەسەربنەمای عەقڵی مرۆیی کۆمەڵگا نووژەن بکرێتەوە و دەوڵەتێکی عەقلانی دابمەزرێندرێت. بەم شێوەیە ئەوان عەقڵیان بە لەپێشتر لە ئەزموون و هەموو جۆرە تاقیکردنەوەیەکی ئەزموونی دانا. بەڵام لەلایەکی ترەوە بەپێی تێگەیشتنی ئەزموونگەرایانەی خۆیان بڕوایان وابوو کە هەموو وێنا و تێگەیشتنەکانی مرۆڤ لە ئەزموونەوە بەرهەمدێت. هەربۆیەش ئەو عەقلانیەتەی کە داماڵراو بوو لە ئەزموون گۆڕا بە ئایدیۆلۆژییەك بۆ ئەوان (لۆك و ڕوشنگەرەکان). نەدەکرا لە چوارچێوەی مەعریفەناسیی ئەزموونگەریدا سەرچاوەی مافی سروشتی و سنووردارکردنی حکوومەت پاساو بکرێت. چونکە وەها بانگەشەیەك لەناوخۆیدا ناهاوسازیی تیادابوو. هەروەها کانت تیۆری موڵکداری لۆکیشی خستەبەر ڕەخنە و بەڵگەهێنانەوەکەی لۆکی بە ناتەواو لە قەڵەمدا. لۆك وتبووی موڵکداری بریتییە لە تێکەڵکردنی کار لەگەڵ شتێکدا. کانت ئەم بەڵگەیە بە داگیرکردنی ویستراو دادەنێت و دەڵێت دەکرێت بپرسین ئەو کەسە بە چ مافێك کاری خۆی تێکەڵ بە شتێك کردووە؟ موڵکداری تەنها لە کۆمەڵگای سیاسیدا دەتوانێت بوونی هەبێت، چونکە مەشروعیەتی ئەو پەیوەستە بەوەی کە ئەو کەسانەی لە دەوروبەری کەسەکەن چاوپۆشیان لە مافی خۆیان کردبێت سەبارەت بە سوود وەرگرتن لەو شتە. ئەمەیش پێویستی بەوەیە کە سەرەتا یەکێتییەکی ویستەکان بە شێوەی دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی هاتبێتە بوون.

## ویستی رووە و باشەی کەسی

هەڵێنجاندنی ئازادی و کۆمەڵگای سیاسی لە مافی سروشتییەوە چەمکی رەزامەندی لاواز دەکات لە دامەزراندن و بەڕێوەبردنی حکوومەتدا، لە کاتێکدا کە چەسپاندن و دیاریکردنی رۆڵی رەزامەندی و رێکەوتن لە کۆمەڵگای سیاسیدا لە ناوەندی پرۆژەی بیری سیاسی نوێدا بوو. ئەگەر بڕیار وابێت بە شێوەیەکی سروشتی و پێشوەخت لەناو کۆمەڵگای سیاسیدا مافێکمان لەسەر ئازادی هەبێت لەم حاڵەتەدا رۆڵی رەزامەندی و رێکەوتن و ویستی ئێمە لە دامەزراندن و بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای سیاسی تارادەیەك کەم دەبێتەوە. ئەو کێشەیەی کە لە بیری هۆبز و لۆك و هۆگۆ گرسیۆس و بزووتنەوەی رۆشنگەریدا هەبوو بیرمەندانی پەیوەست بە سوودگەرایی و رۆسۆ هەریەك بە جۆرێکی جیاواز کەوتنە بیرکردنەوە لە چارەسەرکردنی. هۆبز و لۆك بەدەستپێکردن لە مافی سروشتییەوە (تەنانەت مافی سروشتی بەواتا نوێیەکەشی) مافیان بە لەپێشتردا نابوو لە باشەی کەسی. هۆبز بە لەپێشتردانانی ماف بەسەر باشەدا بەتەواوی کۆمەڵگای مەدەنی کردبووە گۆڕەپانی سیاسەت. هۆبز بە جۆرێك هێڵی یەکسانی لەنێوان حکوومەت و کۆمەڵگای مەدەنیدا کێشابوو کە هەموو خەڵکی کردبووە شوێنکەوتووی فەرمانی فەرمانڕەوا. لۆکیش لەگەڵ ئەوەی حکوومەت و کۆمەڵگای مەدەنیی لە یەك جیاکردبووەوە بەڵام بە لەپێشتر دانانی ماف بەسەرئەرکدا بەردەوام بوو لە ئەفراندنی لڤیاتانەکەی خۆی. بیرمەندانی پەیوەست بە سوودگەرایی هەوڵیاندا کە باشەی کەسی بە لەپێشتر دابنێن لە ماف و چەمکی مافی سروشتی وەلاوە بنێن تاوەکو کۆمەڵگای مەدەنی لە حکوومەت جیابکەنەوە و کارەکەی لۆك بگەیەننە سنووری لۆژیکیی خۆی. هۆبز بواری ئەخلاق و مافی ئاوێتەی یەکترکردبوو. بێنتهام هەوڵیدا کە فەرمانڕەوایی بە سنووری سیاسی و یاسایی سنووردار بکات و یاسا لە رێسا ئەخلاقییەکان جیابکاتەوە. لەلایەکی ترەوە رۆسۆ بە شیکردنەوەی مێژوویی — عەقلانی بەو ئەنجامە گەیشت کە ئەو هۆکارانەی هۆبز باسیان دەکات لەوانەیش لووتبەرزی، کە شوێنێکی گرنگی هەیە لە وێنەی باری سروشتی هۆبزدا لە بنەڕەتدا سروشتی نین و تەنها لە کۆمەڵگادا لەدایکدەبن. رۆسۆ لە سوودگەراییش پێشترچوو و نیشانیدا ئەو قازانجانەشی کە بیرمەندانی پەیوەست بە تێڕوانینی سوودگەرایی ناویان بردووە و هەر لە ماکیاڤیلییەوە






هەتا ئادەم سمیت باسیان لێوەکردووە سروشتی نین و قازانجخوازی زیاد لەوەی کە خەسڵەتێکی چەسپاو بێت لە پرۆسەی یەك لەدوای یەکی رووداوە مێژووییەکانەوە دروستبووە.

کەم و کورتییەکی تر کە لە تیۆرەکانی هۆبزدا هەبوو و دەبوو پرۆژەی بیری سیاسی نوێ زاڵببێت بەسەریدا بریتیبوو لە بەیەکسان تەماشاکردنی چەمکی حکوومەت و فەرمانڕەوایی. لە تیۆرەکانی هۆبز جیاوازی لە نێوان حکوومەت و فەرمانڕەواییدا نییە. سوودگەرایی لەلایەك و رۆسۆش لەلایەکی ترەوە هەریەك بە شێوازی تایبەتیی خۆیان بیری سیاسی نوێیان رووە و ئەم جیاکردنەوەیە بەرەو پێشەوەبرد.

بەڵام بەر لەوەی باس لە دەستکەوتەکانی رۆسۆ و رەخنەی ئەو لە مافی سروشتی بکەین سەرەتا پێویستە لێرەدا چەند ئاماژەیەك بە سوودگەرایی و بانگەشەکانی لە بواری بیری سیاسی نوێ و رۆڵی لە بەرەو پێش بردنی سیاسی نوێ بکەین. سوودگەرایی بەو جۆرەی کە لە تیۆری سیاسیی بێنتهامدا پەرەی پێدرا لە دووڕووی گرنگەوە هاوکارییەکی بەرچاوی پرۆژەی بیری سیاسی کرد سەبارەت بە عەقلانیەتی دەوڵەت. یەکەم جیاکردنەوەی چەمکی فەرمانڕەوایی لە حکوومەت و دووەم شیکردنەوەی کۆمەڵگای مەدەنی وەکو بواری رکەبەری و ململانێی قازانجەکان. ئەم دەستکەوتەی دووەمیان بە نۆرەی خۆی هاوکاری کامڵبوونی تیۆری دەوڵەتی کرد لە فەلسەفەی هیگڵدا.

## قەیرانی مافی سروشتی

بەڵام سوودگەرایی یەکێك بوو لەو پرۆسانەی کە هەندێك لە گرنگترین پرسە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی سەدەی رۆشنگەریی خستەروو وشییکردەوە. هەندێك لەو پرسانە بریتی بوون لە خستنەرووی تێگەیشتنێکی زانستی بۆ ناوەرۆکی مرۆڤ و کۆمەڵگا، هەروەها پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی کە لە ئاکامی داڕووخانی بناغەکانی بیروبڕوای ئەخلاقیی کۆنەوە دروستببوو. بیری یاسای سروشتی و مافی سروشتی کە لەسەردەمی هەیوانییەکان و تەنانەت بەر لەوانیش زاڵببوو بەسەر هزری ئەوروپادا و تاسەردەمی روشنگەری بەردەوام بوو تووشی قەیران هاتبوو و نەیدەتوانی وەڵامی ئەو پرسە نوێیانە بداتەوە کە لە بیری مرۆڤی نوێدا گەڵاڵە ببوو. رۆسۆ و مونتیسکیۆ و سوودگەرایی هەریەك بە شێوەیەکی جیاواز کەوتنە هەوڵدان لەپێناو دۆزینەوەی نموونەیەکی نوێ بۆ شیکردنەوەی کۆمەڵگا. مۆنتیسکیۆ هەوڵیدا بە پەیڕەوی

لێکردنی وردی شێوازەکەی بیکۆن و لێکۆڵینەوەی ئەزموونیی بەشێوەیی ئستقرایی هەندێك لە یاسا گشتییەکانی کۆمەڵگای مرۆیی لە مێژووی مرۆڤدا بدۆزێتەوە، بەم جۆرە تیۆری جیاکردنەوەی دەسەلاّتەکانی خۆی بەدەستهێنا. رۆسۆ نموونەیەکی تری خستەروو ویستی کە یاساکانی کامڵبوون و پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆیی وەکو یەك گشت بدۆزێتەوە و نەخشەی وەرچەرخانی مێژوو لە ماوەی سەردەمەکاندا بەدەستبێنێت و نەریتەکەی لەلایەن ئۆگەست کانت و هیگڵ و مارکسەوە درێژەی پێدرا.

سوودگەرایی بەنۆرەی خۆی نموونەیەکی نوێی خستەروو. ئەم نموونەیە بە نۆرەی خۆی بەدوای بنەڕەتێکی رێکخەر و سەنتەریی بوو لە مرۆڤدا کە کرداری تاك و جووڵەی کۆمەڵگا دیاریبکات، دروست بەهەمان ئەو شێوەیەی کە تیۆری کێش و راکێشان جووڵەی تەنە فیزیکییەکان روون دەکاتەوە. ئەم نموونەیە لەبری کردنەوەی رازی پێچاوپێچی مێژوو بەدوای هێزی پاڵنەری تاکەکەسییەوە بوو. سەر ئەنجام ئەم هێزە پاڵنەرەشی لە بەدواداگەڕانی خۆشی و دوورکەوتنەوە لە ئازار وەکو پاڵنەری سەرەکی مرۆڤ دۆزییەوە.

هۆبز و لۆك کە لە چەمکی ((باشەی هاوبەش)) کە ناوەرۆکی بیری کلاسیکی بوو دوورکەوتبوونەوە بەناچاری هەڵسەنگاندنە بەهاییەکانیان دایە پاڵ میکانیزمی حەز و ئارەزوو. بەم جۆرە بڕوایان بە باشەیەکی بینراو بە واتا کلاسیکییەکەی بۆ هەمووان نەبوو، چونکە بابەتی حەزەکانیان لەنێوان مرۆڤەکاندا بەجیاواز و ناکۆك لە قەڵەمدا. هۆبز کە چەمکی ((باشەی هاوبەش))ی کلاسیکیی وەلاوەنابوو نەیدەیویست بگاتە رێژەیی بوونی ئەخلاقی و گومانگەرایی و تیۆری هۆشگەرایی لە ئەخلاق. لە تیۆرەکەی هۆبزدا حەزی پاراستنی خود (یاخود رووە نیگەتیڤەکەی هەڵهاتن لە مەرگی ناسروشتی) کە بەهێزترین حەزە لە هەمان کاتیشدا عەقلاّنیترین حەزیشە، چونکە لە کۆتاییدا بەرەو دامەزراندنی کۆمەڵگای سیاسی و دروستکردنی ئەرکی سیاسیی بینراو لەسەربنەمای فەرمانی فەرمانڕەوا (بەیەکبوونی ئەخلاق و ماف) هەنگاو دەنێت. بەلاّم شوێنکەوتووانی کە سوودگەراییان دامەزراند هەڵوەستەیەکیان لەسەربنەما و گریمانەکانی تیۆرەکەی ئەوکرد، بەلاّم ئەنجامگیرییەکانی ئەویان بەجێ هێشت. لە ئاکامدا ئەم بیرە بەرە بەرە بەهێزبوو کە خۆش و باشە بابەتێکە پەیوەستە بە تاکەوە. ئێستا کە هۆبز عەقڵی خستوەتە خزمەت تێرکردنی



حەزەکانەوە چ کەسێك باشتر لە خودی تاك دەزانێت کە خۆشی و باشەی ئەو لە چیدایە. سەرئەنجام ئەم پرۆسەیە بەرەو تێڕوانینی سوودگەرایی چوو.

## لە عەقلاّنیەتی مافەوە بۆ عەقلاّنیەتی قازانج

هۆبز شوێنێکی گرنگی دابووە عەقڵ لە تیۆرەکەی خۆیدا. راستە کە عەقڵ لە بەرامبەر حەزدا بێ توانایە بەلاّم لە هەندێ رووەوە هەر بەهەمان هۆوە دەبێتە خاوەن دەسەلاّتێکی زاڵ. عەقڵ لەو رووەوە بێتوانایە کە هیچ پشتیوانییەکی نییە لە سیستەمی جیهانیدا. جیهان لە دەرەوەی دەسەلاّتی عەقڵی مرۆڤە. بەلاّم هەر ئەم کارە رێگە بە عەقڵ دەدات کە خۆی دەست بە ئەفراندنی ئازاد بکات و لە زاڵبوون بەسەر سروشتدا بە پێشکەوتنی بێسنوور بگات. عەقڵ لە بەرامبەر حەزدا بێ توانایە، بەلاّم ئەگەر لەگەڵ بەهێزترین حەزدا واتە حەزی پاراستنی خود بکەوێتە هاوکاری دەتوانێت بگۆڕێت بۆ هێزی زاڵبوو.

لۆك بنەڕەتی نەخشەکەی هۆبزی قبوولکردبوو، بەلاّم لە چەند خاڵێکدا گۆڕانی تیادا دروستکرد کە بەر لە هەموو شتێك بە قازانجی تێگەیشتنی سوودگەرایی کۆتایی هات. لۆك بەو ئەنجامە گەیشت ئەوەی کە مرۆڤ بۆ پاراستنی خود پێویستی پێیەتی چەك و تفەنگ نییە، بەڵکو بریتییە لە موڵکداری و دارایی. لە دیکترینەکەی لۆکدا حەزی پاراستنی خود گۆڕا بۆ حەزی بەدەستهێنانی سامان و مافی پاراستنی خودیش بۆ مافی بەدەستهێنانی بێسنوری سامان. ئەنجامەکانی ئەم گۆڕانە بچووکە زۆر گەورە بوون. لۆك نەخشەکەی ماکیاڤیلیی باشتر لە هۆبز سەبارەت بە دۆزینەوەی جێگرەوەیەك بۆ ئەخلاقیاتی کلاسیکی بەرەو پێشەوە برد. ئەم جێگرەوەیە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی سامان. ئەم حەزە خۆپەرستانە لە خۆگری رژانی خوێنی هیچ کەسێك نییە و کاتێکدا ئەنجامەکەی بە باشتربوونی باری هەمووان کۆتایی دێت. بازرگانی بووە شوێنگرەوەی فەزیلەتی هەیوانییەکان. رۆسۆ نارەزایی دەربڕی بەرامبەر بەم کەمبوونەوەیەی گەورەیی مرۆڤ بەلاّم سوودگەرایی تا سنووری لۆژیکی ئەم بیرەی بەرەو پێشەوە برد.

هیۆم لە بەرامبەر ئەرکی ئەخلاقی، کە ئەرکێکی دروستکراو و ساختەبوو لە تیۆرەکەی هۆبز و لۆکدا قازانجی وەکو هۆکاری ملکەچیکردن لە حکوومەت دیاریکرد. هیۆم رایگەیاند پێویست بەوە ناکات کە بناغەی ئەرکی سیاسی لەسەرگرێبەستی سەرەتایی دابمەزرێنین.





پابەندبوون بە پەیمان کە پێویستی بە جێگیربوون و پایەداری گرێبەستی کۆمەڵایەتی هەیە ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ قازانج و سوودمەندی. لەبری ئەو پێچاوپێچیانەی کە لە دیکترینەکەی لۆکدا ڕووبەڕووی دەبینەوە دەتوانین ڕاستەوخۆ ڕووە و بنەڕەتی سوود و قازانج هەنگاو بنێین. بەڵام هێشتا ماوەیەك لە نێوان هیوم و بێنتهامدا ماوەتەوە. سوود لە تیۆرەکەی هیومدا سوودی کۆمەڵایەتییە، بەپێی ئەو واتایەی کە هیوم دەڵێت یاسا و دامەزراوە حکوومییەکان لەپێناو قازانجی گشتی کە لە ماوەیەکی دووردا لەگەڵ قازانجی تاکەکاندا یەکدەگرێتەوە و تاکەکان لە ماوەیەکی دووردا لەگەڵ قازانجەکانی خۆیاندا دەیگونجێنن دروستدەبن. هیوم بە دوورکەوتنەوە لە چەمکی مافی سروشتی باشەی بە لەپێشتر دانا لە ماف و مافی بەو شتەلێکدایەوە کە باشە و قازانج دەگەیەنێتە ئەوپەڕی. لەپێشتردانانی باشە بەسەر مافدا بەواتای جیاکردنەوەی هەرچی زۆرتری بواری کۆمەڵگای مەدەنی لە بواری حکوومەت بوو.

تیۆرەکەی بێنتهام دەربارەی فەرمانڕەوایی و جیاکردنەوەی چەمکی فەرمانڕەوایی لە چەمکی حکوومەت کەم و کورتی تیۆرەکەی هۆبز لەلایەك و تیۆرەکەی لۆکیش لەلایەکی ترەوە چارەسەرکرد. بێنتهام بە جیاکردنەوەی ئەم دوو چەمکە سنووری ئەخلاقی لە سنووری ماف جیاکردەوە. بێنتهام بە پێچەوانەی هۆبزەوە هیچ پەیوەندییەکی پێویست لەنێوان ڕەهابوونی بنەڕەتی فەرمانڕەوایی و ملکەچی لێکردنی ڕەها لە فەرمانڕەوا بەدیناکات. لە تیۆرەکەی ئەودا مەبەست لە ڕەهابوونی فەرمانڕەوایی واتە دەسەڵاتی تەواوی دەسەڵاتی یاسادانەری کە هیچ پەیمانێك بە ئاشکرا سنوورداری ناکات. بەڵام هەبوونی فەرمانڕەوایی باڵا لەلایەن دەسەڵاتی یاسادانەرییەوە بەو واتایە نییە کە دەبێت ئەم دەسەڵاتە بڕیار لەسەر دراوەکانی خۆی بخاتە جێبەجێکردنەوە. دەسەڵاتی یاسادانەری لەو ڕووەوە دەسەڵاتی باڵا و خاوەن فەرمانڕەوایە کە هیچ کەسێك مافی سەرپێچی لێکردنی یاسابڕیار لەسەر دراوەکانی ئەوی نییە و هیچ پەیمانێك نییە ئەم یاسایە ناچار بکات کە بڕیار و بڕیار لەسەردراوەکانی خۆی لەگەڵ ئەودا بگونجێنێت. دەسەڵات تەنها لەم ڕووەوە بێسنوورە نەك لە هیچ ڕوویەکی ترەوە. بێنتهام لە بەرامبەر بنەڕەتی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی مۆنتیسکیۆشدا دەڵێت درێژکردنەوەی دەسەڵاتێك بە دەسەڵاتێکی تر بەواتای ڕەتکردنەوەی بنەڕەتی فەرمانڕەوایی نییە، دەسەڵاتی یاسادانان دەسەڵاتی فەرمانڕەوایە بەڵام دەسەڵاتی تایبەتی نییە.





## دیموکراسیی نوێنەری

تیۆری دیموکراسی نوێنەریش یەکێکی ترە لە دەستکەوتەکانی بێنتهام و بیرمەندانی شوێنکەوتووی ئەو. بێنتهام لەسەربنەمای گریمانەکانی خۆی دەربارەی هێزی پاڵنەری تاك دیموکراسی نوێنەری بونیاد دەنێت. لە تیۆرەکەی بێنتهامدا هێزی پاڵنەری تاك و مێژوو بریتییە لە بەدواداگەڕانی خۆشی و دوورکەوتنەوە لە ئازار. خۆشی و (ڕووەکەی دیکەی ئەو، واتە دوورکەوتنەوە لە ئازار) نەك تەنها هێزی بزوێنەری مرۆڤە بەڵکو پێوەری دروست و نادروستیشە. باشی کارێك و دروستی پاڵنەر لە ڕیزی چۆنیەتی زاتیی شتەکانن کە لە هەستەکاندا ڕەنگدەدەنەوە. قازانجی گشتیش شتێك نییە جگە لە کۆی قازانجی ئەو تاکانەی کە کۆمەڵگا پێکدەهێنن. کەوابوو سوودی گشتی یان سوودمەندیی گشتی بناغەی دەوڵەتە. بەڵام بۆچی دیموکراسی نوێنەری باشترین فۆرمی دەوڵەتە؟ بێنتهام ئەمەیش لە گریمانە پێشینەکانی خۆیەوە وەردەگرێت. بەڵگەهێنانەوەی ئەو لەم بارەیەوە بەم جۆرەیە: مرۆڤەکان قازانجگەلێکیان هەیە کە باشترین دادوەر لەم بارەیەوە خۆیانن، بەم پێیە مرۆڤەکان مافی یەکسانیان هەیە لە بەدواداچوونی قازانجەکانی خۆیان و دیموکراسی نوێنەریش باشترین ئامرازی ڕەنگدانەوەی ئەم یەکسانییەیە.

لایەنگرانی سوودگەرایی یەکسانیان بە لەپێشتردانا لە ئازادی، بەم جۆرە ئازادیان گۆڕی بۆ ئامراز. لە تیۆرەکەی بێنتهام و جێمزمیلدا ئازادی ئامرازی بەدەستهێنانی خۆشیی تاك و خۆشیی گشتییە. بەپێی ئەم تێڕوانینە لە کاتی دۆزینەوەی شوێنگرەوەیەك کە بتوانێت بە شێوەیەکی باشتر خۆشی تاکەکان دابین بکات دەکرێ چاوپۆشی لە ئازادی بکرێت. بەهەمان شێوە ئەگەر خۆشی گشتی و زۆرترین قازانجی زۆرترین ژمارەی تاکەکان لەبەرچاو بگیرێت بۆچی حکوومەت نەتوانێت لە کاتی پێویستدا ئازادییەکان بکاتە قوربانی خۆشی و خۆشگوزەرانیی ئابووری؟ لەوها تێڕوانینێك بۆ دیموکراسی کە هەندێك بە دیموکراسی بازاڕ ناویان بردووە ناکرێت وەها ئەگەرێك ڕەتبکرێتەوە. وەها تێڕوانینێك کاردانەوەی لای کانت و ڕۆسۆ بۆ بەرگریکردن لە ڕێزداری مرۆڤ دروستکرد و کانت لە چەقی تیۆرداڕێژی خۆیدا مرۆڤی وەك ئامانج تەماشاکرد نەك وەك ئامراز.

هەروەها ئەو بنەڕەتەشی کە تیۆری دیموکراسی بێنتهام و تەواوی فەلسەفەی سیاسی ئەو لە سەری دامەزراوە ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی گەورەیە. ئەو بنەڕەتەی کە بە ئەوپەڕگەیاندنی

خۆشی و هەرچی کەمترکردنەوەی ئازار بە پاڵنەری سەرەتایی کرداری مرۆڤ دادەنێت جیا لە دووبارە بێژییەك[1] هیچی تر نییە. ئایا ئەوە دووبارە بێژی نییە گەر بڵێین مرۆڤ بەدوای خۆشییەوەیەو خۆشی ئەو شتەیە کە مرۆڤ دەیەوێت؟ هەروەها دانانی تیۆری ئەخلاقی لەسەر تیۆری دەروونناسی لەلایەن بێنتهامەوە کارێکی زیادە بوو. ئەگەر چێژ و ئازار فەرمانمان پێدەدات کەچی بکەین لەم حاڵەتەدا ئەوەی بەپێی بنەڕەتی دەروونناسی ئەنجامیدەدەین هەمان ئەو شتەیە کە لەرووی ئەخلاقییەوە دەبێت ئەنجامی بدەین.

لە تێڕوانینی سوودگەراییدا هەماهەنگی نییە لە نێوان قازانج و دادپەروەری و باشە و مافدا. لە روانگەی ماف و دادپەروەریدا هەموو کەسێك سەبارەت بە دادپەروەری و ئازادی مافگەلێکی هەیە کە خۆشی خەڵکانی تر هەرکێشێکی هەبێت و تەنانەت تەواوی کۆمەڵگاش لەخۆبگرێت ناتوانێت رێگری بە هەرەمەندبوونی تاك بێت لەو مافانە. لە کاتێکدا کە لە روانگەی سوودگەراییدا قازانجی هەندێك زیانی تاك یان کۆمەڵێکی بچووکتر دیاریدەکات، وای دابنێ لە سێدارەدانی بێتاوانێك رێگە لەسەرهەڵدانی خراپەیەکی گەورەتر کە رەنگە ناوچەیەك لەخۆبگرێت و ببێتەهۆی زیانێکی گەورەتر دەگرێت، ئایا دەکرێت لە روانگەی سوودگەراییەوە فەرمانی وەها لە سێدارەدانێك رەتبکرێتەوە؟

ستوارت میل بۆ چارەسەرکردنی کەموکورتییەکان و هەندێك لە ناکۆکییەکانی سوودگەرایی بابەتی بە جیاواز زانینی چێژە چۆنی و چێژە چەندییەکان و بایەخدان بەسەرچاوەی چێژ و خۆشیی خستەروو. بەڵام ئەم تیۆرەش بۆخۆی توشی ناکۆکیگەلێکی نوێ هات. لەوانەش جیاکردنەوەی خۆشییەکان لەرووی چۆنی و بە لەپێشتردانانی خۆشییە چۆنییەکان بەسەر خۆشییە چەندییەکان (لە کاتێکدا کە بێنتهام تەنها لەرووی توندی و بەردەوامی و ئەگەرەوە بەشیاوی بەراوردکردن لەگەڵ یەکتر دانابوو) لەگەڵ بنەڕەتی یەکسانیدا نەدەگونجا. ئەگەر بۆچوونی میل بە پێچەوانەی بۆچوونی بێنتهام دابنێین بەو جێیە دەگەین کە خۆشیی ئەوانەی تواناو لێهاتوویی بەرزتریان هەیە بە بەهاترە لە خۆشیی ئەوانەی کە خاوەن چێژگەلێکی خوارتر و پایەنزمترن.

ستوارت میل دەڵێت تەنها مەبەستێك کە دەکرێت لە کۆمەڵگایەکی خاوەن ژیاردا لە پێناویدا سوود لە زەبر و زۆر وەربگیرێت ئەوەیە کە تاك لە قسە بە خەڵکی کردن دوور

1- Tautoloy.





بخەینەوە. بەڵام ئەم بنەڕتە بە توندی مشتومڕهەڵگرە. بۆ نموونە ئەم پرسە رووبەرووی رادەوەستێت کە چۆن هێڵی جیاکردنەوە لە نێوان ئەو کارانەی کە پەیوەست دەبێت بە خەڵکانی تریشەوە و ئەو کارانەی کە تەنها پەیوەست دەبێت بە خودی کەسەکەوە بکێشین. هیچ کردارێك نییە کە تەنها کاریگەریی بۆ سەرکەسی بکەر هەبێت و خەڵکانی تریش نەگرێتەوە. جیاکردنەوەی سنووری تایبەتی و سنووری گشتی ژیان لە یەکتر زۆر دژوارە. جگە لەمە چەمکی ئازادی بەو جۆرەی کە ستوارت میل و لایەنگرانی سوودگەرایی باسی لێوەدەکەن زیاتر بایەخ بە چوارچێوەی چاودێری و کۆنترۆڵی حکوومەت دەدات تا ناوەرۆکی حکوومەت. ئەو خاڵەی کە حکوومەت تاکوێ دەست لە ژیانی تاکدا وەردەدات لەگەڵ ئەوەی کە چ کەسانێك حکوومەتی بەسەر دادەکەن لەرووی لۆژیکییەوە جیاوازییەکی زۆری هەیە.

## ویستی تاك و ویستی گشتی

لە کۆمەڵگای دامەزراو لەسەر بازاڕ و دیموکراسیی دامەزراو لەسەر بازاڕ دەربڕینێك بۆ عەقڵانیەت خرایەڕوو کە بەپێی ئەو هەموو کەسێك بۆخۆی بڕیاردەدات و ئەنجامی بڕیارەکەشی ئاراستەی خۆیەتی. سوودگەرایی وەها شێوازێك بە گونجاو لەگەڵ قازانجی کۆمەڵگا و ئازادی لەقەڵەمدەدات. بەڵام ئەم ئازادییە تەنها وەهمێکە و هیچی تر، چونکە بڕیاری تاکەکەس کاریگەرییەکی زۆر کەم دەکاتە سەرکاری گشتی. تاك لە دەرەوەی ئەوەی کە پەیوەست دەبێت بەبڕیاری ئەوەوە رووبەرووی هەلومەرجێکە کە کاری ئەو نییە و ئەنجامی ملیۆنەها ویستی ترە کە هەموو ئەوانیش گرفتاری هەمان بارودۆخن. ئەوەی ئەم ویستە پەرت و بڵاوانە بەیەکەوە دەبەستێتەوە یاساکانی کۆمەڵگایە. لە ئەنجامدا ئەو ویستە جیاکەوتوانەی کە بەبێ بایەخیەوە دەڕواننە کاری گشتی، بۆ نموونە یاساکانی کۆمەڵگا بە پێچەوانەی رواڵەتەوە زۆر ئازاد نین. ئەگەر ئازادی ئەوەیە کە ئەو شتەی ژیانی من دروستدەکات دەبێت لەلایەن خودی منەوە دیاریبکرێت لەم حاڵەتەدا هەرچەندە من بکەومە بارێکەوە کە تەنها بەشێکی کەمی کاروبارەکان پەیوەستبن بەبڕیاری منەوە بە هەمان ئاست من لە ئازادی دووردەکەومەوە ئازاد نابم. ئازادی ئەوەیە کە تەواوی ئەو شتانەی کە هەلومەرجی ژیانی من دروستدەکەن پەیوەستبن بە بڕیاری منەوە. هەڵبەتە لەو جێیەوەی کە

ئەنجامی گشتی و هەلومەرجی گشتی کارێکی کۆمەڵایەتییە شتێکی سروشتییە کە ناکرێت تەنها لە لایەن منەوە دیاریبکرێت، بەڵام ئەگەر من لەگەڵ هەموو ئەو کەسانەی کە لە کۆمەڵگای سیاسی مندا ژیان بەسەردەبەن بەیەکەوە بکەوینە بڕیاردان دەربارەی کاری گشتی ئەوکات ئەو بڕیارەی کە بەم جۆرە وەردەگیرێت بڕیاری منیشە. بەواتایەکی تر من سەبارەت بە تەواوی ئەو هەلومەرجانەی کە ژیانی من لە سنووری ئەواندایە بڕیارمداوە. لە ئەنجامدا سنووری ئازادی من زۆر بەرفراوانتر دەبێت تەنانەت ئەگەر رەنگی پێچەوانەیشم بە بڕیاری کۆتایی دابێت. ئەمە پەرجوی فەرمانڕەوایی ویستی گشتی رۆسۆ و بەشداری گشتی و هەموانیی هیگڵە. ئازادی راستەقینە لە هەڵبژاردنە تاکەکەسیەکاندا نییە بەڵکو لە بەشداری کردنی ویستی گشتیدا.

رۆسۆ حاڵی دەستپێکی خۆی لە هەمان ئەو بنەمایەوە دەستپێدەکات کە هۆبز لێیەوە هەنگاوی نابوو، بەڵام بە نۆرەی خۆی ئەنجامگەلێك وەدەستدەهێنێت کە جیاوازە لە تیۆرەکانی هۆبز و لۆك لەلایەك و تیۆرەکانی بیرمەندانی سوودگەرایی لەلایەکی ترەوە. رۆسۆ لە هەڵسەنگاندنی گرێبەستی کۆمەڵایەتی هۆبز و لۆکدا رایگەیاند کە لەراستیدا ئەم گرێبەستە کۆمەڵایەتییە دەوڵەت دروستناکات بەڵکو کۆمەڵگایەکی یاسایی دروستدەکات کە بوارێکە بۆ رکەبەرێتی قازانجە تایبەتییەکان. هەموو تاکەکان لە رێگەی ئەم گرێبەستەوە هاورابوونە کە تەنها بەدوای قازانجەکانی خۆیاندا بچن و ئەم رێکەوتنە تەنها خاڵی پەیوەندی نێوانیانە. بێ بناغە نییە کە لە کۆتاییدا تێڕوانینی سوودگەرایی لەوەها روانگەیەکەوە سەردەربێنێت.

رۆسۆ دەڵێت هەموو ئەو کەسانەی کە تاکاتی ئەو لە بونیادەکانی کۆمەڵگایان کۆڵیوەتەوە هەستیان کردووە کە دەبێت بگەڕێنەوە بۆ باری سروشتی یان بونیادی دەروونیی مرۆڤ و لەوێوە بەدوای خاڵی دەستپێکی باری مەدەنیدا بچن. بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە هیچ یەکیان بەراستی بەو جۆرەی هەبووە نەگەڕاونەتەوە بۆ باری سروشتی، بەڵکو گەڕاونەتەوە بۆ باری مەدەنی و مرۆڤی خاوەن ژیاریان لەگەڵ مرۆڤی سروشتیدا تێکەڵ بەیەك کردووە. مرۆڤی سروشتی بێبەشە لە عەقڵ و هەربۆیەش بێبەشە لە ئازادی یان هەر خەسڵەتێکی دی. ئازادی بەبێ بەهرەمەندبوون لە عەقڵ هیچ واتایەکی نییە و عەقڵ بەزمان و زمانیش بە کۆمەڵگا دروستدەبێت. لەبەرئەوەی زمان سروشتی نییە کەوابوو عەقڵیش سروشتی نابێت. هەڵەی هۆبز لەو [illegible] بوو کە وایدەزانی مرۆڤ بەر لە بە کۆمەڵایەتی بوون بوونەوەرێکی عەقڵانی بووە و





توانیویەتی پەیمان دروستبکات و گرێبەست ببەستێت. وتەکەی هۆبز کاتێك واتادار دەبێت کە مرۆڤی جێ مەبەستی ئەو بە مرۆڤی کۆمەڵایەتی لەقەڵەمبدەین.

رۆسۆ لە بونیادی حکوومەتدا بنەڕەتی رازیبوون و رێکەوتنی گۆڕی بۆ بنەڕەتی بەشداری بەردەوام و ئەمە بۆخۆی هەنگاوێکی مەزن بوو لە بەرەو پێشەوەبردنی پرۆژەی بیری نوێدا. لە تیۆرەکەی هۆبز و لۆکدا تاکەکان بە بەستنی گرێبەستی کۆمەڵایەتی تەنها بۆ جارێك رەزامەندیان نواندووە بەرامبەر بە بەکارهێنانی زەبر و زۆر لەلایەن حکوومەتەوە و لەوە بەدواوە دەوڵەت بۆ هەتا هەتایە ئازادە لە سوود لێوەرگرتنی ئەم مافە. بەواتایەکی تر لە تیۆرەکەی هۆبز و لۆکدا ویستی خەڵکی لە دامەزراندنی حکومەتدا لەبەرچاوگیراو بوو بەڵام لە درێژەی کارەکەدا حکوومەت لەبەرچاو دوورکەوتبووەوە، بەڵام رۆسۆ بڕوای وایە کە رازیبوونی یەکەم لە گرێبەستی کۆمەڵایەتیدا لەرووی ئەخلاقییەوە کارەکانی پاشتری فەرمانڕەوا پاساو ناکات. رۆسۆ لە هیچکات و ساتێکدا پەنابردن بۆ زەبر و زۆر بەرێگەپێدراو دانانێت و بڕوای وایە کە ئەگەر تاك لە هەرساتێکدا ناچاربێت بە ملکەچی لێکردن لەرووی ئەخلاقییەوە ئەرکی ملکەچیکردنی لێدەسەندرێتەوە.

ئێستاکە زەبر و زۆر ناتوانێت شتێکی پاساو کراوبێت ئەی چ شتێك دەتوانێت دەوڵەت بۆ دامەزراوەیەکی ئەخلاقی بگۆڕێت؟ بەپێی تیۆرەکەی رۆسۆ رازیبوونی هاوڵاتیان مەرجە بۆ سوود وەرگرتن لە زەبر و زۆر بەڵام نەك تەنها لە کاتی بەستنی گرێبەستدا بەڵکو بەشێوەیەکی بەردەوام و لە رێگەی بەشداری لە ویستی گشتییەوە. لە گرێبەستی جێ مەبەستی رۆسۆدا هەموو کەسێك دەسەڵاتی خۆی دەخاتەژێر رێبەریکردنی باڵای ویستی گشتییەوە و وەکو بەشێکی جیانەکراوەی کۆمەڵێك وەردەگیرێت. بەم گرێبەستە هەیکەلێکی ئەخلاقی دروستدەبێت کە دەبێتە شوێنگرەوەی یەك بەیەکی تاکەکان. ئەم هەیکەلە ئەخلاقییە یان دەوڵەتە، ژیان و ویستی تایبەتی خۆی هەیە. تاکەکان وەکو ئەندامانی ئەم هەیکەلە ئۆرگانیکە بەشدارن لە ژیانێکی عەقلانیدا. ئێستا کردارەکانیان بەپێی فەرمانی عەقڵە نەك پاڵنەری غەریزەکان. بەم جۆرە بەپێچەوانەی تێڕوانینی میکانیکیی هۆبز و لۆك و سوودگەرایی دەوڵەت ئامێر یاخود وەکو کەرەستەیەك نییە بەڵکو بریتییە لە ئۆرگانیزمێك.

## بەشداریی لە ویستی گشتی

ڕۆسۆ بەدوای وەها سیستەمێکی ژیانی گشتییەوە بوو کە تیایدا تاك وێڕای ئەوەی لەگەڵ هەمواندا یەکگرتووە و لە یەکێتیدایە لەگەڵیاندا هێشتا پەیڕەوی لەخۆی بکات و وەکو بەر لە پەیوەندیکردن بە کۆبوونەوەی سیاسییەوە بە ئازادی بمێنێتەوە. وەها کارێك بە بەشداریکردن لە ویستی گشتی یان بەشداریی گشتی و هەموانی دێتەدی. بەشداری گشتی و هەموانی واتە چی؟ ئەگەر تۆ پەیوەندی بە کۆمەڵێکەوە بکەیت سروشتییەکە قازانجە تاکەکەسییەکانی خۆت لەبەرچاودەگرێت و بۆ وەها مەبەستێك رووت لەم کارە کردووە. بەلاّم ئەگەر تۆ و هەموو کەسەکانی تر تەنها بیر لە قازانجە خۆپەرستانەکانی خۆیان بکەنەوە و هیچ بایەخێك بە قازانجی هاوبەش نەدەن ئیدی شوێنێك بۆ کۆمەڵەکە نامێنێتەوە. کەوابوو تۆ و کەسەکانی تر ناچارن تەنها بیر لە قازانجە خۆپەرستانەکانی خۆتان نەکەنەوە و بایەخ بە قازانجی کۆمەڵیش بدەن. ئەگەر وەها بکەن ئەو کۆمەڵە دەبووژێتەوە و گەشە دەکات، ئەوکات گیانێکی بە کۆمەڵ دروستدەبێت، و دەکرێت ئەمە بەویستی گشتی ناوببرێت. ویستی گشتی ویستی ئەو هاولاّتیانەیە کە بەدوای قازانجە تایبەتییەکانی خۆیانەوە نین بەڵکو قازانج و باشەی هاوبەش لەبەرچاو دەگرن. ویستی گشتی واتە ویستی هەمووان بۆ باشەی گشتی. وەها بەشدارییەك بەشداریی گشتی و هەموانیە.

## ئازادی تاك و کۆتی ملکەچیکردن لە دەوڵەت

بیرمەندانی پێش ڕۆسۆ چ ئەوانەی ئازادی تاکیان بە پشتبەستن بە مافی سروشتی دیاریدەکرد و چ ئەوانەی کە بەپێی خوازراوبوونی بنەڕەتی بە دواداگەڕانی قازانج پاساویان دەکرد هەردوو لە روونکردنەوەی عەقلاّنیەتی دەوڵەتدا رووبەرووی گرفتێکی لۆژیکی بوون. ئەم گرفتەش ئەوەبوو کە چۆن دەکرێت بنەڕەتی ئازادی تاك لەگەڵ کۆتی ملکەچیکردن لە حکوومەت و دەوڵەت بگونجێندرێت؟ ئەگەر تاکەکان لە کۆمەڵگای سیاسیدا کۆبوونەتەوە تاوەکو پارێزگاری لە سامان و ئازادی خۆیان بکەن، ئایا بە قبووڵکردنی کۆتگەلێك کە بە ناچاری پەیڕەوی لێکردنی دەوڵەتیان بەسەردا دەسەپێنێت ئازادی خۆیان لە دەستنەداوە. ئایا دژیەك بێژی نییە گەر بڵێین تاکەکان بە پەیڕەوی لێکردنی دەوڵەت و ملکەچی لێکردنی ئازاد دەبن





چارەسەرکردنی ئەم گرفتە لۆژیکییە یەکێکی ترە لە دەستکەوتەکانی ڕۆسۆ لە بواری بیری سیاسیدا، هەروەها یەکێکە لە بنەما گرنگەکانی پرۆژەی بیری سیاسیی نوێ دەربارەی عەقلاّنیەتی دەوڵەت. چارەسەکردنی ئەم گرفتە بە تیۆری ویستی گشتیی ڕۆسۆ هاتەدی. ڕۆسۆ دەڵێت تاکەکان لە کۆمەڵگادا و لە ناو دەوڵەتدا جگە لە یاسا نابنە شوێنکەوتووی هیچ کەسێك و یاساش دیارخەری ویستی گشتی و ویستی راستەقینەی ئەوانە. هەموو کەسێك بە ملکەچیکردن لە یاسا پەیڕەویی لە ویست و عەقڵی خۆی دەکات و پەیڕەویکردن لە عەقڵ و ویستی خود واتە ئازادبوون. تیڕوانینی سوودگەرایی نەیدەتوانی وەلاّمی ئەم گرفتە بداتەوە. لە سوودگەراییدا هەموو کەسێك بەدوای قازانجی تایبەتیی خۆیدا دەگەڕێت و قازانجی گشتی تەنها بەرهەمی کۆی قازانجە پاژییەکانە.

## ویستی گشتی و خود ڕێسایی ویست

هۆبز وێڕای ئەوەی کە لە پێکهێنانی کۆمەڵگای سیاسیدا ویستی مرۆڤی بە بنەڕەت دانابوو بەلاّم بە تواندنەوەی ئەم ویستە لە ویستی فەرمانڕەوای رەهادا نەك تەنها بنەڕەتی رازیبوونی لە دامەزراندنی دەوڵەت و بەڕێوەبردنیدا کاڵکردبووەوە بەڵکو پێگەی ئەم ویستەی لە یاسادانانیشدا لاواز کردبوو. لە روویەکەوە کاری بیرمەندانی پاش ئەو بریتیبوو لە گەڕاندنەوەی ویست بۆ خاوەنە سەرەکییەکەی واتە خەڵکی. تیۆری ویستی گشتیی ڕۆسۆ درێژەی ئەم هەوڵەبوو لە بەرزترین ئاستیدا. دەبوو ((ویستی گشتی))ی ڕۆسۆ لە ڕێڕەوی کامڵبوونی خۆیدا بگۆڕێت بۆ ((ویستی ئەخلاقی)) و ((ویستی عەقلاّنی)) و دەوڵەتە دەرەکییەکەی بگۆڕێت بۆ دەوڵەتی ناوەکی و لەئاکامیشدا بۆ سەنتێزێکی دەوڵەتی دەرەکی و ناوەکی تاوەکو گرفت و کەموکورتییەکانی تری نێو بیری سیاسی بۆ گەیشتن بە وێستگەی مەبەست چارەسەر بن. ئەم دوو هەنگاوەی دوایی لە ئەستۆی کانت و هیگڵدا بوو.

لە تیۆری سیاسیی ڕۆسۆدا جیاوازی نێوان ئەو شتەی کە ئەو بە ((ویستی راستەقینە)) لەلایەك و ((ویستی هەبوو))ی تاك لەلایەکی ترەوە پێناسەی دەکرد کارێکی بەدوور نەبوو. واتە ئەگەری ئەوە هەبوو کە هەماهەنگی لەنێوان ویستی هەبووی تاك و ویستی گشتی کە ((ویستی راستەقینە))ی ئەوە نەبێت. لەوەها هەلومەرجێکدا بوو کە دیکترینی ((ناچارکردن بە ئازادی)) خرایەروو. کانت ویستی بەتەواوی ویست بەرەو سنووری عەقڵی کردەیی پەتی

بەرێت و دەوڵەت لە ویستی عەقڵانیی تاکەکانەوە هەڵبهێنجێت و لەسەر ئەم بنەمایە رایبگەیەنێت کە عەقڵی پەتیی کردەیی لەسەربنەمای بیری پێشینی خوازیاری ئەوەیە کە خەڵکی وەکو بوونەوەرگەلێکی خاوەن عەقڵ ببنە شوێنکەوتووی سیستەمی یاساکان.

بۆ روونکردنەوەی زیاتر دەتوانین بڵێین کە رۆسۆ چەمکەکانی ویست و ئەخلاق و ئازادیی بەو شێوەیەی کە دەبێت هەبێت پێناسە کردبوو و بۆخۆی پێی وابوو کە رەنگە مرۆڤ بە رێگەی هەڵەدا بچێت و خەڵکی یاساگەلێکی نادروست هەڵبژێرین. لەم حاڵەتەدا خەڵکی رێگەی نادروستیان هەڵبژاردووە و سەربەخۆیی خۆیان لەدەستداوە. بەم جۆرە بوو کە پرسی (یاسادانەر)) و رێنماییکردنی خەڵکی لەلایەن یاسادانەر و سەر ئەنجام ناچارکردن بە ئازادی چوەناو تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆوە. ئەو ((یاسادانەرە))ی کە لە تیۆرەکەی رۆسۆدا هاتووە یاسادانەرێکی دەرەکییە. کانت ((یاسادانەر))ی گۆڕی بۆ ((خودیاسادانەر))، بەم جۆرە ناکۆکیی نێو تیۆرەکەی رۆسۆی چارەسەرکرد.

رۆسۆ ئەخلاقی بوونی ئازادیی بەستەوە بە عەقڵانی بوونی یاساوە، بەلاّم خودی ئەخلاقی لە عەقڵەوە هەڵنەهێنجاو ئەم کارە گرنگە لەلایەن کانتەوە ئەنجامدرا. لە دیکترینی ((فەرمانی رەها))ی کانتدا ئەخلاق لە عەقڵ و ئەخلاقیەت لە عەقلانیەتەوە هەڵدەهێنجێندرێت. لە کاتێکدا کە ناکرێت لە تیۆرەکەی رۆسۆدا چەمکی ویست وەکو بنەڕەتی کردار دابنرێت و لە هەلومەرجی کاتی و شوێنی و نەتەوەیی جیابکرێتەوە، بەلاّم دەکرێت فەرمانی رەهای کانت وەکو بنەڕەتی گشتی کردار دیاری بکرێت و بەدوور لە هەلومەرجی دەرەکی تەماشابکرێت.

رۆسۆ دەربارەی پرسی بە یەککردنی سەرچاوەی مەشروعیەتی سیاسی لەگەڵ ویستی خەڵکی چەند تەنگەژەیەکی لە تیۆرەکەی خۆیدا هەڵگرتووە. پرسەکە لەوەدایە ئەگەر فەرمانڕەوایی لای ویستی گشتییە لەم حاڵەتەدا هیچ شتێکی سەروتر لەو بوونی نابێت و سەرچاوەیەکی مەشروعیەتی تر لە دەوڵەتدا نییە. لە کاتێکدا رۆسۆ فەرمانڕەوایی بە یاسا بەخشیوە، واتە یاسا پاش دروستبوون لە لایەن خەڵکییەوە فەرمانڕەوایی بالاّ وەردەگرێت. بەلاّم ئەگەر قبوولّبکەین کە یاسا بەرهەمی ویستی بە کۆمەڵ و ویستی گشتییە ئەوکات ئەوەی دەبێتە دەسەلاّتی بالاّ کاری سیاسیی خەڵکییە نەك یاسا. رۆسۆ بە فەرمانڕەوا دانانی یاسا ئەگەری کەلێن تێکەوتنی نێوان خودرێسایی ویستی تاك و ویستی گشتی، هەروەها






ئەگەری لێك جودابوونی ویستی سیاسی و عەقڵانیەتی سیاسیی هێناوەتە ئاراوە. کانت ویستی بەتەواوی ویست لە هەلومەرجی دەرەکی جیابکاتەوە و لە هەموو روویەکەوە بێ مەرجی بکات. لە کاتێکدا کە هێشتا ویستی عەقڵانیی نێو تیۆرەکەی رۆسۆ پێویستی بە بزوێنەرێك هەیە لە ناو ناخی سروشتی مرۆڤدا یان یاسایەکە کە ((بە پیتگەلێکی دور لە سڕانەوە لە ناو دڵی مرۆڤدا هەڵکەندراوە)) ویستی عەقڵانیی نێو تیۆرەکەی کانت بە تەواوی عەقڵانییە. کانت بە تەواوی پەیوەندی عەقڵ و ئەخلاقی بە سروشتەوە لێك پچڕاند و بەستییەوە بە عەقڵی کردەییەوە وەکو بنەڕەتی پێشینە. لە تیۆرەکەی کانتیشدا ویستی گشتی لەگەڵ خودرێسایی ویستدا یەکیان گرت.

### ویستی ئەخلاقی و ویستی عەقڵانی

کانت چەمکی ((ویستی گشتی)) وەکو ویستی رووەو باشەی لە رۆسۆوە وەرگرت و بەهەمان شێوە پەیوەندی نێوان رووی گشتیی یاسا لەگەڵ رووە ئەخلاقییەکەی. ئەم دووە بوونە بنەڕەتی بناغەی تیۆری ((خودرێسایی ویست))ی کانت. رۆسۆ کۆمەڵگای وەکو بوونەوەرێکی ئەخلاقیی خاوەن ویست دیاری کردبوو و رایگەیاندبوو کە ویستی گشتی بەردەوام باشە و خۆشبەختیی گشت و بەش لەبەرچاو دەگرێت و وەکو پێوەری دەستنیشانکردنی رەواو ناڕەوایە بۆ هەمووان. بیرۆکەی گشتیبوونی یاسا یەکێکە لە سەرچاوەکانی ئیلهامی کانت و بووە سەرەداوی دیکترینی فەرمانی رەهای ناوبراو. کانت بەدیکترینی فەرمانی رەها و هۆشی بالاّ ناکۆکیی تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆی چارەسەرکرد. هەروەك ئاماژەی پێکرا ئەم ناکۆکییە بەم شێوەیە بوو کە رەنگە ئەو میکانیزمەی لە کۆمەڵگادا دیارخەری ویستی گشتییە بەردەوام بە دروستی کار نەکات و ویستەکەی رووەو باشە نەبێت. هەر لەبەرئەمە بوو کە رۆسۆ جیاوازی دانابوو لە نێوان ((ویستی گشتی)) و ((ویستی هەمووان)). گەرچی ویستی هەمووان ویستی هاوبەشە بەلاّم لەبەرئەوەی رووەو باشەی گشتی نییە بە ویستی گشتی لەقەڵەمنادرێت. ویستی گشتی لەو رووەوە جیاوازە لە ((ویستی هەمووان)) کە جیا لەوەی ویستی هاوبەشە رووەو باشیشە. بەلاّم رۆسۆ پێوەرێکی نەخستبووە بەردەست تاوەکو بزانین کام میکانیزم نوێنەری ویستی گشتییە و کام نوێنەری ویستی هەموانە.

کانت لەم ڕووەوە بەدوای کارەکەی ڕۆسۆ داچوو و دیکترینی ((خۆ یاسادانەری))ی ویستی خستەڕوو. ویستی عەقڵانی شوێنکەوتووی یاساگەلێکە کە خۆی دایدەنێت. ئەم یاسایە گشتی و پێویستە. یاسا دۆزینەوەی عەقڵی تیۆری نییە بەڵکو فەرمانی عەقڵی کردەییە واتە بەرهەمی ویستی ئازادە. ئەمە ئەو شتەیە کە بە شۆڕشی کۆپەرنیکیی کانت ناوی دەرکرد. کانت بەم جۆرە کێشەی ڕێژەیی بوونی ئەخلاقی چارەسەرکرد و پێگەیەکی نوێی بۆ ڕەهابوونی بنەڕەتی ئەخلاقی دروستکرد. کانت ئەو پایەیەی کە ڕۆسۆ بۆ ((ویستی گشتی)) لەبەرچاوی گرتبوو بە ((ویستی باش))ی بەخشی. ویستی باش ویستێکە کە بەبێ کۆت و مەرج و هەموو مەبەستێکی دەرەکی باشە. بەم پێشەکیانە کانت ویستی عەقڵانیی وەکو توانایی ڕێساسازی غەریزەیی مرۆڤ ناساند. بەم جۆرە کارەکەی هۆبزی گەیاند سنووری لۆژیکی خۆی و لە هەموو ڕوویەکەوە ویستی ئازادی کردە بناغەی کۆمەڵگای سیاسی.

هەروەها کانت بە شێوەی تایبەتی خۆی پرسی هاوسازی لۆژیکیی ئازادی لەگەڵ ناچارکردن بۆ پەیڕەوی کردن لە یاسا و شوێنکەوتنی دەوڵەتیشی چارەسەرکرد. هەروەك باسمانکرد ڕۆسۆ بەم جۆرە ئەم پرسەی چارەسەرکرد کە چۆن فۆرمێکی کۆمەڵ یان کۆبوونەوەی سیاسی بدۆزینەوە کە تیایدا بەهێزی هەمووان پارێزگاری لە تاك و باشەی هەموو ئەندامان دەکرێت و تاك لەوکاتەی کە لەگەڵ کەسەکانی تردا یەکی گرتووە و ویستی خۆی پەیوەست کردووە بە ویستی گشتییەوە جیا لە خۆی ملکەچی لە هیچ کەسێکی تر نەکات و وەکو پێشتر ئازاد بێت. کانت بە شێوەی گونجاندنی خودرێسایی ویستی تاك لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیی دەوڵەت ئەم پرسەی خستەڕوو و چارەسەریکرد.

بە بۆچوونی کانت دەسەڵاتی سیاسی واتە مافی ڕاگەیاندنی یاساکان و جێبەجێکردنیان بە بەهرەمەندبوون لە مافی تایبەتیی سوود وەرگرتن لە زەبر و زۆر و ناچارکردنی ڕێگەپێدراو واتە ناچارکردنێك کە خەڵکی بە فەرمی ناسیویانە. بەم پێیە یاسا لە بنەڕەتدا فەرمانی ناچارکەری فەرمانڕەوایە بۆ ئەو هاوڵاتیانەی کە ئەرکدارن بە ملکەچی لێکردن. بەڵام لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدات و پرسیارەکەیش ئەوەیە کە چۆن بنەڕەتی خودرێسایی یان خۆیاسادانەری لەگەڵ پابەندبوون بە یاسای کەسانێکی ترەوە دەگونجێت. دەبێت پابەندبوون بە یاسای کەسانێکی تر خاڵی بەرامبەری خودرێسایی بێت، بۆیە ((ناخودرێسایی))یە. ئێستا کە دەسەڵاتی سیاسی لەخۆگری ناخودرێساییە ئایا ناکۆکی لە تیۆری سیاسی کانتدا





بەرچاوناکەوێت؟ چۆن تاك وەکو هاوڵاتیی شوێنکەوتووی فەرمانی دەسەڵاتی سیاسی بەردەوام پەیڕەوی لە عەقڵی خۆی دەکات؟.

لە باری سروشتیدا تاکەکان شوێنکەوتووی سەرکردایەتی کردنی هیچ دەسەڵاتێك نین. بەڵام لەکاتی هەنگاونانیان بۆ کۆمەڵگای سیاسی ئەم ئازادییە لەدەستدەدەن. هۆبز ئەم کارە بە گونجاو لەگەڵ هۆشمەندی دەبینێتەوە. ڕۆسۆ دەڵێت کاتێك هەمووان لە کۆمەڵگای سیاسیدا ملکەچی لە ویستی گشتی دەکەن لە ڕاستیدا جیا لە خۆیان ملکەچیان لە هیچ کەسێکی تر نەکردووە. کانت بەم جۆرە ئەم پرسە چارەسەر دەکات کە نیشانیدەدات خودرێسایی ویستی تاك و دەسەڵاتی حکوومەت نەك تەنها لە ڕووبەڕووی یەکدا نین بەڵکو لە ڕاستیدا دوو ڕووی یەك دراون. لە تیۆری خودیاسادانەریی کانتدا هەموو ئەندامێکی گرێبەستی کۆمەڵایەتی بەپێی فەرمانی عەقڵیی کردەیی یاسا گشتییەکان دادەنێت و لە کاتێکدا کە شوێنکەوتووی یاساکانە شوێنکەوتووی ویست و یاسای هیچ کەسێك نییە، چونکە ویستی ئەو یاساگەلێکی گشتیی داناوە. بەواتایەکی تر هەموو کەسێك بە تەنها خۆی یاساگەلێکی گشتیی داناوەو هەمووان وەکو یەك ئەم کارەیان ئەنجامداوە. ئەم تیۆرە کێشەکانی تیۆری ویستی گشتیی ڕۆسۆ کە لەسەرەوە ئاماژەیان پێکرا (ئەگەری نەگونجانی ویستی هەمووان لەگەڵ ویستی گشتی) چارەسەرکرد. لە تیۆری خۆیاسادانەریی کانتدا یاسا ویستی هەموو تاکەکانە چونکە ویستی هەموو تاکێك یاسای گشتیی دادەنێت، بەم پێیە کاتێك کە تاك پەیڕەوی لە یاسا دەکات شوێنکەوتووی ویستی هیچ کەسێك و یاسای هیچ کەسێك جیا لە ویستی خۆی و یاسای خۆی نییە. بەم جۆرە کانت وەڵامی ئەم ڕەخنەیەی داوەتەوە کە لە کاتی هاوڕانەبوونی تاك لەگەڵ بڕیاری ویستی گشتی لەم حاڵەتەدا تاك لە سنووری خودرێسایی دەرچووە و بەرەو ناخودرێسایی ڕۆیشتووە. بەهەمان شێوە کانت گرێبەستی کۆمەڵایەتی کە لە تیۆری پێشیناندا ڕووی ئامێریی وەرگرتبوو لە ئامێری بوون ڕزگاریکرد.

## عەقڵ و ویستی تاکەکەسی و عەقڵ و ویستی بە کۆمەڵ

کانت ئەرك و ویژدانی ئەخلاقی کە ڕاستیی دەرەکی لە بەرامبەریدا رادەوەستێت دەکاتە بناغە، ڕاستییەك کە سەربەخۆیە لە ویستی ئەو. بە واتایەکی تر ڕاستیی دەرەکی لە

بەرامبەر ئەرکی ئەخلاقیدا کەوتەبەر سەرنجی کانت. هیگڵ دەڵێت ئێمە ناتوانین تەنها لە بنەڕەتە فۆرمالییەکانی ویستدا بەدوای جەوهەری ئەخلاقیەتدا بگەڕێین. جەوهەری ئەخلاقی لە راستیی دەرەکی و راستیی کۆنکریتی لە بەکردەیی بوونی دەوڵەتدا بە دیاردەکەون. ئەو شتەی کە کانت ناتوانێت لە تیۆرەکەی خۆیدا بیخاتە بەر سەرنجەوە ئەوەیە کە دەستوور یان رێسا ئەخلاقییەکانی تەنها بنەڕەتگەلێکی هۆشەکی نین بەڵکو بنەڕەتگەلێکی مێژوویيشن کە نەك تەنها بە ئەزموونی تاك بەڵکو پەیوەستن بە هەلومەرجی گۆڕاوی کۆمەڵایەتیشەوە. هیگڵ بە لەبەرچاوگرتنی ئەم کەموکورتیانەی تیۆرەکەی کانت وێڕای وەرگرتنی چەند رەگەزێك لە بیری کانتەوە جارێکی تر گەڕایەوە بۆ تیۆری ویستی گشتیی رۆسۆ بە ئیلهام وەرگرتنە لەم دووەوە تیۆرێکی نوێی خستەڕوو.

بیری سیاسی بۆ رزگارکردنی خۆی لە هەموو وێناکۆنەکان دەربارەی دەوڵەت لەگەڵ تیۆری سیاسیی کانتدا رێڕەوێکی سەخت و دژواری تێپەڕاند. کانت هەموو جۆرە پشت بەستنێکی عەقلانیەتی بە سروشت و میتافیزیکەوە لێك پچڕاند و هەموو شتێکی بۆ ویستی مرۆڤ و عەقڵی پەتیی تاك گەڕاندەوە. هەنگاوی پاشتر لە ئەستۆی هیگڵدا بوو کە بۆ چارەسەرکردنی کەموکورتیی تیۆری سیاسی کانت عەقڵی پەتیی کردەیی ئەوی بۆ عەقڵی بە کۆمەڵ و جۆریی گۆڕی و بیری عەقلانیەتی دەوڵەتی گەیاندە پێگەیەکی نوێی گەشەکردن.

کانت بە تێگەیشتنێکی رادیکالتر لە هۆبز ئەرکی مرۆڤی بە تەواوی لە ویستەوە هەڵهێنجا و دیکترینی خودرێسایی ویستی عەقلانیی دامەزراند. هیگڵ خودرێسایی ویستیی عەقلانیی بۆ سەرتاسەری بوونەوەرەکان فراوانکردەوە. خودرێسایی عەقڵ واتە عەقڵ هەموو ناوەرۆکی خۆی لە خۆیەوە دەردەهێنێت. ویست کاتێك ئازادە کە ویستیاری خۆی بێت نەك شتێکی دەرەوەی خۆی.

کێشەی عەقلانیەتی کانت بریتی بوو لە فۆرمالیبوون و لە ئاکامدا بەتاڵبوونی. کانت بە نرخی فۆرمالیبوون بەتاڵبوونی توانیبووی خوردێسایی رادیکالی ویست بەدەستبهێنێت. کانت کە دەیویست بە تەواوی پەیوەندی خۆی لەگەڵ عەقڵ بە واتا کلاسیکییەکەی بپچڕێنێت بە پێچەوانەی نەخشەکەی خۆی لە جۆرێك پێوەری ئەفلاتۆنی بۆ عەقڵ نزیك ببووەوە. کانت وایدەزانی هەبوونی پێوەرێکی گشتی و تەواو فۆرمالی رێگەمان پێدەدات پێوەرێکی پێنراومان هەبێت بۆ رەتکردنەوە یان قبوڵکردنی کارکردن و ((دەبێت)) و





((نابێت))ەکان. تێڕوانینی ئەخلاقی کانت لەسەربنەمای ئەم گریمانەیە دامەزرا بوو کە ((ویژدانێکی ئەخلاقی)) بوونی هەیە و بەردەوام خوازیاری پەیڕەوی لێکردنی ئەرکی پەتییە. بەڵام پرسەکە لەوەدایە کە وەها ویژدانێك بە ناچاری بەردەوام دەکەوێتە رووبەڕووی سروشت و راستی دەرەکیی. راستی دەرەکی پەیڕەوی لە هەمان ئەو یاسایانە دەکات کە ویژدانی ئەخلاقی پەیڕەویان لێدەکات. هیگڵ بۆ زاڵبوون بەسەر ئەم ناکۆکییەدا هەوڵیدا کە عەقڵ بکاتە بکەری ئەخلاقیی سەرتاسەری جیهان و مێژوو. بەم جۆرە ئیدی ئەم بکەرە ئەخلاقییە (عەقڵ) راستی لە بەرامبەر خۆیدا نابینێتەوە بەڵکو لە ناوخۆیدا هەڵیگرتووە. لەبری ئەوەی بەپێی تێگەیشتنی کانت کاری گشتی کارێکی لەناوخۆ و ئەبستراکت و دوورە دەست بێت دەگۆڕێت بۆ کارێکی کۆنکرێتی و مرۆیی و لەسەیروورەتی مێژوودا جێگیر دەبێت. ئێستا مێژوو دەربارەی کاری تاك دەکەوێتە دادوەریکردن و وەکو پێوەر کاری پێدەکرێت.

هیگڵ هەستی بەوەکرد کە ناکرێت لە تاك یان بەواتایەکی تر لە سنووری پاژیدا بەدوای بناغەی ئەخلاق و ئازادیدا بگەڕێین بەڵکو دەبێت لە جۆرێك یەکێتی نێوان پاژ و گشت واتە ویستی تاك و ویستی کۆمەڵدا بەدوایاندا بگەڕێین. ناتوانین تاك بناسین تەنها ئەو کاتە نەبێت کە لە پەیوەندی تایبەتیی ئەو لەگەڵ تەواوی ئەو کۆمەڵگایەی کە تیایدا ئەندامە تێبگەین. کانت رایگەیاندبوو تێگەیشتنی مرۆڤ نەك تەنها یاساکانی خۆی لە یاساکانی سروشت و ئەزموونەوە وەرناگرێت بەڵکو یاساکانی خۆیشی بەسەریاندا دەسەپێنێت. ئەم کارە دەربارەی یاسا ئەخلاقییەکانیش هەر دروستە. لەبواری ئەخلاقیشدا مرۆڤ بە ئاسانی وەرگری یاساگەلێك نییە کە بەهۆی سەرچاوەیەکی دەرەکییەوە (ویستی خودا، یاسا سروشتییەکان) بەسەریدا سەپێندرا بێت. ویستی هەموو دروستکراوێکی خاوەن عەقڵ بریتییە لە ((ویستی یاسادانەر بەشێوەیەکی گشتی)). هیگڵیش بە هەمان شێوە مرۆڤی بە چالاك و مێژووساز راگەیاند، بەڵام لەبری هۆشی تاکەکەسی عەقڵی بە کۆمەڵی دانا.

گیان یان عەقڵ خوازیاری ئەوەیە کە مرۆڤ لە دەوڵەتێکدا ژیان بەسەرببات کە بەپێی دەوڵەتی عەقڵ پەسەند دروستکرابێت و مرۆڤەکان نەك وەکو تاکگەلێك کە قازانجەکانیان بە ئامێرێکی گەورەی هاوبەش دەستەبەردەکەن بەڵکو وەکو بەشداربوانی ژیانێکی گەورەتر لەگەڵ یەکتردا و لەگەڵ دەوڵەتدا لە پەیوەندیدا بن. هیگڵ جارێکی تر لە کۆمەڵەی فەلسەفیی خۆیدا سیستەمی چادریی بە ناوەرۆکێکی نوێوە بەکاربردەوە. بەڵام ئەم سیستەمە

بە تەواوی لە سیستەمی چادری بە واتا کلاسیکییەکەی جیاواز بوو. سیستەمی هیگڵی سیستەمێکی مرۆییە نەك سەر مرۆیی. لە سیستەمی هیگڵیدا مرۆڤ بەردەوام بەپێی نەریتی هۆبز و ماکیاڤیلی پەیڕەوی لە ویستی خۆی و یاسای خۆی دەکات.

لە تیۆرەکەی هیگڵدا مێژوو پرۆسەیەکی کامڵبوونییە و تیایدا مرۆڤ کە بوونەوەرێکی بەشێوەی پۆشراو ئازادە واتە رەنگدانەوەی گیان یان عەقڵە لە بەرزترین قۆناغی رەوتی کامڵبوونی خۆیدا بە خودئاگایی ئازادی دەگات. ئەم خودئاگاییە هێشتا لە کۆمەڵگای کۆیلەداری و فیودالیدا بوونی نییە. لەو دوو کۆمەڵگایەدا هێشتا مرۆڤ هۆگری ئازادی نەبووە، هێشتا ویستی مرۆڤ نەگۆڕاوە بۆ ویستی ئازاد. تەنها لە دەوڵەتی نوێدا مرۆڤ بە ئازادیی تەواو و خودئاگایی ئازادی دەگات.

## دەوڵەتی عەقڵانی وەکو بواری ئازادیی ئاگایانە

بابەتی ئەوەی کە ناسین کارە نەك کاردانەوە رۆڵێکی گرنگی هەبوو لە پێشکەوتنی بیری نوێدا. لایەنگرانی ئەزموونگەرایی هەر لە هۆبزەوە هەتا میل ناسینیان بەکاردانەوە لەقەڵەمدەدا. تەنها رۆڵی وەرگر و کاردانەوەیان بۆ هۆش لە بەرچاودەگرت. کانت لەم بوارەدا بیرێکی نوێی خستەڕوو. بەرەخنەی عەقڵی تیۆری نیشانیدا کە هۆش رۆڵی چالاکی هەیە لە پرۆسەی ناسیندا. بەڵگەی هێنایەوە کە هۆش لە کاری تێگەیشتندا گوتار و فۆرمەکانی خۆی لە ئەزموون باردەکات و ئەزموون دەخاتە ناو قاڵبی ئەم گوتار و فۆرمانەوە. بە واتایەکی تر کانت ئەو تیۆرەی خستەڕوو کە ناسینی بەرهەمی پەیوەندی نێوان بکەری ناسەر لەلایەك و شتی جێ مەبەستی ناسین لەلایەکی ترەوەیە. وتمان کە هیگڵ دیکترینی عەقڵ یان گیانی خۆی بە ئیلهام وەرگرتن لەم بۆچوونەی کانتەوە رێکخست. هیگڵیش وەکو کانت ((خود)) بکەری ناسەری وەکو یەك گشت ناساند کە رێکی و یەکێتی دەبەخشێتە کۆمەڵی دراوەکان. هیگڵ ئەم ((خود))ەی گۆڕی بۆ هۆشی بە کۆمەڵ. هیگڵ وێڕای قبوولکردنی بۆچوونەکەی کانت دەربارەی ئەوەی کە ناسین کارە نەك کاردانەوە رایگەیاند کە ناسین بەرهەمی فەردیی هۆشەکانە. ئەوبیرانەی کە لە رێگەیانەوە وێنەیەکی گونجاومان دەربارەی جیهان دە[illegible]کەوێت بە شێوەی جیاجیاو لە هۆشە تاك کەوتووەکاندا دروستنابن، بەڵکو بنەمای





میراتی هۆشی بە کۆمەڵە. بەم جۆرە بوو کە هیگڵ لە هەموو روویەکەوە لە هۆشی تاك و عەقڵانییەتی تاکەکەسیەوە گەڕایەوە بۆ عەقڵانیەتی مێژوو. لە تیۆرەکەی هیگڵدا ناسین بە شێوەیەکی کۆمەڵایەتی هەماهەنگ دەبێت و لە لە قۆناغی مەرجداربوون بە ئەزموونی مێژووییە. توانا هۆشەکییەکانی مرۆڤ پەیوەندییێکی ئۆرگانیکیی هەیە لەگەڵ چەند فۆرمێکی تایبەتی رێکیی کۆمەڵایەتی. عەقڵانییەت لەرووی ناوەڕۆکەوە نێوان هۆشی و کۆمەڵایەتییە.

بە بۆچوونی هیگڵ دەوڵەت لە لوتکەی پرۆسەیەکدایە کە لە سەرەتای شارستانیەتی مرۆڤەوە دەستی پێکردووە و هێشتا بەردەوام بەرەو کامڵبوون و بەرزبوونەوە بۆ پێشەوە رێگە دەبڕێت، مرۆڤەکان بەپێی سروشت و چارەنووسی خۆیان لە ناو دەوڵەتدا گەشە دەکەن، نەك لەبەرئەوەی کە دەسەڵات و توانایەکی بە ناچارە بەڵکو لەبەرئەوەی کە دەوڵەت لەناو ناخی مرۆڤەکانەوە وەکو بوونەوەرگەلێکی عەقڵانی هەڵدەقوڵێت. بەم پێیە دەوڵەت هەم سروشتێکی ناوەکیی هەیە و هەم سروشتێکی دەرەکی. ئازادی مرۆڤ بە پەیڕەویکردن لە جەوهەری خۆی واتە عەقڵ دێتەدی و پەیڕەویکردن لە عەقڵ بە واتای بەشداری کردنە لە ژیانێکی بەرفراوانتر واتە دەوڵەت. تەنها لە دەوڵەتدا مرۆڤ بوونێکی عەقڵانی وەردەگرێت.

هیگڵ بەپێی لەبەرچاوگرتنی هەموو لایەنەکانی ژیان وەکو خواستەکان و حەزەکان و قازانجەکان و رۆڵیان لە کۆمەڵگادا دەوڵەت شیدەکاتەوە. لە تیۆری دەوڵەتی هیگڵدا هەموو تاکێك لەگەڵ تاکگەلێکی تردا ژیان بەسەردەبات و بەستراوەتەوە بەوانەوە، هەروەك چۆن تاکەکانی تریش بەنۆرەی خۆیان بەستراونەتەوە بە ئەوەوە. بەم پێیە نابێت بەجیا لە کۆی پەیوەندییەکان و ئەو دامەزراوانەی کە خزمەتی پێویستییەکانی ئەو دەکەن و بۆ خۆیان رەنگدانەوەگەلێکی دیارکەوتنی گیانن لە جیهاندا لە تاك بکۆڵدرێتەوە. خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی هەریەك وەلامی بەشێك لە پێداویستییەکانی مرۆڤ دەدەنەوە. دنیای کۆمەڵگای مەدەنی یان کۆمەڵگای بۆرژوازی بەشێوەی تایبەتیی خۆی دنیایەکی عەقڵانییە. دەوڵەت لەچاو خێزان و کۆمەڵگای مەدەنی و باشترین تایبەتمەندییەکانی هەریەك و بە گونجاو لەگەڵ پێویستییەکانی مرۆڤ لە ئاستێکی بەرزتردایە. لە دەوڵەتی عەقڵانیی پێکهاتوو لە مرۆڤە خاوەن عەقڵەکان هەماهەنگی هەیە لە نێوان مەبەستە تایبەتی و گشتییەکانی ژیاندا. تەنها بەم جۆرە ناوەڕۆکی زاتیی دەوڵەت بەکردەیی دەبێت.

له تێڕوانینی سوودگەراییدا ئەو شتەی کە باشە بەردەوام بەتایبەتی لەقەڵەمدەدرێت. بەڵام هیگڵ لەو بڕوایەدایە کە مرۆڤەکان وێڕای رکەبەری و هاوکاری لە کۆمەڵگای مەدەنیدا لە هەمان کاتدا پەی بە بەهاکانی دەوڵەتیش دەبەن. هاوکاریکردن بۆ بەرەو پێشەوەبردنی قازانجە تایبەتییەکان لە هەمان کاتدا فێری بەهای هاوکاری لەپێناو خودی هاوکاریشمان دەکات. ئەو پێویستیانەی کە لە کۆمەڵگای مەدەنیدا دێنە پێشمان زیاتر لە پێویستییە سروشتیەکان بە یەکتر و بە کۆمەڵگاوە دەمانبەستێتەوە. لێرەدا پێوەرگەلێك دەربارەی فەزیلەت بەدەستدەهێنین کە لە ناوەرۆکی ویستی گشتییەوە نزیکترە. هیگڵ بە پێچەوانەی رۆسۆوە ژیانی سادە بە ژیانی خوازراو و سروشتی لەقەڵەمنادات، بەڵکو بڕوای وایە سروشتی مرۆڤ لێرەدا بەردەوام تواناکانی خۆی پەرەپێدەدات و بە پلە بەرزترەکان دەگات.

هیگڵیش وەکو رۆسۆ ئازادی بە جیاواز دەزانێت لەسەربەخۆ بوون بۆ بەدواداگەڕانی حەزەکان و لەپێشترییەکان. گیان کاتێك کە لە باری نوستوودا مابێتەوە و بووبێتە کۆیلەی ئارەزووەکان ئازاد نییە (چونکە کویلەی ئارەزووەکانە). گیانی تاکەکەسی تەنها کاتێك پەیڕەویی لە ویستی راستەقینەی خۆی کردووە و ئازادە کە هەوڵبدات خۆی لەگەڵ گیانی گشتی یان عەقڵی گشتی هەماهەنگ بکات. ئازادی بە واتای هەڵبژاردنی نائاگایانە نییە، بەڵکو ئازادی واتە ویستنی ئەوشتەی کە عەقڵانییە. هەر کاتێك گیانی تاکەکەسی پەیڕەوی لە ویستی راستەقینەی خۆی بکات ئازادە. بەڵام تاك چۆن دەتوانێت ویستی راستەقینەی خۆی بناسێت؟ هیگڵ دەڵێت گیانی راستەقینەی تاکەکان لە یاساکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانی دەوڵەتدا رەنگیداوەتەوە و دامەزراوە سیاسییەکان رەنگدانەوەکانی عەقڵی گشتین. هەڵبەتە لە دەوڵەتی نوێدایە کە دەوڵەت بۆ بەرزترین پایەکانی خۆی گەشە دەکات و بە دەوڵەتی تەواو ناودەبرێت. سەردەمی نوێ بووەتە سەردەمی عەقڵی ئازاد و لەم سەردەمەدایە کە هەستکردنی مرۆڤ پاش تێپەڕاندنی چەرخی کۆن و سەردەمی مەسیحیەت بە ئاستێکی گەشەکردن گەیشتووە کە دەبێت چارەنووسی خۆی بگرێتە دەست و دەوڵەتێکی تەواو عەقڵانی واتە دەوڵەتی تەواو دابمەزرێنێت.

## سەرچاوەکان

### سەرچاوە فارسییەکان:


١- استروس، لئو، فسلفه سیاسی چیست، ترجمه فرهنگ رجایی، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٣.

٢- برلین، ایزایا، ((جان استوارت میل و غایات حیات)) چهار مقاله درباره ازادی، ترجمه علی موحد، انتشارات خوارزمی، ١٣٦٨.

٣- برلین، ایزایا، ((دو مفهوم ازادی))، در مایکل ساندل، لیبرالیسم ومنتقدان ان، ترجمه احمد تدین، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٤.

٤- پلامناتز، جان، ایدئولوژی، ترجمه عزت الله فولادوند، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٣.

٥- پلامناتز، جان، فلسفه اجتماعی هگل، ترجمه حسین بشیریه، نشرنی، ١٣٧٦.

٦- تاك، ریچارد، ((هابز))، ترجمه حسین بشیریه، تهران، طرح نو، ١٣٧٦.

٧- جونز، او، ت خداوندان اندیشه سیاسی، جلد دوم، ترجمه علی رامین، تهران، انتشارات امیر کبیر، ١٣٦٢.

٨- روسو، ژان ژاك، قرارداد اجتماعی، ترجمه منوچهرکیا، تهران، انتشارات گنجه، ١٣٥٣.

٩- ساندل، مایکل، فایده‌گرایی کلاسیك، لیبرالسیم و منتقدان ان، ترجمه احمد تدین، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٤.

١٠- ستیس، و. ت. فسلفه هگل، جلد اول، ترجمه حمید عنایت، تهران، شرکت انتشارات جیبی، ١٣٧٠.

١١- کاپلستون، فردریك، تاریخ فلسفه، جلد ششم، ترجمه اسماعیل سعادت و منوچهر بزرگمهر، تهران، انتشارات سروش، ١٣٧٢.

١٢- کاسیرر، ارنست، ((روسو، کانت، گوته))، ترجمه حسن شمس اوری، کاظم فیروزمند، تهران، نشر مرکز، ١٣٧٤.

١٣- کانت، ایمانوئل، بنیاد ما بعد الطبیعة اخلاق، ترجمه حمید عنایت و علی قیصری، تهران، انتشارات خوارزمی، ١٣٦٩.

١٤- کرم، یوسف، فلسفه کانت، ترجمه محمد رضایی، قم، مرکز انتشارات تبلیغات اسلامی، ١٣٧٦.

١٥- کورنر، اشتفان، فلسفه کانت، ترجمه عزت الله فولادوند، تهران، انتشارات خوارزمی، ١٣٦٨.








١٦- میل، جان استوارت، رساله درباره ازادی، ترجمه جواد شیخ الاسلامی، تهران، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٥.

١٧- نوزیك، رابرت، ((محدودیتهای اخلاقی وعدالت توزیعی)) در مایکل ساندل، پێشوو.

١٨- وینسنت، اندرو، نظریه های دولت، ترجمه دکتر حسین بشیریه، تهران، نشرنی، ١٣٧١.

١٩- هیپولیت، ژان، پریدارشناسی روح برحسب نظر هگل، ترجمه کریم مجتهدی، تهران، انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧١.


### سەرچاوە لاتینییەکان:


1- Ashcraft, Richard "Ideology and Class in Hobbes" Political Theory Vol2, No I, February 1976.

2- Barry, Brian "Warender and his Critics" Philosophy, Vol 43, 1968.

3- Bentham, Jeremy Works of Jermy Bentham, ed. By John Bowring, Edinburogh, William Trait, 1838.

4- Berman, Marshell "Liberal and Totalitarian Therapies in Rousseau" Political Theory Vol 4, No 2, May 1996.

5- Bilefeldet, Heiner "Antonomy and Republicanism, Immanual Kant Philosophy of Freedom" Political Theory, August 1997.

6- Brown, Reith (ed), Hobbed Studies, Oxford Blaerwell, 1965.

7- Brown, Stuart "Hobbes: The Taylor Thesis" PhilosoPhical Reviw Vol 68, 1956.

8- Buch walten, Andrew, "Hegel's Coneept of Virtue" Political Theory, Vol 20, No 4, November 1992.

9- Caro, Tason "Looking over your Sheulder: The Onlookers of Hegel's Phenomenology," Political Studies Vol 14, 1991.

10- Cassirer, Ernst The My th of the State, Yale University Press, 1991.
11- Catlin, George The Story of Political Philospphy, New York, 1930.
12- Cobban, Alfred Rousseau and the Modern State, London, 1964.
13- Colleti, Lucio From Rousseau To Lenin, Trans. John Merrington and Judith White, Norfold, Low and Brydone.
14- Collins, Ardis(ed). Hegel on Modern World, Albany, State University of New York Press 1994.
15- Coor, Themas Introduction to Two Treatises of Government by John Locre, New York, London, Collier Macmillan, 1947.
16- Cox, Richard Locre on War and Peace, Oxford, Oxford University Press, 1960.
17- Crassman, R. H. Government and Governed, London, 1940.
18- Dahl, Robert Who Governs?, New Haven, Yale University Press, 1961.
19- Dodson, Revin "Autonomy and Authority In Kant's Rechtslehre" Political Theory, Vol 25, No 1, February 1997.
20- Douglass, Bruee "The Common Good and Public Interest" Political Theory, Vol 8, No 1, February 1980.
21- Dunn, John The Political Thought of Jhon Locre, Cambridge, Cambridge University Press, 1969.
22- Etudes sur Le Contrat Social de. Rousseau, Proceeding of the Seminal Held At Diton My 1962.
23- Geregor, Mary the Laws of Freedom, Oxford University Press, 1963.
24- Glass, James "Political Philosophy as Thrapy: Ronsseau and Presocial Origins of Consciousness" Political Theory, Vol 4, No 2, May 1976.
25- Glass, James, Looking over your Shoulder: The onlookers of hegel's Phenomenology, "Political Studies Vol 14, 1991.






26- Gregor, Mary The Law's of Freedom, Oxford, Oxford University Press, 1963.
27- Gunn, J. W. "Jeremy Bentahm and Public Interest" In Jack Lively and Andrew Reeve, Modern Political Theory, London, Routledge, 1991.
28- Habermas, Jurgen the Philosophical Discourse of Modernity, Cambridge, Mass, 1987.
29- Halevy, Eli The Growth of Philosophical Radicalism, Boston Press, 1967.
30- Hegel, Fridreich Leetures on the Philosophy of World History, ed. By Johanne Hoffineister, Cambridge University Press, 1975.
31- Hobbes, Thomas Leviathan, ed. By Michael Oakeshott, Oxford Black Well, n. d.
32- Hoekstra, Kinch "Hobbes and the Foll". Political Theory, Vol 25, No 5, October 1997.
33- Hugh, C. F. and Reyburn. A. The Ethical Theory of Hegel, A Study of The Philosophy of Right, Oxford, Clarendon Press, 1921.
34- Hyppolite, John Genesis and Structure of Hegel's Phenomenology of Spirit, Evanston, North Westem University Press 1947.
35- Jonston, David the Rhetorics of Leviathan: Themas Hobbes and the Polities of Caltural Transformation, Princeton 1958.
36- Kant, Immanuel "On the Commen Saying" In kant's Political Writing ed. Hans Relss trans. H. B. Nisbet, Cambridge University Press 1970.
37- Kant, Immanuel Critique of Pure Reason, Eng, trans, Norman remp, New York, St Martin, 1965.
38- kant, Immanuel Critique of Pure Reason, Trans. Norman remp, New York s.t Martin, 1968.

39- Kant, Immanuel Religion Within the Limits of Reason Alone, Trans. Theodor Gleen and Hoyt Hudson, New York, Harper and Row 1960.

40- Kant, Immanuel the Metaphysical Elements of Justice, trans. John Ladd, Indianapolis, Bobbes Merill, 1965.

41- Kavka, Gregory Hobbesian Moral and Political Theory, Princeton, Princeton University Press, 1986.

42- Krieger, Leonard the German Idea of Freedom: History of a Political Tradition, Boston, 1957.

43- Lister, Andrew, "scepticism and Pluralism in Thomas Hobbes' Political Thought" History of Political Thought, Vol XIX No 1, spring 1998.

44- Lively, Jack and Reeve, Andrew (eds), Modern Political Theory From Hobbes to Marn, London, New York, Routledge, 1989.

45- Locke, John Two Treatises of Government ed. Peter Laslet, Cambridge, Cambridge University Press, 1968.

46- Lubirinsky, z. "Hobbes Philosophy and it's Historical Background" Journal of Philosophical Studies Vol 18, 1930.

47- Macadam Y. I "The Discourse on Inequality and Social Contraet" In jack Lively and Andrew Reeve op. eit.

48- Macluer, Robert Leviathan and People, Baten Ronge 1939.

49- Macpherson, C. B. The Political Theory of Possessive Individnalism, Oxford, Clarendon Press, 1962.

50- Mansfield, Harvey "Self – Interest Rightly Understood" Political Theory, Vol 23 No 11, February 1995.

51- Masters, Roger Political Philosophy of Rousseau, Princeton University Press, 1968.






52- Mill, James Essay on Government ed. C Shields, Indian apolis, Bobbs Merrill, 1955.

53- Oareshatt, Michael Rationalism in Politics and other Essorys, New York, Basic Boores, 1962.

54- Oareshatt, Michael "Moral Life Writing of Thomas Hobbes" in Rationalism in Politics and other Essorys, New York Basic Books, 1962.

55- Oareshatt, Michael "Thomas Hobbes" Political Theory, No 2, 1936-7.

56- Olson, Mancur The Logic of Collective Action, New York, Schoren Books, 1968.

57- Pateman, Card The Problem of Political Obligation, Berkley, University of California Press, 1985.

58- Peters, Richard Hobbes, Harmonds Worth, 1950.

59- Peters, Richard Hobbes, Harmonds Worth, Pengnin, 1956.

60- Plamematz, John Man and Society Vol 2, London, New York Longman 1992.

61- Plamenatz, John Man and Society, London, Longman, 1963.

62- Pusey, Michael Jurgen Habermas, London, Tavistock Publicattion, 1987.

63- Pusey, Michael Jurgen Habermas, London, New York, Tavistock Publication 1987.

64- Rayn, Alan, "Two Concept of Polities and Democracy, James and John Stuart Mill" in Jack Lively and Andrew Reeve, eds, Modern Political Thought, London - New York, Rout ledge, 1989.

65- Rees, John (ed) Utilirianlogic and Politics, Oxford, Clarendon Press, 1978.

66- Riley, Partick Will and Political Legitimacy, Cambridge, Harvard University Press, 1982.

67- Rousseau, Jean Jacque Discours Sur L'Economic Politiqne, Biblioteqne de la Pleiade, Vol II.

68- Rousseau, Jean Jacqne The Social Contract and Discourses. Trans. G. Cole, London, Dent, 1973.

69- Schmidt, James "Cabbage Head and Gulps of Water: Hegel on Terror" Political Theory, Vol 26 No 1, February 1998.

70- Sehumpeter, Joseph Capitalism, Socialism and Demecracy, London, Allen and Unwin, 1943.

71- Seliger, Martin The Liberal Politics of John Locke, London, Allen and Unwin, 1968.

72- Sowns, Antheny An Economic Theory of Demoeracy, New York, Harper, 1957.

73- Starobinski, Jean Jacque Roussean Transparency and Obstraction Trans, Arnold, Chicago, Gold Hammer, 1988.

74- Starobinsky; Jean Jacque Rousseau: Trans parency and Obstraction Chicago, Gold Hamer, 1988.

75- Stranss, Leo Natural Right and History, Chieago University Press, 1953. Strauss, Leo The Political Philosophy of Hobbes, Oxford, 1936.

76- Tarlton, Charles "Rehabilitating Hobbes's Obligation, Anti Faschism and The Myth of a Taylor Thesis" History of Political Thought, Vol XIX, No 3, Autumn 1998.

77- Taylor, Charles Hegel, London, New York, Cambridge University Press, 1975.

78- Taylor, Charles Philosophy and the Human Society, Cambridge, 1985.

79- Tregenza, Ian "the Life of Hobbes in the Writing of Michael Oakshat" History of Political Thought, Vol XI. No 3, Autumn 1997.






80- Tully, James Discourse on Property – John Locke and his Adversaries, Cambridge, Camebridge University Press, 1980.

81- Tunick, Mark "Art There Natural Rights? Hegel's Break With Kant" Hegel on Modern World, ed. Ardis Collins, Albany, State University of New York 1994.

82- Tunick, Mark "Hegel on the Justified Diso bedience" Political Theory, Vol 26, No 4, August 1998.

83- Ubirinsky, Z. L "Hobbes Philosophy and it's Historical Background" Journal of Philosophical Studies Vol 18, 1930.

84- Warender, Howard The Political Philosophy of Hobbes, His Theory of Obligation, Oxford, Clarendon Press, 1957.

85- Warrender, Howard "Hobbes Studiesi Documentation Versus History", Political Studies Vol. 33, 1985.

86- Wayper, C. L. Political Thought, English University Press Ltd, 1945.

87- Wolff, Charles "Rawels Political Philosophy Without Politics: in Dowid Rasmussen(ed). University vs. Comunitarianism, England, Mit Press 1990.

88- Workler, Robert "Conceptualizing Hegels Phenomeno logy of the French Revolution and tha Terror" Political Theory, Vol 26, No. 1, 1998.